# کورد و کوردستان

## لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا

(بەشی دووەم و کۆتایی : کوردستانی ئێران و تورکیا)

ئامادە کردنی:

پرۆفیسۆر لوکمان میهۆ

وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە:

وریا رەحمانی

✓ ناوی کتێب : کورد و کوردستان له بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا

✓ ئامادەکردنی : لۆکمان میهۆ

✓ وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە : وریا رەحمانی

✓ نرخی هەردوو بەرگ ( ٢٥٠٠٠ ) هەزار دینارە

✓ ساڵی چاپ : ٢٠٠٩

✓ بڵاوکراوەی : دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات

✓ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٢٢٦٦ ) ساڵی ٢٠٠٩ی داوەتێ

✓ شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات – هەولێر

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا

**سەلام محەمەد رەسول**

پێشكەشە بە

لەیلا زانا

و

سەرجەم ئەو سیاسەتمەدارە بەشەرەفانە كە داكۆكی لە گەلی

بندەستی كورد دەكەن، لەسەرووی هەموویانەوە

ئەندامانی كۆنگرێسی ئەمریكا:

باب فیلنێر

و

فرانك پاڵۆن

# پێرست

| | |
|---|---|
| | یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ئێران بۆ وەزارەتی دەرەوە<br>دەربارەی دیداری كاربەدەستانی ئێران و كوردەكان<br>تاران، ٣ ی گوڵانی ١٩٤٢ |
| ٤٤ | تیلیگرامی ١٨٦٧ / ٠٠ / ٨٩١ لە باڵوێزی وڵاتە<br>یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە توركیا بۆ وەزارەتی دەرەوە<br>دەربارەی نیگەرانی جیدی دەوڵەتی ئێران لە ئاژاوەگێڕییەكانی<br>كوردەكان لە ئازەربایجان<br>ئانكارا، ٤ ی گوڵانی١٩٤٢ |
| ٤٦ | تیلیگرامی ١٨٦٢ / ٠٠ / ٨٩١ لە وەزارەتی دەرەوە بۆ<br>باڵوێزی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە یەكێتی سۆڤیەت<br>دەربارەی چالاكیەكانی عەشیرەتە كوردە یاخیبووەكان لە<br>ناوچەی رەزائیە<br>واشنگتۆن، ٦ ی گوڵانی ١٩٤٢ |
| ٤٩ | تیلیگرامی ١٨٧١ / ٠٠٠ / ٨٠١ لە وەزیرموختاری ئەمریكا<br>لە ئێران بۆ وەزارەتی دەرەوە دەربارەی تاڵانكارییەكانیانی<br>كوردەكان لە ناوچەی رەزاییە<br>تاران، ١٢ ی گوڵانی ١٩٤٢ |
| ٥٠ | تیلیگرامی ٠٠١١ /٢٤٥٤٦٧٤٠ / ١٩٣٩ لە وەزیرموختاری<br>ئەمریكا بۆ وەزارەتی دەرەوە دەربارەی جموجۆڵی سەربازانی<br>روسیا |

| | |
|---|---|
| تاران، ٢٨ ی ئەیلوولی ١٩٤٢ | |
| تیلیگرامی ٢٣٤٥ ـ ١٠ / ٠٠ / ٧٦١ لە باڵوێزی ئەمریکا لە یەکێتی سۆڤیەت بۆ وەزارەتی دەرەوە دەربارەی سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەت بە نیسبەت کوردەکان<br>مۆسکۆ، ٢٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ | ٥٢ |
| تیلیگرامی ٥٤٦ ـ ٣/٩١/٧٦١ لە جێگری کونسولی ئەمریکا لە تەورێزبۆ وەزارەتی دەرەوە دەربارەی ئەوەی کورەکانی ئێران داوای کوردستانی تورکیا دەکەن<br>تەورێز، ٥ ی ئاداری ١٩٤٦ | ٥٩ |
| تیلیگرامی ١٧٤٦ ـ ٣/٢٤٥٩١ ـ ٨٦١ لە لایەن کارداری ئەمریکا لە یەکێتی سۆڤیەت بۆ وەزارەتی دەرەوە دەربارەی هێما و ئاماژەکانی چالاکیەکانی سۆڤیەت لە ئێران<br>موسکۆ، ١٧ ی ئاداری ١٩٤٦ | ٦١ |
| تیلیگرامی ١٨٤٦ ـ ٣/٨٦١/٢٤٥٩١ لە باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران بۆ وەزارەتی دەرەوە دەربارەی بارودۆخی هێزەکانی سۆڤیەت و چالاکیەکانی کوردەکان<br>تاران، ١٨ ی ئاداری ١٩٤٦ | ٦٤ |
| تیلگیرام لە وەزارەتی دەرەوە بۆ جێگری کونسولی وڵاتە | ٦٦ |

| | |
|---|---|
| ٧ ی نیسانی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی پیران<br>سیاسەتەکانی تورکیا بەرامبەر بە هاووڵاتیە کوردەکانی | ١٣٤ |
| حەواندنەوەی کوردەکان لە باکووری عێراق<br>١٢ی حوزەیرانی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی پیران | ١٣٧ |
| درێژکردنەوەی ڕێککەوتننامەی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش<br>لە لایەن تورکیاوە<br>٨ی تەموزی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی نوێنەران | ١٣٩ |
| پیرۆزبایی لە تورکیا بۆ درێژکردنەوەی کاتی شاڵاوی<br>دابینکردنی ئاسایش<br>٩ی تەموزی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران | ١٤١ |
| درێژکردنەوەی ڕێککەوتننامەی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش<br>هیوایەکی نوێ دەبەخشێ بە کوردەکان<br>٩ی تەموزی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران | ١٤٢ |
| ٦ ی گوڵانی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران<br>بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا | ١٤٤ |

| | |
|---|---|
| ٣٠ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ - ئەنجوومەنی پیران | |
| ٢٠ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران<br>پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەلایەن تورکیاوە بەردەوامە | ٢٠٩ |
| ٢٠ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٥ - ئەنجوومەنی نوێنەران<br>دەوڵەتی تورکیا ٥ قاتی ئەو پارەیە کە بۆ جێبەجێکردنی<br>پرۆژەی گەورەی ئاوی GAP خەرج دەکات، بۆ شەڕ لەگەڵ<br>PKK خەرجی دەکات | ٢١٢ |
| ٩ ی شوباتی ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران<br>پەرەسەندنی شەڕی تورکیا لەگەڵ ئازادی رادەربڕین | ٢١٥ |
| ٢٠ ی ئاداری ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی پیران<br>ئاتوێ کردنی گەڵاڵە یاسایەك بۆ سنووردار کردنی یارمەتی<br>وڵاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا | ٢١٩ |
| ٢٣ ی ئاداری ١٩٩٥ - ئەنجوومەنی پیران<br>بڕیارنامەی ٩١ ی ئەنجوومەنی پیران دەربارەی تورکیا | ٢٢٦ |

| | |
|---|---|
| ٢٨ ی ئاداری ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران<br>بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا لە زمانی لیژنەی مافی مرۆڤەوە | ٢٣٢ |
| ٢٨ ی ئاداری ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی پیران<br>داگیرکرانی باکووری عێراق لە لایەن تورکیا | ٢٤٠ |
| ٣٠ ی ئاداری ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران<br>تورکیا دەبێ هێرشە دڵڕەقانەکانی دژبە گەلی کورد رابوەستێنێت | ٢٤٤ |
| ٥ ی نیسانی ١٩٩٥ - ئەنجوومەنی پیران<br>تورکیا دەبێ لەباکووری عێراق پاشەکشە بکات<br>٢٤ ی گوڵانی ١٩٩٥ - ئەنجوومەنی نوێنەران<br>راپورتێك دەربارەی یارمەتیە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا بۆ شەڕ دژی کوردەکان | ٢٤٧ |
| ٢١ ی ئەیلولی ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی پیران<br>هەموار کردنی یاسای یارمەتی ئابووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا | ٢٥٠ |

| | |
|---|---|
| | کێشەی کورد لە ناوخۆی تورکیایە بەڵام دەوڵەتی تورکیا هەوڵ دەدات لە دەرەوەی سنوورەکانی چارەسەری بکات |
| ٣٧٦ | ٩ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧ - ئەنجوومەنی نوێنەران لەیلا زانا ئازاد بکەن |
| ٣٨١ | پێویستی دادگایی کردنی رێبەرانی رژێمی عێراق و تورکیا لە دادگای نێونەتەوەیی تاواندا<br>١٤ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧ – ئەنجوومەنی نوێنەران |
| ٤٠٠ | ١٤ ی ئاداری ١٩٩٨ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران<br>هێزەکانی ئاسایشی تورکیا و گروپە"مرۆڤکوژەکان" پێکەوە هاوکاری دەکەن |
| ٤٠٤ | ٤ ی ئابی ١٩٩٨ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران<br>وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا درێژە دەدات بە پشتگوێ خستنی بارودۆخی خراپی گەلی کورد |
| ٤٠٧ | ٨ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران<br>بریاری تورکیا بۆ مەحکوم کردنی لەیلا زانا پێشێلکردنی بێ |

## پێشەکی وەرگێڕ

راستە ناوی بەرگی دووەمی ئەم کتێبە " کوردستانی ئێران و تورکیا لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا" یە (کە باشتریش وایە بڵێین "کوردستانی ئێران و تورکیا لە سیاسەتی دەرەوی ئەمریکا") بەڵام هەروەها کە دەبینین زۆربەی ناوەرۆکی کتێبەکە پەیوەندی بە کوردستانی تورکیاوە هەیە و زۆر باسی کوردستانی ئێرانی تێدانییە. هۆکاری ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە لە راستیدا بەپێچەوانەی مەسەلەی کوردی عیراق کە ئەمریکا بە "کوردە باشەکان"ی زانیون و جارناجار پشتیوانی لێکردوون و هەروەها کوردی تورکیا کە ئەمریکا بە "کوردە خراپەکان"ی زانیون و زۆربەی جاران دژایەتی کردوون و زۆر باسیشی کردوون، مەسەلەی کوردی ئێران قەد بە لای دەوڵەتی ئەمریکاوە(و تەنانەت کۆنگرێسی ئەمریکاشەوە) گرنگ نەبووە و لە راستیدا ئەمریکا نە بە خاس ، نە بە خراپ هەر باسیشی نەکردووە .

هۆکاری ئەم مەسەلەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا وەك هەموو وڵاتانی دیکە لە سەر بنەمای بەرژەوەندییە و ئەگەر دەبینین نەتەوەی بندەستی کورد سەرنجی تایبەت بەسیاسەت و هەڵوێستی ئەمریکا دەدات و بەردەوام هەوڵی داوە پشتیوانی ئەمریکا بەرەولای خۆی رابکێشێت، هۆکارەکەی ئەوە نییە کە بەتەمای ئەوەبوبێت ئەمریکا بێت و رزگاری بکات یا لە فەلسەفەی سیاسەتی ئەمریکا تێنەگەیشتبێت، بەڵکوو ئەوەیە کە بە هۆی ئەوەی ئەمریکا خاوەن سیستمیکی دیموکرات و یاسایەکی پیشکەوتوو و کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی مۆدیرنە و دەوری یەکلاییکەرەوە دەگێڕێ لە هاوکێشەکانی جیهان و بە تایبەت هاوکێشەکانی

ڕۆژهه‌ڵاتی ناوەڕاستدا، هەربۆیە چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێت پشتیوانی لەو بیرۆکە و چەمکانە بکات کە خۆی بانگەشەی دەکات و خۆی بە پێشڕەویان دەزانێت، بەڵام دەبینین بەتەواوی بەپێچەوانەیە و لەپێناو بەرژەوەندییەکانیدا، ئەمریکا چاوپۆشی لە قوربانیکردنی هیچ پرەنسیپ و ڕێوشوێنێکی مرۆڤی و ئەخلاقی( بەتایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ گەل و نەتەوە بندەست و بێ پشتیوانەکان) نەکردووە و ناکات .

ئەمریکا لە سەردەمی حکوومەتی پەهلەویدا دۆست، هاوپەیمان و پشتیوانی بێ ئەملاولای شا بوو و سەرەڕای ئەو هەموو سەرکووت و زەبروزەنگەی شا دژ بە گەلی کورد، ئەمریکا جارێ لە جاران باسی مافی گەلی کوردی نەکرد و لە کاتی کۆماری کوردستانیشدا سەرەڕای ئەوە کە پێشەوا قازی محەمەد هیچ دژایەتی ئەمریکای نەدەکرد و چەند جار بە شێوەی ناڕاستەوخۆ گڵۆپی سەوزیشی بۆ هەڵکرد، ئەمریکا نەتەنها هیچ گوشارێکی نەخستە سەر شا تا لە بەرامبەر داواکارییەکانی کوردەکان نەرمونیانتر بێت، بەڵکوو تا ئەو شوێنەش کە پێیکرا درێغی نەکرد لە هاندان و پشتیوانیکردن لە شا بۆ ئەوەی کۆماری مهاباد بڕوخێنێت و گەلی کورد سەرکووت بکات. ئەمریکا تەنانەت لە ئاستی ئێران بە گشتیدا، پشتیوانی لە سەرەڕۆیی شا لەبەرامبەر دەوڵەتی نەتەوەیی دۆکتۆر موسەدیق کرد و لە ئەنجامی پیلانی ڕاستەوخۆی ئەمریکا(لەڕێگای CIAوە) دەوڵەتەکەی موسەدیق ڕووخا و بەمشێوەیە دیسان سەرکووت و زەبروزەنگ بەسەر ئێراندا زاڵ بووەوە.

تەنانەت پاش شۆڕشی ئیسلامی ١٩٧٩ و دەستپێکردنی ناکۆکی و دوژمنایەتییە ئیدوئۆلوژیك و سیاسییەکانی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی و ئەمریکا و سەرەڕای ئەوە کە گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بە گشتی و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بە

تایبەتی، هاوتەریب لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دژی کۆماری ئیسلامی خەباتی کردووە و زۆرترین قوربانیش داوە، ئەمریکا نەتەنها دانی خەیری بە خەباتی گەلی کورد و داواخوازییەکانیدا نەناوە و هیچ پشتیوانییەکی لە کوردەکانی ئێران و بزووتنەوەکەیان نەکردووە، بەڵکوو بەردەوام دژایەتی بزووتنەوەی کوردی(بە ناسیونالیست و کومونیستییەوە) کردووە و تەنانەت گلۆپی سەوزیشی بۆ کۆماری ئیسلامی بۆ کوشتن و تیرۆری ڕێبەرانی کورد لە دەرەوە وڵات هەڵکردووە کە بەرچاوترین نموونەی، تیرۆری دۆکتۆر عەبدولڕەحمانی قاسملوو بووە.

لەوانەیە بڵێین ئەمریکا قازانجی سیاسی لەوەدا نەبووە پشتی بزووتنەوەی سیاسی کوردی ئێران بگرێت یا وەك نەتەوەیەك یا لانیکەم وەك لایەنێك مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەمریکا تەنانەت وەك ئەتنیك، کەمینە و گروپێکی کولتووریش هەڵسوکەوتی لەگەڵ کوردی ئێران نەکردووە و لە ڕوانگەی خێرخوازی و مافی مرۆڤیشەوە وەکو پێویست بە قازانجی گەلی کورد و دژ بە کۆماری ئیسلامی هەڵوێستی نەگرتووە.

ئەڵبەتە نابێت ئەوەش لەبیر بکەین کە هەرچەند کە گەورەترین هۆکاری ئەم بێدەنگی و بایەخنەدانەی ئەمریکا بە پرسی کوردی ڕۆژهەڵات، مەسەلەی بەرژەوەندی ئیستراتژیك و دریژخایەن بووە، بەڵام چەند هۆکارێکی دیکەش لەم پەیوەندییەدا دەوریان بینیوە کە یەکێ لەوانە زاڵبوونی بیرۆکەی چەپ بە سەر بزووتنەوی کورد و دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم( بەتایبەت لە ساڵانی سەرەتای شۆڕشی ئیسلامی) بووە. هۆکاری دیکە، لاوازبوونی لۆبی کوردی ڕۆژهەڵات (بە بەراورد لەگەڵ لۆبی بزووتنەوەی کوردی باکوور و باشوری کوردستان) لە ئەمریکا و بەهێزبوونی لۆبی

ئێرانییەکان (بە هەردوو لایەنی لایەنگری کۆماری ئیسلامی و دژبەری کۆماری ئیسلامی) بووە، چونکە بەهەرحاڵ ئێرانییەکان (سەرجەم لایەن و حیزبەکانیان، تەنانەت دیموکراتترینەکانیان) ئەگەر لە سەر مەسەلەکانی دیکە پێکەوە ناکۆك بن، لە سەر ئەوە کۆکن کە نابێت پرسی نەتەوەکانی ئێران، بەتایبەت نەتەوەی کورد رەوایی نێونەتەوەیی پەیدا بکات، هەربۆیەش ئەم هێز و لایەنانە دەوری سەرەکییان بینیوە لە بەلارێدابردن و چەواشەکردنی جەوهەری خەبات و راستی ماف و داواکارییەکانی نەتەوەکانی ئێران (بەتایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ مەترسی یەکپارچەیی خاکی ئێران) لای بیروڕای گشتی و لایەنە نێونەتەوەییە پەیوەندیدار و بڕیاربەدەستەکانی ئەمریکا .

ئێستاش بە هاتنەسەرکاری دیموکراتەکان و بەتایبەت "باراك ئۆباما"ی سەرۆك کۆمار، ئاسۆی پشتیوانی ئەمریکا لە مافی نەتەوە بندەستەکانی ئێران و بە تایبەت گەلی کورد ئەوەندەی دیکە لێڵ و هیوابڕانە بووە، چونکە ئەگەر جاران کۆماریخوازەکان جارناجار رووی قسەیان لە خەڵکی ئێران دەکرد و جارناجار کێشەی پێشێلکردنی مافی مرۆڤیان دەکرد بە بیانوو بۆ ئەوەی گوشار بخەنە سەر دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی، ئێستا دیموکراتەکان ئامادەن بە هەموو بەهایەك، لەوانە قوربانیکردنی مافی گەلانی بندەستی ئێران و تەنانەت بە تیروریست لەقەڵەمدانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد لە کوردستانی ئێران(کە لەم پەیوەندییەدا هەنگاوی یەکەمیان بەنیسبەت یەکێ لە حیزبە کوردەکانی رۆژهەلاتی کوردستانی هەڵگرتووە) نیازپاکی خۆیان بە کۆماری ئیسلامی بسەلمێنن و لەسەر حیسابی خوێن و مافی گەلی کورد لەگەڵ دەوڵەتی ئێران مامەڵە بکەن.

# پێشەكی- نۆام چامسكی*

وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا وەك بەهێزترین دەوڵەت لە جیهاندا، دەوری هەیە لە هەموو كاروباری جیهاندا و بێگومان دەستی هەبووە و دەستیشی هەیە لە كاروباری كوردەكاندا. بۆ نموونە وڵاتە یەكگرتووەكان تا ئاستێك پشتیوانی لە راپەڕینی كوردەكان لە عیراق لە سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ كرد بەڵام دوابەدوای مامەڵەی ئێران و عێراق، بزووتنەوەی كوردی فرۆشت و لە ئاكامدا كوردەكان بوون بە قوربانی و كاتێ كە كۆنگرێس رەخنەی لە "هێنری كیسینجێر"ی وەزیری دەرەوە گرت كە بۆ سەرەتا پشتیوانی لە خەباتی كوردەكان كردوە و پاشان (كاتێك كە سوودیان بۆ ئەمریكا نەما) پشتی لێكردن، كیسینجێر قسەیەكی بەناوبانگی كرد كە واتاكەی ئەوەیە كە" كاری سیاسەتی دەرەوە نابێت لەگەڵ كاروباری ئایینی تێكەڵ بكرێت".

ئەمڕۆش ئەم مەسەلەیە بەنیسبەت دەوری وڵاتە یەكگرتووەكان لە كاروباری كوردەكان وەڕاست دەگەڕێت، بەتایبەت لەپەیوەندی لەگەڵ كوردەكانی توركیا، چونكە دەوڵەتی وڵاتە یەكگرتووەكان لەم دوو دەیەی رابردووەدا بەردەوام پشتیوانی لە سەركوتی كوردەكان بەدەستی دەوڵەتی توركیا كردووە كە لە روانگەی منەوە هیچی لە (كۆمەڵكوژییەكەی) كۆزۆڤۆ كەمتر نییە. ئەمریكا بەردەوام رایگەیاندووە لە خەبات دژی تروریزم، دۆست و هاوپەیمانێكی بەتواناتر و باشتر لە توركیای نییە، چونكە

---

* بۆ ناسینی كەسایەتی نۆام چامسكی بنواڕن بۆ لاپەڕەی ٧٠٠ی ئەم كتێبە.

سوپای تورکیا توانایی خۆی له هەڵمەتی دژەتیرور له ناوچەی کوردنشینی باشوری رۆژهەڵات سەلماندووە.

مەسەلەی کوردەکانی تورکیا روونترین نموونەی پشتیوانی یەکلاییکەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان له تروری دەوڵەتییە. دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان زۆرترین چەکوچۆڵی سەربازی داوە بە تورکیا( لەپاڵ دەوڵەتی ئیسراییل و میسردا) و قەت سەرنجی بە راپۆرتی رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ دەربارەی سەرکووت و تیروری بەردەوامی کوردەکان بە دەستی دەوڵەتی تورکیا نەداوە کە لە ئەنجامیدا میلیونەها کورد لە زێدی خۆیان ئاوارە بوونە، چەند هەزار گوند کاول کراون، دەیان هەزار کورد کوژراون و هەموو جۆرە کردەوەیەکی هۆڤانە دژیە کوردەکان بەرێوەچووە کە هەندێکیان لەریزی خراپترین تاوانەکان دژ بە مرۆڤایەتیدان.

ئەم کردەوانەی تورکیا(کە بە پشتیوانی وڵاتە یەکگرتووەکان ئەنجام دەدرێت) دەکەوێتە ناو پۆلێنی تروریزمی نیونەتەوەیی- دەوڵەتی. پاکانەی تورکیا بۆ ئەم کردەوە دلڕەقانە ئەوەیە کە وڵاتەکەی لەگەڵ مەترسی گریلا کوردە تروریستەکان روبەڕوویە. بەڵام کێ تروریستە و کێ دژە ترورە. بە درێژایی مێژوو، سەرکوت بووەتە هۆی بەرخۆدانی و زۆربەی جارانیش ئەم بەرخۆدانییە توندوتیژانە بووە و پاشان سەرکوتکەرەکان ناویان ناوە خەبات دژی تروریزم و بەو لایەنە کە چەوساندوویانەتەوە وتوویانە تروریست. ئەم مەسەلەیە تەنانەت بۆ مرۆڤکوژترین رژیمەکانیش وەڕاست دەگەڕێت، بۆ نموونە دەوڵەتی ئاڵمانیای نازی دەیگوت ئەوە کە ئەوان دەیکەن بۆ پاراستنی خەڵکە لەبەرامبەر تروریزمی پارتیزانەکان و دەیانگوت دەوڵەتی رەوای فەرانسا لە بەرامبەر پارتیزانە تروریستەکان (کە لە دەرەوە رێنوێنی دەکرێن و یارمەتی دەدرێن)دەپارێزن.

دەوڵەتی ژاپۆنیش له هەرێمی داکیرکراوی "مەنچووری" چین دەیگوت خەڵك له بەرامبەر تروریزمی جەردە چینییەکان دەپارێزێت.

تایبەتمەندییەکی گرنگی دیکەی چەمکی تروریزم ئەوەیە که ئەو شتە که به دژە تروریزم دەناسرێت له لایەن دەوڵەتەکانەوە بەرێوەدەچێت، دەوڵەتەکان دەیکەن، واتا تروریزمی دەوڵەتییە و دەوڵەتەکانیش کۆمەڵێك سەرچاوەیان له دەستدایە که وایان لێدەکات له هێزە نادەوڵەتییە تروریستەکان توندوتیژتر و کاولکارتر بن. بەردەوام دەگوترێت تروریزم چەکی لایەنە لاوازەکانە، بەڵام بەتەواوی بەپێچەوانەیە، تروریزم هەر وەك هەموو ئامرازەکانی دیکە به کاریگەرترین شێوە لەلایەن لایەنە بەهێزەکان، بەتایبەت بەهێزترین دەوڵەتەکانەوە بەرێوەدەچێت.

خەباتی گەلی کورد و ئامانجەکانیان له تورکیا بۆ ئازادی و مافی مرۆڤ، بۆ خەڵکی دیکەی جیهان ئیلهامبەخشە، چونکە خەباتێکی سروشتی و راستەقینەیە و به هەستکردن به بەرپرسیارێتییەوە بەرێوەدەچێت و نموونەیەکی روونە که نیشان دەدات مرۆڤ دەتوانێت له بارودۆخێکی یەکجار دژوار و ناڵەباردا بەسەر سەرکوت و توندوتیژی دەوڵەتدا زاڵ بێت. له تورکیا کوردەکان بوێرانە بەرخودانی دەکەن و کار دەکەن بۆ ئاڵوگۆڕ و پێکهاتنی کۆمەڵگایەکی کراوەتر، ئازادتر، لیبراڵتر و دادپەروەرانەتر. کوردەکان له لایەن گەلێ له خەڵکی ئازا و بەشەرەفی تورکیاوە پشتیوانیان لێدەکرێت.

کوردەکان تەنها ئەوەیان له ئێمە دەوێت که پشتیوانی له ئامانجە رەوا و بەهەقەکانیان بکەین. واتای ئەم پشتیوانییە ئەوەیە که ئێمە کۆتایی بێنین به یارمەتییە یەکلاییکەرەوەکەمان به سەرکووت و توندوتیژی دەوڵەتی تورکیا دژ به کوردەکان.

لەم چوارچێوەیەدا هیوادارم کوردستانێکی خودموختار دابمەزرێت کە هەموو کوردەکانی ناوچە کە دەیان میلیون کەس دەبن، تێیدا بگەن بە مافی خۆبەڕێوەبردن و سەربەخۆیی کولتووری خۆیان بەدەستبهێنن و ببن بە بەشێك لە فدراسیونێکی بەرفراوانتر کە لە گروپە ئەتنیکی، نەتەوەیی و کولتوورییەکانی دیکە پێکبێت.

مەسەلەی کورد بە گشتی و کوردەکانی تورکیا بەتایبەتی یەکێ لەو مەسەلانەیە کە جێگای لە دڵمدایە، هەر ئەم هاوسۆزییە لەگەڵ بارودۆخی تراژیدیکی کوردەکانی تورکیایە کە هانیدام سەرەڕای سەرقاڵییەکی یەکجار زۆر وەڵامی ئەرێنی بە داواکارییەکەی بەڕێز وریا رەحمانی بدەمەوە و ئەم چەند خاڵە لەگەڵ ئێوە بهێنمە بەرباس.

(۱۹۳٦ : بەرگی III ، لاپەڕەی ۳۸۹ ـ ۳۸۷ )

ڕاپۆرتی کارداری باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران (مریەم[1]) بە وەزارەتی دەرەوە

تاران، ۱ ی گوڵانی ۱۹۳٦ نێردراوە، ۲۷ ی گوڵان گەیشتووە

۷۸۱ : بەڕێز، شانازی بەوە دەکەم راپۆرت بدەم کە بە وتەی جەنابی قەشە "هێنری مولێر[2]" لە میسیونی *لوتیرانی ڕۆژهەڵات* لە مهاباد(ساوجبلاخی پێشوو[3]) سەر بە ئازەربایجان ـ کە ئێستا بارودۆخەکەی بە دەستی دەوڵەتی ئێران لە ئاڵوگۆڕدایە ـ لە کونفرانسی مسیونێری جیهانی کە لە ۱۹۱۰ لە ئیدینبورگ[4] بەڕێوەچووە، بڕیار دراوە کە میسیونێرێکی پڕوپاگەندای ئینجیل بە سەرپەرەشتی کلیسای *لوتیران* لە نێو کوردەکاندا کار بکات. کەوابوو *میسیونی لوترانی ڕۆژهەڵات*[5] متمانەی پێدەبەخشرێت لەناو کوردەکاندا وەك گەلێك کار بکات و مەیدانی کارەکەی لە ناوچە کوردنشینەکانی عێراق، ئێران و تورکیا دەبێت. شوێنی ئەم میسیونە لە یەکێ لەم وڵاتانە بەگوێرەی شەرت ومەرج و بارودۆخەکە هەڵدەبژێردرێت، و بەهۆی ئەوەی کە میسیون ئێستا لە سەرزەمینی کوردەکان لە ئێران زۆر دوورە، دەبێ هەوڵ بدرێت شوێنی میسیون لە کوردستانی عێراق دابنرێت. ئەڵبەتە بەهۆی هەڵوێستی تورکیا

[1] *Merriam*

[2] Henry Mueller

[3] سابلاخ راستە، "ساوجبلاغ "شارێکی دیکەیە لە نزیکی تاران (وەرگێڕ).

[4] Edinburgh

[5] Lutheran Orient Mission

بەنیسبەت میسیونێره مەسیحیەکان له ماوەی چارەکه سەدەی رابردوودا، کوردەکانی تورکیا له دەرەوەی ئەم بازنەیه بوونه.

بەڕێز "مولێر" خۆی باسی ئەم مەسەلەیەی لای من کرد و ئەوەی زیاد کرد که ئەڵبەته بڕیاری کۆتایی لەسەر ئەم مەسەلەیه له ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی *میسیونی لوترانی رۆژهەڵات* دەردەچێت. بەبۆچوونی بەڕێز "مولێر"، کاری مسیونێری له عێراق بەگوێرەی رێککەوتننامەیەك رێکوپێك کراوه و بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بەنیسبەت کوردەکان هەم نەرمه و هەمیش له سەر بنەمای روونکردنەوەی شتەکانه (لانیکەم به بەراورد لەگەڵ سیاسەتی توندی دەوڵەتی ئێران و تورکیا بەنیسبەت کوردەکان) بوونی *میسیونی لوتیران* له لایەن دەوڵەتی عێراقەوه پێشوازی لێدەکرێت.

من پێشنیاری ئەوەم به بەڕێز "مولێر" کرد لەسەر رێگای گەڕانەوه بۆ وڵات، سەردانی دەفتەری نوێنەرایەتی ئەمریکا له بەغداد بکات بۆ ئەوەی بتوانێ ئاگاداری دەقه ساردەکەی رێککەوتننامەکەی ئێمه لەگەڵ عێراق بێت و ئاگاداری ئەو کەشوهەوایه بێت که مسیونێرەکان تێیدا کاری خۆیان له عێراق ئەنجام دەدەن و هەروەها ئاگاداری هەر چەشنه فاکتورێکی تایبەت بێت که لەوانەیه کار بکاته سەر کاری مسیونێرەکان له ناوچه کوردنشینەکانی عێراق. شایانی ئاماژەپێکردنه که کاربەدەستانی ئێران ئاگاداری ئەوەن که لەوانەیه "لوتیران"-ەکان له سنوور تێپەڕبن و تووشی کێشه و گیروگرفت بن. کاربەدەستانی ئێران زانیارییاکانی خۆیان له رێگای خوێندنەوەی راپۆرتەکانی *میسیونی لوتیران* به دەست دەهێنین.

ئێران لە راستیدا ئاگاداری ئەو راستییەیە کە ناسیونالیزمی کورد ـ هەرچەند کە ئێستا جێگای نیگەرانی نییە ـ لەوانەیە لە هەرکام لەو وڵاتانە کە کورد تێیدا نیشتەجێن، سەرهەڵبدات، کەوابوو ئەوان هەموو کارێکیان کردووە و ئێستاش دەیکەن بۆ ئەوەی پێش لەم پێشهاتە لە قەڵەمڕەوی ئێران بگرن. بەهەرحاڵ ئەم کارەی ئێران کارێکی زەحمەتە چونکە هێڵی سنووری(ئێران و تورکیا- وەرگێڕ) بە تەواوی دیار نییە، هەرچەند کە هێڵی سنووری لە "پەیماننامەی ئەرزڕوم "[٦] لە ساڵی

---

[٦] کێشەو شەڕی لە مێژینەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران ساڵانێکی زۆری خایاند، سەرەنجام هەردوو دەوڵەتەکە بەو قەناعەت گەیشتن کە واز لەشەڕ بهێنین و پێکەوە رێکبکەون، بۆ ئەم مەبەستەش وتووێژ لە نێوان نوێنەرانی عوسمانی وئێران بە چاودێری روسیا و ئینگلیز لە شاری ئەرزڕۆم دەستی پێکردەوە و لیژنەیەکیان پێکهێنا کە بریتی بوو لە نوینەرانی عوسمانی، ئێرانی، ئینگلیزو روسیا، ئەم لیژنەیە بە ناو لیژنەی تێکلاو ناسرا. دوای گفتوگۆی زۆر توانیان لەساڵی ١٨٤٧ی زایینی رێکەوتنامەیەك لە شاری ئەرزڕۆم مۆر بکەن بە ناوی "رێکەوتنامەی ئەرزڕۆمی دووەم". بەگوێرەی ئەم رێکەوتنامەیە هەر دوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران سازشیان کرد وجارێکی تر کوردستانیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کردەووە. ئەم رێکەوتنامەیە لە٩ مادده پێکهاتبوو کە زۆرترین ماددەکانی پەیوەندییان بە کوردەوە هەبوو و کۆتایی بە فەرمانڕەوایی ناوخۆیی کورد هێنا. لە دوای "رێکەوتننامەی ئەرزڕۆمی دووەم" ، تا رادەیەك ئاشتی لە نێوان عوسمانی وئێرانی چەسپا و ناکۆکییەکانیان تا رادەیەك کەم بوونەوە، ئەمەش بە هۆی ئەوە بوو کە ئەم رێکەوتنامەیە بە چاودێری هەر دوو دەوڵەتی رووس وئینگلیز بەڕێوەدەچوو. شایانی ئاماژەپێکردنە کە پێش لە "رێکەوتننامەی ئەرزڕۆمی دووەم"، وتووێژێك لەشاری ئەرزڕۆم لە باکووری کوردستان لە نێوان نوێنەرانی هەر دوو لادا دەستی پێکرد و رێکەوتنێکی لێکەوتەوە کە لە ٢٨ی تەممووزی١٨٢٣ ئیمزا کرا کە بە "رێکەوتننامەی ئەرزڕۆمی یەکەم" ناسراوە . ئەم

۱۸٤۷دا دیاری کراوە و ساڵی ۱۹۱٤ له لایەن کومیسیونێرەکانی ئێران و تورکیا( بە یارمەتی کومیسیونێرەکانی بریتانیا و روسیا کە لە نێو ئەم دوو وڵاتەدا بوونە بە حەکەم ) سەرلەنوێ دیاری کراوەتەوە.

بەڕێز "مولێر" کە لەسەراسەری ناوچەدا گەڕاوە دەیگوت ناتوانین بڵێین کە دەسەڵاتی ئەم دوو دەوڵەتە لە کوێ دەستپێدەکات و لە کوێ کۆتایی پێدێت. پێموایە دەوڵەتی ئێران لەوە بەدگومان بێت کە میسیونی *لوتێران* دەستێوەردانی سیاسی لە بزووتنەوەی ناسیونالیستی کورددا بکات. پێموایە ئەم دەستێوەردانە هیچ پەیوەندییەکی بە کاری پروپاگەندای ئینجیل و کارەکانی دیکەی میسیونەوە نییە. دەوڵەتی ئێران هەوڵ دەدات پەیوەندییەکانی کوردەکانی ئێران لەگەڵ کوردەکانی عێراق و تورکیا بپچڕێنێت بۆ ئەوەی کوردەکان لەبیریان بچێت کە کوردن و وابیر بکەنەوە کە پێش لە هەموو شتێك ئێرانین، بە کورتی بۆ ئەوەی بیانتاوێننەوە و سەرەنجام جیاوازییەکانی نێوان کوردەکان و ئێرانییەکان لە ناو ببات، کەوابوو کاری میسیون دەکەوێتە خزمەتی پێداگرتن و قووڵترکردنی ئەو جیاوازییانە کە پێشتر هەبووە.

ئەگەر میسیون لەراستیدا ناسیونالیزمی کورد هان نەدات، لانیکەم بوار بۆ گەشەکردنی ئەم ناسیونالیزمە خۆش دەکات. بەڕێز "مولێر" زۆر سپاسی ئەم بیروبۆچوونەی کرد و لەراستیدا سەرزەنشتی دەوڵەتی ئێرانی نەکرد کە بۆ پێیخۆشە میسیون لە ئێراندا نەمێنێت. بەڕێز "مولێر"دەرکی بەوە دەکرد کە جیاوازییەکی

---

ڕێکەوتننامەیە بووە هۆی چەسپانی ئاشتی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیدا و لە حەوت ماددەی ڕێکەوتنەکە، سێ ماددەی پەیوەندی بە کوردستانەوە هەبوو.(وەرگێڕ)

بنەڕەتی هەیە لە نێوان ئامانجەکانی میسیون و ئامانجەکانی دەوڵەتی ئێران و ئەوە کە دەوڵەتی ئێران هێزێکی سکولاری هەیە بۆ لەناوبردنی ئەو کەسانە کە دژایەتی ئامانجەکانی دەکەن و ئەمەش مافی خۆیە.

بەڕێز "مولێر" ڕێزێکی یەکجار زۆر لە کوردەکان دەگرێت و وتی کوردەکان گەلێکی شاخنشینی سەربەرز، سادە، پڕوزە و پاك و خاوێنن. بەڕێز "مولێر" وتی سیاسەتی دەوڵەتی ئێران و تورکیا بەنیسبەت کوردەکان لە ولاتەکەیان زۆر سەرکوتکارانە بووە و بەردەوام لە لایەن ئەم دەوڵەتانەوە ئازار وئەزیەت دەدرێن و چەپاو دەکرێن و هەزاران کەسیان ـ تەنانەت ژنەکانیان ـ بە دەستی ئەم دەوڵەتانە کوژراون. بە وتەی بەڕێز "مولێر"، بەپێچەوانەوەی دەوڵەتی ئێران و تورکیا ، دەوڵەتی عێراق ـ هەرچەند کە دەستی بەسەر کوردەکاندا قورسە ـ کوردەکان وەك گەلێك تەشوێق دەکات و پێیخوشە پێشبکەون. هەر بۆیە گەلێ لە کوردەکانی ئێران کۆچیان کردووە بۆ کوردستانی عێراق.

لەگەڵ ڕێزمدا

گوردۆن پ. مریەم[٧]

---

[٧] GORDON P. MERRIAM

(١٩٤٢ ، بەرگی IV ، لاپەڕەی ٣١٩ ـ ٣١٨ )

تیلیگرامی ١٨٦٢ /٠٠ / ٨٩١ له لایەن وەزیرموختاری وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئێران (درەیفووس[١]) بۆ وەزارەتی دەرەوە

بابەت: نیگەرانیەکانی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئاژاوەگێڕییەکانی کوردەکان له پارێزگای به دەستی سۆڤیەت داگیرکراوی ئازەربایجان

تاران، ١ ی گوڵانی ١٩٤٢ ، کاتژمێر ٤ ی پاش نیوەڕۆ ناردراوە، کاتژمێر ٨/٣٢ ی پاش نیوەڕۆ گەیشتووە

١٣٤ ـ کونیهوڵم[٢]* راپورتی داوە که بارودۆخی رەزائیه خراپ بووە و کوردەکان له دەرەوەی شار هێرشیان کردووەته سەر ٨٠٠ ژاندارم و داوای:

١ـ مۆرکردنی رێککەوتننامەیەك

٢ـ مافی هەڵگرتنی چەك لەناو شار

٣ـ هەڵگرتنی بنکەی ژاندارمەکانیان کردووە.

"کونیهۆڵم" لەسەر ئەو باوەڕەیه که دەبێ رێگه به سەربازانی ئێران بدرێت بچنە ناو ئەم ناوچەیە، ئەگەر هات و بارودۆخەکه باشتر بوو. به بۆچوونی "کونیهوڵم" ئەگەر روسەکان له قەفقاز شکست بهێنن، له نەبوونی هێزی چەکداری بەهێز، سەراسەری ئازەربایجان لەگەڵ هێرش و چەپاوی کوردەکان بەرەورِوو دەبێتەوە. به وتەی ناوبرا بارودۆخەکه باشتر دەبێت ئەگەر سۆڤیەتییەکان به کوردەکان بڵێن که لەگەڵ

---

[١] *Dreyfus*

[٢] بیرتێل ئی کونیهۆڵم کونسولی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە له تەورێز.

* Bertel E. Kuniholm

کردەوەکانیاندا نین. جیدیبوونی بارودۆخی رەزاییە لە لایەن سەرچاوەکانی دیکەوە پشتڕاست کراوەتەوە و دەڵێن کوردەکان، گەلیّ لە شارەکانیان گەمارۆ داوە.

سەرۆك وەزیرانی ئێران[٣] کوپیەك لەو یادداشتنامەیە نیشانی من دا کە ناردبووی بۆ باڵوێزی سۆڤیەت و هۆشداری دابوو کە ئەگەر سۆڤیەت پێش لە هاتنی سەربازەکانی ئێران بۆ ئەو ناوچەیە بگرێت، بارودۆخەکە زۆر مەترسیدار دەبێت. سەرۆك وەزیران وتی دەوڵەتی ئێران مافی ئەوەی هەیە کە چاوەڕوانی ئەوەبێت سۆڤیەت رێگە بە سەربازانی ئێران بدات بچنە ناوچە، چونکە ئێران و روسیا رێککەوتننامەیان پێکەوە مۆر کردووە.

شا دوێنی بانگی منی کرد و باسی هەمان ئەو مەسەلانەی کرد. شا بە عاجزییەوە گلەوگازندەی ئەوەی کرد کە لەم پەیوەندییەدا بە سووکایەتیەوە لەگەڵ ئێران رەفتار کراوە چونکە ئێران وڵاتێکی بچووك و لاوازە، بەڵام روسیا و بەریتانیا ناوێرن بەهەمان شێوە لەگەڵ تورکیا رەفتار بکەن. شا وتی ئێران بەگوێرەی رێککەوتنامەکەی، لەگەڵ روسیا وەك دەوڵەتیکی گەورە هەڵسوکەوت دەکات و دیارنییە بۆ دەبیّ سەربازانی ئێران لەو مافە بیّ بەش بکرێن کە یاسا و سەقامگیری ناوچە بپارێزن. شا هیوای دەربڕی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەم زووانە لەم پەیوەندییەدا یارمەتیان بدات.

بە بۆچوونی من باسکردنی ئەم مەسەلانە لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی سۆڤیەت دەتوانیّ سوودمەند بێت. من ئەم مەسەلەیەم لەگەڵ باڵوێزی سۆڤیەت باس کرد و

---

[٣] عەلی سوهەیلی

ئەویش وتی ژمارەی ژاندارمەکانی ئێران ئەوەندە هەیە کە بتوانن سەقامگیری رەزاییە بپارێزن، ئەگەر لەراستیدا بیانەوێت. بەڵام من لەگەڵ ئەودا هاوڕا نەبووم. چاپەمەنییەکان وادیارە لە ترسی سۆڤیەت یان لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بارودۆخی باکووری ئێران چەواشە دەکەن و بەردەوام باسی پەیوەندییە باشەکانی ئێران لەگەڵ دراوسێ باکورییەکەی دەکەن. لە هەرێمی ژێردەسەڵاتی بریتانیا لە ناوەندی کوردستان شەڕ و پێکدادانگەلێکی زۆر بەرفراوان لە نێوان سەربازانی ئێران و کوردەکان بە رێبەرایەتی حمە رەشید(خان) رووی داوە کە بووەتە هۆی کوژران و برینداربوونی ژمارەیەکی زۆر.

بەگوێرەی راپورتەکان، ورەی سەربازانی ئێران نزمە و کوردەکان کونترۆڵی هەندێ شوێنیان بە تەواوی لەدەستدایە. پێدەچێت بۆ سەرکوتکردنی ئاژاوەگێڕییەکانی کوردەکان پێویست بە کردەوەیەکی سەربازی بەهێز هەبێت. بەهەرحاڵ دەبێ لە چوارچێوەی ئەو پێشنیارانە کە بریتانیا خستوونیەتەڕوو، رێگاچارەیەکی درێژخایەن بۆ ئەم مەسەلەیە بدۆزرێتەوە. دەوڵەتی ئێران دان بەم پێویستیەدا دەنێت و کومیتەیەك دروست کراوە بۆ ئەوەی گلەوگازندەکانی عەشیرەتەکان تاوتوێ بکات و رێگاچارەیەکی بنەڕەتی بۆ ئەم کێشانە بدۆزێتەوە.

درەیفووس

(١٩٤٢ ، بەرگی IV ، لاپەڕەی ٣٢٠ )

تیلیگرامی ١٨٦٦ / ٠٠ / ٨٩١ لە وەزیرموختاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران

(بەڕێز درەیفووس[١] ) بۆ وەزارەتی دەرەوە

تاران، ٣ ی گوڵانی ١٩٤٢ ، کاتژمێر ٤ ی پاش نیوەڕۆ ناردراوە، کاتژمێر ٩/٥٣ ی سەر لە بەیانی گەیشتووە

١٣٩ ـ "کونیهۆڵم" [٢] راپورتی داوە کە ٢ ی مایس، کاتژمێر ٢ ی پاش نیوەڕۆ، کونسولی گشتی سۆڤیەت، ئەفسەرانی فەرماندەی سەربازانی سوور، کاربەدەستانی ئێران و کوردەکان لە گوندی "عەسکەرئاباد"[٣] لە نزیکی رەزائیە[٤] پێکەوە دیداریان کردووە. کوردەکان کۆمەڵێ داواکاریان خستووەتەڕوو کە دەبێ دەوڵەتی ئێران و هەروەها روسەکان زیاتر قسەوباسی لە سەر بکەن. کونسولی گشتی سۆڤیەت داوای لە کوردەکان کردووە دەست لە کارەکانیان هەڵگرن و بچنەوە ماڵ.

چەپاوکارییەکانی کوردەکان بەردەوامە.

درەیفوس

---

[١] *Dreyfus*
[٢] Kuniholm
[٣] Askerabad
[٤] Rezaieh

(١٩٤٢ ، بەرگی IV ، لاپەڕەی ٣٢٠ ـ ٣٢١ )
تیلیگرامی ١٨٦٧ / ٠٠ / ٨٩١ لە باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تورکیا (بەڕێز ستینهاردت[1]) بۆ وەزارەتی دەرەوە
ئانکارا، ٤ ی گوڵانی١٩٤٢ ، کاتژمێر ٤ ی پاش نیوەڕۆ نێردراوە ، کاتژمێر ٩ پاش نیوەڕۆ گەیشتووە
٣٦٢ ـ باڵوێزی ئێران لە تورکیا سەرلەبەیانی ئەمڕۆ بانگی کردم و ئاگاداری کردمەوە کە: دەوڵەتی ئێران بەجیدی نیگەرانی ئاژاوەگێڕییەکانی کوردەکانە لە ئازەربایجان، بەتایبەت لە ناوچەکانی دەورووبەری ئورومیە و دەریاچەی ورمێ. هەرچەند ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی سۆڤیەت کە دەڵێن ٢٠ هەزار کەس دەبن و لە یەکینە میکانیزەکان پێکدێن، ئازەربایجانیان داگیر کردووە بەڵام هیچ هەنگاوێکیان هەڵنەگرتووە بۆ سەرکوتکردن یا کەمکردنەوەی چالاکی ٣ هەزار کورد و تەنانەت یاخیبوونی کوردەکانیشیان هان داوە.
سۆڤیەتیەکان، داواکاری بەردەوامی ئێرانیان رەت کردووەتەوە بۆ ئەوەی سۆڤیەت رێگەی پێبدات هێزەکانی خۆی بنێرێت بۆ ئەم ناوچەیە بۆ ئەوەی کوردەکان سەرکووت بکات. دەوڵەتی ئێران بەردەوام ئاواتی ئەوەبووە ئەم ئاژاوەگێڕیانە سەرکووت بکات و خۆشحاڵ دەبێت هێزی پێویست بنێرێت بۆ راپەڕاندنی ئەم ئامانجە، ئەگەر کاربەدەستانی سۆڤیەت رێگەیان پێبدەن. دەوڵەتی ئێران بەدگومانە بەنیسبەت

[1] *Steinhardt*

هاناکانی هێزە داگیرکەرەکانی سۆڤیەت چونکە ئەم هێزانە کردەوەی پێویست دژی کوردەکان ئەنجام نادەن.

باڵوێزی ئێران وتی هانای دەوڵەتی سۆڤیەت بۆ ئەوەی رێگە نادات هێزەکانی ئێران بچنە ناوچە و خۆیشی هیچ کارێك لەم پەیوەندییەدا ئەنجام نادات ، ئەوەیە کە دەوڵەتی تورکیا چاوترسێن بکات کە ئەم ئاژاوەیە لە نێو کوردەکانی تورکیاش پەرەپێبدات ئەگەر تورکیا مل بە داواکارییەکانی سۆڤیەت لە داهاتوودا نەدات. باڵوێزی ئێران وتی لە زمانی زاوای کونسولی ئێران لە شاری"کۆیبیشێڤ"[٢] بیستوویەتی کە ستالین دوو هەفتە لەمەوبەر لە مۆسکۆ بانگی باڵوێزی ئێرانی کردووە تا لەسەر مەسەلە پەیوەندیدارەکان پێکەوە گفتگۆ بکەن[٣].

ستینهاردت

[٢] Kubyshev

[٣] ئەم راپۆرتە نێردراوە بۆ تاران و کۆیبیشێڤ

(١٩٤٢ ، بەرگی IV ، لاپەڕەی ٣٢١ ـ ٣٢٢ )
تیلیگرامی ١٨٦٢ / ٠٠ / ٨٩١ لە وەزارەتی دەرەوە بۆ باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە یەکێتی سۆڤیەت (بەڕێز ستاندبای[1] )
واشنگتۆن، ٦ ی گوڵانی ١٩٤٢ ، کاتژمێر ١١ ی پاش نیوەڕۆ
٢٠٣ ـ باڵوێزخانەی ئێمە لە تاران راپۆرتی داوە کە چالاکیەکانی عەشیرەتە کوردە یاخیبووەکان لە ناوچەی رەزائیە لە ئازەربایجان بارودۆخێکی زۆر جیدی دروست کردووە کە دەوڵەتی ئێران ناتوانێت کونترۆڵی بکات لەبەر ئەوەی سۆڤیەت ناهێڵێت سەربازانی ئێران بگەڕێنەوە بۆ ناو ئەو ناوچەیە. دەوڵەتی ئێران نارەزایەتی خۆی لە سۆڤیەت دەربڕیووە و داوای لێکردووە بەگوێرەی رۆحی پەیماننامەی هاوپەیمانی بریتانیا ـ روسیا ـ ئێران لەگەڵ ئێران هاوکاری بکات.
شا هیوای دەربڕیوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە هەڵوێستی ئێران بکات. ئەگەر ئێوە پێتان باش بێت، زەحمەت نەبێت هەوڵ بدەن لە کاتێکی گونجاودا نیگەرانی دەوڵەتی ئێمە لەگەڵ کاربەدەستانی سۆڤیەت بخەنە بەرباس دەربارەی ئەو بێ سەرەوبەرەییە کە ئەم دواییانە بەسەر باکووری کوردستاندا زاڵ بووە.
لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ کاربەدەستانی سۆڤیەت دەتوانن ئەم هۆکارانەی خوارەوە کە مایەی نیگەرانبوونی دەوڵەتی ئێمەیە، باس بکەن:
١ـ هەروەها کە دەوڵەتی سۆڤیەت بێ گومان ئاگادارە، ئاژانسە پروپاگەندایەکانی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان سەرمایەگوزارییەکی زۆریان لەسەر راپەڕینەکانی کوردەکان

---
[1] *Standley*

کردووە و دەڵێن روسەکان کوردەکان هان دەدەن وەك بەشێك لە بەرنامەکەیان بۆ لکاندنی ئەو ناوچانە(بە سۆڤیەت) کە ئێستا هێزەکانی سۆڤیەت داگیریان کردووە. ئەم پروپاگەندانە کە بەتایبەت لە تورکیا و عێراق و هەروەها ئێران دەکرێت، لەوانەیە دەنگدانەوەیەکی زۆر خراپی لەسەر پێگەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم ناوچە زۆر زۆر گرنگە هەبێت.

٢ـ ژیانی هاوولاتیانی ئەمریکا و ماڵ و داراییان لە مەترسیدایە. هاوسەری هەواڵنێرێکی ئەمریکایی لە دەروبەری تەورێز بە دەستی کوردەکان کوژراوە.

٣ـ جارێکیان رادیۆی هاوپەیمانان(AXIS) وتی هێزەکانی رەشید عالی گەیلانی، رێبەری راپەرینی عێراق پەیوەست بوونە بە کوردەکانی ئێران. لەکاتێکدا کە لەوانەیە ئەم هەواڵە راست نەبێت، بەڵام نیشان دەدات کە راپەرینی کورد دەرفەتێکی ناراستەوخۆیە کە دوژمن دەتوانێت کەڵکی لێوەربگرێت و تەنانەت لەوانەیە کۆمەڵێك کێشە و گیروگرفت بۆ گەیشتنی پێداویستیەکانی روسەکان لە رێگای ئێرانەوە دروست بکات.

کەوابوو بەگوێرەی ئەو هۆکارانە کە باس کرا، دەوڵەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیوادارە کە دەوڵەتی سۆڤیەت ئەم هەنگاوانە هەڵبگرێت چونکە ئەم هەنگاوانە پێویستە بۆ ئەوەی کاربەدەستە بەرپرسیارەکان بتوانن یاسا و نەزم بپارێزن بۆ ئەوەی کۆتایی بەم بشێوی و بێ سەرەوبەرەییە بێنن.

دەوڵەتی ئێران ئاگاداری ئەم پەیوەندیگرتنەی ئێمە نییە و ئێوە نابێ بە دەوڵەتی سۆڤیەت بڵێن کە ئێران داوای دەستێوەردانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کردووە. بۆ ئاگاداری خۆتان، کاربەدەستانی مەحەلی سۆڤیەت و کاربەدەستانی ئێران

له ئازەربایجان چەند رۆژ لەمەوبەر لەگەڵ رێبەری کوردەکان دیداریان کردووه و پێدەچێت داواکارییەکانی کوردەکان گوازرابێتەوه بۆ تاران و بۆ کاربەدەستە پەیوەندیدارەکانی روسیا.

زەحمەت نەبێت وەزارەتی دەرەوه له پێشهاتەکان ئاگادار بکەنەوه

هۆڵ[۲]

[۲] HULL

(١٩٤٢ ، بەرگی IV ، لاپەڕەی ٣٢٣ )
تیلیگرامی ١٨٧١ / ٠٠٠ / ٨٠١ له وەزیرموختاری ئەمریكا له ئێران (بەڕێز دەریفووس) بۆ وەزارەتی دەرەوە
تاران، ١٢ ی گولانی ١٩٤٢ ، نیوەڕۆ ناردراوە، كاتژمێر ٩:٥٥ ی پاش نیوەڕۆ گەیشتووە
١٥١ ـ "كۆنیهولم" نیوەڕۆی ١١ ی مایس راپورتی داوە كه ژنەراڵی حاكم ، وەزیری جەنگ و كاربەدەستانی سەربازی ئێران و سۆڤیەت دوێنی شەو له رەزائیه گەڕاونەتەوە(بۆ تاران). كوردەكان ئێستا تالانكارییەكانیان راوەستاندووە و ٢١ بازگەی تێكەڵی پولیس(كه له ٢٠ سەربازی رووس و ئەفسەر و ٣ یا ٤ ژاندارمی ئێران پێكهاتووە) لەسەر رێگای نێوان رەزاییه و "خۆی"[1] دانراون بۆ ئەوەی خەڵكی دانیشتووی ناوچەكه بپارێزن.
سۆڤیەتیەكان جارێ رازی بوونه بەوە كه فەوجێكی ئێران له تاران بنێردرێت بۆ رەزاییه. هیچ خواستێك له ئارادا نییه بۆ بەخشینی پوان(ئیمتیاز) به كوردەكان كه گلەوگازندەكانیان له جێی خۆیدا نییه.
هەندێ لەو كەلوپەله كه تالان كراوە، نێردراوە بۆ عێراق.
درەیفووس

[1] Khoi

(١٩٤٢ ، بەرگی IV ، لاپەڕەی ٣٢٤ )
تیلیگرامی ٠٠١١ /٢٤٥٤٦٧٤٠ / ١٩٣٩ لە وەزیرموختاری ئەمریکا(درەیفووس)
بۆ وەزارەتی دەرەوە
تاران، ٢٨ ی ئەیلوولی ١٩٤٢ ، کاتژمێر ٤ ی پاش نیوەڕۆ نێردراوە، کاتژمێر
١١/١٧ ی پاش نیوەڕۆ گەیشتووە

٣٠٢ ـ کاربەدەستانی سەربازی سۆڤیەت داوایان لە دەوڵەتی ئێران کردووە فەوجێك سەرباز بنێرن بۆ تەورێز بەڵام ئێرانیەکان وەڵامیان داوەتەوە فەوجێك سەربازیان لە بەردەستدا نییە. ئێران پێشنیاری کردووە ئەم فەوجە لە سەربازانی پێشووی ئازەربایجان ئامادە بکرێت بەڵام سۆڤیەت لەوەڵامدا وتوویە ئەم کارە کاتی زۆری دەوێت.

بەهەرحاڵ من ئاگادارم کە ئێستا ئەم کارە خەریکە جێبەجێ دەکرێت. بریتانیا لێرە ئەم داواکارییەی سۆڤیەتی وا لێکداوەتەوە کە سۆڤیەت ژمارەی هێزەکانی خۆی لە ئازەربایجان کەم کردووەتەوە یا یا دەیەوێت کەمی بکاتەوە.

"کونیهولم" راپۆرتی داوە کە سەربازانی روسیا لە دو هەفتەی رابردوودا لە ئازەربایجان جموجۆڵی زۆریان بەخۆوە بینیوە و دەڵێت هاوکات لەگەڵ ئەوەی لەوانەیە زۆربەی ئەم جموجولانە بەهۆی ساخکردنەوەی ئاسایی یەکینەکانیان بێت بەڵام ژمارەی هێزەکانیان زۆر زۆر کەم بووەتەوە.

"کونیهولم" هەروەها راپورتی داوە کە سۆڤیەتیەکان هەڵوێستێکی توندوتۆڵتریان بەنیسبەت کوردەکان گرتووەتەبەر. ئەم هەڵوێستەی سۆڤیەت لە تاران هەستپێکراوە

چۆنکە راپورت دراوە کە سۆڤیەتیەکان بە ئێرانیەکانیان وتووە کە ئەوان رازین بە چەککردنی کوردەکان و وتوویانە کە دەکرێت ئەم کارە بە شێوەی ئاشتیخوازانە جێبەجێ بکرێت.

درەیفووس

(١٩٤٥ ، بەرگی V ، لاپەڕەی ٩٠٨ ـ ٩٠١ )

تیلیگرامی ٢٣٤٥ ـ ١٠ / ٠٠ / ٧٦١ له باڵوێزی ئەمریکا له یەکێتی سۆڤیەت (بەڕێز هاریمان[١] ) بۆ وەزارەتی دەرەوە

ژمارە ٢٢١٥ ، مۆسکۆ، ٢٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ نێردراوە ، ٦ ی تشرینی دووەم گەیشتووە

SIR : بەشانازییەوە ئاماژە بە ڕەوتی ئێستای سیاسەتی سۆڤیەت بەنیسبەت ڕۆژهەڵاتی نزیك و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەم[٢]:

گشتی:

ئامانجەکانی سۆڤیەت لەم ناوچەیە ئامانجگەلێکی ئیستراتژیکن و له چوارچێوەی ئاسایش و بەرفراوانترکردنی خاکی سۆڤیەت دان. ئەم ئامانجانە له ڕەوشێکی خێرا و توندوتۆڵدا پێناسە ناکرێن و بەگوێرەی کات و بارودۆخ جێبەجێ دەکرێن. دەسەڵاتخوازی بەردەوام و بێ کۆتایی ، خووخدەی دەوڵەتی روسیایە کە ئەمەش تەنها له دابونەریتەکانی دەوڵەتی روسیا سەرچاوە ناگرێت بەڵکوو له ئیدوئولوژی حیزبی

---

[١] Harriman

[٢] ئەم راپۆرتە له لایەن جۆرج. ف. کینان(George F. Kennan )، کونسولی باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و جان. پ. دەیویس (John P. Davies )، سکرتێری دووەمی باڵوێزخانە له مۆسکۆ ئامادە کراوە.

"کومونیست"یش سەرچاوە دەگرێت کە وەك دوژمنی هەتاهەتایی روسیا سەیری سەرجەم دەوڵەتە پێشکەوتووەکانی دنیا دەکات و وەك داردەست بۆ شەڕی دەسەلاتی خۆی، سەیری دەوڵەتە دواکەوتووەکان دەکات. ئەم مەسەلەیە بەتایبەت لە ناوچەی بەردەوام لە ئالۆگۆڕی رۆژهەلاتی نزیك و رۆژهەلاتی ناوەڕاست وەڕاست دەگەڕێت . بۆ سیاسەتکردنێکی واقعبینانە لەم ناوچەیە نەتەنها دەبێ حیساب لەسەر فاکتورە نەتەوەییەکان بکرێت بەڵکو دەبێ حیسابیش لەسەر هێزە نێونەتەوەییەکان وەك کلیسای ئورتودوکس، کۆمەڵگای ئەرمەنیەکان،جولەکەکان، کوردەکان و یەکێتی عەرەبەکان بکرێت.

تورکیا:

.....

نەبوونی هیچ چەشنە ئوپوزسیونێکی گرنگی چڕوپڕ لە تورکیا بە واتای ئەوەیە کە یەکێتی سۆڤیەت زۆرتر دەبێ پشت بە فاکتورە ناڕازییە راستەقینە و دەستکردەکانی دیکە ببەستێت. ئەم فاکتورانە کوردەکان و ئەرمەنیەکانن. هەم کوردەکان و هەم ئەرمەنیەکان لەگەڵ سۆڤیەت هاوسنوورن، کەوابوو قازانجی زۆریان بۆ سۆڤیەت هەیە. هەرچەند کە ئێستا لە کردەوەدا هیچ ئەرمەنیەك لە رۆژهەلاتی تورکیا نەماوە بەلام بزووتنەوەیەکی ئەرمەنی کە بانگەشەی خاکی ئەرمەنیەکان دەکات، بەناو لە ئەرمەنستانی سۆڤیەت هەیە. ئەگەر ئەم بزووتنەوەیە بەتوندی پێشبکەوێت، دەتوانێت یارمەتی بدات بە جیاکردنەوەی پارێزگاکانی رۆژهەلات لە تورکیا لە رێگای فشارگەلی ئاشتیخوازانەی جۆراوجۆر یا ببێتە هۆی تورەبوونی یەکجار زۆری تورکیا.

لەکاتێکدا کە توانایی سەرەکی جیاییخوازی ئەرمەنیەکان دەبێ لە دەرەوەی تورکیا سەرچاوە بگرێت، کوردەکان ئەوەندە لەناوخۆی تورکیا بەهێزن کە دەتوانن ـ ئەگەر چەکیان پێبدرێت و رێگایان پێنیشان بدرێت ـ ببن بە هێزێکی تێکدەری گرنگ. باڵوێزخانەی ئێمە تا ئێستا هیچ نیشانەیەکی نەبینیوە کە کوردەکانی تورکیا لە لایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە بە رێکخستن کرابن یا چەکدار کرابن بەڵام ئەگەر کاتی خۆی بێت، یەکێتی سۆڤیەت کەڵك لە توانایی سروشتیان وەردەگرێت.

کوردەکان

سودبەخشبوونی کوردەکان وەك هێزێکی نێونەتەوەیی دەکێشرێتە ناو عێراق و ئێران. ئەمە بەواتای ئەوەیە کە ئەگەر یەکێتی سۆڤیەت بیەوێت کەڵك لە توانایی کوردەکان وەربگرێت دەبێ هەستی جیاییخوازی ناوچەیی لە نێو کوردەکانی ئەم سێ وڵاتەدا هان بدات.

عێراق

نەوت و دەستڕاگەیشتن بە کەنداوی فارس و نیمچە دوورگەی عەرەبی، هاناکانی زیادەخوازییەکانی سۆڤیەتن لە عێراق. روسەکان پێدەچێت تا ئێستا گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتە کە ناتوانن لەگەڵ عەرەبەکان مامەڵە بکەن کە ئێستا لە عێراق لە ژێر کونترۆڵدان. روسەکان ئەم دواییانە توانیویانە پەیوەندی دیپلوماتیك لەگەڵ دەوڵەتی عێراق دابمەزرێنن و هێشتا دوودوڵن کە ئایا ئاشکرا هێرش بکەنە سەری یا نا، چونکە لەوە دەترسن کە بەگشتی خۆیان بخەنە ناو کێشەی جیهانی عەرەب، کەوابوو رووسەکان بە پارێزی زۆرەوە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق هەڵسوکەوت دەکەن. بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیە پێش لە رووسەکان ناگرێت کە کەڵك لە سیاسەتی پڕ لە کەموکۆڕی

عێراق بەنیسبەت کوردەکان وەربگرن. ئاماژەپێکردن بەوە گرنگە کە کوردەکان لە دەوروبەری ناوچە نەوتیەکانی باکووری عێراق، زۆر بەهێزن.

دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بین کە دەوڵەتی سۆڤیەت گلەوگازندەکانی کوردەکان هان بدات و ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك ئامرازێك بۆ گوشارخستن لەسەر دەوڵەتی ناوەندی عێراق کەڵکی لێوەربگرێت. جاریَ سیاسەتی سۆڤیەت ئەوەیە کە کێشەی نێوان کوردەکان و عەرەبەکان تا ئەو شوێنە کە دەکرێت قووڵتر بکات، لە هەمان کاتدا سۆڤیەت بەتوندی هەوڵ دەدات دەستڕویشتوویی خۆی لە نێو روشنبیرە عەرەبەکان لە بەغداد قایم بکات. دەبێ چاوەروان بین کە ئەگەر ئەم هەوڵە سەربکەوێت، ڕۆژێك لە ڕۆژان هێزە عەرەبە لایەنگرەکانی سۆڤیەت و نەیاری حکوومەتی عێراق دەست بە سازکردنی کێشە بۆ دەوڵەتی عێراق بکەن و سۆڤیەت هانیان بدات ـ وەك ئەوانەی ئێران ـ داوای دەسەڵاتی سیاسی بکەن.

ئێران

مەسەلەی ئاسایش، نەوت و دەستڕاگەیشتن بە کەنداوی فارس سێ فاکتۆرن کە بە هۆیانەوە یەکێتی سۆڤیەت دەستدرێژی دەکاتە سەر ئێران. زاڵبوون بەسەر باکووری ڕۆژئاوای ئێران یەکێ لە پێویستیەکانی دابینکردنی ئاسایشی ناوچەی قەفقازە و بەدەستهێنانی کونترۆڵی نەوتی باکووری ئێران یەکێ لە ئامانجەکانی سۆڤیەتە لە داهاتوویەکی نزیکدا.

سۆڤیەت بۆ کونترولکردنی نەوتی باشووری ئێران دەبێ چاوەڕوان بکات چونکە ئەگەر ئێستا کارێکی وا بکات لەگەڵ کاردانەوەی توندی بریتانیا ڕوبەڕوو دەبێتەوە. بەهەرحاڵ چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە USSR کەمکەم هەوڵ بدات کونترولی

نەوتی باشووری ئێران بەدەست بهێنێت، هۆکارەکەشی زۆرتر ئەوە نییە کە سۆڤیەت پێویستی بەم نەوتە هەیە، بەڵکوو ئەوەیە کە ئەگەر ئەم نەوتە بکەوێتە دەستی بریتانیا و ئەمریکا، زەبرێکی ئیستراتژیك لە سۆڤیەت دەکەوێت.

دەستڕاگەیشتن بە کەنداوی فارس کە هۆکاری سێیەمی دەستدرێژی سۆڤیەت بۆ ئێرانە، رێگایەکی گەورە دەکاتەوە بۆ سۆڤیەت تا دەستی بگات بە عەرەبستان و هیند و رێگایەکی بازرگانی راستەوخۆیە لە نێوان ناوچەی پیشەسازی "ئورالّ" و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا کە خاوەن سەرچاوەی ماددەی خامە.

یەکێتی سۆڤیەت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی لە ئێران، پشت بە ٤ ئامراز دەبەستێت:

یەکەم ئامراز، سوپای داگیرکەری سوورە کە کەندوکۆسپ دروست دەکات لەسەر کارەکانی دەوڵەتی ئێران، و داردەست و گوماشتەکانی USSR (لە رێگای بوونی راستەوخۆی خۆی) لە ناوچە دەپارێزێت.

دووەم ئامراز، حیزبی "تودە"یە. USSR بەدوای ئەوەدایە کە کەڵك لە حیزبی "تودە" وەربگرێت بۆ بێ متمانە کردن و روخاندنی بەرەبەرەی دەوڵەتی ئێستای ئێران، و رژێمێك بخاتە جێگای کە گوێڕایەڵی یەکێتی سۆڤیەت بێت.

ئامرازی سێیەم، ئازەربایجانی ئێرانە. USSR هەوڵ دەدات(لە قۆناخی یەکەمدا) لە رێگای ئازەربایجانەوە، باکووری رۆژهەڵاتی ئێران لە وڵاتی ئێران جیا بکاتەوە و باڵادەستی سۆڤیەت لەو ناوچە تایبەتە مسۆگەر بکات.

ئامرازی چوارەم، کوردەکانن. کوردەکانیش هێزێکن لە باکووری رۆژهەڵاتی ئێران کە بە رێگاپێشاندەری سۆڤیەت دەتوانن لە ئێران جیا ببنەوە. کۆمەڵێك هێما و ئاماژە

هەیە کە نیشان دەدات بزووتنەوەی سەربەخۆیی کورد باش پێشکەوتووە و هەندێ لە کوردەکانی عێراق لەگەڵ سۆڤیەت پەیوەندیان گرتووە.

**پوختەی تاکتیکە سیاسیەکانی سۆڤیەت لە رۆژهەلاتی نزیك و رۆژهەلاتی ناوەڕاست**

یەکێ لە تایبەتمەندییە سەرەکیەکانی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت، چەند شێوازەبوونیەتی و لە هیچ شوێنێك لە دنیادا بەقەد رۆژهەلاتی نزیك و رۆژهەلاتی ناوەڕاست ئەم تایبەتمەندییە بە روونی رەنگی نەداوەتەوە. کەوابوو لەوانەیە سودمەند بێت لە کۆتاییدا بە کورتی ئاماژە بە لایەنە جۆراجۆرەکانی سیاسەتی سۆڤیەت لەو ناوچانە بکەین:

سۆڤیەت هەستی ناسیونالیستی و گەڕاندنەوەی خاکە لەدەستچووەکان لە نێو ئەرمەنیەکان هان دەدات، راپەڕینی عەشیرەتە کوردەکان و داخوازی ئۆتونۆمی لە نێو کوردەکان هان دەدات، جۆری دەرەکیی ئیدوئولوژی ئیستالینی دەفرۆشێت بە جولەکەکان و پرۆپاگەندا بۆ دوکتورینی یەکێتی کلیسا لە نێو کۆمەڵگا ئورتودوکسەکان دەکات.

بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتەکان، سۆڤیەت لە کۆمەڵێك تێکنیکی دیکە کەڵك وەردەگرێت:

لە میسر لە تاکتیکگەلی خۆشەویستیی کولتووری و ئایینی کەڵك وەردەگرێت، بەپێچەوانەوە دژی تورکیا لە تاکتیکی وتووێژی دیپلوماتیك و شەڕی دەرونی(لەوانە بەرێخستنی هەڵمەتێکی شەڕی دەروونی گەورە دەربارەی هەڕەشەی کردەوەی سەربازی) و پروپاگەندای گوماشتە بیانیەکان(وەك داواکاری ئەرمەنیەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئەوەی پارێزگاکانی رۆژهەلاتی تورکیا بگەڕێنەوە بۆ سەر

USSR ) کەڵك وەردەگرێت و سەرەنجام بەنیسبەت ئێران، کەڵك لە دەستێوەردانی چالاکانە و ئارامی سەربازی و پیلانگێری سیاسی ناوخۆیی وەردەگرێت.

لەگەڵ ڕێزمدا

و ـ ئا هاریمان

(١٩٤٦ ، بەرگی VII ، لاپەڕەی ٣٤٠ )
تیلیگرامی ٥٤٦ ـ ٧٦١/٩١/٣ لە جێگری كونسولی ئەمریكا لە تەورێز(بەڕێز ڕۆسۆ[١]) بۆ وەزارەتی دەرەوە
نهێنی
تەورێز، ٥ ی ئاداری ١٩٤٦
كاتژمێر ١ ی پاش نیوەڕۆ نێردراوە، كاتژمێر ٦/٢٥ ی پێش نیوەڕۆی ٦ ی ئادار گەیشتووە

٤٠ ـ لە دوێنێوە سەربازانی سۆڤیەت كەوتوونەتە جموجۆڵێكی سەربازی گرانی بێ وێنە بەم شێوەیە:
شەوی ٣ ی ئادار، ٤٥٠ ئۆتومۆبیلی بارهەڵگری سۆڤیەت كە بەتەواوی پڕبووە لە كەلوپەل(زۆرتر تەقەمەنی) لە تەورێز ڕویشتوون بەرەو تاران. دوێنێشەو ٢٠ تانك بە ١٠٠ دانە ئوتومبیلی بارهەڵگر بەرەو هەمان شوێن بەڕێكەوتوون و سەرلەبەیانی ئەمڕۆ گەیشتوونەتە ناوچەی "بوستان ئاباد[٢]". دوو فەوجی سوارە لەگەڵ دو هێزی توپخانە بەتەواوی چەكوچۆڵ و پێداویستەوە سەرلە بەیانی ئەمڕۆ لە تەورێز بەرەو "مەرەند[٣]" بەرێكەوتوون و بەتەواوی دیارنییە كە ئایا دەچن بۆ "جولفا[٤]" یان دەچن بەرەو "خۆی[٥]"، ڕەزاییە و "ماكوو[٦]".

---
[١] **Rossow**
[٢] Bostanabad
[٣] Marand

بەهەرحاڵ لە ماوەی هەفتەی رابردوودا سۆڤیەتیەکان ئازوقەیەکی زۆریان لە ناوچەکانی تەوریز بەتایبەت بەرەو رەزاییە کۆ کردووەتەوە کە ئەمە نیشان دەدات هێزەکانی سۆڤیەت لەو رێگاوە رۆیشتوون.

هەروەها لە مهاباد راپورت دراوە کە کوردەکان ئامادەن داوای کوردستانی تورکیا بکەن و بەرنامەیان دارشتووە کە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە بەمزووانە دەست بە ئوپەراسیونی سەربازی بکەن.

هێزێکی گەورەی دیکەی سوپای سوارەی سۆڤیەت دوو رۆژ لەمەوپێش بینراوە کە بەرەو باشوور لە رێگای "گیرگان"[٧]-ەوە بەرەو سنووری عێراق رۆیشتووە. وادیارە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم جموجۆڵەدا ٩ تانکی سۆڤیەت شەوی رابردوو بەرەو "مەراغە"[٨] بەرێکەوتوون. ئێستا لانیکەم ٢ فەوجی سوارە و هەندێ هێزی توپخانە لە تەوریز ماونەتەوە بەڵام دیار نییە ئایا هێزی زرێپۆشیان ماوەتەوە یا نا. لە سێ شەوی رابردوودا هەندێ ئوتومبیلی بارهەڵگری گەورە پڕ لە سەرباز بینراون کە لە سنووری سۆڤیەتەوە هاتوونەتە ناو خاکی ئێران.

رۆسۆ

---

[٤] Zhulfa
[٥] Khoi
[٦] Maku
[٧] Girgan
[٨] Maragheh

(١٩٤٦ ، بەرگی VII ، لاپەڕەی ٣٦٤ ـ ٣٦٢ )
تیلیگرامی ١٧٤٦ ـ ٢٤٥٩١/٣ ـ ٨٦١ لە لایەن کارداری ئەمریکا لە یەکێتی سۆڤیەت (بەڕێز کینان[1]) بۆ وەزارەتی دەرەوە، نهێنی
موسکۆ، ١٧ ی ئاداری ١٩٤٦ ، کاتژمێر ٩ ی نیوەڕۆ ناردراوە، کاتژمێر ٥/٣٧ ی پاش نیوەڕۆ گەیشتووە
٨٤٣ ـ لەم دەرفەتەدا هەوڵ دەدەم هێما و ئاماژەکانی چالاکیەکانی ئێستای سۆڤیەت لە ئێران(وەها کە لە موسکۆ دەبینرێن) بە کورتی بخەمە بەرباس.
پێش لە هەموو شتێك من پێشبینی ئەوە دەکەم کە سۆڤیەتیەکان لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا کۆمەڵێك هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی رژێمێك لە ئێران بهێننە سەر دەسەڵات کە ئامادە بێت داواکارییە سەرەکیەکانی سۆڤیەت قبوڵ بکات، بەتایبەت مانەوەی بەردەوامی هێزە چەکدارەکانی سۆڤیەت لە ئێران و بەخشینی ئیمتیازی نەوت بە سۆڤیەت. ئەڵبەتە ئەم هەوڵە لە رێگای ئەو هێزە ئێرانیانەوە دەدرێت کە سوودمەندن بۆ سۆڤیەت بەڵام راستەوخۆ لەبەرامبەر سۆڤیەت بەرپرسیار نین. هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران خزمەت بەم پلانە دەکەن لە رێگای هەڕەشە و چاوەترسێنکردن و ئەگەر پێویست بکات لە رێگای هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی سەربازی بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پلانە. ئەگەری روودانی ئەم پێشهاتانە هەیە بەهۆی ئەوەی:
١ـ دەوڵەتی سۆڤیەت هیچ نیازێکی نییە سەربازەکانی لە ئێران بباتە دەرەوە، بەپێچەوانەوە بە نیازە ژمارەی سەربازەکانی لە ئێران تۆزێ زۆرتر بکات.

[1] Kennan

٢- درەنگ یا زوو دەوڵەتی سۆڤیەت دەبێ کۆمەڵێك پاساو بۆ جیهان بخاتەڕوو بۆ مانەوەی بەردەوامی هێزەکانی لە ئێران کە پێشێلکردنی پەیماننامەکانە.

٣- درەنگکردن لە وەڵامدانەوە بە پرسیاری ئێمە نیشان دەدات کە دەوڵەتی سۆڤیەت پێیخۆش نییە کردەوەکانی تەنها لەسەر بنەمای پێداویستیە ئاسایشیەکانی USSR ئەنجام بدات و چاوەڕوانی کۆمەڵێك پێشهات دەکات تا وەڵامێکی باشتر بە ئێمە بداتەوە.

٤- باشترین وەڵامێك کە بە مێشکی سۆڤیەتدا دەگات ئەوەیە کە دەوڵەتی ئێران داوای لە سۆڤیەت کردووە هێزەکانی لە ئێران بهێڵێتەوە.

٥- کۆبوونەوەی UNO لە پێشە کە SC(ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان- وەرگێڕ) ناچارە بەم زووانە ڕێگاچارەیەك بۆ کێشەی ئێران بدۆزێتەوە.

بەبۆچوونی من دوورە کە دەوڵەتی سۆڤیەت پلانی ئەوەی دارشتبێ لەم کاتە قەیرانیەدا دەستدرێژی بکاتە سەر تورکیا چونکە لێرە هیچ هۆکارێکی سیاسی تایبەت بۆ ئەم کردەوەیە لەئارادانیە و تا ئەو شوێنە کە من دەیبینم هیچ هەوڵێك لە ئارادانییە بۆ ئەوەی بیانوویەك بۆ ئەم کردەوەیە دروست بکرێت. ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە سۆڤیەت بە شوێن تێکشکاندنی دەسەڵاتی تورکیا و دروستکردنی بنکە لە تەنگەکان و دروستکردنی رژێمێکی دۆست لە ئانکارا لە کات و شوێنی گونجاوی خۆیدا نییە، هەروەها بەواتای ئەوە نییە کە ئەو کوردانە کە لایەن سۆڤیەتەوە چەکدارکراون ، ئێستا دەست نەکەن بە ئاژاوەگێری لەسەر سنووری تورکیا کە سۆڤیەت وەك بیانوویەك کەڵکی لێوەربگرێت بۆ دەستێوەردانی خۆی، بەڵام ئێستا هێما و ئاماژەی

پێویست لەدەستدا نییە کە نیشان بدات سۆڤیەت سوپای خۆی لە باکووری ئێران ئامادە کردووە بۆ ئەوەی دەستبەجێ هێرش بکاتە سەر تورکیا.
بەنیسبەت عێراق، بارودۆخەکە روون نییە. لێرە کۆمەڵێك هێما و ئاماژە هەیە کە نیشان دەدات سۆڤیەت کوردەکانی هان داوە و چەکی پێداون تا ناوچەی موسڵ بگرن و هێزەکانی سۆڤیەت لە پشتەوە ئامادەن لە کاتی گونجاوی خۆیدا پشتیوانی لە کوردەکان بکەن و ئەگەر کوردەکان داوایان لێکردن لەدوای ئەوان بێنە ناو ناوچەکە.
شایانی ئاماژە پێکردنە کە لێرە پروپاگەندایەکی زۆر دەکرێت دەربارەی کێشەخولقاندنەکانی بریتانیا و ئەوە کە ئەگەر ئەم هەوڵە لە ناوچەی موسڵ بەرفراوان بکرێت، لەوانەیە لەگەڵ بریتانیا تووشی کێشە بن. لەوانەیە ئەم پروپاگەندایە بۆ ئەوەبێت کە خەڵکی ئێرە لە رووی دەرونیەوە بۆ ئەم بارودۆخە ئامادە بکەن.
بەڵام لێرە ئێمە هیچ نیشانەیەك نابینین کە دەوڵەتی سۆڤیەت بیەوێت لەم پەیوەندییەدا ئەوەندە بچێتە پێش کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ بریتانیا بە ئاشکرا بپچڕێنێت.
کینان

(١٩٤٦ ، بەرگی VII ، لاپەڕەی ٣٤٠ )

تیلیگرامی ١٨٤٦ ـ ٨٦١/٢٤٥٩١/٣ له باڵوێزی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئێران(مورای[1]) بۆ وەزارەتی دەرەوە، نهێنی

تاران، ١٨ ی ئاداری ١٩٤٦ ، کاتژمێر ٥ ی پاش نیوەڕۆ نێردراوە، کاتژمێر ١١/٥٠ پاش نیوەڕۆ گەیشتووە

٣٦٢ـ کاپیتان گاگارین و رۆسۆ* داوای ئیزنیان کردووە له تەورێز بچن بۆ رەزائیه بۆ ئەوەی ئاگاداری بارودۆخی هێزەکانی سۆڤیەت و چالاکیەکانی کوردەکان ببنەوە[2]. من ئیزنم پێنەدان و موچیاریم کردن بۆ هیچ شوێنێکی کوردستان سەفەر نەکەن[3].

---

[1] *Murray*

* Capt. Gagarine and Rossow

[2] ئالێکسێز م گارگارین، گوماشتەی یارمەتیدەری سەربازی باڵوێزخانەی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە له ئێران. له تیلیگرامی ٣٦٢، بەرواری ١٨ی ئادار، کاتژمێر ٤ی پاشنیوەڕۆ، باڵوێزی وڵاته یەکگرتووەکان له تاران راپۆرتی داوە که گارگارین له ١٧ی ئادار له رێگای جادەی تاران - تەورێز گەیشتووەته تەورێز. راپۆرتەکان ئاماژەیان بەوە کردووە که ٢٥ دانه تانکی سۆڤیەت له گەڵ سەرباز بەرەو تاران رۆیشتوون و ژمارەی هێزەکانی سۆڤیەت له سەربازخانەی قەزوین و یەکینەکانی پیادەی سۆڤیەت له زەنجان زیاد بووە. هەروەها سەربازانی سوور له گەڵ دیموکراته چەکدارەکانی ئازەربایجان له ناو هەمان ئۆتۆمبیله نەفەرهەڵگرانەدا بینراون.
(861.24591/3–1846)

[3] له تیلیگرامی ٢٢٣، بەرواری ١٩ی ئادار، کاتژمێر ٧ی پاشنیوەڕۆ که وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا له تارانی ناردووە، وەزارەتی دەرەوە بە تەواوی له گەڵ

هەتا کاتێك بۆ وەزارەتی دەرەوە، بەدەستهێنانی زانیاری زۆر نوێ و راستەوخۆ دەربارەی سەربازانی سۆڤیەت کە لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران ـ تورکیا مۆڵیان داوە، زۆر گرنگ نەبێت، من پێشنیاری ئەوە ناکەم کە ئێستا هیچ ئەفسەرێکی ئەمریکایی بنێردرێت بۆ ئەو ناوچەیە.

کوردە چەکدارەکان لەم ناوچەیە دەژین کە بە کەمی کونترۆڵ دەکرێن و یا قەت کونترۆڵ ناکرێن. بە بۆچوونی من ئەمە پێشهاتێکی جیدی زۆر مەترسیدارە کە تەنانەت پێدەچێت رووسەکان پیلانیان بۆ دارشتبێ بۆ ئەوەی سەرنجەکان لەسەر مەسەلە سەرەکیەکانی قەیرانی ئێستا بەرەو شوێنەکانی دیکە رابکێشن. بە بۆچوونی من ئێمە دەبێ لە هەر چەشنە کارێك دووری بکەین کە مەسەلەکان لە ئێران تێکبدات لە کاتێکدا کە مەسەلەی ئێران لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکاندا دەخرێتەڕوو.

سپاسی وەزارەتی دەرەوە دەکەم ئەگەر لە بیروبۆچوونەکانی خۆتان لەم پەیوەندییەدا ئاگادارمان بکەنەوە.

مورای

---

بۆچوونەکەی "مورای" هاوڕا بووە کە ئەوان پێیان باش نییە کاربەدەستانی فەرمی ئەمریکا بۆ کوردستان سەفەر بکەن .(861.24591/3–1846)

(١٩٤٦ ، بەرگی VII ، لاپەڕەی ٤٤٣ ـ ٤٤٢ )
تیلگیرام له وەزارەتی دەرەوە بۆ جێگری کونسولی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تەوریز(بەڕێز دۆهێر[1] )
پەنانەکی
واشنگتۆن، ٢٩ ی نیسانی ١٩٤٦ ، کاتژمێر ٧ ی پاش نیوەڕۆ
له وەڵامی تیلگیرامی ١٣٧ ، بەرواری ٢٧ ی نیسان:
بەبۆچوونی ئێمە، بۆ ئێوە یا "ڕۆسۆ" باش نییە لەم بارودۆخەدا وەك میوانی قازی موحەمەد [2]سەردانی مهاباد بکەن چونکە قازی موحەمەد هێشتا ڕێبەری بزووتنەوەیەکی سەربەخۆخوازە دژی دەوڵەتی ناوەندی ئێران[3]. لەمە زیاتر سەردانێکی وەها لەوانەیە لە سەراسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە تایبەت لە عێراق و تورکیا

[1] Dooher

[2] ڕێبەری سەرەکی کورد لە ئێران

[3] لە تیلیگرامی ٦٤٨، بەرواری ٦ی مایس ، گوماشتەی باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران پێشنیاری ئەوەی کردووە کە قەدەخەبوونی سەفەری کارمەندانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران و کونسولگەری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تەوریز بۆ کوردستان هەڵبوەشێتەوە چوونکە سەرجەم سەربازەکانی سۆڤیەت تا ٧ی مایس لە ئێران دەچنە دەرەوە. وەزارەتی دەرەوەش لە تیلیگرامی ٣٩٨، بەرواری ٧ی مایس ڕازی بووە بەوە کە لەو بەروارە، ئەم قەدەخەبوونە هەڵبوەشێتەوە. (124.91/5–646)

وەك هێمای هاوخەمی ئەمریکا لەگەڵ ئامانجەکانی کوردەکان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتیکی سەربەخۆی کورد لێکبدرێتەوە*.

ئاچیسۆن[٤]

* ئەم تیلگیرامە بۆ تارانیش نێردراوە

[٤] ACHESON

(١٩٤٦ ، بەرگی VII ، لاپەڕەی ٥٤٥ )

تیلگیرامی ٨٤٦ ـ ٨٩١/٠٠/١١ لە باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران(بەڕێز ئالین[١] ) بۆ وەزارەتی دەرەوە، نهێنی

تاران، ٨ ی تشرینی دووەمی ١٩٤٦ ، کاتژمێر ٥ ی پاش نیوەڕۆ نێردراوە، کاتژمێر ١/٢٠ ی پاش نیوەڕۆ گەیشتووە

١٤٥٠ـ من ئەمڕۆ "دوهیر[٢]"م لەگەڵ خۆم برد بۆ لای قەوام تا زانیاری پلە یەك دەربارەی بارودۆخی ئێستای ئازەربایجان بدەین بە سەرۆك وەزیرانی ئێران.

"دۆهیر" جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ڕێبەرانی کورد، بەتایبەت شومەرخان و سەرۆکی کوردەکانی ڕۆژئاوا(ی ئێران)، لەوانە "قازی موحەمەد"یش بەتوندی دژی کومونیزمن و لە سۆڤیەت دڵسارد بوونە چونکە سۆڤیەت ئەو پێداویستیانەی بۆ دابین نەکردوون کە بەڵێنی پێدابوون، و ئامادەن لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی ئێران هێرش بکەنە سەر ئازەربایجان بەو مەرجە کە دەوڵەتی ناوەندی دڵنیایان بکاتەوە کە چالاکیە سەربازییەکانی لەگەڵ ئەوان ڕێکدەخات و بەڵێنیان پێبدات کە ئیدی سیاسەتی سەرکوتکارانەی ڕەزاشا[٣] بەنیسبەت عەشیرەتە کوردەکان درێژەی نابێت. قەوام قسەکانی "دۆهێر"ی زۆر پێخۆش بوو و پرسیاری زۆری کرد دەربارەی دەوڵەتی تەورێز

[١] **Allen**

[٢] Dooher

[٣] ڕەزا شای پەهلەوی(باوکی محمد ڕەزا شا کە زۆرتر بە ڕەزاخان ناسراوە- وەرگێڕ) تا کاتی لەسەرکار لابرانی لە ساڵی ١٩٤١ شاهەنشای ئێران بوو.

و بارودۆخە سەربازییەکەی. قەوام وتی شێلگیرە لەسەر ئەوەی لە ماوەی ١٠ ڕۆژدا زەنجان بگرێتەوە(ئەگەر پێویست بکات لە ڕێگای هێزی سەربازی).

من قەوامم دڵنیا کردەوە کە سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ پشتیوانی لە یەکپارچەیی خاکی ئێران قەد لەرزۆك نەبووە، بەپێچەوانەی ئەو دەنگۆانە کە بیستومە کە گوایا جیابوونەوەی ئازەربایجان لە ئێران بە قازانجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێت چونکە ژەهری کومونیزم دزە دەکاتە ناو ئێران.

من بەهەرحاڵ ئاماژەم بەوە کرد کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە زەحمەت دەتوانێت هەروا پشتیوانی بێ سنوور لە یەکپارچەیی خاکی ئێران بکات، ئەگەر دەوڵەتی ئێران نیشان نەدات کە لانیکەم لە بارەی ئەم مەسەلەیە لەگەڵ ئێمە بەرژەوەندی هاوبەشی هەیە. لەئەنجامدا من پێشوازیم لە لێدوانەکەی قەوام کرد کە دەیەوێت کەڵك لە سەرچاوەکانی بەردەستی وەربگرێت بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی تا زەنجان بەرفراوان بکات. من وتم بە بۆچوونی من تەنها گرتنی زەنجان بەس نییە بەڵام لانیکەم سەرەتایەکە بۆ گرتنی شوێنەکانی دیکە. قەوام وتی دەیەوێت کەمکەم بچێتە پێش.

نێردراوێکی ئەمریکایی کە دوێنێ لە تەورێز گەڕاوەتەوە بۆ تاران دەڵێت هێزەکانی(حکوومەتی) تەورێز لە دەروازەی زەنجان چاڵیان هەڵکەندووە و وادیارە دەیانەوێت بەتوندی لە بەرامبەر هێزەکانی حکوومەتی ناوەندی ڕابوەستن.

**ئالین**

(١٩٤٦ ، بەرگی VII ، لاپەڕەی ٨٢٥ ـ ٨٢٤ )
تیلیگرامی ١٧٤٦ ـ ٧٦١/٦٧/٦ له باڵوێزی ئەمریکا له یەکێتی سۆڤیەت (بەڕێز سمیت[1]) بۆ وەزارەتی دەرەوە، پەنانەکی
موسکۆ، ١٧ ی حوزەیرانی ١٩٤٦ ، کاتژمێر ٦ ی پاش نیوەڕۆ ناردراوە، کاتژمێر ٣/٤٤ ی پاش نیوەڕۆ گەیشتووە
١٩٧ ـ هێرشە سیاسیەکانی USSR دژی تورکیا کاریگەرییەکی زۆر کەمی لەسەر مەسەلەی ئەرمەنیەکان و گورجیەکان بووە، بەڵام پێدەچێت هێرشێکی نوێ له بەرەیەکی دیکه واتا کوردەکانی تورکیا بکرێتەوە. (رۆژنامەی) "ترود"[2] سەرەتا ئەم مەسەلەیەی به هەراوهوریاوە تەقاندەوە. ئەگەر USSR بەشوێن وتارەکەی(رۆژنامەی) "ترود" دا بچێت و هەڵمەتی پروپاگەندا بۆ ئوتۆنومی کوردستان دەستپێبکات، به زەحمەت چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت که "کرملین"[3] بتوانێ زیاتر لەو پێشکەوتنەی که بۆ پروپاگەندای گەڕانەوەی خاکی ئەرمەنی و گورجیەکانی تورکیا بۆ وڵاتی باوپیرانیان واتا سۆڤیەت بەدەستی هێنا، بۆ پروپاگەندای هاندانی ئوتونۆمی کوردستان بەدەستی بهێنێت که ئەمەش چەند هۆکاری هەیە:
یەکەم، بەگوێرەی زانیارییەکانی ئێمە، کوردەکانی تورکیا له ناوچه سنوورییەکان گوازراونەتەوە بۆ ناو خاکی تورکیا، کەوابوو USSR به زەحمەت دەتوانێ(ئەگەر نەڵێین قەد بۆی نالوێ) پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان بگرێ و چەکداریان بکات.

---
[1] **Smith**
[2] *Trud*

[3] ٣- کۆشکی سەرۆك کۆماری سۆڤیەت له بەرامبەر کۆشکی سپی ئەمریکادا

دووەم، تەنانەت ئەگەر USSR بتوانێ ئەم کارەش ئەنجام بدات، ئەزموونی سۆڤیەت لەگەڵ کوردەکانی ئێران نیشان دەدات کە ئەم عەشیرەتە رەوەندە(کوردانە) بەتەواوی داردەستی سیاسەتی سۆڤیەت نین. "کرملین" بێ گومان دەزانێت کە ئەگەر نەیەوێت کوردستانێکی راستەقینە دروست بکات، هاندانی کوردەکانی تورکیا لەکردەوەدا دەبێتە هۆی پێشکەوتنی بزووتنەوەی کوردستان لە ئێران و عێراق. کەوابوو ئەگەر ئەوەی سەرەوە راست بێت، هەڵمەتی کوردستانی تورکیا لە لایەن سۆڤیەت دانەڕژاوە بۆ ئەو ئامانجە رواڵەتیانە، بەڵکوو ئامانجەکانی بریتین لە:

١ـ دەستپێکردنەوەی شەڕی دەرونی دژی تورکیا لە بەرەیەکی نوێدا

٢ـ رەشکردنی تارمایی لەسەر مەسەلەکانی CFM کە پێدەچێت داوێنی USSR بگرێت.

بەنیسبەت ئامانجی دووەم، هاوکارتبوونی بڵاوبوونەوەی وتارەکەی رۆژنامەی "ترود" لەگەڵ کردنەوەی کۆبوونەوەی CFM، دووپاتبوونەوەی نموونەیەکی ئاشنامان نیشان دەدات چونکە ئەگەر لەبیرمان بێت لە کاتی کۆبوونەوەکانی رابردووی FM و UN ، سۆڤیەت هێرشێکی پڕوپاگەندایی بەنیسبەت ئەرمەنیەکان، گورجیەکان، یونانیەکان، میسریەکان، ئەندونزیاییەکان و نەتەوە گلەوگازندەکەرەکانی دیکە بەڕێوە برد. ئەم هێرشە پروپاگەندایییانە ـ هەر وەك هێرشە پروپاگەندایییەکەی ئێستا ـ لانیکەم بەشێك لە ئامانجەکەی ئەوەیە کە پێگەی سۆڤیەت بپارێزێت لە رێگای تاکتیکی سەرلەشێواندن، دەستێوەردانی بێ بنەما و ئاڵۆزکردنی بارودۆخەکە.

سمیت

(١٩٤٧ ، بەرگی V ، لاپەڕەی ٩١١ ـ ٩١٠ )
تیلگرامی ١٥٤٧ ـ ٧٦١/٩١/٥ له بالوێزی ئەمریکا له ئێران(ئالین[1]) بۆ وەزارەتی دەرەوە،

نهێنی

تاران، ١٥ ی گوڵانی ١٩٤٧ ، کاتژمێر ٩ ی سەرلەبەیانی

٣٧٩ ـ گەلێ له سەرچاوەکان، لەوانه کوردەکان و ئەندامێکی مەجلیسی(پارلّمان) ئێران ـ که تازه له گەشته سێ مانگیەکەی له پارێزگای ئازەربایجان گەڕاوەتەوه ـ راپۆرتیان داوه که چالاکیەکانی سۆڤیەت له ئازەربایجان بەتوندی دەستی پێکردووەتەوه. سەرچاوەکان دەڵێن ئەم دواییانه چالاکی له نێو هێزەکانی دیموکراتی(ئازەربایجانی ـ وەرگێڕ) پێشوو دەستی پێکردووەتەوه.
ئەم دەنگوباسه، قورسایی ئەو راپورته زیاتر دەکات که پێدەچێت حیزبی دیموکراتی(ئازەربایجان ـ وەرگێڕ) خۆی وەك هێزێکی ژێرزەمینی سەرلەنوێ بەرێکخستن بکاتەوه. ئەم راپۆرته دواییه، وەردەکارییەکانی پلانی ئەم سەرلەنوێ بەرێکخستنکردنەی باس کردووه و دەڵێت فیداییەکانی[2] پێشوو و هەندێ له

[1] Allen

[2] فەداییەکان هێزه چەکداره مەدەنییه خۆویستەکانی رژێمی (دیموکراتی) ئازەربایجان به رێبەری جەعفەر پیشەوەری بوون که رژێمەکەیان له دیسامبری ١٩٤٦ بەدەستی دەوڵەتی ناوەندی ئێران رووخا.

موهاجیرەکان[٣](کە مانگی دیسامبر لەگەڵ پیشەوەری[٤] هەڵهاتبوون و ئێستا گەڕاونەتەوە بۆ ئێران) و ژمارەیەك لە قەفقازییەکانی سۆڤیەت لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئاستارا لە نزیکی سنووری سۆڤیەت، بەتایبەت ناوچەی خەڵخاڵ، خۆی و ماکو کۆبوونەتەوە. دەڵێن ئەم هێزانە باش چەکدار کراون.

ئەندامەکەی مەجلیس ئاماژەی بەم مەسەلەیە کرد و وتی لەرێگای دۆستەکانی دیموکراتی پێشوو سەردانی سێ دانە لە بنکەکانی سەرکردایەتی دموکراتەکانی پێشووی کردووە، هەروەها ئەوەی زیاد کرد کە لەگەڵ کونسولی سۆڤیەت لە تەورێز، ژنەراڵ کراسنیك[٥] گفتوگۆی کردووە و پێیوتووە بە هەموو شێوەیەك پشتیوانی لێدەکات ئەگەر یارمەتی بدات بە"دیموکراتیزەبوونی" ئازەربایجان.

راپۆرت دراوە کە هەندێ لە نیمچە عەشیرەتەکانی کوردی جەلالی(لە ناوچەی ماکو) دالّدەی ژمارەیەکی بەرچاو لە موهاجیرەکان و داردەستەکانی سۆڤیەتیان داوە و لە بەرامبەردا بڕێك تفەنگ و تەقەمەنییان لە سۆڤیەتییەکان وەرگرتووە.

---

[٣] موهاجیرەکان ئەو کەسانە بوون کە لە ناوچەی قەفقازیای سۆڤیەت بۆ ئازەربایجانی ئێران کۆچیان کردبوو.

[٤] محمد جەعفەر پیشەوەری، سەرۆکی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوو کە ساڵی ١٩٤٦، چەند رۆژ پێش لە راگەیاندنی کۆماری مهاباد، کۆماری دیموکراتی ئازەربایجانی دامەزراند و پاش رووخانی ئەم کۆمارە بێ هیچ بەرخۆدانییەك هەڵهات بۆ ئازەربایجانی سۆڤیەت و چەند ساڵ دواتر بە پیلانی محمد جەعفەر باقرۆڤ، سەرۆکی کۆماری خودموختاری ئازەربایجانی سۆڤیەت لە باکو بە ئۆتۆمبیل کوژرا.(وەرگێڕ)

[٥] General Krasnik

جموجۆڵی بارزانییەکان بەرەو باکوور( کە لە تیلیگرامی ٢١٧ ی باڵوێزخانە لە ٢٤ ی ئادار) ئاماژەی پێکراوە، پڕوپاگەندای سۆڤیەتیەکان بووە بە ئامانجی ئەوەی بڵێن گوایا بارزانیەکان دەچنە ریزی بزووتنەوەی پارتیزانی دیموکراتەکان کە سەرلەنوێ بەرێکخستن کراوەتەوە. رۆژنامەکانی تاران لە دوو هەفتەی رابردوودا هەڵمەتێکی پڕوپاگەندابیان دژی هاتنی موهاجیران لە یەکێتی سۆڤیەت بۆ ناو ئێران ئەنجام داوە و دانیشتووانی تەورێز هەفتەی رابردوو خۆپیشاندانیان کردووە بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی خۆیان لە هاتنی موهاجیران. سوپای ئێران حاشای لەوە کردووە کە هیچ هێزێکی گەورە هاتبێتە ناو خاکی ئێران بەڵام دانی بەوەدا ناوە کە لەوانەیە هەندێ گروپی بچووك لەرێگای رووباری ئاراسەوە پەڕیونەتە ناو خاکی ئێران.

لە لایەکی دیکەوە ئەفسەرانی لیژنەی ژاندارمری ئەمریکا کە تازە لە تەورێز گەڕاونەتەوە، راپۆرتیان داوە کە سوپای ئێران جگە لە چەند شوێنێك وەك جولفا و ئاستارا، هیچ خاڵێکی سنووری دیکە کونترۆڵ ناکات و دەڵێن پێدەچێت قەفقازییەکانی سۆڤیەت بەشێوەیەکی بەرفراوان بێنە ناو خاکی ئێران. هەندێ لە ئەفسەرەکان راپۆرتیان داوە کە جوتیارانی ئازەربایجان پێشوازی لە هاتنەوەی دیموکراتەکان دەکەن چونکە دەوڵەتی ئێران نەیتوانیوە هیچ کارێك بکات بۆ باشترکردنی ژیانە هەژارانەکەیان و پشتیوانی لە چینی زەمیندار لە پارێزگای ئازەربایجان دەکات.

هاوکات لەگەڵ ئەوەی باڵوێزخانە(ی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران) بەتەواوی متمانەی بەم راپۆرتانە نییە بەڵام لەسەر ئەو باوەڕەیە کە سۆڤیەتیەکان لەوە بێ هیوا نەبوونە کە کونترۆڵی ئازەربایجان دیسان بگرنەوە دەستی خۆیان و ئەگەر

مەجلیسی ئێران بەخشینی ئیمتیازی نەوت بە سۆڤیەت رەت بکاتەوە و بەم شێوەیە پێش لە دزەکردنی ئاشتیخوازانەی(لە رووی سیاسیەوە) سۆڤیەت لە پارێزگای(ئازەربایجان - وەرگێڕ) بگرێت، پێدەچێت سۆڤیەت دەست بکاتەوە بە دەستێوەرادنی چالاکانەتر لە ئازەربایجان و لەوانەیە هەوڵ بدات بارودۆخێکی جەنگی گریلایی وەك ئەوەی یونان (لە ئێران - وەرگێڕ) دروست بکات.

ئالێن

(١٩٤٧ ، بەرگی V ، لاپەڕەی ٩٦٠ ـ ٩٦٢ )

تیلگرامی ٢٦٤٧ ـ ٧٦١/٩١/٩ لە کەفیلی وەزیری دەرەوە بۆ باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئێران

نهێنی

واشنگتۆن، ٢٦ ی ئەیلوولی ١٩٤٧ ، کاتژمێر ٥ ی پاش نیوەڕۆ

URTELS ـ ٥٨٤ ی ئەم دواییانە نیشان دەدات هەڵوێستی ئەمریکا بەنیسبەت پەیوەندی ئێران ـ سۆڤیەت دەربارەی نەوت سودمەند بووە. وەزارەتی دەرەوە لەسەر ئەو باوەڕەیە کە کاردانەوەی توندی سۆڤیەت ـ تەنانەت پێش لە کردەوەی فەرمی مەجلیسی ئێران ـ پێدەچێت بە یەکێ لەم شێوانەی خوارەوە بێت:

١ـ دەستپێکردنی جەنگی گریلایی لە سنووری ئێران ـ سۆڤیەت کە لەوانەیە بارزانیەکان، موهاجیرکان و هێزەکانی دیکەی قەفقازیای سۆڤیەت تێیدا بەشداری بکەن.

٢ـ دروستکردنی بشێوی لە شارەکانی ئازەربایجان و ئابادان، ئیسفەهان و تاران بۆ ئەوەی ئەو تۆمەتانەی سۆڤیەت ببێ بە راست کە تیرور بەسەر ئێراندا زاڵە و هێزە چەکدارەکانی ئێران لە ناوچە سنوورییەکان بکێشنەوە.

٣ـ توندترکردنی پروپاگەندای دژی ئێرانی لە لایەن سۆڤیەتیەکان.

بە پێشبینیکردنی کردەوەگەلێکی وەها لە لایەن سۆڤیەتەوە، وەزارەتی دەرەوە ئێستا چالاکانە ئیستراتژی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەم کردەوانەی سەرەوە لەبەرچاو دەگرێت. ئێمە دیسان جەخت لەسەر هەوڵەکانی باڵوێزخانە دەکەینەوە بۆ

تەشویقکردنی عەشیرەتەکان تا کەڵك لە ئامرازی ئاشتیخوازانە و وتووێژ وەربگرن بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە کە خۆیان بە دادپەروەرانەی دەزانن(تیلیگرامی ٤٧٦ ی وەزارەتی دەرەوە، ١٤ ی ئاب).

ئێمە بەتایبەت بە پەرۆشین کە کوردەکان بە هەموو شێوەیەك تەشوێق بکەین، چونکە دوابەدوای رەتکردنی بەخشینی ئیمتیازی نەوت بە سۆڤیەت(لە لایەن ئێرانە ـ وەرگێڕ)، کوردەکان بوونە بە ئامرازی یەکەمی دەستێوەردانی سۆڤیەت لە ئێران و ئەگەر بەهۆی سیاسەتی تاوانبارکردنی یەکدی لە لایەن سوپای ئێرانەوە، لە ئێران نامۆ بن، لەوانەیە بن بە چەکێك لەدەستی سۆڤیەت بە دژی ئێران و هەروەها عێراق و تورکیا. ئێمە وای بۆ دەچین کە ئەگەر کوردەکان تا رادەیەك لە لایەن دەوڵەتی ناوەندییەوە بەفەرمی بناسرێن ـ وەك رێککەوتنەکەی قەوام لەگەڵ بەختیارییەکان و قەشقاییەکان ـ ئەگەری ملکەچنەبوونی کوردەکان بە دەوڵەتی ئێران لە میانەی رووداوە پێشبینیکراوەکانی سەرەوە کەمتر دەبێت.

لە کۆتاییدا ئێمە وا هەست دەکەین کە هەڵوێستمان لە نەتەوە یەککگرتووەکان زۆر بەهێزتر دەبێت و زۆرتر دەتوانین داکۆکی لێبکەین ئەگەر:

١ـ رق وکینەی نێوان شا ـ قەوام کۆتایی پێبێت

٢ـ وەفاداری کەمینەکانی ئێران بە دەوڵەتی ئێران مسۆگەر بێت

٣ـ کۆمەڵێك چاکسازی درێژخایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەستبەجێ لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە دەستپێبکات.

لۆویت[1]

---

[1] LOVETT

(١٩٥٠ ، بەرگی V ، لاپەڕەی ٢٠٦ ـ ٢١٢ )

٢١٥٠ ـ ٧٨٠/٠٠/٩

یادداشتنامەی گفتوگۆ غەیرە فەرمیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا - بەریتانیا لە لەندەن پاشنیوەڕۆی رۆژی پێنج شەمە، ٢١ ی ئەیلوولی ١٩٥٠ ، نهێنی

بەشدار بووان: ئوفیسی دەرەوەی بەریتانیا:

ـ بەڕێز م. ر. رایت[١]، یارمەتیدەری جێگری وەزیری دەرەوە

ـ بەڕێز گ. و. فورلانگ[٢]، سەرۆکی بەشی کاروباری رۆژهەڵات

ـ بەڕێز ت. ی. ئیوانس[٣]، سەرۆکی بەشی سکرتاریای کاروباری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

ـ بەڕێز ل ـ ئا.س. فری[٤]، ئوفیسی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا

ـ بەڕێز ل. بارنێت[٥]، ئۆفیسی رۆژهەڵات

بەشدار بووان لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا :

ـ زۆر بەڕێز جۆرج .سی. مەککگی[٦](بۆ تەوەری ١٢ و ١٩)

ـ بەڕێز ساموئێل. ك. سی. کۆپێر[٧](بۆ سەرجەم تەوەرەکان)

ـ بەڕێز و . ساندز[٨](بۆ سەرجەم تەوەرەکان)

---

[١] Mr. M. R. Wright
[٢] Mr. G. W. Furlonge
[٣] Mr. T. E. Evans
[٤] Mr. L. A. C. Fry
[٥] Mr. L. Barnett
[٦] Hon. George C. McGhee
[٧] Mr. Samuel K. C. Kopper

ـ بالوێزی ئەمریکا لە لەندەن

ـ بەڕێز جۆزێف پالمێر[٩](بۆ تەوەری ١٢ و ١٩)

..........

کوردەکان

ئێمە وتمان هەرچەند کە بارودۆخەکە ئەوەندە خراپ نییە کە لێی بترسین بەڵام کۆمەڵێك نیشانە هەیە دەربارەی زۆرتربوونی بشێوی لە نێو کوردەکان لە سەرجەم ئەو وڵاتانە کە کوردەکان تێیدا نیشتەجێن و بارودۆخەکە لەوانەیە لە داهاتوودا جێگای مەترسی بێت. کەوابوو ئێمە وا هەستمان کرد کە دەبێ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بریتانیا زانیارییەکانیان ئاڵوگۆڕ بکەن بۆ ئەوەی کونترۆڵی بارودۆخەکەیان بەتەواوی لە دەستدابێت.

نوێنەرانی بریتانیا وتیان بەتایبەتی نیگەرانی کێشەی کورد نین و ئاماژەیان بەوە کرد کە کوردەکان هەمیشە ناسەقامگیر و پەخش و بڵاون و هاوکات لەگەڵ ئەوەی بەریتانیا ئاگادارە کە ئێستا هەندێ بشێوی و ئاڵۆزی هەیە، بەڵام زۆر بە مەسەلەیەکی جیدی نازانن.

بەهەرحاڵ نوێنەرانی بەریتانیا وتیان هەمیشە خۆشحاڵ دەبن کە زانیاری و بیروبۆچوونەکانیان لەگەڵ ئێمە ئاڵوگۆڕ بکەن و لەگەڵ ئێمە هاوڕا بوون کە دەبێ چاودێری بارودۆخە بکرێت. ئێمە نوێنەرانی بریتانیامان ئاگادار کردەوە کە سەرقاڵی ئەوەین کونسولگەری زیادە لە سەراسەری ڕۆژهەڵاتی نزیك بکەینەوە و هیوامان

---

[٨] Mr. W. Sands

[٩] Mr. Joseph Palmer

دەربڕی کە لەرێگای ئەم کونسولگەریانە بتوانین پەیوەندی نزیکتر لەگەڵ کوردەکان و عەشیرەتەکانی دیکە دابمەزرێنین.

لێژنەکەی ئێمە و بەریتانیا لەسەر ئەوە هاوڕا بوون کە هەر چەشنە نزیکبوونەوەیەك لەگەڵ کوردەکان دەبێ لەرێگای ئەو دەوڵەتانەوە بێت کە کوردەکان لە وڵاتەکەیاندا نیشتەجێن و دەبێ وریا بین کە کوردەکان ئەوەندە بەهێز نەبن کە کردەوەیەکی وەها راپەڕینی کوردەکانی لێبکەوێتەوە. هەروەها لێژنەکەی ئێمە و بەریتانیا لەسەر ئەوە هاوڕا بووین کە ئاڵوگۆڕی زانیاری و بیروڕا لە نێوانمان دەبێ لەرێگای کاناڵگەلی ئاساییەوە ئەنجام بدرێت و جارێ ئێستا پێویست ناکات گفتگوی تایبەتمان لەسەر ئەم تەوەرە هەبێت.

(١٩٥٠ ، بەرگی V ، لاپەڕەی ٢٢١ ـ ٢٣٠)

٢٠٥٠ ـ ٧٨٠/٠٠/١٠

پێشنووسی بەرپرسی كاروباری میسر و بەریتانیا ـ میسر و سودان(بەڕێز ستابلێر[1])

بەتەواوی نهێنی

واشنگتۆن، ٢٤ ی تشرینی یەكەمی ١٩٥٠

ئەم نووسراوەیە، ئەو هەڵوێست و كاردانەوانە لەخۆدەگرێت كە چاوەڕوان دەكرێت دەوڵەتانی عەرەب و ئیسرائیل لە كاتی روبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم پێشهاتانانەی خوارەوە لە داهاتوودا بیگرنەبەر و پێشنیار دەكات چ كردەوەگەلێك لەم بەیوەندییەدا ئەنجام بدرێت. ئەو پێشامەدانە كە ئەگەری رووداانیان لەداهاتوودا هەیە بریتین لە:

١ـ گرتن و داگیركردنی رۆژهەڵاتی نزیك بەدەستی سۆڤیەت

٢ـ هێرشی بەرتەسكی سۆڤیەت بۆ سەر هەندێ لە شوێنە زۆر گرنگەكانی رۆژهەڵاتی نزیك

٣ـ پشتیوانی سۆڤیەت لە راپەڕینی كەمینەكان

٤ـ داگیركردنی شوێنەكانی دیكەی جیهان بە ئیلهامگرتن لە سۆڤیەت وەك ئەوەی كۆریا

٥ـ دوژمنایەتیەكانی نێوان USSR و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەستبەجێ رۆژهەڵاتی نزیك ناگرێتەوە

.........

٣ـ پشتیوانی سۆڤیەت لە راپەڕینی كەمینەكان:

---

[1] Stabler

(الف) ـ هەڵوێستەکان و کاردانەوەکان: هەرچەند کە USSR گلەوگازندەکانی نێو زۆربەی کەمینەکانی پەرەپێداوە و هانی داوە، بەڵام تەنها گروپێکی چڕوپڕ کە دەتوانن دەست بە راپەڕین بکەن، کوردەکانن.

بەڵام بەهەرحاڵ یەکگرتوویی و یەکڕیزی عەشیرەتە کوردەکان زۆر نییە و گەلێ لە رێبەرە دەستڕۆیشتووەکانیان هاوپەیمانی دەوڵەتە ناوەندییەکان و سوپای ئەم دەوڵەتانەن. لەمەزیاتر لەوە ناچێت کە بزووتنەوەیەکی ناسیونالیستی لاوازی کورد یا رێبەرانی عەشیرەتەکان بتوانن دژی ئەم دەوڵەتانە راپەڕن چونکە ئەم دەوڵەتانە بەریانێکی زۆریان بەرەولای سۆڤیەت هەیە. بەهەرحاڵ مەلا مستەفا(بارزانی)، رێبەری راپەڕینی ١٩٤٥ ی کورد لە عێراق لە لایەن USSR لە قەفقاز داڵدە دراوە و دەڵێن سۆڤیەت ئامادەی دەکات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ عێراق.

هێزە چەکدارەکانی عێراق و سوریا ئەوەندە بەهێزن کە بتوانن لە بەرامبەر راپەڕینی مەحەلی کوردەکان رابوەستن ، تەنانەت ئەگەر سۆڤیەت بە بەخشینی بڕێکی کەم چەکی سووك پشتیوانی لە کوردەکان بکات. ئەگەر شتێکی وەها رووبدات، دەوری هێزی هەوایی عێراق یەکلاییکەرەوە دەبێت، بەتایبەت ئەگەر یەکینەکانی RAF (هێزی هەوایی پاشایەتی بریتانیا ـ وەرگێڕ) پشتیوانی لە هێزی هەزایی عێراق بکات.

چاوەڕوان دەکرێت ئیسرائیل بەچاوی ترسەوە سەیری ئەم راپەڕینانە بکات بەڵام پێدەچێت سیاسەتی"بنواڕە و چاوەڕوان بکە" بەنیسبەت ئەم راپەرینانە بگرێتە بەر، مەگەر ئەو کاتە کە ئاسایشەکەی راستەوخۆ بکەوێتە ناو مەترسی. لەوانەیە هەندێ لە گروپە توندڕەوەکان لەم بارودۆخە کەڵك وەربگرن لەپێناو ئامانجەکانیان لە بەرامبەر

دهوڵهتانی عهرهبی. بههەرحاڵ هێزه چهكدارهكانی عێراق و سوریا ناتوانن له بهرامبهر هێرشێكی گهورهی یهكینه نارێكوپێكهكانی روسیا رابوهستن كه له جلوبهرگی راپهرینێكی گشتی كوردهكاندا چالاكی دهكهن. ئهگهر شتێكی وا رووبدات، تهنها دهستێوهردانی هێزه چهكدارهكانی دهوڵهتانی رۆژئاوا دهتوانێ هێرشی سۆڤیهت رابوهستێنێت كه پێدهچێت له ناو یهك یا چهند جلوبهرگدا له ناوچهكانی دیكهی رۆژههڵاتی نزیك پهره بسێنێت.

(ب) ـ رهوتی كار: ئهگهر پێشهاتێكی وهها رووبدات(مهبهستی راپهرینی كوردهكانه ـ وهرگێڕ) دهبێ هێزه چهكدارهكانی رۆژئاوا له چوارچێوهی هێزهكانی سوپای بهریتانیا و چهك و تهقهمهنی سوپای وڵاته یهكگرتووهكانی ئهمریكا دهستبهجێ و بهشێوهیهكی كاریگهر یارمهتی عێراق و سوریا بدهن.

**ئهنجامهكان**

......

٣ـ پشتیوانی سۆڤیهت له راپهرینی كهمینهكان: هێزه چهكدارهكانی عێراق و سوریا ـ كه ئهگهری راپهرینی كهمینهكان لهم دوو وڵاته زۆره ـ ئهوهنده بههێزن كه بتوانن له بهرامبهر راپهرینی مهحهلی كوردهكان به هاندانی سۆڤیهت رابوهستن و بههەرحاڵ كوردهكان نه بهرێكخستن كراون و نه بهگشتی لایهنگری سۆڤیهتن. بههەرحاڵ هێزه چهكدارهكانی عێراق و سوریا ناتوانن له بهرامبهر هێرشێكی گهورهی كوردهكان، ئاسورییهكان و ئهرمهنیهكان له چوارچێوهی یهكینه سهربازییه نارێكوپێكهكانی یهكێتی سۆڤیهت و روسهكان رابوهستن كه له جلوبهرگی راپهرینێكی گشتی كورد و

کەمینەکانی رۆژهەلاتی نزیك چالاکی دەکەن و لەرێگای ئێرانەوە دەگەنە عێراق و سوریا.

ئەگەر لەم مەسەلەیەدا ـ وەك ئەوەی کۆریا ـ نەتەوە یەکگرتووەکان دەست بەکار بێت و دەوڵەتانی رۆژئاوا یارمەتی سەربازی بدەن، دەوڵەتانی عەرەبی بەتوندی پشتیوانی لە رۆژئاوا دەکەن. بەهەرحاڵ ئەگەر دەوڵەتانی رۆژئاوا یارمەتی نەدەن یا یارمەتیەکەیان کاریگەر نەبێت، عێراق و سوریا هیچ رێگایەکیان بۆ نامێنێت جگە لەوە کە ئاکامی رووداوەکان قبوڵ بکەن. لەمەزیاتر بە دروستبوونی پێگەیەکی وەها لە رۆژهەلاتی نزیك، پێدەچێت USSR هەموو هەولێك بدات کونترولی ناوچەکانی دیکە بە دەست بێنێت.

چاوەڕوان دەکرێت ئیسرائیل بە چاوی ترسەوە سەیری ئەم راپەڕینانە بکات بەڵام پێدەچێت سیاسەتی"بنوارە و چاوەڕوان بکە" بەنیسبەت ئەم راپەڕینانە بگرێتە بەر، مەگەر ئەوکاتە کە ئاسایشەکەی راستەوخۆ بکەوێتە ناو مەترسی.

(١٩٥٨ ـ ١٩٦٠ ، بەرگی XXI ، لاپەڕەی ٥٦٦ ـ ٥٦٩)

٢٠٤ـ یادداشتنامەی گفتوگۆی شا لەگەڵ سەرۆك كۆمار ئایزینهاوێر [1]

واشنگتۆن، ٣٠ ی حوزەیرانی ١٩٥٨ ، كاتژمێر ٢/٤٥ تا ٤/٢٥ پاش نیوەڕۆ [2]

بەتەواوی نهێنی

ئامادەبووانی دیكە:

جەنابی شای ئێران

كاپیتان ئەورەند [3]

سەرۆك كۆماری ئەمریكا، ئایزینهاوێر گفتوگۆی خۆی لەگەڵ شا بەو پرسیارە دەستیپێكرد كە ئایا سوپای ئێران لە ١٠ لیوا پێكهاتووە. "شا"یش وەڵامی دایەوە: "بەڵێ لە ١٠ لیوا و چەند تیپ پێكهاتووە"

پاشان شا لە روانگەی خۆیەوە چەمكی بارودۆخی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پێناسە كرد و باسی گرنگی ئیستراتژیكی ئێران بۆ رۆژئاوا لە ژێر سێبەری جموجۆڵەكانی USSR ی كرد. شا جەختی لەسەر ئەم خاڵانە كردەوە:

---

[1] President Eisenhower

[2] سەرچاوە: كتێبخانەی ئایزینهاوێر، فایلی Whitman، فایلی نێونەتەوەیی، ئێران، بەتەواوی نهێنی."ئەورەند" ئامادەی كردووە. ئەم كۆبوونەوەیە لە كۆشكی سپی بەڕیوەچوو.

[3] Captain Aurand

١ـ چوار ساڵ لەمەوپێش ئێران دەستی له سیاسەتی بێ لایەنبوونی ١٥٠ ساڵەی خۆی كێشا و بەختی خۆی تێكەڵ بە رۆژئاوا كرد.

٢ـ شا جەختی لەسەر گرنگی هەڵكەوتی ئیستراتژیكی ئێران كردەوە و وتی ئێران دەروازەیەكە كە هەرچەشنە داگیركردنێكی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست یا جموجۆڵ بەرەو باشووری ئاسیا دەبێ لەرێگای ئێرانەوە ئەنجام بدرێت. شا وتی: "ئەگەر كەسێك بتوانێ ئێران كونترۆڵ بكات، دەتوانێ تەواوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست كونترۆڵ بكات"

٣ـ شا جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە پێناچێت شەڕیكی گەورە له روانگەی"سیاسەتی رێگری دولایەنە" له ئەنجامی بەرهەمهێنانی بومبە هیدروژینیەكان ساز بێت

٤ـ شا وتی ٢ ساڵ لەمەوپێش، روسیا هیچ پلانێكی نەبوو بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەڵام له كاتی دروستبوونی "كاناڵی سوئیزە"وە بە ئاشكرا پلانی هەیە بۆ دزەكردنە ناو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و كونترۆڵ كردنی. ئامانجەكانی روسیا، كونترۆڵكردنی هێڵی پەیوەندی رۆژئاوایە بۆ رۆژهەڵاتی دوور و كونترۆڵكردنی نەوتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەستڕاگەیشتن بە عێراق و ئوردونە( پاش لوبنان).

٥ـ شا وتی ئێستا كومونیستەكان لەرێگای بڵاوكردنەوەی بەرنامە له رادیۆ قاهیرە، كوردەكان هان دەدەن بۆ"كوردستانێكی ئازاد" شەڕ بكەن و بەرنامەكانیان له سەرزەمینی ئێران، توركیا، عێراق و USSR بڵاو دەبێتەوە. شا ئاماژەی بەوە كرد كە دەستبەجێ پاش داگیركردنی ئازەربایجان، روسەكان ئازەربایجانیان بە دو پارێزگای تورك و كورد دابەش كردووە و دەوڵەتیكی كوردیان دامەزراندووە و بە هەموو

پێداویستییەکان، لەوانە سرودی نەتەوەیی تەیاریان کردووە. شا وتی رادیۆ قاهیرە، ئێستا لە هەڵمەتی پڕوپاگەنداکەی خۆی هەمان ئەو سرودە بلاو دەکاتەوە.

..........

سەرۆك کۆماری(ئەمریکا) دەربارەی ئیزگەکانی رادیۆ لە شا پرسیاری کرد. شا وتی ئەوان(دەوڵەتی ئێران - وەرگێڕ) دەستیان کردووە بە دامەزراندنی ئەم ئیزگانە و هەوڵ دەدەن لەرێگای ئەم ئیزگانەوە خەڵك پەروەردە بکەن. شا وتی فەرمانی دامەزراندنی دو ئیزگەی زیاتر لە ۱۰۰ کیلوواتی دەرکردووە کە بەرنامەکانی لە سەراسەری ناوچە عەرەبنشینەکان و ناوچە موسلمانەکانی روسیا بلاو دەبێتەوە.
شا هەروەها وتی ئەم ئیزگانە بە زمانی تورکی و کوردی و هەروەها فارسی بەرنامە بلاو دەکەنەوە. سەرۆك کۆماری ئەمریکا وتی پێیخۆشە ئەم ئیزگانە لەو ناوچەیە بەرنامە پەخش بکەن کە رادیۆ قاهیرە بەرنامەیان تێیدا بلاو دەکاتەوە و بەتایبەت دەنگی بگاتە خەڵکی عەرەبستانی سعوودی بۆ ئەوەی مەلەك سعود ناچار بکات تۆزێك زیاتر خەمی خەڵکەکەی بخوات. سەرۆك کۆماری ئەمریکا وتی("شا"ش لەگەڵی هاوڕا بوو) مەلەك سعود وەك پارێزەری شوێنە پیرۆزەکان(مەبەستی مەکە و مەدینەیە - وەرگێڕ) لە قازانجەکانی پروپاگەندایەکی گەورە سود وەردەگرێت.

..........

شا وتی نیگەرانی ئەوەیە کە هێزەکانی سوریە - میسر بە چەکوچۆڵی روسیا تەیارتر بن و وتی ئەم ئامادەکارییە بۆ ئەوەیە ئەنباری چەك و تەقەمەنی بۆ"کوردە خۆویستەکانی" سوریا دابین بکەن. شا وتی ئێران و وڵاتانی دیکەی(رۆژهەڵاتی

ناوەڕاست) کە لایەنگری رۆژئاوان، پێویستیان بە چەك هەیە بۆ ئەوەی بتوانن دەستبەجێ لە بەرامبەر هەڕەشەیەکی وەها رابوەستن.

(١٩٥٨ ـ ١٩٦٠ ، بەرگی XII ، لاپەڕەی ٦٠٤ ـ ٦٠٠)[١]

٢٥٦ـ یادداشتنامەی گفتوگوکانی ٣٨٦ مین کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی

واشنگتۆن، ١٣ ی تشرینی دووەمی ١٩٥٨

بەتەواوی نهێنی

١ـ پێشهاتە گرنگەکانی جیهان کە کار دەکاتە سەر ئاسایشی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

.... لە ئێران سەرۆکی دەزگای هەواڵگری شا، راپۆرتێکی بۆ شا ئامادە کردووە و دەربارەی پیلانە خراپکارانەکانی سۆڤیەت هوشداری پێداوە.

بەبۆچوونی بەڕێز دولز[٢] پێویستە ئێمە بە وریایی تایبەتەوە، پێشهاتەکانی ناوچە سنوورییەکان، بەتایبەت ناوچە سنوورییە کوردنشینەکان بخەینە ژێر چاودێری. ناوچە سنوورییە کوردنشینەکان باشترین شوێنە بۆ ئەوەی سۆڤیەتیەکان کێشەی تێدا ساز بکەن. بەگشتی پەیوەندییەکانی سۆڤیەت ـ ئێران ئێستا گەیشتووە بە کەمترین ئاستی خۆی لە ماوەی سێ ساڵی رابردوودا. لە بەشی ئەنجامی قسەکانیدا بەڕێز "دولز" بە کورتی ئاماژەی بە چەند هەنگاوێکی بچووك کرد کە شا هەڵیگرتووە بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەی چاکسازی ناوخۆیی ولاّت. هاوکات لەگەڵ ئەوەی ئەم

---

[١] سەرچاوە: کتێبخانەی ئایزینهاڤێر، فایلی Whitman، فایلی ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتمانی، بەتەواوی نهێنی.گلیسۆن لە ١٣ی نڤامبر ئامادەی کردووە.

[٢] Mr. Dulles

بەرنامەیە بە عاقارێکی راستدا دەچێتە پێش، بەلاّم بەبۆچوونی بەرێز "دولز" هێشتا زۆری ماوە کە کۆتایی بە نارازیبوونی(خەڵك) بهێنێت.......

بەرێز گۆردۆن گرای[3] لەبەشی ئەنجامی قسەکانیدا داوای لە بەرێز هیرتێر[4]، وەزیری دەرەوە کرد بیروڕای خۆی دەربارەی سیاسەتە تازە پێشنیارکراوەکە دەربڕێ. بەرێز هیرتیر وتی بەبۆچوونی ئەو سیاسەتی نوێ زۆر سەرنجڕاکێشە، زۆرتر بەهۆی ئەوەی ئێران یەکێ لەو وڵاتانەیە لە جیهاندا کە سنوورێکی درێژی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت هەیە کە ئێمە هیچ هاوپەیمانییەکی بەرگریمان لەگەڵی نییە، تەنانەت ئێمە بەتەواوی ئەندامی "پەیماننامەی بەغداد" نین.

بەرێز هیرتێر هەروەها وتی روونە کە ئێران هەڵکەوتێکی زۆر ئیستراتژیکی هەیە و لەکاتی گفتوگۆکانمان لەگەڵ ئێران، لەگەڵ کەسێکدا مامەڵەمان کردووە (شا) کە کەسایەتیەکی زۆر لەرزۆکی هەیە. روونە کە شا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ "ئاریستوکراسی سەرزەمینی کۆن" بە هێواشی بچڕاندووە بەلاّم ئێستا کۆمەڵێك هەنگاوی گرنگی بەرەو ئاراستەیەکی نوێ و باش هەڵگرتووە. ئەم هەنگاوە نوێیانە ئاکامی پێداگرتنی دوستانەی وڵاتە یەکگرتووەکان لەسەر شا بووە نە سەرنیان بەسەر شادا.

وەزیری دەرەوە وتی شا ئەوەندە توندمەزاج بوو کە وەزارەتی دەرەوە لەوە دەترسا کە ئەگەر ئێمە لەراستیدا هەوڵ بدەین سەر بنێینە سەری، پێدەچێت شا بەتەواوی لێمان توڕەبێت و لەگەڵ لایەنی دیکە دەست بە تۆپ تۆپێن(مەبەستی مامەڵە کردنە-

[3] Mr. Gordon Gray
[4] Herter

وەرگێڕ) بكات. بارودۆخەكە، بارودۆخێكی باش نەبوو و لەمەزیاتر ئێستاش بەهۆی ئاژاوەگێڕییەكانی ئەم دواییانەی كوردەكان بارودۆخەكە ئاڵۆزتر بووە.

سەرۆك كۆماری ئەمریكا باسەكەی بردەوە سەر مەسەلەی تەیاربوونی سوپای ئێران و ئاماژەی بەوە كرد كە كاتێ كە شا لە هاوینی رابردوو سەردانی ئەوی كردووە، باسی ئەوەی بۆ كردووە كە پێویستە دو یەكێنەی باشی سوپای ئێران لە سەر سنووری ناوچە كوردنشینەكانی عێراق و ئێران تەیار بكرێت و هەروەها وتوویە كارێكی باشە ئەگەر ئێزگەیەكی رادیۆ دابمەزرێت بۆ ئەوەی بەرنامە بە زمانی كوردی بۆ كوردەكانی ئێران بڵاو بكاتەوە.

شا ئاماژەی بەوە كرد كە كوردەكان لە ژێر بومبارانی بەردەوامی پڕوپاگەندای سۆڤیەتدان و ئەو دەیەوێت بەچەند شێوازێك دژكردەوە لە بەرامبەر پروپاگەنداكەی سۆڤیەت نیشان بدات. سەرۆك كۆمار پرسیاری كرد ئایا ئێمە هیچ كارێكمان كردووە بۆ ئەوەی وەڵامی داواكارییە یارمەتی خوازانەكەی شا بدەینەوە. بەرپرسی USIA ، بەڕێز جۆرج ئالین[٦] وتی ئاژانسەكەیان ئێستا لەگەڵ دەوڵەتی ئێران كار دەكات بۆ دامەزراندنی ئێزگەیەكی ٥٠ كیلوواتی بۆ پەخشی بەرنامەی رادیویی. بەڕێز ئالین لە درێژەی قسەكانیدا وتی ئەڵبەتە بە هەمان ئەندازە كە دامەزراندنی ئەم رادیویە گرنگە، بەهەمان ئەندازەش گرنگە كە ئەم رادیویە چی بەرنامەگەلێك بڵاو بكاتەوە و چی بە كوردەكانی ئێران بڵێت.

كاربەدەستانی ئێران هێشتا بڕیاری ئەوەیان نەداوە كە ئەم رادیو نوێیە چی سیاسەتێك بگرێتە بەر. كەوابوو USIA هەوڵ دەدات جۆرە سیاسەتێك بۆ بەرنامەكانی ئەم

---

[٦] Mr. George Allen

رادیویە دابڕێژێت کە کوردەکان پێشوازی لێبکەن و وەڵامی ئەرێنی بدەنەوە، ئەڵبەتە ئەم کارە کارێکی ئاسان نییە چونکە کوردەکان هەمیشە رقیان لە (دەوڵەتی) ئێران بووە و زۆر زەحمەتە تەشوێق بکرێن (دەوڵەتی) ئێرانیان خۆش بوێت.

س ئیوێریت گلیسۆن[٧]

[٧] S. Everett Gleason

(١٩٦٤ ـ ١٩٦٨ ، بەرگی XXII ، لاپەڕەی ١٨ ـ ١٣)

یادداشتنامەیەك لە لایەن كەفیلی جێگری وەزیری دەرەوە لە كاروباری رۆژهەڵاتی نزیك و باشووری ئاسیا(بەڕێز جێرنیگان[1]) بۆ گروپی تایبەت(دژە راپەڕین)

واشنگتۆن، ٢ی ئاداری ١٩٦٤

بابەت: راپۆرتی بەرەوپێشچوونی پلانی بەرگری ناوخۆیی ـ ئێران

......

٤ـ ئەو ناوچە سەرەكیانە كە بەردەوام جێگای نیگەرانین:

ج ـ كێشەی كورد لە ئێران پێدەچێت كەوتبێتە ژێر كاریگەری ئاگربەستی ئەم دواییانەی نێوان دەوڵەتی عێراق و كوردەكانی عێراق.

ئێستا جارێ زۆر زووە بۆ ئەوەی بڕیاری ئەوە بدەین كە ئایا ئەم ئاگربەستە جێگیر دەبێت یا نا و ئەگەر هاتوو جێگیربوو ، ئایا كاریگەری خراپی لە سەر كێشەی ئاسایشی ناوخۆی ئێران دەبێت یا كاریگەری باش ؟

......

[1] Jernegan

(١٩٦٤ ـ ١٩٦٨ ، بەرگی XXII لاپەڕەی ٥٢ ـ ٤١)

**٢٣ـ ئوفیسی هەڵسەنگاندنی هەواڵگری نیشتمانی**

**٦٤ ـ ٣٤ ـ NIE ، واشنگتۆن، ٢٠ ی گولانی ١٩٦٤**

**ئێران**

......

**ئەنجامەکان**

**١ـ گیروگرفتەکانی ئێران**

**دژایەتیەکان**

١٤ـ ئێستا دژایەتیکردنی عەشیرەتەکان، هەڕەشەیەکی دەستوبرد نییە بۆ رژێمی ئێران. کوردەکانی ئێران هێشتا ململانێی نەریتی عەشیرەتی بەسەریاندا زاڵە و هیچ کەسێکیان نییە کە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە لایەن ئەوانەوە وەك رێبەرێکی مەحەلی قبوڵ کرابێت. لەمەزیاتر کوردەکان گلەوگازندەیەکی زۆر جیدییان(لە حکوومەت ـ وەرگێڕ) نییە و دەوڵەتیش ئێستا خەریکە کۆمەڵێك هەنگاو هەڵدەگرێت بۆ ئەوەی ناوچە کوردنشینەکان لە رووی ئابوورییەوە پێش بخات و کوردەکان زیاتر بەرەو ژیانی نیشتمانی ئێران رابکێشێت.

پێناچێت کوردەکانی ئێران گیروگرفتی جیدی بۆ دەوڵەتی ئێران دروست بکەن مەگەر ئەو کاتە کە کوردەکانی عێراق ئوتۆنومیەکی گەورە بەدەست بهێنن یا USSR هەوڵی شێلگیرانە بدات بۆ هاندانی بزووتنەوەیەکی جیاییخوازانە لە نێو کوردەکان کە بەهەرحاڵ ئەگەری روودانی ئەم دوو پێشهاتە لەئێستادا دوورە. لەوانەیە بشێوی

عەشیرەتی لە شوێنەکانی دیکەی ئێراندا روو بدات بەڵام کونترۆڵکردن و گۆشەگیرکردنیان ئاسانە و لەرادەبەر زەحمەتە بۆ گروپە عەشیرەتیە پەخش و بڵاوەکان کە کردەوەیەکی هاوئاهەنگ دژی رژێمی ئێران ئەنجام بدەن.

هەرچەند کە بەدڵنیاییەوە میسر و عێراق کۆمەڵێك پیلان و فیتنە لەناو عەرەبەکانی خوزستاندا دەنێنەوە بەڵام عەرەبەکانی خوزستان بێ چەکن، هەژاری بەسەریاندا زاڵ بووە و خوێنساردن، کەوابوو لە ئێستادا هیچ هەڕەشەیەك دروست ناکەن بە دەوڵەتی ئێران.

......

(١٩٦٤ ـ ١٩٦٨ ، بەرگی XXII ، لاپەڕەی ٣ ـ ٨ )[1]

٢ ـ نامەی (شا)ی ئێران بۆ جانسۆن، سەرۆك کۆماری ئەمریکا

تاران، ٧ ی کانوونی دووەمی ١٩٦٤

بابەت: پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق و کێشەی کورد

.....

جارێکی دیکە بگەڕێینەوە بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بارودۆخی عێراق ناسەقامگیرە. بە رووخانی رژێمی لەرزۆکی قاسم، ئێمە هیواداربووین کە پەیوەندی نزیکترمان هەبێت لەگەڵ عێراق و وابیرمان دەکردەوە کە بەهۆی ئەوەی کە بەعسیەکان وڵاتی عێراقیان لە کومونیستەکان پاك کردووەتەوە، ئێمە لە شەڕی دراوسێیەکی کێشەخولقێنەر رزگارمان بووە بەڵام بەهەرحاڵ خۆشبینیەکەی ئێمە زۆری نەخایاند لەبەر ئەوەی کە ئێمە ماوەیەکی کورت پاش ئەوە، بنکەی سیخوڕی عەرەبەکانمان لە باشووری ئێران کەشف کرد کە چاوی تەماحیان بڕیوەتە بەشێکی تایبەتی جیانەکراوەی وڵاتی ئێمە (پارێزگای خوزستان) کە ناوەندی سەرەکی پیشەسازی نەوتی ئێمەیە.

---

[1] سەرچاوە: کتێبخانەی جانسۆن، فایلی ئاسایشی نیشتمانی، فایلی هەواڵنێری تایبەتی سەرۆك کۆمار، هەواڵنێری ئێران ـ سەرۆك کۆمار، پۆلێنبەندی نەکراوە. کۆپی نامەکەی شا لە وەزارەتی دەرەوە هاوپێچ کراوە لەگەڵ یادداشتنامەیەك کە نیشان دەدات ئەسڵی نامەکە لەلایەن باڵوێزخانەی ئێران لە ئەمریکا لە ١٧ی حوزەیران تەسلیم بە وەزارەتی دەرەوە کراوە (وەزارەتی دەرەوە، فایلە ناوەندییەکان، POL ١٥ ـ ١ US/JOHNSON).

به رووخانی دەوڵەتی بەعس لە عێراق، ئەم مەترسییە وادیارە کەم بووەتەوە بەڵام بەهەرحاڵ بەدگومانییەکە هەر بەردەوامە. زانیارییەکانی ئێمە نیشان دەدات کە خودی "مارشاڵ عارف" بەتەواوی ئاگاداری ئەم چالاکیانە بووە و بەتەواوی پشتیوانی لێکردووە.

بەداخەوە دەبێ بڵێم کە پێشتر "مارشاڵ عارف" بەریانی بەرەولای میسر نیشان دابوو. ئەگەر من لەسەر ئەم مەسەلەیە پێدادەگرم و نیگەرانی خۆم دەردەبڕم لەبەر ئەوەیە کە ئێمە بەتەواوی ئاگاداری پێشهاتەکانی ئەم ناوچەیە و ئەو رێگایەین کە ئەوان دەیانەوێت بیگرنە بەر.

دەبێ بڵێم هەڵویستی ئێمە بەنیسبەت عێراق هەمیشە دۆستانە بووە و هەمیشە هیوادار بووینە کە عێراق دەوڵەتیکی بەهێز و سەقامگیری هەبێت کە بتوانێ سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت و داکۆکی لە بەرژەوندییە نەتەوەییەکانی بکات.

کێشەی کورد هێشتا چارەسەر نەکراوە. داردەستەکانی کومونیزمی نێونەتەوەیی هەموو هەوڵێك دەدەن بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوە و میسر دەیەوێت دەوری خۆی(کە بە بۆچوونی ئێمە دەورێکی گومانلێکراوە) لە هەموو پێشهاتەکانی ئەم بارودۆخەدا بگێڕێت. ئەگەر وتووێژەکانی نێوان حکوومەتی عێراق و کوردەکان هەرەسبهێنێت، چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە شەڕ لە بەهار دیسان دەست پێبکاتەوە.

ئێمە کۆمەڵێك راپۆرتی متمانەپێکراومان لە دەستدایە کە "پریزیدنت ناصر" هەوڵی داوە (و ئێستاش هەوڵ دەدات) ببێ بە ناوبژیوان لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی ناوەندی عێراق. ئەم هەولانە هەرچەند کە جێگای دەستخۆشییە، بەڵام بەتەواوی

زیانی هەیە(بۆ ئێمە). بەهەرحاڵ ناوەرۆكی یەكێ لە پەیامەكانی ناصر بۆ كوردەكان، نیازخراپی ناصر بەنیسبەت ئێران بەتەواوی نیشان دەدات.

بەگوێرەی زانیارییەكانی ئێمە، ناصر لە كردەوەدا وتوویەتی كە جێگای داخە كوردەكان لەگەڵ عەرەبەكان شەڕ دەكەن و وتوویەتی بەتەواوی پشتیوانیان لێدەكات ئەگەر كوردەكان، ئاراستەی شەڕەكە بگۆڕن بەرەولای ئێران. كەوابوو بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی عێراق و پێشكەوتنەكانی میسر لە یەمەن و شوێنەكانی دیكە كە وادیارە لە شوێنەكانی دیكەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش دەتەقێتەوە، ئەرك و بەرپرسیارەتییەكانی من بەنیسبەت وڵاتەكەم و خەڵكەكەم، ناچارم دەكات هەموو تەگوبیرێكی پێویست بگرمەبەر بۆ پاراستنی وڵات و بەرژەوەندییە نەتەوەییەكانمان. ئێمە ناتوانین كاریگەری خراپكارانەی میسر لەبەر دەرگای ماڵەكەمان تەحەمول بكەین و بە مەسەلەیەكی جیدی دەزانین.

من پێموایە(هەروەها كە پێشتریش باسم كرد) سەقامگیری ئێران گرێدراوە بە ئاسایشی هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لەكاتێكدا كە ئێمە لە ئێران هەوڵ دەدەین بۆ زامن كردنی ئاسایش و سەقامگیری وڵاتەكەمان و كەنداوی فارس، یارمەتی دەوڵەتانی دیكەش دەدەین بۆ پاراستنی ئاشتی لە سەراسەری ئەم ناوچەیە كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەرژەوندی یەكلاییكەرەوەی تێدا هەیە. خۆشبختانە لەم مەسەلەیەدا(هەر وەك مەسەلەكانی دیكە) ئێمە پەیوەندی نزیك و زۆر دوستانەمان هەیە لەگەڵ وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و قەد روانگەی جیاوازمان نەبووە لەم پەیوەندییەدا.

جارێکی دیکە شادی و سەرکەوتنتان بۆ بە ئاوات دەخوازم لە خزمەت بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئامانجی پێکهاتنی جیهانێکی ئازاد.

لەگەڵ ئەوپەڕی رێزمدا

محمد رەزا پەهلەوی

(١٩٦٤ ـ ١٩٦٨ ، بەرگی XXI ، لاپەڕەی ٣٥٧ ـ ٣٥٨ )[1]

تیلیگرام لە باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران بۆ وەزارەتی دەرەوە

تاران، ٢٠ ی کانوونی دووەمی ١٩٦٦

نهێنی

بابەت: پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق و کێشەی کورد

١٠٤٤ : ١- پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق

من ئەمرۆ پێشنیاری ئەوەم بە "شا" کرد کە پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق کونترۆڵ بکات و نەچێت بۆ سەفەرە بەرنامە بۆدارێژراوەکەی بۆ ئەوروپا، شا وەڵامی ئەرێنی بەم پێشنیارە دایەوە. شا وتی هەست دەکات ئێران گەیشتووە بە ئامانجی سەرەکی خۆی واتا ئەوە کە عێراقیەکان بزانن هەرچەشنە دەستدرێژی سەربازی بۆ سەر سنووری ئێران، لەگەڵ وەڵامی توندی ئێران روبەڕوو دەبێتەوە و هەرکاتێك ئێران بیەوێت، سەرچاوەی ئەم چالاکیە بێ دەنگ دەکات.

٢ـ ئامانجە درێژخایەنەکان: شا وتی ئامانجی ئێران هیچ کاتێك ئەوە نەبووە کە یەکپارچەیی خاکی عێراق بباتە ژێرپرسیار و هەر دو وڵات لە رێگای پەیوەندی دراوسێیتیەوە دەتوانن هەموو دەستکەوتێك بەدەست بهێنن. شا وتی هەر دو وڵاتی ئێران و عێراق بەرهەمهێنەری نەوتن و سەرچاوەی ئاوی هاوبەشیان هەیە کە دەبێ بە

[1] سەرچاوە: ئیدارەی ئارشیف و تۆمارکراوە نیشتمانیەکان، POL IRAN – IRAQ ، نهێنی . ناردراوە بۆ ئانکارا، بەغداد، جەددە و لەندەن.

شێوهیهكی یهكسان كهڵكی لێوهربگرن. ههروهها كۆمهڵگای شیعه له عێراق پهیوهندییهكی نزیكی ههیه له گهڵ شیعهكانی ئێران و هتد.

٣ـ كێشهی كورد: شا وتی نایهوێت له ڕێگای كاركردن دژی كوردهكانی عێراق، كوردهكانی ئێران بكات به دوژمنی خۆی و وتی كوردهكان" ئاریایی رهسهنن " كه رهگهزی ئێرانیهكانه. خاڵهكهی شا ئهوه بوو كه كێشهی كوردهكان له عێراق، كێشهی ناوخۆیی عێراقه كه له ڕێگای قوربانی كردنی كوردهكان چارهسهر ناكرێت و ناكرێت بنێردرێته ناو ئێرانیش.

٤ـ مهسهلهی "شهتولعهرهب": شا وتی ههرچهند گرنگه كه كهڵك له ناكۆكیهكهی له گهڵ عێراق وهربگرێت بۆ چارهسهركردنی كێشهی "شهتولعهرهب"، بهڵام ئهمه ئامانجی روونی ئێران نییه و وتی ئهم كێشهیه ریشهیهكی دهیان ساڵهی ههیه و ئێران دهتوانێت چهند ساڵێكی دیكه چاوهڕوان بكات. له راستیدا له ماوهی چهند ساڵی داهاتوو بههۆی گهشه كردنی بهندهرهكانی ئێران له كهنداوی فارس، ئێران هیچ پێویستییهكی به "شهتولعهرهب" نامێنیٚ.

شا وتی كاتیٚ كه كهشتییهكان دێن بۆ بهندهرهكانی ئێران، عێراقیهكان كێشهیان بۆ ساز دهكهن و باری ئابووری راگرتنی دهریاوانی "شهتولعهرهب" زیاد دهكهن. شا له ههمان كاتدا ئاماژهی بهوه كرد كه كاربهدهستانی عێراق له داهاتوودا سهردانی ئێران دهكهن و هیوای خواست ئهوانیش بهشێك لهم باری ئابوورییه بگرنه ئهستۆ و "شهتولعهرهب" له نێوان خۆیاندا دابهش بكهن. بهههرحاڵ شا ئهوهی وهبیرهێنایهوه كه بیٚ ئهنجامدانی گفتوگۆ، مهسهلهی ناكۆكیهكانی "شهتولعهرهب" دهبیٚ به سهرچاوهی كۆمهڵێك كێشهی بیٚ كۆتایی له نێوان ههر دوو وڵاتدا.

٥- پێشهاته‌کانی ئه‌م دواییانه: ئاماژه به گفتوگۆ تیروته‌سه‌له‌که‌م (تیلیگرامی ١٠٣٤ ی بالۆێزخانه*) له‌گه‌ڵ "حه‌سه‌ن دوجه‌یلی[2]"، باڵوێزی نوێی عێراق له ئێران:

من به "شا"م وت هه‌ر چه‌ند ئه‌م دۆسته‌م به ماوه‌ی ١٨ ساڵ نه‌بینیوه به‌ڵام وه‌بیرم دێت دۆستێکی زۆر راستگۆ و یه‌کدڵ بوو. هه‌روه‌ها به (شا)م وت "دوجه‌یلی" منی دڵنیا کردووه‌ته‌وه که هیچ ده‌وڵه‌تیکی عێراق ناتوانێت له ژێر زه‌خت و زۆردا گفتوگۆ له‌سه‌ر مه‌سه‌له‌یه‌کی وه‌ك "شه‌تولعه‌ره‌ب" بکات. وادیاره "دوجه‌یلی" به‌ته‌واوی به په‌رۆشه که گرژییه‌کانی نێوان ئێران و عێراق که‌م بکاته‌وه و په‌یوه‌ندییه‌کانی هه‌ر دوولا پته‌و بکات.

٦- ره‌خساندنی ده‌رفه‌تێك بۆ "به‌زاز": هه‌روه‌ها که هێماکان نیشان ده‌دات له کاتێکدا که ده‌وڵه‌تی عێراق هێشتا رێگایه‌کی درێژی له‌به‌ره بۆ ئه‌وه‌ی بتوانێ بگات به ئامانجه پاك و شیاوه‌کانی سه‌رده‌می پێش ١٩٥٨ ، من پێموایه "به‌زاز"( که ئێستا له سه‌ر کورسی ده‌سه‌ڵاته له عێراق) تا راده‌یه‌ك خۆی باش نیشان داوه و ئێرانیه‌کان ده‌بێ ده‌رفه‌تێکی باشی پێبده‌ن. شا رازی بوو به‌مه و ئاماژه‌ی به‌وه کرد که له‌وکاته‌وه که ده‌وڵه‌تی "حیزبی کار" له به‌ریتانیا گه‌یشتووه به ده‌سه‌ڵات، به به‌رپرسیاره‌تیه‌کی زۆرتره‌وه ره‌فتاری کردووه (زۆرتر له‌وه‌ی که له راگه‌یاندننامه‌کانیدا پێش له گه‌یشتن به ده‌سه‌ڵات چاوه‌روان ده‌کرا).

هه‌روه‌ها تێگه‌یشتنی شا له رابردوو باشتر ببوو ده‌رباره‌ی ئه‌وه‌ی که "به‌زاز" و جێگری سه‌رۆك کۆماری عێراق حه‌تمه‌ن عه‌بدی میسر نین به‌ڵام وتی "عارف"

---

* به‌رواری ١٩ ی کانوونی دووه‌م (هه‌مان سه‌رچاوه)

[2] Hassan Dujaili

لایەنگری (ناصر)ه و شێتە. پاشان ئاماژەی بە دۆستە عێراقیەکانی میسر کرد. هەروەها هاوڕا بوو لەگەڵ ئەوەی کە تەنانەت ناصر دەبێت لەوە تێبگات کە عێراق دەتوانێت لە سوریا کێشە خولقێنەرتر بێت .

٧ـ بەرنامەی ٣ خاڵی: شا وتی ئێران هەوڵی داوە لە رێگای قبولکردنی پێشنیارە ٣ خاڵییەکەی "بەزاز" نیوەی ئەو هەنگاوانە هەڵبگرێت کە لە ئەستۆیەتی بەڵام وتی ئەم بەرنامە ٣ خاڵییە دەبێ دوو لایەنە بێت و ئێران نایەوێت عێراقیەکان واتێبگەن کە پەرداختکردنی(دانی) پارەی قەرەبوو کردنەوە(کە دەبێ کومیسیونێکی لێپرسینەوەی، هاوبەش بریاری لەسەر بدات) هەموو ناکۆکیە سەرەکیەکانی ئێران و عێراق چارەسەر دەکات و دەبێ دەرگای گفتوگۆ لەسەر کێشەکانی دیکە وەك کێشەی "شەتولعەرەب" و دابەشکردنی سەرچاوەکانی ئاو(کە ٦٥٪ ی لە خاکی ئێران سەرچاوە دەگرێت) کراوە بێت.

٨ـ هەڵسەنگاندەن: من وای بۆ دەچم کە شا پێش سەفەر بۆ دەرەوە، دەوڵەتەکەی دڵنیا دەکاتەوە کە ئێران هیچ هەنگاوێك هەڵناگرێت بۆ سەرهەڵدانەوەی گرژییەکانی ئێران و عێراق. کێشە درێژخایەنەکان(هەم مەسەلەی یارمەتی ئێران بە کوردەکان و هەم مەسەلەی "شەتولعەرەب") بە چارەسەرنەکراوی دەمێننەوە بەڵام بریاردان لەم پەیوەندییەدا ئێستا پێویست نییە. مەبەستی من لە دەربڕینی بۆچوونەکانم ئەوە بوو کە شا تەشویق بکەم وەزیرەکانی دڵنیا بکاتەوە کە دەیەوێت بارودۆخەکە لە کاتی نەبوونی خۆی ئارام بێت.

مایێر[3]

[3] MEYER

(١٩٦٤ ـ ١٩٦٨ ، بەرگی XXII ، لاپەڕەی ٣٢٤ ـ ٣٢١)[١]

١٧٨ـ نامەی باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران(بەڕێز مایەر[٢]) بۆ جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی نزیك و باشووری ئاسیا(بەڕێز هارێ[٣])

تاران، ٢٢ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦

نهێنی

بەڕێز (رای[٤]) ی ئازیز

ئەم پاراگرافانەی خوارەوە هەڵسەنگاندنی باڵوێزخانەیە لە بارودۆخی ئاسایشی ناوخۆی ئێران کە بەگوێرەی رێنوێنییەکانی IRG ـ NEA (ئەیرگرامی ١١ ـ A ی وەزارەتی دەرەوە لە بەرواری ٢١ ی تەموز) ئامادە کراوە. شایانی ئاماژەپێکردنە کە لە مانگی تشرینی یەکەمی رابردوو ـ کە ئێمە دوایین راپۆرتی فەرمی خۆمان دەربارەی بارودۆخی دژەراپەڕین لە ئێران تەسلیم بە ئێوە کردووە(٢٨١ ـ A ، ٢٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥) ـ تا ئێستا بارودۆخەکە ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە.

---

[١] سەرچاوە: وەزارەتی دەرەوە، فایلەکانی NEA/IRN Files: Lot 70 D 330 ، ئێران،١٩٦٦، نهێنی. یادداشتێکی دەستنووس نیشان دەدات کە ٢٧ی ئوکتۆبر گەیشتووە بە وەزارەتی دەرەوە.

[٢] **Meyer**

[٣] **Hare**

[٤] Ray

بەهەرحاڵ جموجۆڵەکان بۆ چارەسەرکردنی راپەڕینی کورد لە عێراق لە ئەمساڵ و دەرکەوتنی کۆمەڵێك هێما و نیشانە ـ دەربارەی ئەوە کە ژمارەیەکی رۆژبەرۆژ زیاتر لە تکنیسیەنەکانی سۆڤیەت کاروباری ئاسایش لە ئێران ئەنجام دەدەن و چاودێری کاریگەر دەکەن بەسەر بارودۆخەکەدا ـ نیشان دەدات کە پێدەچێت کۆمەڵێك گیروگرفتی درێژخایەن دروست بێت. هەروەها بەرەوپێشچوونێکی نەرێنی بەدی دەکرێت بۆ بە فەرمیناسینی یەکینەکانی دژەراپەڕینی سوپای ئێران(CIC) کە تا ئێستا وەك کاریگەرترین هێزی دژەراپەڕین لە دەوڵەتی ئێران لە قەڵەم دەدرێت کە بەهەرحاڵ پێویستی بە لێکدانەوەی ورد و بەردەوام هەیە.

........

بەهەرحاڵ کۆمەڵێك هێما و ئاماژە هەیە دەربارەی زیادبوونی چالاکی کوردەکانی ئێران. چارەسەربوونی راپەڕینی کورد لە عێراق لەسەر بنەمای وتووێژ لە مانگی حوزەیرانی رابردوو، بەگشتی لە لایەن کوردەکانی ئێرانەوە پێشوازییەکی باشی لێکراوە. بەهەرحاڵ کۆتاییپێهاتنی ناکۆکیەکانی(کوردەکانی عێراق و حکومەتی عێراق ـ وەرگێڕ) گرووتینی ناسیونالیستی شاراوە لەناو ئەم گروپە کەمینەیە(مەبەستی کوردەکانی ئێرانە ـ وەرگێڕ) گەرموگوڕتر دەکات چونکە چاوەڕوان دەکرێت کوردەکانی عێراق کۆمەڵێك قازانج و سوودی تایبەت لە قبوڵکردنی ئاگربەست بە دەستبهێنن.

ئەم بەریانە بە باشترین شێوە لەو شتەدا رەنگ دەداتەوە کە سەرچاوەکانی باڵوێزخانە وەك "زیادبوونی گشتی چالاکی سیاسی"، بەتایبەت لە نێو گروپە کوردەکان لە ناوچەی مهاباد وەسفیان کردووە. وادیارە دەوڵەتی ئێران بە وریاییەوە چاودێری دەکات

بەسەر ئەم بارودۆخە ناسەقامگیرەدا و دەیەوێت بزووتنەوەی بەرخۆدانی نیشتمانی(NRM) زیندوو بکاتەوە. بەهەرحاڵ تا ئێستا ئێمە هیچ نیشانەیەکمان نەبینیوە کە سیاسەتی دەوڵەتی ئێران بەنیسبەت کوردەکان ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆی بەسەردا هاتبێت.

هەرچەند هەندێ لە رێبەرانی عێراق بەردەوام بە پێچەوانەی ئێمە بیر دەکەنەوە، بەڵام دەوڵەتی ئێران دەستی لە یارمەتی سەربازی بە کوردەکانی عێراق کێشاوە و سنووری عێراق و ئێرانی لە ناوچە کوردنشین داخستووە. ئێستا ـ هەرچەند کە وەك رابردوو قاچاقچیتی و چەتەگەری روو دەدات ـ بەڵام کوردستانی ئێران ئارامە.

ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەنین کە لەداهاتوویەکی نزیکدا جۆرە چالاکیەکی سیاسی لە نێو کوردەکانی ئێراندا پەرەبسێنێت کە بتوانێ کاریگەرییەکی زۆر توند لەسەر کوردستانی ئێران دابنێت، و رێکخراوە ئاسایشیە ناوەندەییەکانی ئێران بە تەواوی دەتوانن هەموو بارودۆخێك لەداهاتوودا کونترۆڵ بکەن. هاوکات لەگەڵ ئەوەی هێزەکانی ئاسایشی ئێران وادیارە دەتوانن هەر چەشنە چالاکیەکی سیاسی لە داهاتوودا لە کوردستان کونترۆڵ بکەن، بەڵام لە شوێنەکانی دیکەی ئێران کۆمەڵێك گیروگرفتیان هەیە.

لە ئێستادا، گەورەترین کێشەی ئاسایشی ئێران، کێشەیەکی درێژخایەنە. هێزەکانی ئاسایشی ئێران روونە کە ناتوانن زیادبوونی ژمارەی تکنیسیەنەکانی سۆڤیەت لە ئێران بخەنە ژێر چاودێری توند. ژمارەی تکنیسیەنەکانی سۆڤیەت لە ئێران کە لە بەشی(پیشەسازی) تاواندنەوەی ئیستیل، بۆری و پرۆژەکانی دیکەدا کار دەکەن، نزیکەی ٦٠٠ کەسە کە لەوانەیە ژمارەیان زیاتر بێت. بەهەرحاڵ ئێرانیەکان کۆمەڵێك

هەنگاوی ئیداریان هەڵگرتووە بۆ ئەوەی باشتر و زۆرتر جموجۆڵەکانی کاربەدەستانی سۆڤیەت لە بنکە کەم و زۆر هەمیشەییەکانیان لە ئێران کونترۆڵ بکەن.

هەروەها باڵوێزخانەی(ئەمریکا) بیستوویەتی کە کۆمەڵێك بەڵگەنامە دەربارەی چالاکیە گوماناوییەکانی سۆڤیەتیەکان لەسەر مێزی شا کۆ بووەتەوە. بە باوەڕی ئێمە، هێزەکانی ئاسایشی ئێران بەتایبەت پەیوەندییەکانی نێوان تکنیسەنەکانی سۆڤیەت و کومونیستەکانی ئێرانیان(ئەگەر پەیوەندییەك لە ئارادا بێت) بە وریاییەوە خستووەتە ژێر چاودێری.

لەگەڵ ڕێزمدا

ئارمین [°]

° ARMIN

## کوردەکان: ڕۆڵە هەتیوەکانی جیهان
## ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٧٩- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز " داسشێل [١] ":

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران ، لە چوارچێوەی قەیرانی هەنووکەی ئێران کە دیپلۆماتەکانی ئەمریکا بە بارمەتە گیراون ، بە بیروبۆچوونی من ئەوە گرینگە کە بزانین هەموو خەڵکی ئێران لە گەڵ بیروبۆچوونە ژەهراوییە دژە ئەمریکاییەکانی "ئایەتوڵا خومەینی"دا نین ، بەتایبەت کەمینەی کورد لە باکووری ڕۆژئاوای ئێران . لە ڕاستیدا هەر ئێستا کوردەکان شەڕی مان و نەمان دەکەن لە گەڵ "خومەینی" و گرووپە خوێنمژە توندئاژۆکانی . کوردەکان لە ساڵانی ڕابردوودا لایەنگری ئەمریکا بوون و هەرچەند سۆز و هەستیان بە هۆی کۆتاییپێهاتنی یارمەتی ئەمریکا بە خەباتەکەیان بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان لە چەند ساڵی ڕابردوودا کەم بووەتەوە ، بەڵام هێشتا کورد وەك هێزێکی گرینگ لە ئێراندا ماوەتەوە . ئێستا کاتی ئەوە هاتووە هەڵە و ڕەفتارە نادادپەروەرانەکانی ڕابردوومان سەرڕاست بکەینەوە و لاپەڕەیەکی نوێ لە گەڵ کورد لە ئێران بکەینەوە .

کورد کە گەلێکی زۆر چارەڕەشە، پتر لە یەك سەدەیە بۆ کوردستانێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی خەبات دەکات و بە درێژایی چەند سەدە تووشی داگیرکاری و سەرکووت

---

[١] Mr. DASCHLE

بووهتهوه : سهرهتا له سهر دهستی یۆنانییهکان ، پاشان له سهر دهستی مهغۆڵهکان و تورکهکان و بهریتانییهکان .

باشترین راپۆرت سهبارهت به مێژووی تاریکی ئهم دواییانهی کورد ، وتارێکه که ١٦ی ئهیلوول له رۆژنامهی "واشنگتۆن ستار" له لایهن "ئیسمیت هێمپستۆن"[٢] " بڵاو بۆتهوه که رۆژنامهنووسێکی دانیشتووی واشنگتۆنه که هاوینی ١٩٧٤ لهگهڵ پێشمهرگهکانی مهلا مستهفا بارزانی له عێراقدا بووه . هاوکات بارزانی بههاری رابردوو له واشنگتۆن کۆچی دوایی کرد . بهداخهوه رێبهرایهتی بارزانی و ههڵوێسته لایهنگرانهکانی به نیسبهت رۆژئاوا له کیسمان چوو.

[٢] Smith Hempstone

رهوشی خراپی كورد ژینۆسایدمان وهبیر دێنێتهوه

٦ی كانوونی یهكهمی ١٩٨٢ = ئهنجوومهنی پیران

بهڕێز "پرۆكزماییر":

بهڕێز سهرۆكی ئهنجوومهن، له ٢٤ی تشرینی یهكهمی ١٩٨٢ رۆژنامهی "نیۆیۆرك تایز" نامهیهكی بڵاو كردهوه كه بۆ سهرنووسهری رۆژنامهكه نێردرا بوو و باسی رهوشی خراپی كوردی دهكرد. ئهم نامهیه له وهڵامی ئهو شرۆڤهیه نووسرا بوو كه" وینسێنت كانبی[١] " له ٦ی تشرینی یهكهمی ١٩٨٢ سهبارهت به فیلمی "یوول" بڵاوی كردبووهوه . فیلمی سینهمایی "یوول" بهسهرهاتی جوانێكی كوردی دهگێڕایهوه كه ئیزنی پێدرابوو بۆ چهند رۆژێك له بهندیخانهوه بگهڕێتهوه ماڵ و بینیبووی گوندهكهیان به دهستی هێزه توركه دژهكوردهكان خاپوور كراوه . نووسهری نامهكه "وێرا بیۆدین سهیدپوور[٢]" ستایشی دهرهێنهری فیلمهكه ، "یلماز گونای" كردبوو ههم به بۆنهی ئهوهی كه بارودۆخی كولتووری كوردی له گهڵ رۆژئاوا بهراورد كردبوو و ههم به بۆنهی ئهوهی ئامرازهكانی سهركوتی له توركیای ئهمڕۆدا نیشاندابوو . له نامهكهی دا نووسهر ههروهها ههوڵهكانی دهوڵهتی توركیای نیشان دابوو بۆ له ناوبردنی ناسنامهی كورد و دهیگوت توركهكان ٨تا١٠ میلیۆن كورد له وڵاتهكهیان به فهرمی ناناسن . نووسهر ههروهها ئاماژهی به راپۆرتێكی رێكخراوی

---

[١] Vincent Canby
[٢] Vera Beaudin Saeedpour

لێبووردنی نێونەتەوەیی کردبوو کە بە گوێرەی ئەوە کۆمەڵناسی تورك، ئیسماعیل بیشکچی بە ماوەی ١٠ ساڵ خراوەتە بەندیخانە بە تاوانی ئەوەی وتوویەتی کورد گرووپێکی ئەتنیکی جیاوازە . هەروەها نووسەر ئاماژەی بەوە کردبوو کە تورکیا تەنها ولاتیك نییە کە کورد سەرکووت دەکات. راستە تورکیا شوێنێکی ترسناکە بۆ کورد بەلاّم ئێران و سووریا و عێراقیش بە هەمان ئەندازە ترسناکن و تەنانەت لە دەرەوەش گەلیّ لە کوردەکان بێدەنگن ، بە هۆی کە لە تۆڵەسەندنەوەی ئەم دەوڵەتانە لە بنەماڵەکانیان لە ناوخۆی ولات دەترسن .

بەرێز سەرۆکی ئەنجوومەن، ئەم نامەیە ئەوەمان وەبیر دەهێنێتەوە کە ئازار و ئەزیەتی ترسناکی ئەتنیکی لە سەرانسەری جیهاندا روودەدات . بەداخەوە ئەوەشمان وەبیر دەهێنێتەوە کە بواری ژینۆساید هێشتا لە جیهانی ئەمرۆدا هەیە و هەرچەند کە ئەمریکاییەکان لەم سەرکوتانە بێزارن بەلاّم گەلەکەمان هەرچی لە دەست هاتووە نەیکردووە بۆ کۆتایی پێهێنانی ئەم کردەوە دزێوە .

بەرێز جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن، لە ساڵی ١٩٦٧وە من بەردەوام داوام لە ئەنجوومەنی پیران کردووە کۆنوانسیۆنی سزادان و پێشگیری لە ژینۆساید پەسەند بکات . لە کاتێکدا کە ئەم گەلالّەیە لە ئەنجوومەنی پیران دا ماوەتەوە ، زیاتر لە ٨٠ ولات ئەم کۆنوانسیۆنەیان پەسەند کردووە . بە کەمتەرخەمی لە پەسەندکردنی ئەم کۆنوانسیۆنە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناتوانیّ هەڵبسێت بە جێبەجیّ کردنی ئەرکی نێونەتەوەیی خۆی وەك رێبەرێك لە بواری مافی مرۆڤدا . لە روانگەی مافی مرۆڤەوە ، گرینگی ئازاردانی گرووپە رەگەزی ، ئایینی و ئەتنیکییەکان لە مافی ژیان کەمتر نییە.

لە کاتێکدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خۆی لە پەسەندکردنی ئەم پەیماننامەیە دەبوێرێ ، هەزاران کەس لە گەڵ هەڕەشەی لە ناو چوون رووبەڕوون . ئێمە ناتوانین لەمە زیاتر چاوەڕوان بین . داوا لە ئەنجوومەنی پیران دەکەم هەر ئێستا دەست بە کار بێت .

## ئێش و ئازاری ئاوارە کوردەکان لە تورکیا
## ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٩٠ — ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "جان ئێدوارد پۆرتێر"[١]:

ئێش و ژانی ئاوارە کوردەکان لە تورکیا هەروا بەردەوامە . ئەوە دوو ساڵە ٧٠هەزار کورد لە ترسی چەکە کیمیاییەکانی سەدام حوسەین هەڵهاتوون و بەداخەوە رەفتاری تورکیاش لە گەڵیان لە رەفتاری عێراق زۆر باشتر نییە . راپۆرتە هەواڵیەکان نیشان دەدەن کە کەمپی ئاوارە کوردەکان لە بارودۆخێکی خراپ دایە ، پێداویستییە سەرەکییەکان دابین ناکرێت ، هەلی کار کردن بۆ کوردەکان نییە ، گۆشەگیر کراون و بە هۆی ئەوەی کە کاربەدەستانی تورکیا مافی پەنابەریان نەداوە بە کوردەکان ، لە بارودۆخێکی زۆر نالەباردا دەژین .

هەوڵە نێونەتەوەییەکان بۆ درووست کردنی خانوو بۆ ئاوارەکان لە لایەن تورکیاوە رەت کراوەتەوە . وادیارە سەرۆك "تۆزاڵ" دەیەوێت کوردەکان بگەڕێنەوە بۆ عێراق . ئەگەر شتێکی وا روو بدات بێگومان لە گەڵ ئازار و ئەزیەتی زۆرتر رووبەڕوو دەبنەوە .

ئاوارەکان لە تورکیا دەبێ دەستیان بگات بە رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی ئاوارەکان و بە شێوازی گونجاو بپارێزرێن. هەروەها ئێمە دەبێت پێداگری بکەین لە سەر ئەوەی کە عێراق ، ئێران و تورکیا بە تەواوی رێز لە مافی هاووڵاتییە کوردەکانیان بگرن .

---
[١] JOHN EDWARD PORTER

## ئاوارە کوردەکانی عێراق لە تورکیا بەردەوام لە سەختیدا دەژین

## ۱۲ی تەموزی ۱۹۹۰- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "دیکۆنیسنی[1]":

من دەمەوێت نیگەرانی خۆم دەرببڕم بە نیسبەت رەفتاری تورکیا لە گەڵ ۳۰هەزار کوردی ئاوارەی عێراق کە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دەژین . ئەم خەڵکە چارەڕشە پێشتر لە سەر دەستی سەدام حوسەین ئێش و ئازاری زۆریان بینیوە . سەدام ئەوانی کیمیاباران کردووە ، کوشتووە و ئەوانەی کە لە کاول کردنی گوندەکان و خانووەکان رزگاریان بووە، دوورخستووەتەوە . لە بەر ئەوەی کە لە لایەن میدیاکانەوە سەرنجی کەمی پێدراوە، کەمتر کەسێك لە دەرەوەی کۆمەڵگای کوردستان دەزانێت لەم ناوچە دەستپێڕانەگەیشتووەدا چ روو دەدات . بە داخەوە ئەم رەفتارە دزێوە کە سووکایەتییە بە هەموو مرۆڤایەتی، بەردەوامە لە بەر ئەوەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دەوڵەتانی دیکەی رۆژئاوا ناتوانن گوشار بخەنە سەر رژێمی سەرەڕۆی عێراق.

پاش ئەوەی کە هەزاران کورد بە دەستی سەربازەکانی عێراق بە کۆمەڵ کوژران، هەزاران کەس هەڵاتن و پەنایان بۆ تورکیا برد، بەڵام بەهەرحاڵ لە تورکیاش لەگەڵ کۆمەڵێك کێشەی نوێ بەرەوڕوو بوونە، دەوڵەتی تورکیا ئەوانی وەك پەنابەر بە فەرمی نەناسی و ئەوانی وەك رێبوار ناوزەد کرد. ئەم رەفتارە بووە هۆی ئەوە کە

---

[1] Mr. DECONCINI

ئەوان لە کۆمەڵێك یارمەتی مرۆڤانە بێبەش بن . ئێستاش پاش ۳ ساڵ ئەم ڕێبوارانە لە کەمپەکانی باشووری تورکیا نیشتەجێن و دەوڵەتی تورکیا درێژە بە هەوڵەکانی دەدات تا ئەوان وەك نیشتەجێبووی کاتی لە رەوشێکی دژواردا بهێڵێتەوە . لە مانگی ئابی رابردوودا من و سناتۆر "لاتینبێرگ"[۲] "سەردانی یەکێ لەم سێ کەمپانەمان کرد کە بە نیسبەت کەمپەکانی دیکە دۆخەکەی باشتر بوو، ۳۰ تا ٤۰ کەس لە شۆقەیەکی ۳ ژووریدا بوون ، دۆخی پاك و خاوێنی خراپ بوو . ئاوارەکان نەیاندەتوانی کار بکەن. لەمە زیاتر دەوڵەت نەیدەهێشت منداڵە کوردە ئاوارەکان بە شێوازی فەرمی پەروەردە ببینن و ماندوویی و بێ هیوایی بە نیسبەت داهاتوو ، کەشوهەوای سەرکووت و بێ دەنگی و بێزاری بە سەریاندا زاڵ کردبوو .

لەم دواییانەدا، دەوڵەتی تورکیا پەیماننامەکەی خۆی لە گەڵ کۆمیسۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەنابەران (UNHCR ) هەڵوەشاندەوە کە بە گوێرەی ئەوە دەوڵەتی تورکیا دەبوو بە پەناگەی هەمیشەیی هەزاران ئاوارە. دەوڵەتانی سەرانسەری جیهان پارەیان تەرخان کرد بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژەی نیشتەجێ بوونی ئاوارەکان لە لایەن UNHCR و دەوڵەتی تورکیا . کۆنگرێس ٥٠ میلیۆن دولاری بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرد و وەزارەتی دەرەوە دەورێکی گرینگ و جێگای ستایشی بینی لە دابینکردنی هاوکاری.دەوڵەتانی دیکە لەم بوارە دا .

زێدەباری هەڵوەشاندنەوەی پرۆژەکە بە بێ هیچ پاساوێکی فەرمی، دەوڵەتی تورکیا هەروەها نەیهێشتووە یارمەتییە نێونەتەوییەکان بە کار ببردرێت بۆ باشتر کردنی رەوشی کەمپەکان . لەوە خراپتر ئەوەیە کە لە سەرەتای ئەمساڵەوە ، دەوڵەتی تورکیا

[۲] Senator Lautenberg

هاتووچۆی دیپلۆماتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وکارمەندانی UNHCR ی بۆ کەمپەکان بەرتەسك کردووەتەوە .

کاربەدەستانی تورکیا دەڵێن کوردەکانی عێراق لە لێبوردنەکەی سەدام حوسەین کەڵك وەربگرن و بگەڕێنەوە بۆ عێراق . ئاوارەکان دەڵێن دەوڵەتی تورکیا یارمەتییە نێونەتەوەییەکان نادات بە کەمپەکان بۆ ئەوەی ئاوارەکان ناچار بن بگەڕێنەوە بۆ عێراق. گروپەکانی داکۆکیکاری مافی مرۆڤ کە ئاگاداری رەوشی کەمپەکانن ، نیگەرانی خۆیان دەربڕیوە بەنیسبەت گەڕاندنەوەی زۆرەملی ئاوارەکان بۆ عێراق . ئەگەر ئەم ئاوارانە بگەڕێنەوە بۆ عێراق، مەترسی ئەوە زۆر جیدییە کە تووشی چارەنووسی برا و خوشکەکانیان بن کە کوژراون یان لە ماڵ و زێدی خۆیان دەرکراون . من مانگی ئابی پێشوو لە تورکیا گەڕاومەتەوە . تورکیا پشتیوانی بە هێزی ئێمەیە و پەیوەندی و بەرژەوەندی دوولایەنەمان پێکەوە هەیە و دۆستایەتییە لەمێژینەکەمان لە گەڵ ئەوان بەرز دەنرخێنم . بە درێژایی سەدەکان ، تورکیا ( هەروەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ) پەناگایەکی ئەمن بووە بۆ میلیۆنەها ئاوارە . لە راستیدا ، ساڵی ١٩٩٢ دەبێت بە پانسەدەمین ساڵیادی پێکهاتنی کۆمەڵگای جوولەکەکان لە تورکیا کە لە دەستی ئازار و ئەزیەتی ئایینی لە ئیسپانیا هەڵهاتبوون. دەوڵەتی تورکیا لە بەرامبەر هەر شتێکدا کە پەیوەندی بە کوردەکانی دانیشتووی باشووری رۆژهەڵاتی ئەو وڵاتەوە هەبێت ، کۆمەڵێك حیساباتی گرینگی سیاسی و ئاسایشی هەیە .

بە هەرحاڵ کردەوەکانی دەوڵەتی تورکیا بەنیسبەت ئاوارە کوردە.عێراقیەکان پێشاندەری جۆرێك هەستیاربوونە کە تەنها ناکۆکیەکانی ناوچە خراپتر دەکات . داوا

له دەوڵەتی تورکیا دەکەم بە رەفتاری خۆی له گەڵ ئاوارەکاندا بچێتەوە و هەرچی له دەست دێت بیکات بۆ ئەوەی پێشوازی لەم ئاوارانە بکات و بهێڵێت له ئازادی و هەلەکانی وڵاتی تورکیا چێژ وەربگرن .

## كورد ، تورك و قبرسییه‌كان : ئاژینی نوێی جیهانی، بۆ كێ [1] ؟
## ٧ی ئاداری ١٩٩١ــ ئه‌نجوومه‌نی پیران

به‌ڕێز" كرانستۆن[2]" :

به‌ڕێز جه‌نابی سه‌رۆكی ئه‌نجوومه‌ن، بۆ ئه‌و كه‌سانه له ئێمه كه چ پێش له داگیر كردنی كوێت له ٢ی ئاگۆست و چ پاش ئه‌وه دژی سه‌دام بوون ، بارودۆخی دژواری ٣میلیۆن كوردی عێراق جێگای تایبه‌تی خۆی هه‌بووه . زۆر كه‌م خه‌ڵك له مێژووی هاوچه‌رخدا هه‌یه كه به قه‌د كورد پشتگوێ خرابێ و زوڵمی سیستماتیكی لێ كرابێ . له ناوه‌ڕاستی ده‌یه‌ی ١٩٧٠ "هێنری كسینجێر" ی وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریكا و "شا"ی ئێران پشتیان له هاوپه‌یمانیه‌كه‌یان له گه‌ڵ كورد كرد و ڕێگه‌یان بۆ سه‌ركوتی خوێناوی ئه‌وان خۆش كرد .

له‌م ساڵانه‌ی دواییدا ده‌یان هه‌زار كورد له سه‌ر ده‌ستی سه‌دام و هێزه دڕه‌نده‌كانی خراونه‌ته به‌ندیخانه ، ئه‌شكه‌نجه كراون و كوژراون ، نیو میلیۆن كه‌س له زێدی شاخاوی باوباپیرانی خۆیان له كوردستان ده‌ركراون . له ژماره‌ی ئه‌مڕۆی ڕۆژنامه‌ی "واشنگتۆن پۆست" دا ئه‌فسه‌ری پێشووی خزمه‌تی بیانی، "ده‌یڤید أ كۆڕن[3]" وتارێكی تێروته‌سه‌لی سه‌باره‌ت به بارووده‌خی دژواری ئه‌م خه‌ڵكه له ژێرناوی

---

[1] KURDS, TURKS, AND CYPRIOTS: A NEW WORLD ORDER FOR WHOM?
[2] Mr. Cranston
[3] David A. Korn

"کوردەکانی عێراق پشتگوێ مەخەن ، سیاسەتێکی وەها هەڵە و کورتبینانەیە"
نووسیوە. "کۆڕن" دەنووسێت :
"کاتێ رێبەری کورد، جەلال تالەبانی لەم دواییانەدا سەردانی واشنگتۆنی کردووە
هیچ کەس لە کارمەندانی وەزارەتی دەرەوە یا کۆشکی سپی لە گەڵی دانەنیشتووە ،
دەوڵەتی ئەمریکا تەنانەت سەبارەت بە مافی مرۆڤیش قسەی لە گەڵ تالەبانی
نەکردوە و یاریدەدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری مافی مرۆڤیش لەگەڵ جەلال
تالەبانی دیداری نەکردووە . رێبەرانی دیکەی کوردی دانیشتووی واشنگتۆن بە
نیگەرانییەوە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە قسەکانیان تەنانەت لە ئاستی خواری
وەزارەتی دەرەوە بە هەند وەربگیردرێت" .
لە روانگەی "کۆڕن"ەوە(کە منیش لە گەڵ بیروبۆچوونەکەی ئەودام) ئەم بێدەنگییەی
حکوومەتی ئەمریکا بە هۆی پەیوەندییەکانی ئێمە لە گەڵ تورکیایە کە ئەویش
دەستی داوەتە شالاوێك بۆ سەرکوت کردنی خەڵکی کوردی وڵاتی خۆی . "کۆڕن"
هەروەها دەڵێت :
"دەوڵەتی تورکیا بە توندی لەوە نیگەرانە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا
ئەوەندە یارمەتی کوردەکانی عێراق بکات کە جۆرێك ئۆتۆنۆمی بەدەست بهێنن،
ئۆتۆنۆمییەك کە دەوڵەتی تورکیا نایدات بە هاوولاتیانی کوردی خۆی".
بەڕێز جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، هیچ کەس ناتوانێت حاشا لە گرینگی تورکیا
وەك ئەندامی ناتۆ یان یارمەتییەکانی ئەم دەوڵەتە لەم شەڕەی دوایی کەنداودا
بکات . بە هەر حاڵ پرسیارەکەی من ئەوەیە کە ئایا ئێمە تا ئێستا لە پەیوەندییە

نزیکەکانمان لە گەڵ تورکیا باسی ئەو پێشێلکارییە بەلگەمەندانەی مافی مرۆڤمان کردووە لە تورکیا یان داگیرکردنی بەردەوامی بەشێك لە قوبرس لە لایەن تورکیاوە .
سەرکەوتن لە کەنداوی فارس سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ یاسای نێونەتەوەیی بەلآم ئەوەندە کە نەتەوە یەکگرتووەکان دژی دەستدرێژی عێراق بۆ سەر کوێت دەنگی خۆی بەرز کردەوە ، ئەوەندەش پێویستە ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیارنامە دەربکات و داوا لە تورکیا بەکات لە قوبرس بچێتە دەرەوە . جیهان چاوەڕوانی ئەوەیە سەربازانی تورکیا لە دوورگەی قوبرس بچنە دەرەوە و ڕێز لە سەربەخۆیی و یکپارچەیی خاکی قوبرس بگیردرێت .
جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن داوا لە حکوومەتی ئەمریکا دەکەم بە گوێرەی ڕێوشوێنی یاسایی نێونەتەوەیی هەڵسوکەوت بکات . داواکارم دەستی دۆستی بەرەو لای کورد درێژ بکەین و لە هەمان کاتدا بە تورکیا بلێین کە جیهان چاوەڕوانی ڕێگاچارەیەکی دادپەروەرانەیە بۆ قوبرس .
جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن داوادەکەم وتارەکەی ڕۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست" و لێدوانەکەی ئەم دواییەی "پیتر گالبرەیس[٤]"، کارمەندی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران سەبارەت بە بارودۆخی دژواری کورد بخرێتە بەر دەستی هاوکارانم .
وتەکانی "پیتر گالبرەیس ":
"ئەمرۆ سەرنجی جیهان لە سەر دواین قوربانیانی سەدام حوسەین چڕ بووەتەوە واتا خەڵکی کوێت . بە هەرحاڵ کورد یەکەمین و درێژخایەنترین قوربانی سەدام بووە.

[٤] PETER GALBRAITH

به‌داخه‌وه زۆربه‌ی ئه‌و شتانه‌ی که به سه‌ر کورددا هاتووه له شوێنگه‌لێك رووی داوه که به هۆی سیاسی و جۆگرافیاییه‌وه ، میدیا جیهانییه‌کان ده‌ستیان پێی راناگات . من به کورتی به‌شێك له‌و نه‌هامه‌تیان ده‌خه‌مه روو که به سه‌ر ۳میلیۆن کوردی کوردستانی عێراقدا هاتووه" .

له په‌یوه‌ندی له گه‌ڵ کاروباری کۆمیته‌ی په‌یوه‌ندییه‌کانی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌نجوومه‌نی پیران سه‌باره‌ت به شه‌ڕی ئێران و عێراق ، من دوو جار سه‌ردانی کوردستانی عێراقم کردووه : ساڵی ۱۹۸٤ و ساڵی ۱۹۸۷ . له میانه‌ی ئه‌م دیدارانه‌دا توانیم ره‌فتاری زۆر خراپی ده‌وڵه‌تی عێراق له گه‌ڵ خه‌ڵکی کورد ببینم . له ساڵی ۱۹۸۸ بارودۆخی کورده‌کانی عێراق ، دوو جار دزه‌ی کرده ناو ویژدانی کۆمه‌ڵگای نێونه‌ته‌وه‌یی : یه‌که‌م جار له رێگای ئه‌و راپۆرتانه که سه‌باره‌ت به هێرشی کیمیایی بۆ سه‌ر شارۆچکه‌ی کوردنشینی هه‌ڵه‌بجه بڵاو بووه‌وه و جاری دووه‌م له‌کاتی کۆڕه‌وی به‌رفراوانی ئاواره‌کانی باکووری عێراق له مانگی ئه‌یلوول . ئه‌م ئاوارانه به سه‌رهاتی هێرشه کیمیاییه‌کانیان له‌لایه‌ن سوپای عێراقه‌وه ده‌گێڕایه‌وه .

له په‌یوه‌ندی له گه‌ڵ ئه‌و گه‌ڵاڵه یاسایه که سناتۆر " پێڵ " بۆ گه‌مارۆدانی ئابووری عێراق (به هۆی که‌ڵك وه‌رگرتن له‌چه‌کی کیمیایی دژی کورد ) ته‌سلیمی ئه‌نجوومه‌نی کردبوو کۆمیته‌ی په‌یوه‌ندییه‌کانی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌نجوومه‌ن داوای لێکردم به سه‌رۆکایه‌تی لێژنه‌یه‌ك ، سه‌باره‌ت به که‌ڵك وه‌رگرتنی عێراق له چه‌کی کیمیایی راپۆرت بده‌م و به‌ڵگه‌نامه کۆ بکه‌مه‌وه .

لێژنه‌ی راستی دۆزینه‌وه‌ی ئێمه به‌ڵگه‌نامه و نیشانه‌ی زۆری دۆزییه‌وه سه‌باره‌ت به‌وه‌ی که عێراق دژی خه‌ڵکی سڤیل ، چه‌کی کیمیایی به‌کار هێناوه له هێرشێکی

بەرفراواندا کە لە ٢٥ی ئابی ١٩٨٨ دەستی پێکردووە . ئامانجی ئەم هێرشە ، تێکشکاندنی بزووتنەوەی کورد بوو و گەیشتە ئامانجی خۆی .

ئەم هێرشە کیمیاییانە بەشێك بوو لە سیاسەتی سەربازی عێراق کە مەبەستی چۆڵ کردنی گەلێ لە ناوچەکانی کوردستانی عێراق بوو. هەندێك لە خاڵەکانی ئەم سیاسەتە بریتی بوون لە :

١ـ کاول کردنی گوند و شارۆچکەکانی سەراسەری کوردستان

٢ـ دووبارە نیشتەجێ کردنی خەڵکی کورد لە شوێنە نوێ بەکۆمەڵەکان کە لە ژێر چاودێری سەربازیدان

٣ـ دوورخستنەوەی کوردەکان بۆ شوێنەکانی دەرەوەی کوردستان

٤ـ بەکارهێنانی تاکتیکە تۆقێنەرەکان ، لەوانە گازی کیمیایی بۆ ئەوەی خەڵکەکە لەو شوێنانە کە دەبێ چۆڵ بکرێن ، بچنە دەرەوە .

ئەم سیاسەتە بە دڵرەقییەکی زۆرەوە جێبەجێ دەکرا و هیچ حیسابێك بۆ بیرورای جیهان و یاسای نێونەتەوەیی نەدەکرا . لیژنەی راستی دۆزینەوەی ئێمە بەو ئەنجامە گەیشت کە بە چەکی کیمیایی هێرش کراوەتە سەر ٤٩ گوند . ئێمە لە سەر ئەو بڕوایەین کە ژمارەی گشتی ئەو گوندانە کە بە چەکی کیمیایی هێرشیان کراوەتە سەر گەلێ لەوە زۆرترە . لە دوای هێرشی کیمیایی ، شاڵاوی سەربازی بەڕێوەچووە و ئەو کەسانە کە زیندوو مابوون یان نەیانتوانیبوو خۆیان بگەیەننە تورکیا بە کۆمەڵ کوژراون. بە گوێرەی ئەو گفتوگۆیانە کە ئێمە لە گەڵ خەڵکەکە دا ئەنجامان داوە ، دەتوانین بەراورد بکەین کە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ئەنجامی هێرشی کیمیاییدا و شاڵاوە سەربازییەکانی پاش ئەوە کوژراون و بریندار بوونە ، هەزاران کەسە .

بەهەرحاڵ زانیارییەكانی ئێمە تەنها لەو كوردانەی عێراق وەرگێڕاوە كە پەنایان بۆ توركیا هێنابوو . ئەگەر ئەو جۆرە شاڵاوە سەربازییانە كە لە ناوچە سنوورییەكاندا بەڕێوە چووە لە ناوچەكانی قوڵایی خاكی كوردستانی عێراقیش بەڕێوە چووبایا ، ژمارەی كوژراوە كوردەكان دەبوو بە دەیان یان سەدان هەزار كەس .

ژمارەی گشتی كوژراو بریندارەكان لە دەستی ئێمەدا نییە . ئێمە لە راستیدا بە دڵنیاییەوە نازانین لە ساڵی ١٩٨٨ەوە لە كوردستانی عێراق چی رووی داووە . سەربازە عێراقییەكان سنووری توركیا و عێراقیان لە سەرەتای ئەیلوولی ١٩٨٨ەوە داخستووە و بێ دەنگییەكی كوشندە بە سەر كوردستانی عێراقدا زاڵ بووە . لە هەفتەی كۆتایی مانگی ئاگۆست و هەفتەی سەرەتای مانگی ئەیلوولی ١٩٨٨ ، نزیكەی ٦٥هەزار كەس لە ناكاو سنووری عێراق و توركیایان تێپەڕاند . هەرچەند كە ئەم كەسانە لە گوندە جیاوازەكانی ناوچە شاخاوییەكانەوە هاتبوون بەڵام یەك جۆرە هێرشیان كرابووە سەر .

بە یارمەتیتان شتێك سەبارەت بە چۆنییەتی ئەم هێرشانە بڵێم . لە ئێوارەی رۆژی ٢٥ی ئاب ، فڕۆكە و هێلیكۆپتەرەكانی عێراق ، گوندەكانی ناوچەی زاخۆ، دهۆك و ئامێدییان بە چەكی كیمیایی بومباران كرد . بە وتەی یەكێ لە دانیشتووانی ئەم ناوچانە:

" فڕۆكەكان هەرجارێ ٤ تا٨ دانە بۆمبیان دەخستە خوارەوە . ئەم بۆمبانە كە بە "كانیستیری سەوز" [٥] ناسراون ، لە كاتی تەقینەوەدا دەنگێكی كەمیان هەبوو و پاش تەقینەوە هەورێك ئاسمانی شوێنەكەی دادەپۆشی كە رەنگەكەی سپی یا زەرد بوو .

---

[٥] green cannisters

پاشان بۆنی نوندی سیر ، پیوازی گهنیو ، سێو و جافهری(مهعدهنووس) له ناوچه بلاو دهبووه و ئهوانهی كه كهوتبوونه بهر كیمیایی ، بهرهبهره یان كتووپڕ دهمردن .
تهرمی مردووهكان وشك ببوو و ههندێ جار شین و رهش ببوو . ژیان و مهرگ پهیوهندی بهوهوه ههبووه كه كهسهكه له كوێ راوهستابوو و ئاراستهی با دهیگرت یا نا. له ناكاو هاواری دایكێكم بیست كه منداڵهكانی ۲۰ ههنگاو لهو لاتر مردبوون و خۆی هیچی لێ نههاتبوو" .
به وتهی ئهوانهی كه زیندوو ماون ، ئاژهڵهكان مردوون و پهلهوهرهكان له ئاسمانهوه كهوتوونهته خوارهوه . پاشان سهربازهكان جل و بهرگی تایبهتی دژه كیمیاییان له بهر كردووه و هاتوونه ناو گوند . له ههندێ شوێندا وهك گوندی" بازێ [٦]" ، هێزهكانی عێراق گوندنشینهكانیان داوهته بهر دهستڕێژی گووله و پاشان تهرمهكانیان له گۆڕه بهكۆمهڵهكاندا شاردۆتهوه و به بۆڵدیزر خاكیان كردووه به سهریاندا . ئهم وهسفكردنه تێكهڵێك بوو له سهدان گفتوگۆی ئێمه لهگهڵ ئاوارهكانی كهمپه سهرهكییهكان ( له توركیا) . گفتوگۆكان دوو ههفته پاش رووداوهكان ئهنجام دراون و ههموو چین و توێژێكی خهڵكی له خۆ گرتووه له كورده خهباتكاره چهكدارهكان( پێشمهرگه ) بگره تا ژن و پیاو و منداڵ . ئێمه كێشهمان نهبوو بۆ دۆزینهوهی شاهیدی رووداوهكان له بهر ئهوهی كه له راستیدا به بهراوردی من نیوه ههتا سێ له چواری ئاوارهكان ئهم رووداوانهیان به چاوی خۆیان بینیوه كهمن وهسفم كرد.
به گوێرهی سیستمی یاسایی ئێمه ، قسهكانی شاهیدانی عهینی باشترین بهڵگهیه . بههەرحاڵ كۆمهڵێك له نیشانه فیزیكییهكانی ئهم هێرشانه له سهر جهستهی

[٦] the village of Baze

ئاوارەکان دیار بوو . تیمێك لە پزیشکە ئەمریکاییەکان کە ئاوارە برینندارەکانیان بینیوە ، کۆمەڵێك لە نیشانەکانی چەکە کیمیاییەکانیان لە سەر جەستەی ئاوارەکان بینیوە . تیمێك لە تەلەفزیۆنی بەریتانیا بە سەرۆکایەتی "گوین رابێرتز" [٧] (کە پاشان فیلمەکەیان دەبینین ) چوونەتە ناو عێراق و پارچەی بۆمبە کیمیاییەکانیان لە ژێر خاك دەرهێناوە . کاتێ کە لە ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨ وەزیری دەرەوە ،" شۆڵتز" بەکارهێنانی چەکی کیمیایی (لە لایەن عێراقەوە ) شەرمەزار کرد ، بە وتەی چاپەمەنییەکان بە گوێرەی زانیارییە تەکنیکییەکانی بەردەست ئەم کارەی کرد. لە راستیدا لە کاتێکدا کە کێشەی وەڵامی گونجاو بە عێراق بە هۆی هێرشە کیمیاییەکانی لە نێوان ئەنجوومەنی پیران (کە خوازیاری گەمارۆدانی ئابووری عێراق بوو) و دەوڵەتی رەیگان ( کە بە هیچ شێوەیەك لە گەڵ ئەوەدا نەبوو هیچ کارێك دژی عێراق بکرێت) هەروەها بە توندی بەردەوام بوو ، هیچ جیاوازێکی بیروڕا لە سەر ئەو راستییە لە ئارادا نەبوو کە عێراق کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە .

بە یارمەتیتان دەمەوێت دوو خاڵی دیکە سەبارەت بە کەڵك وەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی کەمینەی کوردی خۆی زیاد بکەم : یەکەم ئەوە کە ئەم هێرشانە لە ٢٥ی ئابی ١٩٨٨ دەستی پێکردووە واتا ٥ رۆژ پاش جێبەجێ کرانی ئاگربەستی نێوان ئێران و عێراق . دووەم ئەوە کە ئامانجی ئەم هێرشانە تەنها کوردە شەڕوانەکان(مەبەستی پێشمەرگەکانە- وەرگێڕ) نەبوون . شەڕوانەکان لە مۆڵگەکانی خۆیان لە باکووری عێراق بوون کە سەرزەمینێکی وشکی بێ دار و بەرگە و رەنگە بنکەکانیان لە ئاسمانەوە دیاربن . بە هەرحاڵ رژێمی عێراق هێرشی کردە سەر

---

[٧] Gwynne Roberts

گوندەکانی نێو دۆڵەکان ، هەر بۆیە زۆربەی قوربانییەکان ژن، منداڵ و پیاوە سڤیلەکان بوون .

هێرشە کیمیاییەکانی عێراق زۆر توند بوو . عێراق دەیتوانی بە بێ کەڵك وەرگرتن لە چەکی کیمیایی و بە کۆمەڵ نەکوشتنی بێ گوناح ، بزووتنەوەی چەکداری کوردی سەرکوت بکا بەڵام لە باتی ئەوە دەوڵەتی عێراق خەڵکەکەی بە درِندانەترین و نامرۆڤانەترین شێوە سزا دا لە بەر ئەوە کە وەك نەیاری خۆی سەیریانی دەکرد .

کیمیاباران تەنها بەشێك لە سیاسەتی دژە کوردانەی عێراق بوو . لە کاتی سەفەرەکەی من بۆ عێراق لە ئەیلوولی ١٩٨٧ ، لە سەر جادەی بەغداد ــ جلەولا ، دەربەندیخان ، سلێمانی و کەرکوك ، ٤٠ گوندی کوردنشینم ژمارد کە لەم دواییانەدا کاول کرابوون . ئەم بەشەی خاکی کوردستان سەرزەمینێکی ترسناك بوو کە تەنها تیری داری کارەبا ، گۆرستان و باخە بێ خاوەنەکانی تێدا مابوو .ئەم گوندانە لە ناوچە دەستپێڕانەگەیشتووەکاندا نەبوون بەڵکوو لە سەر جادە سەرەکییەکانی کوردستانی عێراق بوون . کە وابوو کاول کردنی ئەم گوندانە هیچ پاساوێکی سەربازی نەبوو ، بەڵکوو تەنها نموونەیەکی دیکەی سیاسەتی سزادانی خەڵکی سڤیلی بێ گوناح بوو .

رێبەرانی کورد بەڵگەنامەی ئەوەیان خستۆتەڕوو کە ٣٨٩٧ گوند کاول کراون و هەزاران قوتابخانە و سەدان کلیسا و مزگەوتی کۆن رووخێنراون . خەڵکی ئەم گوندانە لە هەندێ کەمپ لە نزیکی شارۆچکەکان نیشتەجێ کراون کە لە ژێر چاودێری سوپای عێراقدان و هەندێ جار بۆ بیاوانەکانی باشووری وڵات دوور دەخرێنەوە کە زۆر لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان دوورن . من ناتوانم ژمارەی قوربانیانی ئەم سیاسەتە

مەزەندە بکەم بەڵام مەعقولـە ژمارەیـان زۆر بێـت . بەرنامــەی دەرکردنــی خـەڵك بەتایبەت دڵڕەقانە بوو و کولتووریکی دەوڵەمەند و کەوناری لە ناو برد .
سەرەنجام دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم کە کورد بووەتە قوربانی جۆرێك پێشێل کردنـی مافی مرۆڤ کە رووبەڕووی هەموو خەڵکی عێراق بۆتەوە . ئـەم کردەوانـە بـریتین لـە کوشتن ، ئەشکەنجە ، دەستبەسەر کردن بە بێ حـوکمی دادگـا و بێبـەش کـردن لـە ئازادییە بنەڕەتییەکان . یەکێ لـە کـردەوە نـوێ و تایبەتـەکانی دەوڵـەتی عێـراق ، ئەشکەنجە و کوشتنی منداڵەکانە بۆ ئەوەی دایك و باوکیان سزا بدات و  و گوشـاریان بخاتە  سەر. رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی بەڵگەنامەی ئەوەی لـە دەسـتدایە کـە بنەماڵەکان لە بەرامبەر وەرگرتنەوەی تەرمی پارچە پارچـە کـراوی مێرمنداڵـەکانیان پارەیان داوە بە دەوڵەت .
بە نیسبەت کوردەوە ، عێراق بە تـەواوی مرۆڤکـوژ بـووە. بـە هـەرحاڵ بـە گـشتی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بەرامبەر کاول کردنی کوردستانی عێراق و تەنانەت کەڵك وەرگرتن لە چەکی کیمیایی دژی خەڵکی سڤیلی بێ گوناح بـە پـارێزەوە کاردانـەوەی نیشان داوە . هەروا کە گەلێ لە ئێوە دەزانن ، لە ساڵی ١٩٨٨ کتوپڕ پاش وەرگرتنی راپۆرتی بەکارهێنانی بەرفراوانی چـەکی کیمـایی دژی کـورد ، سـناتۆر " پێـڵ " و سناتۆر" هێلمز" گەلاڵەنامەیەکیان تەسلیمی ئەنجوومەن کـرد بـۆ ئـەوەی کۆمـەڵێك گەمارۆی ماددی و ئابووری بخرێتە سەر عێراق. ئەم گەلاڵەنامەیە ( بەناوی پێشگیری لە ژینۆسایدی ١٩٨٨) یـەك رۆژ دواتـر لـە لایـەن ئەنجوومەنـەوە پەسـند کـرا (کـە کردەوەیەکی ئەوندە خێرا لە ئەنجوومەندا نموونەی نەبووە)  بەڵام بەداخـەوە نـەبوو بـە یاسا و بە هۆی بەرژەوەندییە ئابوورییە زۆر تایبەتەکانی ئەمریکا  دژایـەتی لـە گـەڵ

کرا و ئیدارەی رەیگان بە تەواوی دژی راوەستا و لە ئاکامی مانۆڕە پارلمانییەکانی رۆژی کۆتایی خولی ۱۰۰ی کۆنگرێسی ئەمریکا هەرەسی هێنا .

گەلاڵە یاسای پێشگیری لە ژینۆساید تەنها رووداوێك بوو کە لە جیهان دا قەوما بۆ ئەوەی وەلامێکی چڕوپڕ بدرێتەوە بە پێشێل کردنی مافی کورد و یاسای نێونەتەوەیی.لەم پەیوەندییەدا تەنها چەند ولات بوون کە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر چوونە پێش، لانیکەم شۆلتز ، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا هێرشە کیمیاییەکانی شەرمەزار کرد .

کاتێ کە سەدام حوسەین کوێتی داگیر کرد لە سەر ئەو بڕوایە نەبوو کە جیهان کاردانەوەیەکی ئەوەندە توند نیشان بدات . لەوانەیە یەکێ لە هۆکارەکانی ئەم شێوازە بیرکردنەوەیەی سەدام، بێ هەلۆێستی ئێمە بووبێ بە نیسبەت کیمیاباران کردنی خەلکی عێراق کە پێشتر سەدام دەیکرد .

ئێستا کە سەربەخۆیی کوێت دەستەبەر بووە هیوادارم یەکەمین و درێژخایەنترین قوربانییانی سەدام لە بیر نەکەین واتا کوردەکان . هەتا کاتێك دیکتاتۆرێك سەرکردایەتی عێراق بکات مافی کورد لە عێراق بە هیچ شێوەیەك دەستەبەر نابێت.

مانەوەی کولتووری کورد و تەنانەت مانەوەی فیزیکی کورد بەوە پەیوەستە کە بوار بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان خۆش بکرێت . کاتێك کە عێراق کەوتە ژێر چەتری پاراستنی زلهێزەکان(مەبەستی بریتانیایە- وەرگێر) ئۆتۆنۆمی کوردستان لە لایەن زلهێزەکانی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی و کۆمەلەی گەلانەوە گارانتی کرا بەلام بە هەرحال کۆمەلگای نێونەتەوەیی نەیویست و توانایی ئەوەشی نەبوو ئەم گارانتیانە جێبەجێ بکات . لەوانەیە لە باروودۆخی پاش شەڕی( کەنداوی فارس) گارانتی

نێونەتەوەیی دەستەبەر بکرێت لە نێو عێراقێکدا کە ڕێز لە مافی مرۆڤ و مافی سیاسی هەموو هاوولاتیانی عێراق بگرێت . ئۆپۆزیسیۆنی نایەکانگیری عێراق( لەوانە حیزبە سەرەکییەکانی کوردستان) لە سەر بەرنامەیەکی سیاسی دیموکراتێك بۆ عێراقی پاش سەدام ڕێککەوتوون . بە بیروبۆچوونی من ئەمە سەرەتایەکی هیوابەخشە . من لە سەر ئەو بڕوایەم کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی دەبێت هەرچی لە دەستیان دێت بیکەن بۆ ئەوەی ئالترناتیڤێکی دیموکرات لە عێراق پێکبێت ، ئالترناتیڤێکی وا باشترین هیوایە بۆ کورد .

من لە قۆناخی پاش هۆلۆکاست(شالاوی سووتاندنی جولەکەکان بە دەستی هیتلەر- وەرگێڕ) گەورە بووم و بە هۆی ئەوەی کە ئاگاداری ئەم ڕووداوە جیهانییە بووم باش لە بیرم دێت بیروڕای ئەوەی ئێمە ئەوە بوو کە نابێت شتێکی وا ئیدی قەد ڕوویدات . واتاکەی ئەوەیە کە ڕووداوێکی جەهەنمی وا نابێت جارێکی دیکە پشتگوێ بخرێت و سەرنجی پێنەدرێت .

هیچ کەس تراژیدیایەکی ئەوەندە گەورەی بە چاو نەبینیوە کە لە ئەیلوولی ١٩٨٨ ڕووی داوە و بێ ناونیشان ماوەتەوە . من وێنای زۆرم لەو ٥ ڕۆژە هەیە کە لە سنووری عێراق و تورکیا بووم : لە سەر شاخێکی بەرز ژنێك لە سەر کۆڵە کەلووپەلە بچووکەکەی دانیشتبوو کە هەموو دارونەداری بوو و بیری لە داهاتوویەکی بە تەواوی نادیار دەکردەوە . کەرەکان پاش ئەوەی لە لایەن خاوەنە ئاوارەکانیانەوە بەرەلا کرابوون بە توورەکەی پڕ زەرق وبەرقەوە سەرگەردان دەگەڕان ، پیرەمەردێك دەگریا لە بەر ئەوەی هەواڵی مردنی منداڵە گەورە و بچووکەکانی خۆی بیستبوو . ئەمانە

کۆمەڵێك وێنان کە تا ماوم قەد لەبیرم ناچێت . هیوادارم ئێمە نەهێڵین جارێکی دیکە ئێش و ژانگەلێکی وا بێ سەرنج و بێ وەڵام بمێنێتەوە.

## ۳۰ ی ئاداری ۱۹۹۲ – ئەنجوومەنی نوێنەران
## تراژیدیایی مافی مروڤ : رەفتاری تورکیا لەگەڵ کوردەکان

بەڕێز "برومفیلد"[1]، نوێنەری ئەیالەتی میشیگان:

جەنابی سەرۆك ، جیهان بەهۆی رەفتاری دڕندانەی سەدام حوسەین لەگەڵ کەمینەی کورد لە باکووری عێراق هەژا. ئێستاش جیهان راستیەکانی پێشهاتێکی تەنانەت هەژێنتر دەبینێ کە ئەویش سەرکووتی دڕندانەی کوردەکانە بەدەستی تورکیا کە (ئەندامی) ناتۆیە و هاوپەیمانی نزیکی وڵاتە یەکگرتووەکانە لە ناتۆدا.

لەماوەی چەند هەفتەی رابردوودا، هێزەکانی ئاسایشی تورکیا هێزێکی بەرفراوانیان بەکارهێناوە بۆ سەرکووتکردنی گریلا کوردە جیاییخوازەکان. لەداویین شەڕ لەگەڵ کوردەکان، یەکینەکانی سوپای تورکیا کەڵکیان لە پێداویستە سەربازییەکانی ئاڵمانیا وەرگرتووە. دەوڵەتی ئاڵمانیا کەڵکوەرگرتنی دەوڵەتی تورکیا لە پێداویستە سەربازییەکانی ئەم وڵاتەی دژ بە کۆمەڵگای کورد بەتوندی شەرمەزار کردووە و داوای لە کۆمەڵگای ئورووپا کردووە پێشێلکردنی مافی مروڤی کەمینەی کورد بەدەستی تورکیا پروتستۆ بکات.

ئاڵمانیا بەو شەرت ومەرجە سازوبەرگی سەربازی داوە بە تورکیا کە تەنها بۆ ئامانجی بەرگری لە ناتۆ کەڵك لەم سازوبەرگە وەربگرێت و ئێستا ناردنی چەك بۆ تورکیای هەڵواسیوە تا لێپرسینەوە و لێکولینەوە لەم رووداوە بکرێت. حیزبێکی نادەسەڵاتدار

[1] Mr. BROOMFIELD

له ئالمانیا بەناوی"حیزبی دیموکراتە ئازادەکان" داوای لەکۆمەڵگای ئەورووپا کردووە کە داواکاری تورکیا بۆ بەئەندامبوون لەو ڕێکخراوەیە ڕەت بکاتەوە.

پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) لەساڵی ١٩٨٤ ـ ەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ لە تورکیا هەوڵ دەدات و تا ئێستا پتر لە ٣٤٠٠ کەس لەئاکامی شەڕ لە نێوان هێزەکانی ئاسایشی تورکیا و کوردە جیاییخوازەکان کوژراون.

هەرچەند کە دەوڵەتی تورکیا کۆمەڵێك کێشەی ئەمنی هەیە کە دەبێ چارەسەری بکات، بەڵام هێزەکانی سەرەڕۆیی دەکەن و گەلێ لە سەربازە تورکەکان و یەکینەکانی پولیس دەستیان داوە بە کوشتنی نایاسایی، ئەشکەنجە و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ .

هەرچەند کە سەرۆك وەزیرانی نوێی تورکیا، "سولیمان دمیرل" بەڵێنی داوە ئەو رەفتارە هەڵانە قەرەبوو بکاتەوە کە لەگەڵ کەمینەی کورد کراوە، بەڵام وادیارە ئەویش بڕیاری داوە ئۆپەراسیونە سەربازییەکانی دژی کوردەکان زیاد بکات، لە باتی ئەوەی بۆ دوزینەوەی ڕێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ ئەم پێکدادانە درێژخایەنە، لەگەڵ کوردەکان وتووێژ بکات.

من بەتایبەت لەوە زیزم کە تورکیا جارێکی دیکە بۆ سەرکوتکردنی هاوولاتیانی خۆی لەو سازوبەرگە سەربازییە کەڵك وەردەگرێت کە لەپێناو ئامانجەکانی ناتۆدا پێیدراوە. ئەم کردەوەیە، بڕیاری ناخۆشی تورکیام وەبیردەهێنێتەوە بۆ کەڵکوەرگرتن لە چەکەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ داگیرکردنی تراژیدیکی قوبرس لەساڵی ١٩٧٤ ، ئەو داگیرکارییە کە تا ئەمڕۆ بەردەوامە.

## ٧ ی نیسانی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی پیران
## سیاسەتەکانی تورکیا بەرامبەر بە هاووڵاتیە کوردەکانی

بەڕێز دیکونسینی[1]:
جەنابی سەرۆك، من ئەمڕۆ دەمەوێت نیگەرانی خۆم دەربڕم دەربارەی بارودوخی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا کە لەم هەفتانەی دواییدا گەیشتووەتە ئاستی شەڕی ناوخۆ. سەرۆك وەزیرانی ئەم دواییە هەڵبژێردراوی تورکیا، "سولەیمان دمیرل" وتوویەتی کە چارەسەرکردنی بارودۆخی کورد، ئامانجی سەرەکی دەوڵەتەکەیەتی. "دمیرل" لەکاتی سەردانە گشتیەکەی بۆ ناوچەی کوردنشین لەساڵی رابردوو ئاماژەی بەهاوولاتیانی کوردی تورکیا کرد و بەڵێنی دا ئۆتۆنومیەکی کوولتووری فراوانتر و پێشکەوتنی زۆرتری ئابووریان پێبدات. دەوڵەتی بەڕێز "دمیرل" کەندوکۆسپەکانی سەر بڵاوبوونەوەی چاپەمەنیە کوردییەکان و کەڵکوەرگرتن لە زمانی کوردی لابردووە و هیوای دەربڕیوە کە زیادبوونی ئۆتۆنومی کوولتووری ببێتەهۆی کەمبوونەوەی پشتیوانی لە PKK کە هەوڵ دەدات بۆ دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ.
بەداخەوە هەوڵەکانی "دمیرل" بۆ ئارامکردنی بارودۆخی کورد، نەبووەتە هۆی کەمبوونەوەی ئالۆزییەکان و لە باتی ئەوە شەپۆلی نارەزایەتییەکی بەرفراوان لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا تەقیوەتەوە و ئاستی توندوتیژییەکانی نێوان هێزەکانی

[1] Mr. DECONCINI

ئاسایش و هێزهکانی PKK بهرز بووهتهوه و بووهته هۆی کوژرانی خهڵکی بێ گوناح که ئهمهش شتێکی قبووڵنهکراوه.

ئهم دواییانه ١٤ نوێنهری کورد بۆ پرۆتستۆکردنی سیاسهتی دهوڵهت بهرامبهر به هاووڵاتیه کوردهکان، له ئینتلافی دهسهڵاتدار له پارڵمانی تورکیا کشاونهتهوه. دهوڵهتی نوێی تورکیا و بهرنامه بهرفراوانه چاکسازه دیموکراتیهکانی ئێستا بههۆی ئاڵۆزی و شڵهژاوی بارودۆخهکه له باشووری رۆژههڵاتی تورکیا کهوتووه ناو مهترسی. هێرشه سهربازییهکانی تورکیا بۆ باکووری عێراق(که ئامانجی بنکهکانی PKKیه ) لهراستیدا بووهته هۆی کوژرانی خهڵکی مهدهنی که هیچ پشتیوانییهکیان له PKK نهکردووه. کردهوهکانی هێزهکانی ئاسایش دژی PKK بێ دهستپارێزان بووه و زیاتر دانیشتووانی کوردی هانداوه و سهراسهری ناوچهی ناسهقامگیرتر کردووه. هاوپهیمانی تورکیا له ناتۆ واتا ئاڵمانیا ئهم دواییانه ناردنی چهك بۆ تورکیای ههلواسیوه، لهبهر ئهوهی تورکیا ئهم چهکانهی بۆ هێرش دژی کوردهکان بهکارهێناوه. ئاڵمانیا رایگهیاندووه دهیهوێت مهسهلهی کورد له کونفرانسی ئاسایش و هاوکاری له هیلیسینکی بخاتهڕوو.

جهنابی سهرۆکی ئهنجوومهن، لهقازانجی ههموو لایهنهکاندایه که دهوڵهتی تورکیا لهکاتی بهرهنگاربوونهوه لهگهڵ PKK بهتهواوی دهست بپارێزێت. لهکاتێکدا که تورکیا و لهراستیدا ههموو دهوڵهتهکان مافی پاراستنی ئاسایشی هاووڵاتیان و یهکپارچهیی خاکهکهیان ههیه، بهڵام تورکیا له بهرامبهر ئهوه دهروهسه که مافی هاووڵاتیانی خۆی بپارێزێ. بهداخهوه ههر کاتێ که هێرشهکانی PKK زیاد دهبێت، بههۆی کردهوه توندوتیژهکانی هێزهکانی ئاسایشی تورکیا، مافی مرۆڤی خهڵکی

مەدەنی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا زیاتر پێشێل دەکرێت. ئەم کردەوانە بەتایبەت جێگای داخە، چونکە لە کاتێکدا ئەنجام دەدرێت کە بە رێبەرایەتی سەرۆك "دمیرل"، دەوڵەتی تورکیا کۆمەلێ هەنگاوی گرنگی هەڵگرتووە بۆ باشترکردنی مافی مەدەنی و مرۆڤی هاوولاتیانی.

ئەم رەوتە دەبێ بەردەوام بێ و چاکسازی دەبێ بە توندی لە هەموو ئاستەکانی دەوڵەت بەردەوام بێت. دەوڵەتی تورکیا دەبێ بەخێرایی و گڕوتینی زۆرترەوە، مافی مەدەنی و مرۆڤیی هاوولاتییەکانی بپارێزێ و ئەوە مسوگەر بکات کە هێزەکانی ئاسایشی تورکیا بەگوێرەی رەوتی جێکەوتووی دیموکراسی و نێونەتەوەیی رەفتار بکەن. توندوتیژی تەنها توندوتیژی دەهێنێت و پشتیوانی لە PKK زیاتر دەبێت، ئەگەر سەرۆك "دمیرل" هەنگاوی شێلگیرانە هەڵنەگرێت بۆ پاراستنی مافەکانی سەرجەم هاوولاتیانی تورکیا.

## حەواندنەوەی کوردەکان لە باکووری عێراق
## ١٢ی حوزەیرانی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" رەید[١]" :

جەنابی سەرۆك دوێنێ ئەنجوومەنی پیران رەزامەنـدی دەربـڕی لەگـەڵ بڕیارنامـەی ٢٩٩ی کۆنگرێس کە لەلایەن نوێنەری کۆنگرێس ، "جەیمز بیلـبرەی "یـەوە خرابـووە روو . ئەم بڕیارنامەیە داوا لە تورکیا دەکات رێکەوتنننامەی خـۆی لەگـەڵ ئـەمریکا پـاش حـوزەیرانی ١٩٩٢ درێـژ بکاتـەوە بـۆ ئـەوەی بنکـە سـەربازییەکانی وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشووری تورکیا وبنکەکانی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـە عێراق بێننەوە . هەروەها بڕیارنامەکە دەڵێت: "وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێ زۆر گرنگـی بـدەن بـەوەی قەناعـەت بـە عێـراق بهێـنن گـەمارۆ ئابوورییـەکانی سـەر بـاکووری عێـراق لاببـات و هـەروەها دەڵێـت وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ پشتیوانی لە یەکپارچەیی خاکی هەموو وڵاتانی ناوچە بکات" .

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کوردەکانی هاندا راپەڕین بکەن و پاشان لە بەرامبەر کۆمەڵکوژی سەدام بە تەنیا هێشتنییەوە و میلیۆنەها کورد ــ زۆرتر ژن و منداڵ ــ ناچار بوون لە ترسی هەڕەشەکانی سوپای عێراق لـە زێـدی خۆیـان ئـاوارە بـن. ئـەم ئاوارانە ئێش و ئازاری زۆریان بینی، برسێتی زۆریان کێشا .

[١] Mr. REID

سەدام کوردەکانی کیمیاباران کردووە و هەموو گوندەکانی خاپوور کردووە . ئەگەر ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتووەکان لە ناوچە بچنە دەرەوە دەبێ چاوەڕوانی کۆمەڵکوژی تەواوی کوردەکان بین .

لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکان و "شالآوی دابینکردنی ئاسایش"ەوە ، ئێمە توانیومانە پێش لە هێرشی گورگەکانی سەدام بگرین بەڵام کات کۆتایی پێدێت ، بەم زووانە کات کۆتایی پێدێت و دەبێ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەست بەکار بێت . ئەمە داواکاری مادی نییە یان داواکاری بۆ دەستێوەردانی سەربازی نییە ، بەڵکوو داواکاری بۆ ڕێبەرایەتی کردنە .

ئەم دواییانە کوردەکان ئاوات و ئارەزووی خۆیان بۆ دیموکراسی لە ڕێگای بەرێوەبردنی هەڵبژاردنێکی ئازاد و ساڵم و بە دوور لە توندوتیژی دەربڕی. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بەڵێنەکانی خۆی بە نیسبەت ئەم خەڵکە ئازادیخوازە جێبەجێ بکات ، هەربۆیە پەسەند کردنی بڕیارنامەی ۲۹۹ی دوێنێ زۆر گرنگە .

من ستایشی هەوڵەکانی بەڕێز "بیلبرەی" دەکەم بۆ وەبیرهێنانەوەی بەڵێنەکانی دەوڵەتی ئەمریکا و ناردنی پەیامێك بۆ خەڵکی هەژاری کورد . ئەمە کەمترین کارێکە کە ئێمە دەتوانین بۆ کوردەکان بیکەین .

## درێژکردنەوەی رێککەوتننامەی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش لە لایەن تورکیاوە
## ٨ی تەموزی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" شۆگ[1]" :

جەنابی سەرۆك، دەمەوێت لەم هەلە کەڵك وەربگرم بۆ ئەوەی سپاسی دەوڵەتی تورکیا بە گشتی بکەم بۆ درێژکردنەوەی ماوەی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش بۆ ٦ مانگی دیکە . هەروەها کە ئێوە دەزانن " شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش" بەرنامەیەکی نێونەتەوەییە کە دوابەدوای بەئەنجام گەیشتنی "شاڵاوی سەربازیی گەردەلوولی بیابان" بۆ پاراستن و یارمەتێدانی کوردەکانی عێراق دارێژراوە. هەروەها کە دەوڵەتی ئێمە داوای کردبوو، لە ٢٦ی حوزەیران بە ٢٢٨ دەنگی بەڵێ لە بەرامبەر ١٣٦ دەنگی نەخەیر ، پارلمانی تورکیا ئەم رێککەوتننامەیەی درێژ کردەوە.
جەنابی سەرۆك بەفەرمانی ئێوە من بە سەرپرشتی لێژنەیەکی دوو حیزبی ، ساڵی پار پاش کۆتایی پێهاتنی شاڵاوی سەربازیی گەردەلوولی بیابان (بۆ یارمەتیدانی کوردەکان) سەردانی ناوچەم کرد. بارودۆخی کوردەکان لە کاتی سەردانی ئێمە شڵەژاو بوو و بە تەواوی دیار بوو کە هیچ هەوڵێك بۆ یارمەتیدانی ئەم ئاوارانە بێ هاوکاری دەوڵەتی تورکیا سەرکەوتوو نابێت . ئەم پشتیوانییە هاتە دی و شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش بە سەرکەوتوویی توانی کوردەکان بپارێزێ و یارمەتیان بدات . پارلمانی تورکیا بە درێژکردنەوەی ئەم رێککەوتننامەیە بۆ ٦ مانگی دیکە ، جارێکیتر

[1] Mr. MCHUGH

نیگەرانی مرۆڤدۆستانەی خەڵکی تورکیای بە نیسبەت کوردەکانی باکووری عێراق نیشان دا .

## پیرۆزبایی له تورکیا بۆ درێژکردنەوەی کاتی شالآوی دابینکردنی ئاسایش
## ٩ی تەموزی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "بیلبرەی" :

جەنابی سەرۆك: لەم دەرفەتە کەڵك وەردەگرم و پیرۆزبایی لە خەڵکی تورکیا دەکەم بە تایبەت لە پارڵمانەکەیان (بە ڕێبەرایەتی سەرۆك وەزیران ، سولیمان دمیرل ) بۆ دەنگدانە بوێرانەکەی بۆ درێژکردنەوەی شالآوی دابینکردنی ئاسایش . بە ٢٢٨ دەنگی ئەرێنی لە بەرامبەر ١٣٦ دەنگی نەرێنی ، هێزە هاوپەیمانەکان ڕێگایان پێدرا شالآوی ئاسمانی خۆیان درێژە پێبدەن بۆ پاراستنی ئاسایش و ئەمنییەتی ئەو سەدان هەزار کوردە ئاوارەیە کە لە باکووری عێراق ماونەتەوە . ئەم دەنگدانە نیشانی دا کە تورکیا دەیەوێت ببێت بە شەریکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پەیوەست بێت بەو هێزانە کە لەگەڵ ئێمە دیموکراسی و سەقامگیری دەبەنە ناوچە . ئاگادار بوون لە بارودۆخی کوردەکان و هەوڵەکانیان بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی کوردەکان ، تورکیای کردووە بە ڕێبەری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستێکی دیموکرات و ئاشتیخواز .

جارێکی دیکە سپاسی خۆم و سەرجەم ئەندامانی کۆنگرێس- کە دەنگیان خستۆتە پاڵ دەنگی من بۆ پشتیوانی کردن لە خەڵکی کورد- پێشکەشی خەڵکی تورکیا دەکەم. من گەشبینم بە نیسبەت هاوکاری بەردەوامی دوو وڵاتی ئەمریکا و تورکیا و یارمەتیدانی تورکیا بە ئێمە بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە ودیمۆکراتیك بۆ داهاتووی کورد .

## درێژکردنەوەی رێککەوتننامەی شالآوی دابینکردنی ئاسایش هیوایەکی نوێ دەبەخشێ بە کوردەکان

## ٩ی تەموزی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز " گیلمان" ، نوێنەری ئەیالەتی" نیۆیۆرك" :

جەنابی سەرۆك، دوا بەدوای شەڕی کەنداو ، جیهان رووبەڕووی قەیرانی ئاوارەکان بوەوە واتا کاتێك کە کوردەکانی عێراق لە ترسی ئەوەی چارەنووسیان بەدەستی دیکتاتۆرێکی هەرسهێناو قۆربانی بکرێت بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا هەڵهاتن . لە وەڵامدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نیونەتەوەیی هەرێمیکی پارێزراویان لە باکووری عێراق پێکهێنا و کوردەکانیان هاندا بگەڕێنەوە زێدی خۆیان . وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە هاوکاری کۆمەڵگای نیونەتەوەیی ، دەستی بە هەوڵی حەواندنەوەی کوردەکان کرد کە بە "شالآوی دابینکردنی ئاسایش" ناسراوە. بۆ ئاسانکاری بۆ ئەم شالآوە دەوڵەتی تورکیا رەزامەندی خۆی لە گەڵ مانەوەی هێزە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشووری ئەو وڵاتە دەربڕی . ئەم بڕیارە بڕیارێکی قارەمانانەیە لە بەر ئەوەی لەوانەیە عێراق تۆڵە لە تورکیا بسێنێتەوە. ئەم رێککەوتننامەیە لە حوزەیرانی ١٩٩٢وە بۆ ٦ مانگی دیکە درێژ کراوەتەوە و بە هۆی ئەوەی کە سیستمی حکوومەتی تورکیا دیموکراسی پارلمانییە، درێژکردنەوەی ئەم رێککەوتننامەیە دەبێ لە لایەن پارلمانەوە بکرێت .

جەنابی سەرۆك گەلێ لە ئێمەی ئەندامی کۆنگرێس خۆشحاڵین کە دۆستانی ئێمە لە پارلمانی تورکیا، ئەم مانگە شێلگیرانە دەنگیان دا بە درێژکردنەوەی رێککەوتننامەی دابینکردنی ئاسایش. ئەم دەنگدانە کە دوایین نموونەی هاوکاری تورکیایە لەگەڵ رۆژئاوا ، سەقامگیری ناوچە هان دەدات و هیوایەکی نوێ دەبەخشێ بە دەیان هەزار کەس .

درێژکردنەوەی پشتیوانی تورکیا لە شالاوی دابینکردنی ئاسایش ، گرنگی دەوری تورکیا لە ناوچە بەرجەستە دەکات . هاوکاریی تورکیا شتێکی یەکلاییکەرەوە بوو بۆ سەرکەوتنی هێزە هاوپەیمانە نێونەتەوەییەکان لە کاتی قەیرانی کەنداو و دەورێکی زۆر گرینگیش دەبینێ لە درووست کردنی داهاتوویەکی دیمۆکراتیك . تورکیا نموونەیەکی باشە، نەتەنها بۆ کۆمارە تازە سەربەخۆبووەکانی یەکێتی سۆفیەتی پێشوو ، بەڵکوو هەروەها بۆ جیهانی عەرەب . تورکیا لە رێگای هاوکاری و دانووستانی ئابووری زۆرتر لە بەرامبەر بیرۆکەی ئاشتی دەروەست بووە و ئەم دواییانەش میوانداری لە رێبەرانی ١١ وڵات کردووە ( لەوانە رێبەرانی ٦ کۆماری پێشووی سۆڤیەت و ئەرمەنستان و ئازەربایجان کە لە سەر کێشەی نەگرونی قەرەباغ ناکۆکن) بۆ واژۆ کردنی پەیمانی هاوکاری ئابووری دەریای رەش .

جەنابی سەرۆك بڕیاری تورکیا بۆ درێژکردنەوەی رێککەوتننامەی شالاوی دابینکردنی ئاسایش، هیوایەکی نوێ دەبەخشێ بە کوردەکان . هەڵوێستی شێلگیرانەی تورکیا وەبیرهێنەری ئەوەیە کە رۆژئاوا دەتوانێ لە سەر تورکیا حیساب بکات و تورکیا دەتوانێت رۆژ لە دوای رۆژ دەورێکی گرینگتر ببینێت لە کاروباری ناوچە و جیهاندا .

## ٦ ی گوڵانی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران
## بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا

بەڕێز هامیلتۆن[1]، نوێنەری ئەیالەتی ئیندیانا:
جەنابی سەرۆك، من دەمەوێت جارێکی دیکە سەرنجی هاوکارانم بەرەولای دوایین زنجیرەی ئاڵوگۆڕی نامە لەنێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و کاربەدەستانی تورکیا دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا رابکێشم. من لەم پەیوەندییدا نامەیەکەم لەگەڵ "نوزهەت خاندمیر"، باڵوێزی تورکیا لە وڵاتە یەکگرتووەکان ئاڵوگۆڕ کردووە. لەکاتێکدا کە ئێستا چەند مانگ بەسەر ئاڵوگۆڕکردنی نامە لەگەڵ باڵوێزی تورکیا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، نوزهەت خاندمیر تێپەڕ بووە، بەڵام بە بۆچوونی من، بیروبۆچوونەکانی ئەم باڵوێزە هێشتا بۆ ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران سەرنجڕاکێشە. نیگەرانی ئێمە بەنیسبەت بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا لەمانگی کانوونی یەکەمەوە نەڕەویوەتەوە و لەم مانگانەی دواییدا کۆمەڵێك توندوتیژی لەنێوان هێزەکانی تورکیا و خەڵکی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا رووی داوە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەردەوام هێزی سەربازی خۆی لەم ناوچەیە وەك بەشێك لە"شاڵاوی دابینکردنی حەسانەوە" دەهێڵێتەوە. بەم هۆیە و کۆمەڵێك هۆکاری دیکە، بەبۆچوونی من ئێمە بەرپرسیارێتی تایبەتمان هەیە کە تورکیا بارودۆخی مافی مرۆڤ لەم ناوچەیە و ناوچەکانی دیکە باشتر بکات.

---

[1] Mr. HAMILTON

له بەرواری ١٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١ ، باڵوێزی تورکیا له ولاّته یەکگرتووەکان نامەیەکی بۆ من لەم پەیوەندییدا نووسیوه، منیش له بەرواری ٢٨ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١ له نامەیەکدا وەڵامم داوەتەوه که ئەمه دەقی نامەکەی منه:

کۆنگرێسی ولاّته یەکگرتووەکان

واشنگتۆن، دی سی، ٢٨ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١

بەڕێز نوزهەت خاندمیر

باڵوێزی کۆماری تورکیا، واشنگتۆن، دی سی

بەڕێز جەنابی باڵوێز: سپاسی نامەکەی ئێوه له بەرواری ١٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١ دەکەم که لەوەڵامی بیروبۆچوونەکانی من له ٧ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١ دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ له تورکیا نووسیوتانه. من سپاسی ئێوه دەکەم و خۆشحاڵم که بۆچوونەکانی ئێوەم بەنیسبەت دیموکراسی و مافی مرۆڤ له تورکیا وەرگرت. نامەکەی ئێوه خاڵی باشی زۆری تێدا بوو و من خۆشحاڵم که ئاگاداری ئەو هەنگاوانه بووم که ئێوه ئاماژەتان پێکردووه. هەروەها که ئێوه ئاماژەتان پێکردووه، تورکیا تەنها ولاّتێکه لەجیهانی ئیسلامیدا که ئازادی هەڵبژاردن، ئازادی چاپەمەنی و سەروەری یاسای تێیدا ریشەی داکوتاوه. تورکیا پێشکەوتنی گرنگی له باشترکردنی دامەزراوه دیموکراتیەکان و رەفتارەکانی له ٤٠ ساڵی رابردوودا بەدەستهێناوه بەلاّم گەلێ له خەڵك دیموکراسی ئێوه به دیموکراسیەکی جوان و هەندێ جار به دیموکراسیەکی لەرزۆك دادەنێن. من ئاگاداری ئەو راستیەم که تورکیا هەندێ دراوسێی ناشیاوی هەیه و لەگەڵ کۆمەلێ کێشەی تایبەتی لەلایەن گروپە تروریسته

ناوخۆییە غەیرە کوردەکان و گروپە کوردە جیاییخوازەکان روبەڕوویە کە لە بەشی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا چالاکی دەکەن. لەگەڵ ئەمشدا من لەو زانیارییانە نیگەرانم کە بەنیسبەت پێشێلکردنی بەردەوامی مافی مرۆڤ لە تورکیا پێمگەیشتووە. بەتاییەت رێگەم پێبدەن چەند نموونەیەك لەم پێشێلکاریانە کە زۆر جێگای نیگەرانین بخەمەروو:

ـ سەرەڕای ئەو راستیە کە تورکیا ئێستا کونوانسیونی ئوروپا و نەتەوەیەکگرتووەکانی دژ بە ئەشکەنجە واژۆ کردووە، من ئاگادارم کە نزیکەی ۹۵ بەندکراوی سیاسی ئەمرۆ لە تورکیا لەژێر ئەشکەنجەدان.

ـ یەکێ لە میتودە هاوبەشەکانی ئەشکەنجە، شۆکی کارەباییە کە پێویستی بە کەرەستەی تاییەتی خۆی هەیە و روونە کە کەلکوەرگرتن لەم کەرەستەیە شتێکی هەرەمەکی نییە لە رەوتی لێپرسینەوەدا.

ـ لەساڵی ۱۹۹۱ ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە بەندیخانەدا گیانیان لە دەست داوە، بەشێوازێکی بەرچاو زیاد بووە و ۱۲ بەندکراوی سیاسی لە کانوونی دووەمی ۱۹۹۱ ەوە بەشێوەیەکی گوماناوی گیانیان لە دەست داوە.

ـ هەروەها ژمارەی ئەو کەسانە زیاد بووە کە لە ئەنجامی زیادەڕۆیی هێزەکانی پۆلیس گیانیان لەدەست داوە. لە حوزەیرانی ۱۹۹۱ ەوە ۱۹ کەس بەهۆی هێرشی ماڵ بە ماڵی پۆلیس کوژراون و ۱۰ خۆپێشاندەر لە ئەنجامی لێدان و تەقەی بێ دەستپارێزانەی هێزەکانی ئاسایشی تورکیا گیانیان لەدەست داوە.

ـ کەندوکۆسپەکانی سەر ئازادی رادەربڕین بەردەوامە و جێبەجێ کردنی ئەم دواییانەی یاسایی بەرفراوانی "دژە تیرۆر" بووە بەهەنگاوێك بەرەوپاش لەم پەیوەندییەدا.

پێشێلکردنی مافی مرۆڤی کەمینەی کورد بەردەوامە، سەرەڕای داواکاری گشتی خەڵك بۆ ئازادبوونی بەکارهێنانی زمانی کوردی. بەکارهێنانی زمانی کوردی له ئیدارەکان، لەوانه لەکاتی دیداری بەندکراوەکان لەگەڵ بنەماڵەکانیان و راوێژ و گفتوگۆی بەندکراوەکان لەگەڵ پارێزەرەکانیان قەدەخەیە.

من ستایشی راگەیاندننامە گشتیەکانی دەوڵەتی تورکیا دەکەم دەربارەی پێویستی کۆتاییپێهاتن به ئەشکەنجە له تورکیا و باشترکردنی بارودۆخی مافی مرۆڤ ، بەڵام دەبێ ئەوەش پشتڕاست بکەمەوە که تا ئەو شوێنە که من ئاگادارم تا ئێستا هیچ کردەوەیەکی یاسایی یا کردەوەیەکی دیکه دژی ئەو کەسانه ئەنجام نەدراوە که بەندکراوەکانیان ئەشکەنجە کردووە. من هیچ زانیارییەکەم لەبەردەستدانییە که نیشان بدات پۆلیس یا کارمەندێکی بەندیخانە سزادرابێت، لەسەرکار دەرکرابێت یا لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرابێت بەهۆی ئەو پێشێلکاریانە که ئاماژەی پێکرا. بۆ گەلێ له ئەندامانی کۆنگرێس زەحمەتە دەرك بەو ئەرك و بەرپرسیارەتیانە بکەن و داکۆکی لێبکەن که ئێوە له نامەکەتاندا ئاماژەتان پێکردووە.

من سپاسی ئاوڕدانەوەکەی ئێوە دەکەم و خۆشحاڵ دەبم بیروبۆچوونەکانی دیکەی ئێوە لەپەیوەندی لەگەڵ وەڵامدانەوە بەو نیگەرانیانە که ئاماژەم پێکردن، وەربگرم.

لەگەڵ رێزمدا

لی ه هامیلتۆن، سەرۆکی کومیسیونی ئەوروپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاس

## ١ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران
## پاکتاوی رەگەزی دەوڵەتی تورکیا بەردەوام پشتگوێ دەخرێت

بەڕێز ماوریلیس[1]:
جەنابی سەرۆك، ئێستا زۆربەی سەرنجی جیهان لەسەر هەوڵی پاکتاوی رەگەزی له هەندێ له شوێنەکانی کۆماری پێشووی یوگسلاڤیا چڕ بووەتەوە. وەك کاردانەوەیەك لەبەرامبەر گەلێ له راپورتەکانی ئەم کردەوە بێ بەزەییانە، نەتەوە یەکگرتووکان گەمارۆی نێونەتەوەیی خستووەتە سەر "سربستان[2]" و "مونتینوگرۆ[3]" و هێزێکی ئاشتیپارێزی رەوانەی ئەو شوێنە کردووە و له ئاستی نێونەتەوەییدا ئەم کردەوانەی بەتوندی شەرمەزار کراوە.
من خۆشحاڵم کە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای ئەورووپا وەك پشتیوانانی بەهێزی ئەم جۆرە گوشارە نێونەتەوەییە، ئەوەندە له ئاستی نێونەتەوەییدا پشتیوانی له هەوڵەکانیان کراوە بۆ کۆتاییهێنان بە پاکتاوی رەگەزی له باڵکان.
بەهەرحاڵ زۆر جێگای داخە کە ئیدارەی بوش و گەلێ له هاوپەیمانەکانمان، بەردەوام پاکتاوی رەگەزی بەدەستی وڵاتیکی نزیکی یوگسلاڤیا واتا وڵاتی تورکیا پشتگوێ دەخەن. دەوڵەتی تورکیا ئەم پاکتاوی رەگەزییە دژی کەمینەی ئەرمەنی، یونانی، قوبرس و کورد ئەنجام دەدات. تورکیا له ساڵی ١٩١٥ پاکتاوێکی رەگەزی تا

---
[1] Mr. Mavroules
[2] Serbia
[3] Montenegro

ئەوپەڕی خۆی ئەنجام دا کە ژینوسایدی ئەرمەنیەکانی لێکەوتەوە. ئەم کردەوەیە خۆی بەتەنها ـ لەگەڵ داننەنانی تورکیا بەم بەرپرسیارەتیە ـ لەرز بە لەشی مندا دێنێت، کاتێ کە بیر لەوە دەکەمەوە کە ئێمە ساڵی رابردوو یەك بیلیون دولار یارمەتیمان بەم "بەناو هاوپەیمانە" داوە. بەڵام مەسەلەکە لێرە کۆتایی پێنایێت. چەندها ساڵە کە دانیشتوانی یونانی تورکیا کە لە ژێر دەسەڵاتی تورکیا دەژین، بوونە بە قوربانی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی دەوڵەتی تورکیا. لە ساڵی ۱۹۹۲ تورکەکان شاری"سمیرنا"[3] یان سووتاند و دانیشتووەکانیان بە کۆمەڵ کوشت، هەروەها کۆمەڵێك بەرنامەیان دژی یونانیەکان لە ئیستانبول و ئیزمیر بەرێکخستن کرد. تەنانەت ئەمڕۆش یونانیەکانی دانیشتووی تورکیا وەك کەمینەیەك دەچەوسێنرێنەوە.

قوبرسیەکانیش نمونەیەکی سەرەکی دیکەی گروپێکی ئەتنیکین کە لە بەدەستی تورکیا بوونەتە قوربانی پاکتاوی رەگەزی. لە ماوەی ۱۸ ساڵی رابردوو، دەوڵەتی تورکیا هەموو رۆژێك چالاکانە قوبرسیەکانی لە ماڵ و زێدی خۆیان دەرکردووە، بەهۆکاری سیاسی قوبرسیەکانی دەستگیر کردووە و حاشا لە چارەنووسی قوبرس و ئەرمەنیە بێ سەروشوێنکراوەکان دەکات. دەوڵەتی تورکیا هەروەها کار دەکات بۆ سەرنەکەوتنی ئەو وتووێژانە کە بە پشتیوانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەستی پێکردووە بە مەبەستی دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ ئەم قەیرانە. دەبێ ئاماژە بە سەروتارێکی رۆژنامەی *نیویورك تایمز* بکەم دەربارەی پاکتاوی رەگەزی لە قوبرس. ئەم سەروتارە باسی بارودۆخی داگیرکرانی دەوڵەتی خاوەن سەروەریی قوبرس لە ۱۹۷٤ بە دەستی هێزە چەکدارەکانی تورکیا دەکات.

[3] Smyrna

هەروەها زۆر جێگای داخە کە وڵاتە یەکگرتووەکان هاوکات لەگەڵ ئەوەی بەتوندی دژی پاکتاوی رەگەزی کەمینەی کوردە بە دەستی دەوڵەتی عێراق و بەهێزی هەوایی کوردەکانی باکووری عێراق دەپارێزێت، بەڵام لە هەمان کاتدا کردەوە سەربازییەکانی تورکیا دژی هەمان ئەو کەمینە کوردە، هەم لە تورکیا و هەم لەسەر سنووری باکووری عێراق پشتگوێ دەخات. رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی بەردەوام دەوڵەتی تورکیای شەرمەزار کردووە بەهۆی ئەشکەنجە و کردەوە نامرۆڤانەکانی دیکە دژی کەمینەی کوردی خۆی. ئەم سیاسەتە دوورووییەی ئەمریکا نابێ بەردەوام بێت. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا میلیۆنەها دولار لە گیرفانی باجدەرانی ئەمریکا خەرج دەکات بۆ پاراستنی گەلێك (کوردەکان لە عێراق) کە لە وڵاتی تورکیا لە ژێر هێرشی رۆژانەی دەوڵەتی تورکیای هاوپەیمانی ئێمەدایە.

ئێمە وەك گەلێك، نابێ رێگا بەوە بدەین کە ئەم دەستدرێژییە بەردەوام بێت.ئێستا شەری سارد کۆتایی پێهاتووە، کومونیزم و یەکێتی سۆڤیەت مردوون. تورکیا پێیخۆش نەبوو لەکاتی قەیران و شەری کەنداوی فارس یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان بدات. واقعبینی سیاسی" ئاژینی نوێی جیهانی"[4] نیشان دەدات کە تورکیا ئەو هاوپەیمانە ئیستراتژیکە نییە کە ئیدارەی بوش

---

[4] ئاژینی نوێی جیهانی( New World Order) ئەو سیستمە سیاسییە جیهانییەیە کە جۆرج بوش(باوك)، سەرۆك کۆماری ئەمریکا پاش شەری کەنداو(١٩٩١) رایگەیاند. هەندێ لە پرەنسیپەکانی ئەم سیستمە بریتین لە سەروەری یاسا، دەستنەبردن بۆ توندوتیژی، چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانەی ناکۆکییەکان و رێزگرتن لە مافی مرۆڤ بە سەرۆکایەتی ئەمریکا و لە سەر بنەمای نۆرم و شرۆڤەی ئەمریکا. (وەرگێر)

بانگەشەی دەکات. مەسەلەی لەوە خراپتر ئەوەیە کە تورکیا مەنشوری نەتەوەیەکگرتووەکان، پەیماننامەی ناتۆ، بەشی مافی مرۆڤی یاسای یارمەتی بیانی ١٩٦١ ، کونوانسیونی مافی مرۆڤی ئەوروپا، کونوانسیونی چوارەمی ژنیڤ، جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ و پەیماننامەی گارانتیکردنی رێککەوتنامەی١٩٥٩- ١٩٦٠ی "لەندەن ـ زوریخ" پێشێل دەکات و رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی، لێکۆڵینەوەی ساڵانەی یانەی ئازادی، راپورتی رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ ، راپورتی پرۆژەی یاسای ئازادی، رێکخراوی چاودێری هلسینکی و گەلێ لە رێکخراوە هەواڵگرییە نێونەتەوەییەکان، پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ بە دەستی دەوڵەتی تورکیایان بە بەڵگە خستووەتەڕوو. لیستی ئەم پێشێلکارییەکانە لە کارنامەی دەستدرێژی تاوانبارێکی نێونەتەوەیی دەچێت نە هاوپەیمانێکی نزیکی سەرزەمینی ئازادی(مەبەستی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە ـ وەرگێڕ).

سەرۆك بوش ناتوانێت درێژە بە پشتگوێ خستنی ئەم پێشێلکارییە بەردەوامانەی مافی مرۆڤ بدات. پاکتاوی رەگەزی لە باڵکان چەندە ترسناکە، بەهەمان ئەندازەش هەوڵە هاوشێوەکانی رژێمی تورکیا و ئیمپراتۆری عوسمانی لە سەدەی رابردوو بەهەمان ئەندازە ترسناکە.

جەنابی سەرۆك، من داوا لە هەموو هاوکارانم دەکەم بۆ مافی مرۆڤ لەسەراسەری جیهان وەدەنگ بێن و نەهێڵن ئەم رێوشوێنە دووقاتە کوشندەیە بەردەوام بێت. ئێمە وەك ئەنجوومەنی نوێنەران ناتوانین رێگەبدەین و رێگەش بەوە نادەین کارنامەی دزێوی

پڕ له پێشێلکاریی، ئەشکەنجە، ژینوساید و پاکتاوی رەگەزی تورکیا بۆ وەڵام بهێنێتەوە.

## ئێستا كاتی ئهوهیه ئێمه و كۆمهڵگای جیهانی سهرنج بدهین به پاكتاوی رهگهزی كوردهكان له توركیا

### ٩ ی تشرینی یهكهمی ١٩٩٢ - ئهنجوومهنی نوێنهران

بهڕێز رابێرت ماتسۆی[1]، نوێنهری ئهیالهتی كالیفۆرنیا:

جهنابی سهرۆك، من ئهمرۆ دهمهوێت گهلاڵه یاسایهك بخهمهڕوو بۆ باسكردنی پاكتاوی رهگهزی و پێشێلكردنی مافی مرۆڤ له توركیا و قوبرس. ولاّته یهكگرتووهكانی ئهمریكاو كۆمهڵگای جیهانی هۆشدارییان داوه و گهمارۆیان سهپاندووه بهسهر یوگسلاڤیا بههۆی پاكتاوی رهگهزی له كوماری یوگسلاڤیای پێشوو. ئێستا كاتی ئهوهیه ئێمهش و كۆمهڵگای جیهانی سهرنج بدهین به پاكتاوی رهگهزی كوردهكان له توركیا و كهمینهی یونانی له قوبرس به دهستی توركیا. ولاّته یهكگرتووهكانی ئهمریكا قهد تا ئێستا كردهوهكانی توركیایی بهتوندی شهرمهزار نهكردووه، كهوابوو ههموو یارمهتییهكی سهربازی و ئابووری ئێمه بهتوركیا، ناڕاستهوخۆ پشتیوانیكردنه له كردهوهكانی پاكتاوی رهگهزی كوردهكان (كه ٢٠٪ دانیشتووانی توركیا پێكدههێنن) و یونانیهكانی قوبرس بهدهستی توركیا.

بهداخهوه توركیا بهردهوام مافی مرۆڤی نێونهتهوهیی به توندترین شێوه پێشێل كردووه و بهشی ١١٦ و B ٥٠٢ ی یاسای یارمهتی بیانی ١٩٦١ بهئاشكرا پێشێل دهكات. بهوتهی سهرنووسهری رۆژنامهی "نیویورك تایمز" كه لهمانگی نیسانی

---

[1] ROBERT T. MATSUI

ئەمساڵ بڵاو بووەتەوە: "کوردەکانی تورکیا لەگەڵ پێشێلکردنی سیستماتیکی مافی مرۆڤ لەوانە ئەشکەنجە روبەڕوو بوونەتەوە. کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لەرووی ئەخلاقیەوە بەرپرسیارە کە داوا لە دەوڵەتی تورکیا بکات سەرکوتی دژێوی هاوولاتیانی کورد رابوەستێنێت، پێش ئەوەی ئەم سەرکوتە ببێ بە ژینوساید.

لە قوبرس، تورکیا هێشتا ٣٥ هەزار سەربازی داگیرکەری هەیە و ٨٠ هەزار کەس موستەعمرەچی بە نایاسایی بردووەتە ناو قوبرس کە ئەمەش پێشێلکردنی یاسای نێونەتەوەییە. لەکاتێکدا کە نەتەوەیەکگرتووەکان پشتیوانی لە وتووێژەکانی قوبرس کردووە، ئەم وتووێژانە لە ناوەڕاستی ئاب تا ٢٦ ی ئوکتوبری ١٩٩٢ دواخرا و ئێستاش راوەستاوە. تورکیا و رەئوف دەنگتاش، سەرۆکی بەشی تورکنشینی قوبرس، کەندوکۆسپی سەرەکی ئەم وتووێژانن. بەوتەی سەرنووسەری رۆژنامەی "نیویورك تایمز" کە وتارەکەی کە لە ٥ ی ئەیلوولی ١٩٩٢ لەژێر ناوی" پاکتاوی رەگەزی: شێوەی قوبرس" بڵاوبووتەوە، رەئوف دەنگتاش سەرجەم پێشنیارەکانی بۆ دابەشکردنی دەسەڵات و دادپەروەری بۆ ناوارەکان رەت کردووەتەوە. لەوانەیە وتووێژەکان ئەم مانگە دەستپێبکاتەوە بەڵام راستیەکەی ئەوەیە کە قوبرس هەروا دابەش بووە لەبەرئەوەی هیچ کەس لەراستیدا گوشار ناخاتە سەر تورکیا تا هێزە داگیرکەرە نایاساییەکان و کولونیالیستە نایاساییەکانی خۆی لە قوبرس بباتە دەرەوە.

ئێستا ئەندامانی ئیتلافی سەوز و ٦٤ کەس لەهاوکارەکانم گەڵاڵە یاسایەکیان ئامادە کردووە کە کۆمەڵێك شەرت ومەرج دادەنێت بۆ یارمەتی بیانی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا. بەبۆچوونی من پێویستە کۆمەڵێ گەمارۆی توندوتۆڵتر بخرێتە سەر تورکیا، هەر بۆیە من گەڵاڵە یاسایەك دەخەمەڕوو بۆ کەڵکوەرنەگرتنی تورکیا

له پشتیوانی MFN . پشتیوانی MFN هەڵدەواسێت هەتا كاتێك كه توركیا درێژه به پاكتاوه رەگەزییەكەی بدات لەرێگای پێشێلكردنی بەرفراوانی مافی مرۆڤی كوردەكان و كەمینەكانی دیكه و درێژه به داگیركردنی نایاسایی قوبرس بدات و هاوكاری نەكات بۆ بەرەوپێشچوونی وتووێژەكانی قبرس كه نەتەوه یەكگرتووەكان پشتیوانی لێدەكات. من داوا له هاوكارانم دەكەم پەیوەست بن به من و ئەنجوومەنی نوێنەران به سەرۆكایەتی خاتوون "داونی، پلۆسی[٢]" بۆ پشتیوانیكردن لەم گەڵاڵه یاسایه گرنگه.

ئێستا كاتی ئەوەیه كه دەوڵەتی توركیا تێبگەیەنین كه بەلۆعەی یارمەتی ئەمریكا بەتوركیا بەستراوه و گەمارۆی ئابووری دەخرێته سەر توركیا ئەگەر هەنگاوی ئەرێنی هەڵنەگرێت بۆ راوەستاندنی پاكتاوی رەگەزی و پێشێلكردنی هەمه جۆرەی مافی مرۆڤ .

---

[٢] DOWNEY, PELOSI

## ٥ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٣ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## کارنامەی پڕ لە شەرمی مافی مرۆڤی تورکیا

بەرێز جان ئێدوارد پورتێر[١]، نوێنەری ئەیالەتی ئیلینۆیز:
جەنابی سەرۆك، سەرەڕای هەوڵە زۆرەکانی تورکیا بۆ یەکخستنی خۆی لەگەڵ جیهانی ڕۆژئاوا، لەوانە داواکاری بۆ بەئەندامبوون لە کۆمەڵگای ئوروپا و وەرگرتنی ڕێژەی یەکجار زۆری یارمەتی سەربازی و ئابووری لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، کارنامەی مافی مرۆڤی تورکیا پڕە لە کەموکۆڕی. لەساڵی ١٩٩٣ تارادەیەك بەهۆی ڕەفتاری ترسناکی تورکیا لەگەڵ خەڵکەکەی، ڕەفتاری خراپ لەگەڵ کوردەکان و دروستکردنی کەندوکۆسپ بۆ یەککگرتنەوەی دوورگەی بچووکی قوبرس، کۆنگرێسی ئەمریکا هەموو یارمەتیە سەربازییەکانی ئەمریکای بەتورکیا لابرد. لە ٥ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٣ وتارێك لەژێر ناوی" ئەو هاوارانە کە لە تورکیا دەگەنەوە یەك" لەلایەن "جەك هێلەی"[٢] و "مەریەم ئیلاهی"[٣] لە ڕۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست"دا بڵاو بووەتەوە کە بە ڕوونی شێوازەکانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە تورکیا و سەرپێچیکردنی سەرۆك وەزیرانی تورکیا، "سولەیمان دمیرل" لە وەڵامدانەوە بەم مەسەلە بنەڕەتیەتانەی بەشێوەیەکی واتادار خستووەتە ڕوو.

---

[١] JOHN EDWARD PORTER

[٢] Jack Healey
[٣] Maryam Elahi

من پەیوەست دەبم بە نووسەرانی ئەم وتارە كە داوایان لە توركیا كردووە پابەند بێت بە ڕێوشوێنە نێونەتەوەییەكانی مافی مرۆڤ و سەرۆكی كۆماری تازە هەڵبژێردراوی ئەمریكا واتا كلینتۆن بۆ سەرۆك وەزیرانی توركیا، "دمیرل" ڕوونی بكاتەوە كە دژی یارمەتی ئەمریكایە بە توركیا هەتا كاتێك كە توركیا كارنامەی مافی مرۆڤی خۆی زۆر باشتر نەكات. من سەرنجی ئەندامانی ئەنجوومەن بەرەولای ئەم وتارە گرنگە رادەكێشم و تكا لە سەرجەم ئەندامانی ئەنجوومەن دەكەم كە دژی یارمەتی ئەمریكا بە توركیا ڕابوەستن هەتا ئەو كاتە كە توركیا كارنامەی پڕ لە شەرمی مافی مرۆڤی خۆی بەشێوازێكی بەرچاو باش بكات.

## سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنیسبەت تورکیا و کێشەی کورد

## ١٠ شوباتی ١٩٩٤ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز هامیلتون:

جەنابی سەرۆك، من دەمەوێت سەرنجی هاوکارانم بەرەولای ئاڵوگۆڕی نامە لەگەڵ وەزارەتی دەرەوە دەربارەی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنیسبەت تورکیا و هەوڵەکانی تورکیا بۆ خەبات دژی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK ) لە باشووری رۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە رابکێشم. بڵاوبوونەوەی سەروتارێك لە VOA لە ساڵی رابردوو دەربارەی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنیسبەت بارودۆخی باشوری رۆژهەڵاتی تورکیا منی هاندا ئەم نامانە لەگەڵ وەزارەتی دەرەوە ئاڵوگۆڕ بکەم.

جەنابی سەرۆك، لەچەند رووەوە بارودۆخی تورکیا لەم چەند مانگی رابردووەدا خراپتر بووە. بارودۆخی ئابووری تورکیا خراپتر بووە و سەرەڕای هێرش و بومبارانی بنکەکانی PKK لە عێراق ، هێرشە سەربازییەکانی دەوڵەت لە باشووری رۆژهەڵات دژی PKK پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە. تورکیا دوستێکی زۆر نزیك و هاوپەیمانی وڵاتە یەکگرتووەکانە لە ناتۆ، کەوابوو بارودۆخی تورکیا بۆ بەرژەوەندی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر گرنگە. لە بەرژەوەندی ئێمە و بەرژەوەندی پەیوەندییەکانی وڵاتەیەکگرتووەکان ـ تورکیادایە کە تورکیا بتوانێت بەسەرکەوتوویی کێشەکانی باشووری رۆژهەڵاتی چارەسەر بکات. تەنها رێگاچارەی سەربازی ناتوانێت

ئەم كێشەیە چارەسەر بكات و رێگاچارەیەكی سیاسی و كۆمەڵایەتی زۆر پێویستە بۆ چارەسەركردنی درێژخایەنی بارودۆخی كوردەكان لە باشووری رۆژهەڵاتی توركیا.

من لە ۷ ی كانوونی یەكەمی ۱۹۹۳ نامەیەكەم لەم پەیوەندییەدا ناردووە بۆ وەزارەتی دەرەوە كە وەزارەتی دەرەوش لە ۱۵ ی كانوونی دووەمی ۱۹۹٤ وەڵامی منی داوەتەوە. ئەمە دەقی نامەكەی من و وەڵامەكەی وەزارەتی دەرەوەیە:

ئەنجوومەنی نوێنەران

**واشنگتون دی سی، ۷ ی كانوونی یەكەمی ۱۹۹۳**

بەڕێز "وارنێر كریستوفێر"ی وەزیری دەرەوە، وەزارەتی دەرەوە، واشنگتون دی سی

من دەمەوێت باسی بارودۆخی ناوچەی زۆرتر كوردنشینی باشووری رۆژهەڵاتی توركیا و سیاسەتی وڵاتە یەكگرتووەكان بەنیسبەت توركیا لەم پەیوەندییەدا بكەم. تا ئەو جێگایە كە من ئاگادارم ئەمرۆ بارودۆخی سیاسی و ئابووری باشووری رۆژهەڵاتی توركیا خراپە. من وای بۆ دەچم كە وەڵامی دەوڵەتی توركیا بەم بارودۆخە زۆرتر لەسەر رێگاچارەی سەربازی بۆ كێشەكە چڕ بووەتەوە. هەوڵەكانی دەوڵەتی توركیا بۆ لەناوبردنی رێكخراوی PKK لە رێگای هێزی سەربازی لە دەیەی رابردوو و بەتایبەت لە كانوونی یەكەمی ۱۹۹۲ وە ئاكام و ئەنجامی ئەرێنی ئەوتۆی بەدواوە نەبووە.

PKK ریشەی پشتیوانی گرنگی لەباشووری رۆژهەڵاتی توركیا هەیە و بەگوێرەی هەڵسەنگاندنەكان ئەم پشتیوانییە زۆرتر بووە كە یەكێ لەهۆكارەكانی ئەو میتودانەیە كە سوپا و جاندرمەی توركیا دژی خەڵكی سڤیل بەكاری دەهێنن. من لەم

پەیوەندییەدا بەجیدی نیگەرانی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان ئەمریکام بەنیسبەت تورکیا. بەتایبەت من سەرنجی ئێوە بەرەولای دو مەسەلە رادەکێشم : یەکەم ناوزەدکردنی PKK بە تروریست لە سەروتارەکەی VOA لە ١٣ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٣ کە من لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا نیم و دووەم، شەرت ومەرجەکانی فرۆشتنی چەك بەتورکیا بۆ ئەوەی لەخەباتی چەکدارییەکەی لەباشووری رۆژهەڵات کەڵکی لێوەربگرێت.

یەکەم، سەروتارەکەی VOA تەنها یەکێ لەلایەنەکانی کێشەی کوردی لە تورکیا (ئەوە کە PKK ی بەتروریست ناوزەد کردووە) باس کردووە، کەوابوو بەو شێوازە کە ئەمریکا باسی کردووە، دەتوانین بڵێن کە دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان پێش لەهەموشتێك وەك کێشەیەکی تروریستی سەیری کێشەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دەکات. کەوابوو بەهۆی ئەوەی کە ئەمریکا پشتیوانی لە بۆچوونەکانی تورکیا دەربارەی قەلاچۆ کردنی تروریزم و رەت کردنەوەی داواکارییەکانی تروریستەکان دەکات، خەڵك وا سەیری وڵاتە یەکگرتووەکان دەکەن کە پشتیوانی لە تاکتیکەکانی سوپای تورکیا دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا.

من دەمەوێت هەندێ پرسیار دەربارەی سەروتارەکەی VOA و ئاکامەکانی بۆ سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بخەمەڕوو:

ـ کێ دەقی ئەم سەروتارەی پەسەند کردووە؟

ـ ئایا زمانی ئەم سەروتارە دەربڕی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان ئەمریکایە لەم پەیوەندییەدا؟

- بۆچی هیچ هەوڵێك نەدرا بۆ ئەوەی هاوسەنگی نێوان نیگەرانیەکانی تورکیا و نیگەرانیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بەنیسبەت مافی مرۆڤ لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵات ڕابگیردرێت.

- بۆچی ئەم سەروتارە نەیتوانی بەشێوازی ڕاستەوخۆتر باسی گرنگی ڕەخسانی دەرەفتی سیاسی و ئابووری بۆ دانیشتووانی کوردی تورکیای بکات؟

- پەیامی ئەم سەروتارە لەئانکارا چۆن لێکدراوەتەوە؟

بەنیسبەت مەسەلەی دووەم، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەردەوام سازوبەرگی سەربازی دەدات بەتورکیا بۆ ئەوەی لە خەباتە چەکدارییەکەی لەباشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا کەڵکی لێوەربگرێت. بەبۆچوونی من ئێمە دەبێ لەم بارودۆخەدا بەپارێزی زۆرترەوە نزیکی مەسەلەی تێوەگلانی زۆرتری ئەمریکا لە کێشەی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا ببینەوە. من دەرك بەوە دەکەم کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیەوێت لەم مەسەلە دژوارەدا یارمەتی تورکیا بدات کە دوستی ئەمریکایە و هاوپەیمانی ناتۆیە. هیچ گومان لەوەدانییە کە PKK کێشەیەکی ئاسایشی جیدییە بۆ دەوڵەتی تورکیا بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بە بۆچوونی من ئێمە دەبێ لە ڕاگەیاندننامەکانماندا و لە کردەوەکانماندا نەکەوینە ناو خەباتی سەربازی دەوڵەتی تورکیا دژی کوردەکان کە لەوانەیە بەتەواوی لەگەڵ بەرژەوەندییە بەرفراوانترەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان لەناوچە یەکنەگرێتەوە. من سپاسی سەرنجدانی ئێوە بەم مەسەلەیە دەکەم و هیوادارم لە داهاتوودا لەسەر ئەم مەسەلەیە دیالۆگتان لەگەڵ بکەم.

لەگەڵ ڕێزمدا

لی هـ هامیلتون

سەرۆك کومیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران

*** 

وەزارەتی دەرەوە

**واشنگتۆن، ١٥ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٤**

بەرێز لی هـ هامیلتۆن، سەرۆکی کومیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران

سپاس بۆ نامەکەی ٧ ی کانوونی یەکەمی ئێوە کە تێیدا نیگەرانی خۆتان دەربڕیبوو بەنیسبەت سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەربارەی تورکیا و هەوڵەکانی تورکیا بۆ خەبات دژی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) لەباشووری رۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە. داوای لێبوردن دەکەم کە درەنگ وەڵامی نامەکەی ئێوە دەدەمەوە.

ئێمە شەریکی نیگەرانیەکانی ئێوەین بەنیسبەت پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە لایەن هێزەکانی تورکیا لەباشووری رۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە. هەندێ راپۆرت نیشان دەدات کە تورکیا بەشێوازێکی بەرچاو مافی مرۆڤی پێشێل کردووە، لەوانە کوشتن و ئەشکنجەی نایاسایی کە سوپای تورکیا لە خەبات دژی PKK ئەنجامی داوە. سیاسەتی پاش"شەڕی سارد[1]"ی ئێمە بەنیسبەت تورکیا ئەوەیە کە لەپەیوەندی لەگەڵ

---

[1] شەڕی سارد ئەو ململانێ و دوژمنایەتییە سیاسی، ئابووری ، سەربازی و ئیدوئولۆژیکییە بوو کە لە نێوان بلۆکی رۆژهەڵات (بە سەرکردایەتی سۆڤیەت) و بلۆکی رۆژئاوا(بە سەرکردایەتی ئەمریکا)لە ئارادا بوو بێ ئەوەی دەست ببەن بۆ شەڕی راستەقینە(شەڕی گەرم). شەڕی سارد پاش شەڕی دووەمی جیهانی دەستی پێکرد و پاش لێدوانەکەی کارتێر، سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە

بەشدارییەکی دولایەنەی بەرفراوانتر بۆ پەرەپێدانی پەیوەندییە ئابووریەکانمان، کەمتر جەخت لەسەر مەسەلەی ئاسایش بکەینەوە. لەگەڵ ئەمەشدا نیگەرانی ئێمە بۆ ئاسایشی دەوڵەتی ئانکارا، بەشێکی جیانەبووی سیاسەتی ولاتە یەکگرتووەکانە بەهۆی گرنگی تورکیا لە رووی ئیستراتژیکییەوە. لەم چوارچێوەیەدا ولاتە یەکگرتووەکان پشتیوانی لە شەڕی تورکیا دژی PKK دەکات. لەهەمان کاتدا ئێمە پێداگری لەسەر رێبەرانی تورکیا دەکەین کە بەشوێن رێگاچارەی سیاسی و کۆمەلایەتیدا بگەڕێن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی هاوولاتیانی کورد لەباشووری رۆژهەلات و لە خەباتە سەربازییەکەیاندا مافی مرۆڤ پێشێل نەکەن. سەرۆك کۆماری ئەمریکا لەکاتی دیداری سەرۆك وەزیرانی تورکیا، "تانسۆ چیللەر" لە تورکیا لەمانگی تشرینی یەکەم باسی ئەم مەسەلانەی کردووە. جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا "ئوکسمان[۲]" لەکاتی دیدار لە ئانکارا لەمانگی رابردوو پەیامی ئێمەی بۆ خاتوون "چیللەر" و رێبەرانی سەربازی تورکیا دووپات کردووەتەوە.

من لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی ئێوەدام دەربارەی پێویستبوونی راگرتنی هاوسەنگی لە هەردوو بواری سیاسەت و راگەیاندنە گشتیەکانی ئێمەدا. وتارەکەی ١٣ ی تشرینی دووەمی VOA دەربڕی نیگەرانیەکانی ئێمەیە بەنیسبەت مافی مرۆڤ بەگشتی. ئێمە لەو باوەڕەداین کە راپۆرتەکەی VOA ئەم هاوسەنگییەی راگرتووە. بۆ نموونە

---

سالی ١٩٧٨ (بە باوەڕی هەندی کەس لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠ بە لە یەك هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت) کۆتایی پێهات. (وەرگێڕ)

[۲] Oxman

سەروتارەکەی ١٨ ی حوزەیرانی ١٩٩٣ بەوردی باسی پێویستی دۆزینەوەی ڕێگاچارەی سیاسی بۆ کێشەی باشووری ڕۆژهەڵاتی کردووە.

بەنیسبەت نیگەرانی ئێوە دەربارەی یارمەتی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکان بەتورکیا لە داهاتوودا، ئامانجی سەرەکی ئێمە بەهێزکردنی هێزی بەرگری هاوپەیمانەکانمانە لە ناتۆدا. ئێمە هەموو داواکاریەکان بۆ وەرگرتنی پێداویستی بەرگری لە چوارچێوەی بەرژەوەندییە ئاسایشە بەرفراوانترەکانمان لە ناوچە ڕەچاو دەکەین و چاودێری دەکەین بەسەر کەڵکوەرگرتن لە چەك و سازوبەرگەکانی EDA لە ڕێگای ڕاپۆرتی نوێنەرە سەربازی و دیپلۆماتیکەکانمان لە تورکیا و هەروەها ڕاپۆرتی چاپەمەنی و ڕێکخراوە ناحکوومەتیەکان. ئێمە درێژە دەدەین بەراوێژکردن لەگەڵ کۆنگرێس، پێش ئەوەی ئەم سازوبەرگە سەربازییانە بدەین بەتورکیا. من ستایشی بۆچوونەکانی ئێوە دەکەم دەربارەی پێویستبوونی ئەوە کە تورکیا بە نەرمونیانی زۆرترەوە نزیکی کێشەکانی باشووری ڕۆژهەڵات ببێتەوە و مافی مرۆڤ پێشێل نەکات. دڵنیابن کە ئێمە بەردەوام بەشێوازێکی گشتی و تاکەکەسی پێداگری لەسەر تورکیا دەکەین کە هاوسەنگی نێوان خەبات دژی ترورێزم و دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی سیاسی و پاراستنی مافی مرۆڤ ڕابگرێت.

لەگەڵ ڕێزمدا

پیتەر تارنۆڤ [٣]

کارگێڕی وەزیرەی دەرەوە

[٣] Peter Tarnoff

## ٢ ی ئاداری ١٩٩٤ ـ ئەنجوومەنی پیران
## دیموکراسی له تورکیا کەوتووەته ناو مەترسی

بەڕێز دیکۆنسینی:

جەنابی سەرۆك، من ئەمڕۆ دەمەوێت نیگەرانی خۆم دەربڕم بەنیسبەت داهاتووی سیاسی تورکیا. بەهۆی ئەوەی تورکیا دوست و هاوپەیمانێکی گرنگی ئەمریکایە لەناوچەی ناسەقامگیری (رۆژهەلاتی ناوەڕاست)، ئەم کۆنگرێسە و ئیدارەی ئەمریکا دەبێ زۆر سەرنج بدات بە زیادبوونی توندوتیژی له باشووری رۆژهەلاتی تورکیا. ئەم ناوچە زۆرتر کوردنشینە لەراستیدا "هەرێمی شەڕە" کە تێیدا مافە مرۆڤە بنەڕەتیەکان هەلواسراوە و ترس و تۆقان و مەرگ زیاد بووە.

لەساڵی ١٩٩١ ەو پتر له ٥ هەزار کەس بەهۆی شەڕی نێوان گریلا کوردەکان، ئیسلامیە بناژۆخوازەکان و هێزەکانی ئاسایشی تورکیا کوژراون. بازنەی توندوتیژی لەبەردەم پەرەسەندندایە و هەڕەشە له دیموکراسی تورکیا دەکات و پەیوەندییە هەستیارەکانی ناوچە تێکدەدات. لەکاتێکدا کە من هیچ گومانم لەوەدانییە کە دامەزراوە دیموکراتەکانی تورکیا ئێستا لەهەموو کاتێکی دیکە بەهێزترن، بلاوبوونەوەی شایعە دەربارەی کودیتا له چاپەمەنیەکانی تورکیا ، بیرەوەرییە ناخۆشەکانی سێ دەیە بەرەوپاشچوون له دیموکراسی له ١٩٦٠ ەوە زیندو کردووەتەوە. لەکاتی دامەزرانی تورکیای نوێ له ١٩٢٣ ، کوردەکان کە ئێستا نزیکەی ١١ میلیون لەدانیشتوانی ٥٧ میلیونی تورکیا پێکدەهێنن، لەگەڵ گوشارگەلی جۆراوجۆر

روبەڕوو بوونە و کیانە جیاوازە کولتووریەکەیان حاشای لێکراوە. کوردەکان هاوکات لەگەڵ ئەوەی مسڵمانن، زمان و دابونەریتی کولتوری جیاوازیان هەیە. کوردەکان لەرێگای دەربڕینی ناسنامەی کوردی خۆیان، لەرێگای سەرپێچیی مەدەنی و لەتوندترین حاڵەتدا لە رێگای راپەڕینی ئاشکرا، هەوڵیان داوە کولتوور و مافەکانیان بپارێزن و پێشی بخەن.

لەساڵی ١٩٨٧ەوە، هەشت پارێزگای کوردنشین لە بارودۆخی نائاساییدان کە کاربەدەستانی ناوچە و سوپا تێیاندا میدیا و چالاکیە سیاسی و کولتوورییەکان کونترۆڵ دەکەن. لەساڵی ١٩٨٤ پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK ) بۆ ئوتۆنومی کوردەکان دەستی بەخەباتی چەکداری کرد. بەشێك لە ئابووری PKK لەلایەن گروپە(کوردەکانی) ئەوروپا دابین دەکرێت و لە عێراق، ئێران، سوریا و (بەشێوازی نهێنی) لە تورکیا چالاکی دەکات. لەو ناوچانە کە PKK چالاکی دەکات، خەڵکی سڤیل لە نێوان یارمەتیدان و یارمەتی نەدانی PKK دا گیریان خواردووە، لەبەر ئەوەی ئەگەر یارمەتی PKK بدەن لەگەڵ تۆڵەسەندنەوەی توندی هێزەکانی ئاسایشی تورکیا رووبەڕوو دەبنەوە و ئەگەر یارمەتی PKK نەدەن PKK ئەوەیان لێ قبوڵ ناکات. لەلایەکەوە PKK ئەوکەسانە لە سێدارە دەدات کە لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیا هاوکاری دەکەن و لەلایەکی دیکەوە هێزەکانی ئاسایشی تورکیا سەرەڕۆیانە گوندنشینەکان کۆ دەکەنەوە و لێیان دەدەن و بەکۆمەڵ دەیانگرن و دەیانتۆقێنن. تاکتیکی تایبەتی رووخێنەری دەوڵەتی تورکیا ناکام و ئەنجامی دژواری بەدواوە بووە و بووەتە هۆی ئاوارەبوونی خەڵك، چۆڵ کردنی زۆرەملێی سەدان گوند و کاول کردنی تەواوی هەندێ لە شاروچکەکان.

لەکاتێکدا کە تورکیا و راستیدا هەموو دەوڵەتەکان هاووڵاتیانی خۆیان دەپارێزن و یەکپارچەیی خاکەکەیان دەپارێزن بەڵام تورکیا بەرپرسیارە لەبەرامبەر ئەوەی پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ پێشێل نەکات. بەداخەوە هەرکاتێك کە PKK هێرش دەکاتە سەر هێزەکانی تورکیا، خەڵکی سڤیل زۆرتر لەگەڵ کاردانەوەی هێزەکانی ئاسایش رووبەڕوو دەبنەوە و لەراستیدا دەوڵەتی تورکیا بەبیانووی خەبات دژی ترووریزم حاشا لە مافە رەواکانی کوردەکان دەکات. توندوتیژییەکان، کوردەکان و تورکەکانی وەك دو جەمسەر لەیەك جودا کردووەتەوە و ترس و بەدگومانیەکی بێ وێنەی لەنێوانیان دروست کردووە. کوردەکان(کە لەگەڵ هەلسوکەوتی خراپی هێزەکانی ئاسایش روبەڕوون) زیاتر پشتیوانی لە ناسیونالیزمی کورد و PKK دەکەن و تورکەکانیش رۆژبەرۆژ زیاتر حاشا لە مافە رەواکانی هاووڵاتیانی کورد دەکەن.

هەوڵە سەربازییەکانی دەوڵەتی تورکیا بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخی کورد تەنها ئالۆزی و ناکۆکیەکان زیاتر دەکات. بەهۆی کوژرانی خەڵکی بێ گوناح، نارەزایەتی خەڵك بەگشتی پەرەی سەندووە. نزیکایەتی سەربازی یەك لایەنەی دەوڵەتی تورکیا تەنانەت دەنگی سیاسی کوردە میانەڕەوەکانیش کپ کردووە و لەئەنجامدا PKK توانیویەتی پشتیوانی ئەو کەسانە بەدەست بهێنێت کە لەدەستی زۆرداریی تورکیا وەزاڵە هاتوونە و هێزی ئەوەیان نییە ئامانجە کولتووری و سیاسیە رەواکانیان بەرەو پێش بەرەن. ئەو توندوتیژییە کە لەکاتی هەڵبژاردنە مەحەلیەکاندا سەریهەڵدا، هەڕەشە لەسەر رەوتی دیموکراسی ئاشکرا کرد و پێشگرتن لە کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی نوێنەرایەتی سیاسی لە ناو حکوومەت یا بەدەستهێنانی مافە بنەڕەتیەکانی دیکەی بەرجەستە کرد.

لە ٢ ساڵی رابردوودا گرووپە پیاوکوژەکانی تورکیا ٧٠ کەس لە لایەنگرانی پارتی دیموکرات(DEP) یان کوشتووە کە حیزبێکی لایەنگری کوردەکانە و ١٨ کورسی لە ٤٥٠ کورسییەکەی پارلمانی تورکیای لەدەستدایە. ٢٠ نووسینگەی ئەم حیزبە بە بۆمب تەقیندراوەتەوە، پتر لە ٣٠٠ کەس لە کاندیداکانی DEP دەستگیر کراون و گۆڕینی یاسای هەڵبژاردن ـ بەهۆکاری ئەمنی ـ ئەوەی بۆ دەنگدەرە کوردەکان زۆر ئەستەم کردووە کە بە کاندیدی دڵخوازی خۆیان دەنگ بدەن. لە ٢٣ ی شوبات ئەندامانی DEP بڕیاریان دا هەڵبژاردنەکانی ٢٧ ی ئادار بایکۆت بکەن. رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ و پارلمانی ئەورووپا رایانگیاند کە دەیانەوێت چەند لێژنەیەك بنێرن بۆ چاودێری کردن بەسەر هەڵبژاردنەکاندا. جەنابی سەرۆك، هەر دوێنی پارلمانی تورکیا یاسای پارێزراوبوونی بۆ پارلمانتارەکانی سەربە DEP هەڵوەشاندەوە بۆ ئەوەی بە تاوانی لێدوانە زارەکی و نووسراوەکانیان، لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکات.

٢ کەس لە پارلمانتارانی سەربە DEP بەتاوانگەلێك کە سزای مەرگی بۆ دیاری کراوە، لە دەرەوەی پارلمان دەستگیر کراون. دادئەستێنەکانی تورکیا دەیانەوێت سەرجەم ٨ پارلمانتارە کوردەکە تاوانبار بکەن. ئەم سیاسەتانە دژی پرنسیپە بنەڕەتیەکانی ئازادی رادەربڕینە و سووکایەتی کردنە بە مافی کوردەکان لە سەراسەری تورکیا.

لە کاتێکدا کە تورکیا هاوپەیمانی ناتۆیە و وەرگری سەرەکی یارمەتی سەربازی و ئابووری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، ئەم کۆنگرێسە و ئیدارەی ئەمریکا نابێت خۆی لەوە بوێرێت کە نیگەرانی جیدی خۆی دەربڕێت بەنیسبەت خراپتر بوونی

بارودۆخی مافی مرۆڤ و ناتوانێ یا خۆنەویستی دەوڵەتی تورکیا بۆ سەرراست کردنەوەی ئەم پێشێلکاریانە.

جەنابی سەرۆك، لەکاتێکدا کە هیچ رێگاچارەیەکی ئاسان بۆ کێشەی ئاڵۆزی کورد لە ئارادا نییە، خۆشبەختانە هەندێ دەنگی سازگار لە نێو سیاسەتمەدارانی مەدەنی میانەڕەوی تورکیا بەرز بووتەوە کە داوای گوێگرتن لە داواکاری و گلەو گازندەکانی کوردەکان و جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی تورکیا دەکەن بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەك کە یاساسەروەر بێت. ئەم دەنگانە داوای سەرمایەگوزاری ئابووری بەردەوام لە باشووری رۆژهەڵات، کۆتایی هێنان بەحاڵەتی نائاسایی، هەموار کردنی یاسای دژەتیرور، هەڵوەشاندنەوەی سیستمی"پارێزەرانی گوند"، بەفەرمی ناسینی مافە کولتووریەکانی کوردەکان و هەڵگرتنی کەندوکوسپەکانی سەر رێگای چاپ و پەخشی زمانی کوردی و شێوازەکانی دیکەی ئازادی رادەربڕین دەکەن. هۆکارەسەرەکیەکانی نارەزایەتی و بێ هیوایی خەڵك(کە بووەتە هۆی زیادبوونی چوونە ناو ریزی PKK ) دەکرێت بەشێوازێکی بەرچاو کەم بێتەوە لەرێگای ئازادبوونی مافی رادەربڕینی سیاسی و کولتووری کوردەکان و زیندوبوونەوەی دامەزراوە مەدەنی و ئابووریەکان و پاشەکشەی سەربازان لە شەقامی شارەکان و گوندەکان. لەروانگەی منەوە ئەم کردەوانە دەتوانێ یارمەتی بدات بەپێکهاتنی بنەمای دموکراسیەکی ئاشتیخوازتر، خۆشبەختر و سەقامگیرتر بۆ سەرجەم هاوولاتیانی تورکیا.

مانگی تشرینی یەکەمی رابردوو، کاتێ کە سەرۆك وەزیرانی تورکیا، "چیللەر" سەردانی واشنگتونی کرد، من و هاوسەرۆکی کومسیونی هلیسینکی، بەرێز "ستینی

هۆیهر[1] "و ژمارهیهك له ئهندامانی كۆنگرێس نامهیهكمان نارد بۆ سهرۆك وهزیرانی تورکیا و داوامان لێکرد دهوڵهتی تورکیا پهیڕهوی له رێگاچارهی سیاسی( نه سهربازی) بۆ کێشهی کورد بکات.

ئێستا پاش ٦ مانگ، من بێ هیوا بوومه، لهبهر ئهوهی هیچ وهڵامێکمان له سهرۆك وهزیرانی تورکیاوه پێنهگهیشتووه. هاوسهرۆك "هۆیهر" نامهیهکی دیکهی نارد بۆ کاربهدهستانی پایهبهرزی تورکیا که پاشان وهڵامی ئهم نامهیه دهخهینهڕوو. من دهمهوێت پاش تهواوبوونی قسهکانم دهقی ئهو نامهیه له بولتهنی ئهنجوومهنی نوێنهران بخهمهڕوو و دیسان هیوادارم که بهم زووانه وهڵامی ئهم نامهیه بدرێتهوه. لهگهڵ ئهمهشدا هاوکات لهگهڵ ئهوهی توندوتیژییهکان پهرهدهستێنێت ، جارێکی دیکه داوا له دهوڵهتی تورکیا دهکهم که له سیاسهتی" گۆپاڵ و گێزهر" دا زۆرتر له گێزهر و کهمتر له گۆپاڵ کهڵك وهربگرێت بۆ چارهسهرکردنی ریشهی ناڕازیبوونی کوردهکان. بارودۆخی ئاسایشی نائاسایی، ژیانی ئاسایی خهڵکی تێکداوه و توانایی ئابووری باشووری رۆژههڵاتی لاواز کردووه. سهربازیچێتی تورکیا بووهته هۆی خاڵی بوونی خهزانهی دارایی تورکیا و پهیوهندییهکانی تورکیای لهگهڵ دراوسێکانی تێکداوه و بووهته هۆی رهخنهگرتنی چاوهدێرانی سهراسهری جیهان له بارودۆخی مافی مرۆڤ له تورکیا. ئهندامانی ٥٣ دهوڵهتی بهشدار له کونفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئهوروپا(CSCE) داوایان کردووه لیژنهیهکی فهرمی چاودێری مافی مرۆڤ بنێرن بۆ تورکیا و بهلهبهر چاوگرتنی ئاستی گرژییهکانی ئێستای باشووری رۆژههڵاتی تورکیا، بهبۆچوونی من لیژنهکانی CSCE ئهم پێشنیارکاریانه پشتڕاست دهکهنهوه.

---

[1] Steny Hoyer

جەنابی سەرۆك، ئێمە لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شانازی بە میراتەکەمان وەك" کورەی تواندنەوەی" ئەتنیکەکان و کولتوورەکان دەکەین. ئێمە دەبیّ زۆرتر شانازی بەتورکیا بکەین لەبەر ئەوەی تورکیا لەمێژە بووە بە" کورەی تواندنەوە". پێکەوەهەڵکردن و لەیەك تێگەیشتن شتێکی زۆر پێویستە بۆ ئەوەی ئەم جۆرە کۆمەڵگانە نەتەقنەوە، بەتایبەت ئەمە بۆ کۆمەڵگای ئەمڕۆی تورکیا شتێکی زۆر پێویستە. بەدڵنیاییەوە توندوتیژی، توندوتیژی زۆرتر لەگەڵ خۆی دێنێت و زیاتر دیموکراسی تورکیا دەخاتە ناو مەترسی. پشتیوانی لە PKK زیاتر دەبێت، هەتا ئەو کاتە کە دەوڵەت ڕێگاچارەگەلی سیاسی پەیڕەو نەکات و کار نەکات بۆ پاراستنی مافەکانی سەرجەم هاوولاّتیانی تورکیا.

ئەمە دەقی ئەو نامەیە کە ئێمە لە ١٤ ی ئۆکتوبری ١٩٩٣ ناردوومانە بۆ سەرۆك وەزیرانی تورکیا

بەڕێز خاتون "چیللەر"، سەرۆك وەزیرانی تورکیا
پێش لەهەموو شتێك پیرۆزباییتان لێدەکەین بەبۆنەی هەڵبژاردنتان وەك سەرۆك وەزیران. هیواداریین قۆناخی سەرۆك وەزیری ئێوە ئاشتی و خۆشبەختی پێوە دیار بێت و چاومان لەوەیە کار بکەین لەگەڵ دەوڵەتی ئێوە بۆ پتەوکردنی پەیوەندییە دۆستانەکانمان لە نێوان دەوڵەتی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو تورکیا و خەڵکەکەمان. تورکیا وەك هاوپەیمانێکی ناتۆ و دۆستی جێگای متمانەی ولاّتە یەکگرتووەکان کە پەیماننامەی کۆتایی هلسینکی واژۆ کردووە،

هەڵکەوتێکی(جوگرافیایی) بێ وێنەی هەیە لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا. ئێمە ستایشی ئەوە دەکەین کە تورکیا کۆمەڵگای خۆی بەرەوپێش بردووە، بەڵام تورکیا بەرپرسیاریشە لەبەرامبەر ئەوەی دامەزراوەگەلە دیموکراتیکەکانی بەهێز بکات و مافی مرۆڤ بپارێزێت و بەرەوپێش بەرێت.

ئێمە دەزانین کە تورکیا لەگەڵ بارودۆخێکی دژواری ئەمنی روبەڕوویە بەڵام لەهەمان کاتدا ئێمە زۆر نیگەرانین بەنیسبەت پەرەسەندنی کردەوە سنووردارکەرەکان و توندوتیژییەکانی دەوڵەتی تورکیا دژی هاووڵاتیانی کورد لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا. بڕیاری ئەم دوییانەی دادگای یاسای بنەرەتی تورکیا بۆ نایاسایی کردنی "پارتی کاری گەل" (HEP) و هەوڵە فەرمیەکان بۆ سەرکوتکردنی چاپ وپەخشی کوردی نیشان دەدات کە مافی ئازادی رادەربڕین بۆ ئەوکەسانە سنووردار کراوە کە بەشێوازی ئاشتیخوازانە پشتیوانی لە بەرەوپێشچوونی مافەکانی کوردەکان دەکەن. کوشتنی رێبەرانی کورد، چالاکانی مافی مرۆڤ و رۆژنامەنووسان بە دستی تورکیا، کەشوهەوای ترس و تۆقان و متمانەنەکردنی کوردەکان بە دەوڵەتی تورکیای دروست کردووە. کوژرانی "مەحمەت سینجار[٢]"، ئەندامی پارلمان، نموونەی سەرەکی ئەو مەترسییەیە کە ئەو کەسانە کە پشتیوانی لە مافە کولتووری و سیاسیە رەواکانی کوردەکان دەکەن، لەگەڵی روبەڕوون. بەبیانووی خەبات دژی تروریزم، هێزەکانی ئاسایشی دەوڵەتی تورکیا بەزۆر هەزاران سڤیل کوردیان لە ماڵ وحاڵی خویان دەر کردووە و سەدان گوندی کوردنشینیان کاول کردووە. بە بۆچوونی ئێمە ئەم

[٢] Mehmet Sincar

سەربازچێتییە توندڕەوانەیە شێوازێکی دیکەی توندڕەوی دروست دەکات و روانگە سیاسی و پێشکەوتووەکانی کوردە میانەڕەوەکان و رێکخراوەکان خراپ دەکات.

دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەئاشکرا کردەوە تروریستیەکانی هەموو کەس، رێکخراو و دەوڵەتەکان شەرمەزار دەکات و دژی هەموو کردەوەیەکە کە هەڕەشە لە سەقامگیری و یەکپارچەیی خاکی تورکیا بکات. بەهەرحاڵ بەبۆچوونی ئێمە تورکیا دەبێ رێز لە ئازادی و مافەکانی سەرجەم هاووڵاتیانی خۆی بگرێت، لەوانە هاووڵاتیانی ناوچەی کوردنشین. بە لەبەرچاوگرتنی پەرەسەندنی ئاستی توندوتیژییەکان لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، وادیارە کە لە باتی پشتبەستنی بەردەوام بە هێزی سەربازی، رێگاچارەیەکی سیاسی دەتوانێت باشترین دەرفەت بڕەخسێنێت بۆ سەرلەنوێ چەسپانەوەی ئاسایش و ئاشتی لەسەراسەری تورکیا و ناوچە.

ئێمە وەك دوست و پشتیوانی تورکیا، هیواداریین کە ئێوە لە جێبەجێ کردنی ئەم مەسەلە یەکلاییکەرەوەیە سەرکەوتوو بن.

لەگەڵ رێزماندا

## ١٧ ی گوڵانی ١٩٩٤ - ئەنجوومەنی پیران
## دیموکراسی لە تورکیا؟ مەهدی زانا ئازاد کەن

بەڕێز دیکۆنسینی:

جەنابی سەرۆك ناچارم ڕووداوێك وبیری ئەنجوومەن بهێنمەوە کە دەربڕی قەسدونیازی ڕوو لەزیادبوون و زۆر مەترسیداری دەوڵەتی تورکیایە بۆ سنووردارکردنی ئازادی رادەربڕینی کوردەکان. لەم پەیوەندییەدا بەداخەوە لێدوانە هاوشێوەکانی خۆمم وەبیر دێتەوە بە نوێنەرایەتی لەلایەن بەندکراوە سیاسیەکان کە قسەیان کردبوو و پاشان بەدەستی کاربەدەستانی سەرەڕۆی کومونیست کە لەپشت"پەردەی ئاسنین[1]" دابوون، چەوسانەوە.

---

[1] لە ئەدەبیاتی سیاسیدا مەبەست لە "پەردەی ئاسنین"، ئەو جیاوازی و ئاستەنگیانەیە کە جیهانی کومونیزمی لە جیهانی غەیرەکومونیزم جیا دەکردەوە. ئەم دەستەواژەیە یەکەمجار لە لایەن "گوبلێزی"ی وەزیری پڕوپاگەندای ئاڵمانیای هیتلەری و نووسەرانی دژبەری بولشویسم بەکاربرا و دەربڕی گەمارۆدانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بوو بۆ ئەوەی پێش لە ئاڵوگۆڕی ئازادی هەواڵ و زانیاری و هاتوچۆی ئازادانەی خەڵك بگیردرێت. چرچیلی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە ئاداری ١٩٤٦ لە لێدوانیکدا هۆشداریدا کە پەردەیەکی ئاسنین لە ناوەڕاستی ئەورووپا دروست بووە و سۆڤیەت دەیەوێت دەسەڵات و دۆکتورینی کومونیستی خۆی پەرە پێبدات و پاشان پێشنیاری ئەوەی کرد کە یەکێتییەکی سەربازی لە نێوان بریتانیا و ئەمریکا دروست بکرێت بۆ ئەوەی پێش لە پەرەسەندنی دەسەڵاتی سۆڤیەت بگیردرێت.(وەرگێڕ)

هەینی رابردوو، مەهدی زانا- کە من پێشتر دیدارم لەگەڵی کردووە و رێزێکی یەکجار زۆرم بۆی هەیە- بەتاوانی لێدوان لە پارلمانی ئەورووپا لە تشرینی یەکەمی ۱۹۹۲ ، حوکمی ٤ ساڵ بەندیخانەی لەسەردرا. جەنابی سەرۆك، مەهدی زانا پیاوی شەرەف و ئاشتیخوازییە کە پتر لە ۳۰ ساڵ لەپێناو مافی مرۆڤ لە تورکیا خەباتی کردووە. مەهدی زانا پێشتر ۱۵ ساڵ لەبەندیخانەدا بووە و ئەشکەنجە کراوە لەبەر ئەوەی بێ دەنگ نەبووە لەبەرامبەر ئەو نادادپەروەرییانە کە بەسەر برا و خۆشکە کوردەکانیدا هاتووە. هاوسەرەکەی مەهدی زانا، واتا لەیلا زانا یەکێ لەو ٦ پارلمانتارە کوردانەی تورکیایە کە لەگەڵ سزای مەرگ روبەڕوو بووەتەوە، بەهۆی ئەو لێدوانانەی کە لەپشتیوانی لە مافەکانی کوردەکان دایوەتی.

جەنابی سەرۆك، من بەداخم نەتەنها بۆ چارەنووسی بنەماڵەی زانا، بەڵکوو بۆ داهاتووی خودی دیموکراسی لە تورکیا. بارودۆخی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا گەیشتووەتە ئاستێك کە توندوتیژی بووە بە هاوبەشترین شێوەی ئاخێو(گوفتمان) لەنێوان تورك و کوردەکاندا. جێگای داخە کە هەزاران کوردی تورکیا ئێستا ناچار بوونە ئاوارەی باکووری عێراق بن واتا هەر ئەو رێگایە بگرنە بەر کە ئاوارە کوردەکانی عێراق گرتیانە بەر کە لەدەستی دەزگای شەڕی سەدام حوسەین هەڵهاتبوون.

هێزەکانی ئاسایشی تورکیا ناوچەیەکی قەڵخانیان لەپاڵ سنووری عێراق دروست کردووە بۆ ئەوەی پێش لە دزەکردنی هێزەکانیPKK بگرن و سەدان گوند کاول کراون و دانیشتووەکانیان ناچارکراون هەڵبێن. ئەم رەفتارەی دەوڵەتی تورکیا بەراوەرد کراوە لەگەڵ پاکتاوی رەگەزی "سربە" کان لە بۆسنیا. کوردەکانی تورکیا، چ لە

ئیستانبول چ دیاربەکر، دەبێ رێگایان پێبدرێت ناسنامەی کولتووری خۆیان دەربڕن و لە پرۆسەی سیاسی تورکیا بەشداری بکەن. بەهەرحاڵ بەرکەنار لە نیگەرانیە گشتیەکانم بەنیسبەت مافی مرۆڤ لە تورکیا، هانای سەرەکی من بۆ قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە(بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە لەسەر ئەو باوەڕەم تورکیا پڕبایەخترین هاوپەیمانی وڵاتە یەکگرتووەکانە) ئەوەیە کە ناتوانم لەبەرامبەر ئەو سیاسەتانە بێ دەنگ بم کە تورکیا پەیڕەوی دەکات و هیچ هیوایەك نییە بەوەی کە کۆتایی بە توندوتیژی بهێنێت. من لەسەر ئەو قەناعەتەم کە ئەم سیاسەتانە زیاتر هەڕەشەیە بۆ دیموکراسی و سەقامگیری ناوچە. تورکیا ساڵانە ٧ بیلیون دولار خەرج دەکات بۆ شەڕ لەگەڵ PKK ، لەکاتێکدا کە دەتوانێت بەم پارەیە کێشە ئابووریە جیدییەکانی تورکیا چارەسەر بکات.

من وەك دۆست و پشتیوانێکی تورکیا ناچارم بڵێم کە بێ هیوا بوومە لەوەی کە دەوڵەتی تورکیا رێگاچارەی سیاسی نەگرتووەتەبەر بۆ ئەو قەیرانە کە بەشێوازگەلی سەربازی چارەسەر ناکرێت و ئەو هەوڵە هەڵنەسەنگێندراوانە کە بۆ سنووردار کردنی ئازادی رادەربڕین دەدرێت.

جەنابی سەرۆك، دوێنێ "ستینی هۆیەر" و من، وەك سەرۆکی کومسیونی هلسینکی، پەیامێکمان نارد بۆ سەرۆك وەزیرانی تورکیا، "تانسۆ چیللەر" و داوامان لێکرد دەستبەجێ مەهدی زانا ئازاد بکات. من دەمەوێت کۆپییەك لە داواکارییەکەی مەهدی زانا لێرە بخەمەڕوو کە ناردوویەتی بۆ پارلمانی ئەورووپا و بەهۆی ئەوە حوکمی ٤ ساڵ بەندیخانەی لەسەر دراوە. حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی تورکیا خۆیان بە پابەند زانیوە بەنیسبەت کونوانسیونە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ کە مافی ئازادی

رادەربڕین لەخۆ دەگرێت. ڕۆژبەڕۆژ زیاتربوونی دەستگیرکردنی ئەو کەسانە کە بەشێوازی ئاشتیخوازانە داوای مافی کورد دەکەن، سووکایەتییە بە دیموکراسی و پشتگوێ خستنی ئەرك و بەرپرسیارتیە نێونەتەوەییەکانی دەوڵەتی تورکیایە.
جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن، جارێکی دیکە داوای دەستبەجێ ئازادکردنی مەهدی زانا دەکەم و داوا لە هاوکارانم دەکەم بەشوێنی ئەم مەسەلەیەدا بچن. ئەمە دەقی ئەو داواکارییەیە کە مەهدی زانا بەهۆی ئەوە ئێستا لە بەندیخانەدایە:

**داواکارییەك لەلایەن مەهدی زانا بۆ پارلەمانی ئەورووپا، چالاکانی مافی مرۆڤ و چاپەمەنیەکان**

**٢٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٢**

---

سەرەتا لەناخی دڵمەوە سپاستان دەکەم بۆ ئامادەبوونتان لێرە لەم کونفرانسە چاپەمەنییەدا
ناوی من "مەهدی زانا"یە، تەمەنم ٥٢ ساڵە و ماوەی ٣٠ ساڵە بۆ بەفەرمیناسینی مافەکانی گەلی کورد لە تورکیا خەبات دەکەم. سەرەڕای ئەو راستیە کە من قەد دەستم نەبردووە بۆ هیچ کردەیەکی توندوتیژانە، ناچار کرام بەهۆی بیرو بۆچوون و خەباتی ئاشتیخوازانە بۆ گەلەکەم ١٥ ساڵ لە ژیانم لە بەندیخانەکانی تورکیا تێپەڕ بکەم. من یەکێ لەو کەسانە بووم کە بەشێوەیەکی پەرجووئاسا(موعجزە) لە بەندیخانەی دۆزەخینی دیاربەکر رزگارم بوو کە تێیدا ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێیانم بەهۆی ئەشکنجە گیانیان لەدەستدا. ئەو ئەشکەنجە درندە "سادیستی"(سادیسم جۆرە نەخۆشییەکی دەروونییە- وەرگێڕ) و بەزمان نەهاتووە کە من لە بەندیخانەی دیاربەکر

بەچاوی خۆم بینیومە ئێستا له زمانی تورکی بۆ زمانی فەرانسی وەردەگێڕدرێتەوە و له"گۆڤاری بەربەرییەتی" دا بڵاو دەبێتەوە. رزگار بوونی من قەرزاریاری وەگەڕخستنی بیروڕای گشتی، NGO کان و هاوکارە شارەدارە رۆژئاواییەکانم که بەلایەنگری له من کاریان کرد. من بۆیە دەڵێم هاوکارە شارەدارە رۆژئاواییەکانم، لەبەر ئەوەی خۆم شارەداری دیاربەکر بووم که پایتەختی سیاسی- کولتووری کوردستانی تورکیایە. دانیشتوانی ئەم شارە که ژمارەیان لەساڵی ۱۹۷۷ نزیکەی ٤۰۰ هەزارکەس بووە، لەرێگای دەنگدانی راستەوخۆ منیان وەك شارەدار هەڵبژارد. ئەو کاتە من کاری بازرگانی بەرگدووریم دەکرد و هەڵسووڕاوێکی سەربەخۆ بووم. کودیتای سەربازی ئەیلوولی ۱۹۸۰ ئەنجوومەنی شارەوانی ئێمەی هەڵوەشاندەوە، من دەستگیر کرام و تا مایسی ۱۹۹۱ له بەندیخانەدا بووم، پاش ئەوە دوو جارێکی دیکە دەستگیر کرام. ئێستا من(هەروەك هەموو ئەو کوردانەی که به تاوانی"جیاییخوازی" حوکمیان لەسەر دراوە) هەتا کۆتایی ژیانم لەمافە سیاسیەکانی خۆم بێ بەش کراوم. ئەمەیە دیموکراسی تورکیا.

سەرئەنجام دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە که من هاوکات لەگەڵ ئەوەی درێژە بەخەباتە ئاشتیخوازانەکام دەدەم بۆ مافی ۱۵ میلیون کورد له تورکیا، سەربە هیچ حیزب یا بزووتنەوەیەك نیم، کەوابوو وەك هەڵسووڕاوێکی سەربەخۆی کورد دەنگی هاواری خۆم دەگەیەنم به ئێوە و لەرێگای ئێوەوە به بیروڕای گشتی و ویژدانی جیهانی شارستانی.

کوردەکانی تورکیا ئێستا یەکێ له دراماتیکترینی ساتەکانی مێژووی خۆیان تێپەڕ دەکەن. شار و گوندەکانمان بەشێوەیەکی سیستماتیك کاول کراون و دارستانەکانمان

دهسوتێنرێن. دهوڵهتی تورکیا بهکهڵك وهرگرتن له شێوهگهلی سهربازی و ئابووری، خهڵکی کوردی ناچار کردووه سهرزهمینی باوباپیرانی خۆیان چۆڵ بکهن. کچان و ژنانی گوندنشین لهلایهن سهربازانی تورکهوه دهستدرێژی جنسیان لێکراوه و سوکایهتیان پێکراوه. خانووهکانمان رووخێنراون، کورده رۆژنامهنووس و رۆشنبیرهکان بهشێوهیهکی گومانی یهك له دوای یهك دهکوژرێن. ئهو کهسانه که دهستگیر دهکرێن له کاتی لێپرسینهوه تا ئاستی مهرگ بهشێوهگهلی بهربهری ئهشکهنجه دهدرێن. بهندیخانهکان پڕن له منداڵ و مێرمنداڵی ژێر ۱۸ ساڵ، رێکخراوه یاسایی و نایاساییه دهوڵهتیهکان که به"یهکینهکانی دژه گریلا" یا "یهکینه تایبهتهکان" ناسراون رێگهیان پێدراوه ههر کارێك پێیان خۆشه، بیکهن و مهرگ و ژیانی خهڵك بهدهستی ئهوانۆیه. "ئهنجوومهنی ئاسایشی نیشتمانی تورکیا" لهدوایین کردهوهی خۆیدا، هێزهکانی ئاسایشی تورکیای لهوه پاراستووه که که بههۆی ئهو کارانه که ئهنجامی دهدهن لێپرسینهوهیان لهگهڵ بکرێت و چاپهمهنیهکانیشی لهوه قهدهخه کردووه که ئهم رووداوانه بڵاو بکهنهوه.

زمانی زگماکی ئێمه واتا زمانی کوردی هێشتا قهدهخهیه و ئهو کهسانه که بهم زمانه قسه بکهن دهستگیر دهکرێن و له بنکهی پۆلیس ههڵسوکهوتی خراپیان لهگهڵ دهکرێت. ئهمه یهکێ له نمونه یهکجار زۆرهکانی ئهم قهدهخهبوونهیه: نزیکهی ۱۵ رۆژ لهمهوپێش له دیاربهکر، هێزهکانی ئاسایش چوونهته ناو زهماوهندی مافناسێکی کورد بهناوی "فیکرهت ئاکیاس[1]" و ئامێره موزیکه کوردییهکانیان شکاندووه و گهلێ کهسیان(لهوانه ۷ مافناس) دهستگیر کردووه.

---

[1] Fikret Akias

ئیزگە تەلەڤیزیونە حکوومەتیەکان لەرێگای بەرنامە پڕوپاگەندایيەکان، خەڵکی تورك هان دەدەن دژی کوردەکانی دانیشتووی ئاناتۆلی راپەڕن و لەگەڵ کوردەکان مامەڵە نەکەن. دوایین زنجیرە رووداوی توندوتیژی دژی کوردەکان لەشاری "فەتحییە"[٢] لە رۆژئاوای تورکیا، بەڵگە و نیشانەی ئەم بارودۆخە دژوارەیە. دانیشتووانی کورد لەناوچەی خۆیان لەگەڵ شەپۆلی ئازار و ئەزیەت و توندوتیژی رووبەڕوونە و ئیدی هیچ شوێنێك شك نابەن پەنای بۆ ببەن کە تێیدا لە ئاسایشدا بژین. کوردەکان هەمیشە لە بەردەم مردندان. مەترسی هەڵسانی شەڕیکی رەگەزی لە نێوان کورد و تورك رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێت. من بەسەدان کاتژمێر ناتوانم باسی ئەو کوشتن، ئەشکەنجە و هەڵسوکەوتە خراپانە بکەم کە بەچاوی خۆم بینیومە و ئەو تراژیدییە کە بەسەر گەلەکەی مندا دێت(کە تەنانەت ئێستاش کە لەبەرامبەر ئێوەدا راوەستاوەم بەردەوامە) بۆ ئێوە باس بکەم. لەبەشی "پریسکیتدا" ئێوە دەتوانن گەلێ راستی، کەسایەتی و شاهیدی عەینی لەبارەی ئەم مەسەلەیە بدۆزنەوە. ئایا ئێمە دەتوانین وێنای ئەوە بکەین کە لە کۆتایی سەدەی ٢١ ، هێشتا گەلێك لە جیهاندا هەبێ کە لە کەڵکوەرگرتن لە زمانی زگماکی خۆی و دەربرینی شوناسی خۆی بێ بەش بێت؟

بەڵێنگەلی دیموکراتیك وەك لێدوانەکان دەربارەی رێزگرتن لە مافی مرۆڤ بەسەر کەشوهەوای هەڵبژاردنەکانی پارلمان لە تشرینی یەکەمی ١٩٩١دا زاڵ بوو. لەسەروبەندی کۆبوونەوەکانی هەڵبژاردندا، بەڵێنەکانی رێزگرتن لە ماف و داواکارییەکانی گەلی کورد لەلایەن ئیتلافی DYP و SHP خرایە روو کە هۆکارەی ئەوە بوو کە ئەوان لە پشتیوانی بەرفراوانی کوردەکان لە کاندیداکانی پارتی

---

[٢] Fethiye

HEP که لەراستیدا هیوایەکی نوێی لەنێوان کوردەکان دروست کرد، نیگەران بوون.
سەرۆك وەزیرانی ئێستای تورکیا، "دمیرل" دروست ٥ رۆژ پاش ئەوەی بوو بە سەرۆك وەزیران، لە لێدوانێکی تەلەڤیزیونیدا کە هەموو کەسێکی تووشی سەرسوڕمان کرد، بەگشتی رایگەیاند کە لەمەوبەدوا دەوڵەتی تورکیا "راستی کورد" لە رۆژهەڵات و رۆژئاوای وڵات بەفەرمی دەناسێت و سیاسەتی یەکسانی کورد و تورك و ژیانی هاوبەشی گەلی کورد و تورك دەگرێتەبەر.
بەڕێز "دمیرل" هەروەها باوەڕی خۆی بە دیموکراسیەکی بێ سنوور و کۆتاییهێنان بە سەرجەم یاسا دژە دیموکراتیکەکان و پێشخستنی یاسایەکی بنەڕەتی نوێ کە راستی هاوچەرخ و بایەخەکان لەبەرچاو بگرێت، راگەیاند. بەڵام لەوکاتەوە تا ئێستا تەنانەت یەك یاسای دژە دیموکراتیك کە لە کودیتا سەربازییەکە بەمیرات ماوەتەوە و ئامانجی بنبڕکردنی مافەکانی گەلی کوردە، هەڵنەگیراوە، بەپێچەوانەوە یاساگەلی سەرکوتکەری نوێ درێژ کراونەتەوە کە لە خەون و خەیاڵی رژێمی سەربازی ئیلهام دەگرێت. ئێستا لە تورکیا بەپێچەوانەی نیگەرانی رۆژنامەنووسان و رۆژنامەنووسان، تەنانەت یەك لێپرسینەوە یا دادگایی کردن لەگەڵ ئەو هێزانە نەکراوە کە ئاگریان لە شارگەلێك وەك شەرناخ، جزیرە، کولپ، وارتۆ و گەلێ شاری دیکە بەرداوە و کاولیان کردوون. ئێوە دەتوانن لیستی تەواوی ئەم شارانە لە "پریسکیتدا" ببینن. کۆبوونەوە لەسەر دیموکراسی و مافی مرۆڤ لەپارێزگا کوردنشینەکان قەدەخەیە. دەوڵەتی تورکیا بەتەواوی هێزی خۆی، دەنگوباسی سەربەخۆ لەبارەی بەربەرییتی ئەو شەڕە کە لە کوردستاندا بەڕێوەدەچێت، سانسۆر دەکات. تەنانەت یەك رۆژنامەنووس رێگەی

پێنادرێت سەردانی شوێنی ئەپوراسیونەکانی سوپا بکات. تەنانەت پارلمانتارەکانی ناوچەش مافی ئەوەیان لێ زەوت کراوە کە باسی نیگەرانیەکانی خەلکی ناوچە بکەن. دەولەتی نوێی تورکیا سەرجەم مافەکانی بەڕێوەبردنی ناوچەی بەخشیوە بە سوپا. ئێستا کوردستان لەژێر گەمارۆیەکی رانەگەیەندراودایە و سوپا دەسەلاتی تەواوی بەسەردا هەیە. نزیکەی ۳ هەفتە پێش، لیژنەی IFHR سەردانی کوردستانی تورکیای کرد بەلام دەولەتی تورکیا ریگای پێنەدان سەردانی شاری شەرناخ و جەزیرە بکەن. با خودی ئەم لیژنەیە باسی بارودۆخی ئەم ناوچەیە بکات.

بەبیروباوەڕی من، رژیمی تورکیا قەد دەولەتیکی دیموکرات نەبووە. چەمکی دیموکراسی لە تورکیا تەنها لە چوارچێوەی لیدواندا بووە بۆ فریودانی جیهانی شارستانی. ئەگەر ئیمە بەوردی کردەوەکانی دەولەتی ئیستای تورکیا لە سالی رابردوو هەلبسەنگێنین هیچ هەنگاوێکی زیاتر بەرەو رێزگرتن لە مافی مرۆڤی تێدا نابینین. من پێش لە هەموو شتێك داوا لە هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە بەپەرۆشن بۆ ئازادی و دیموکراسی کە کار بکەن بۆ ئەوەی سیاسەتی دەولەتی تورکیا رابوەستێنن کە ئامانجی لەناوبردنی کولتووری جیاوازی گەلی کوردە و کار بکەن بۆ ئەوەی سەرەنجام رێگە بەم گەلە بدرێت کە لە خۆشی و ئاشتیدا بژیت. من داوا لە هەموو رۆژنامەنووسان، پارلمانتاران و NGO کان دەکەم (کە لە ناوچەدان) کە ئەو دیواری بێدەنگییە بروخێنن کە گەمارۆی لە ناوچوونی ولات و گەلەکەی منی داوە.

## ٢٣ ی گوڵانی ١٩٩٤ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## دواین بەرنامەی دیموكراسیزایونی توركیا

بەڕێز ستینی هۆیەر[١]، نوێنەری ئەیالەتی میریلەند:
جەنابی سەرۆك، ١٨ ی مایس، دەوڵەتی ئیتیلافی توركیا بەرنامەیەكی چاكسازی ئاشكرا كرد بۆ ئازادی چالاكی سیاسی لە توركیا. ئەم بەرنامەیە بریتیە لە پێداچوونە بەسەر یاسای بنەڕەتی و هەموار كردنی ٦٢ خاڵی یاساكانی ئێستا یا یاسا تازە پەسەندكراوەكان. مەبەستی سەرەكی ئەم بەرنامەیە هەڵگرتنی كەندوكۆسپەكانی سەر ڕێگای چالاكی سیاسی كۆڕوكۆمەڵەكان، یەكێتی كرێكاران، خوێندكاران و كەسایەتیە ئاكادیمیكەكانە كە حكومەتی سەربازی بەسەریانیدا سەپاندووە. ئەم بەرنامەیە هەروەها دامەزراندنی نووسینگەی مافی مرۆڤ لەخۆ دەگرێت و دەیەوێت وێنەی مافی مرۆڤی توركیا لە دەرەوە باشتر بكات و یارمەتی بدات بە دروستبوونی پەیوەندی نزیك لەگەڵ یەكێتی ئەورووپا كە ڕێوشوێنەكانی ئەم یەكێتیە لە ١٩٩٥ وە دەكەوێتە بواری جێبەجێ كردنەوە.
جەنابی سەرۆك ئەم دەستپێشخەریانەی دواییە نیشاندەری هەوڵە گرنگەكانی توركیایە بۆ بەهێزكردنی دیموكراسی. ئەم هەنگاوانە لەكاتێكدا هەڵدەگیردرێت كە توركیا لەگەڵ كۆمەڵێك كێشەی گرنگی ئابووری و بەرخۆدانی ڕۆژبەدوای ڕۆژی میلیشیا كوردەكان(PKK ) ڕووبەڕوویە. دەمەوێت ئەوەتان وەبیر بهێنمەوە كە بەهەرحاڵ

[١] STENY H. HOYER

بەرنامە دیموکراتیزاسیونەکانی پێشووی تورکیا یا لە لایەن پارلّمانی تورکیاوە رەت کراونەتەوە یا نەکەوتوونە بواری جێبەجێ کردنەوە. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو کێشە جیدییانە کە دەولّەتی تورکیا لەگەلّیدا رووبەڕوویە، هیوادارم ئەم بەرنامەیە بەخێرایی پەسەند بکرێت و بەتەواوی بکەوێتە بواری جێبەجێ کردنەوە.

جەنابی سەرۆك، هاوکات لەگەلّ ئەوەی نامەوێت لە بایەخی ئەم هەنگاوە ئەرێنییانەی دەولّەتی دەسەلاّتداری ئیتیلافی تورکیا کەم بکەمەوە، بەلاّم دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە دیموکراسی لە تورکیا بە جیدی کەوتووە ناو مەترسی لەبەر ئەوەی خەلّك تەنها بەهۆی دەربڕینی بیروڕای خۆیان دەستگیر دەکرێن. ٦ پارلمانتاری کورد بەناوەکانی، خەتیپ دیجلە، ئورهان دوغان، سەلیم ساداك، لەیلا زانا، ئەحمەد تورك و مەحمووت ئالّیناك[1] بەهۆی دەربڕینی بیروڕای ئاشتیخوازانەی خۆیان بە لایەنگری لە مافی کوردەکان، لەگەلّ سزای مەرگ بەرەوڕوو بوونەتەوە. هەفتەی رابردوو، مەهدی زانا، لە هەلّسووڕاوانی سەربەخۆی مافی کوردەکانیش بە تاوانی دەربڕینی بیروڕای خۆی، خرایە بەندیخانە.

جەنابی سەرۆك، تایبەتمەندی سەرەکی دیموکراسی، تەحەمول کردنی هەموو بیروڕا ناتوندوتیژەکان و ئالّوگۆری ئازادی بیروڕایە، تەنانەت ئەگەر بەدلّی خەلّك بەگشتی نەبێت. سەرەڕای نیاز و نیەتی ئەوکەسانە کە ئەو پێشنیارە چاکسازەخوازانە نوێیانە خستووەتەڕوو، بەرپرسیاریتی تورکیا بەنیسبەت دیموکراسی بەردەوام دەچێتە ژێر پرسیار هەتا کاتێك کە بەندکراوە سیاسیەکان تەنها بەهۆی دەربڕینی بیروڕاکانیان لە بەندیخانەدا بمێننەوە.

---
[1] Mahmut Alinak

## ۲۳ ی حوزەیرانی ۱۹۹٤ - ئەنجوومەنی نوێنەران
## دیموکراسی تورکیا: هەنگاوێکی دیکە بەرەو قوڵایی

بەڕێز دیکۆنسینی:
جەنابی سەرۆك، من ناچارم جارێکی دیکە نیگەرانی توندی خوم دەرببڕم بەنیسبەت کاروباری تورکیا. ئەگەر من نەگەیشتبامایە ئەو قەناعەتە کە تورکیا یەکێ لە گرنگترین هاوپەیمانەکانی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە ئەوەندە بێ هیوا نەدەبووم کاتێ کە دەبینم دەوڵەتی تورکیا یاسای بنەڕەتی ئەو وڵاتە دەخاتە ژێر پێ و بەرپرسیاریەتییەکانی خۆی بەنیسبەت مافی مرۆڤ پێشێل دەکات.
پێنجشەمەی رابردوو، ۱٦ ی حوزەیران، کاتێ کە دادگای باڵای تورکیا ،"حیزبی دیموکراتی" لایەنگری کوردەکان(DEP) ی قەدەخەکرد و پاش هەڵسووکەوتێکی سووکایەتیپێکەرانە ۱۳ کەس لە ئەندامانی DEPی لە پارلمان بەهۆی لێدوانەکانیان دەرکرد، نیگەرانی و بێ هیوایی من گەیشتە لووتکەی خۆی. ۱۳ کەس لە ئەندامانی بەهەق هەڵبژێردراوی پارڵمانی تورکیا لەپارلمان دەرکران، بە هۆی ئەو داواکارییە کە حیزبی DEPساڵی پار دەری کرد کە تێیدا داوای دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانەی بۆ کێشەی کورد کردبوو. ٥ کەس لەئەندامانی پارلمان کە لە سەرەتای مانگی ئادارەوە بێ راگەیاندنی سووچەکەیان، لە بەندیخانەدان، ئێستا بەتاوانی داکۆکی کردن لە مافی هاووڵاتیانی کوردی تورکیا لەگەڵ سزای مەرگ بەرەوڕوون. ٦ ئەندامی دیکەی پارلمان لە تورکیا هەڵهاتوون و من ئاگادارم کە داوای مافی

پەنابەرییان لە دەوڵەتی بەلژیکا کردووە. دو ئەندامی دیکەی پارلمان لەسەرویەندی گیراندان.

جەنابی سەرۆك من لەگەڵ چەند کەسێك لەم پارلمانتارانە و پارلمانتارەکانی دیکە دیدارم کردووە کە تەنها بەهۆی دەربڕینی بیروڕای خۆیان ئێستا لەبەندیخانەکانی تورکیادان. من لەمە دەترسم.

جەنابی سەرۆك لەکام جۆرە دیموکراسیدا هەیە کە یاسادانەرەکانی لە بەندیخانەدا بن یا لە ترسی ئەوەی دەستگیر نەکرێن داوای پەنابەری سیاسی بکەن. یەکێ لەم ئاکامە نەخوازراوەکانی بڕیاری دادگا بۆ دەر کردنی ئەندامانی DEP ئەوەیە کە ئەگەر ٢٤ کورسی لە ٤٥٠ کورسیەکەی پارلمان چۆل بێت، دەبێت سەرلەنوێ هەڵبژاردنی لاوەکی ئەنجام بدرێت. ئەگەر ئەو ٤ نوێنەرە کوردە کە لە DEP دەستیان لە کارکێشاوەتەوە، لە پارلمان هاتبانە دەرەوە، دەبوایا لەماوەی ٣ مانگدا هەڵبژاردن بەرێوە چووبایا.

جەنابی سەرۆك دەمەوێت لەسەرەتادا ئەوە روون بکەمەوە کە دەبێ ئەم هەڵبژاردنە نوێیە ئەنجام بدرێت و دەبێ دەوڵەتی ئێمە و گەلێ لە چاودێرانی نێونەتەوەیی غەیرە دەوڵەتی هەڵبژاردنەکان، چاودێر بنێرن بۆ تورکیا بۆ ئەوەی رێوشوێنە نێونەتەوەییەکانی هەڵبژاردن جێبەجێ بکرێت. لەمە زیاتر لە سایەی پێشهاتەکانی ئەم دواییە، کومسیونی هلسینکی(کە من سەرۆکیمی) لە کۆبوونەوەکانی داهاتووی "کونفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا(CSCE ) بەشداری دەکات و پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە لێژنە فەرمیەکانی CSCE بنێردرێن بۆ تورکیا بۆ ئەوەی چاودێری بکەن بەسەر خراپبوونی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا.

جەنابی سەرۆك، ئەوە كە لەپەیوەندی لەگەڵ خراپتر بوونی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە توركیا زۆر مەترسیدارە، خێراتربوونی رەوتی بەتاوانزانینی دەربڕینی بیروڕایە. دەربڕینی وشە و بیروڕا (بێ لەبەرچاو گرتنی ناوەرۆكەكەی) لە هەموو سیستمە دیموكراتیەكاندا تەحەمول دەكرێت. توركیا وەك دەوڵەتیك كە بەشدارە لە كونفرانسی ئاسایش و هاوكاری ئەوروپا(CSCE) و راگەیاندننامەی جیهانی نەتەوە یەككگرتووەكانی دەربارەی مافی مرۆڤ و كونوانسیونی جیهانی ئازادییە سیاسی و مەدەنیەكانی واژۆ كردووە، خۆی دەرەوس كردووە بەنیسبەت پاراستنی هەموو شێوازەكانی رادەربڕینی ناتوندوتیژانە. بڕیاری توركیا بۆ دەركردنی ئەو ۱۳ پارلمانتارە بەهەق هەڵبژێردراوە بەهۆی لێدوان یا واژۆكردنی بەڵگەنامە، سووكایەتییە بە سەرجەم یاسادانەرە دیموكراتیكەكان.

جەنابی سەرۆك، ئاشكرایە كە هیچ وڵاتیك، لەوانە وڵاتی ئێمە لەبەرامبەر كەوتنە ناوی مەترسی مافی مرۆڤ بەتەواوی پارێزراو نییە. مەسەلەی كوردەكانی توركیا، مێژوویەكی دووروودرێژ و ئاڵۆزی هەیە كە بەداخەوە رۆژبەرۆژ توندوتیژی زیاتر دەیتەنێتەوە. لەكاتێكدا كە توركیا لە قەیرانێكی جیدی ئابووریدایە، دەوڵەتی توركیا و سوپای توركیا ساڵێنە پتر لە ۷ بیلیون دولار بۆ شەڕ لەگەڵ PKK خەرج دەكەن بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا PKK درێژە بە ئوپەراسیونەكانی دەدات و رۆژبەرۆژ لایەنگری زۆرتر دەبێت. بەداخەوە تاكتیكە زاڵمانەكانی هێزەكانی ئاسایش كە پتر لە هەزار گوندی كوردنشینیان لە ماوی ۱۸ مانگی رابردوودا كاول كردووە، بووەتە هۆی نامۆ بوونی كوردەكان لە دەوڵەتی توركیا و پشتیوانی كردن و هاوخەم بوونیان لەگەڵ كوردە توندڕەوەكان. لەمەزیاتر، بەهۆی بەتاوانبار زانینی تەنانەت دەربڕینی میانەڕەوانەی

نارەزایەتی کوردەکان، دەوڵەتی تورکیا ئاخێوی رەوا لە نێو چوارچێوەیەکی دموکراتیك دەخەنکێنێت و ئەو رێگایە لە هاوولاتیەکانی دادەخات تا بەشێوازی یاسایی، بێ هێوایی خۆیان لە بارودۆخەکە دەربڕن. لەکاتێکدا کە هیچ کەس حاشا لە مافی تورکیا بۆ پاراستنی هاوولاتیانی لەبەرامبەر تروریزمدا ناکات، ئەمە نابێت بە بەهای پێشێل کردنی مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ ئەنجام بدرێت.

جەنابی سەرۆك، لەپێناو ئاشتی و سەقامگیری ناوچە، داوا لە رێبەرانی مەدەنی و سەربازی تورکیا دەکەم زیاتر بەسیاسەتە پێکەوە هەڵنەکەرو نەگونجاوەکانیان بەنیسبەت هاوولاتیانی کوردی تورکیادا بچنەوە.

هیچ هیوایەك بە چەسپانی ئاشتی نامێنێت ئەگەر دەنگی هەموولایەنەکان کپ بکرێت و ناچار بکرێن هەڵویستی توندڕەوانەتر بگرنە بەر. سیاسەتگەلێکی وەها پرسیارگەلی جیدی دەهێنێتە ئاراوە دەربارەی توانایی دیموکراسی تورکیا بۆ وەلامدانەوە بە پێداویستییە زۆر پێویستەکانی کۆمەڵگایەکی مودێرنی چەند ئەتنیکی. لەمەزیاتر، جەنابی سەرۆك سەرەڕای بەیەك گەیشتنەوەی بەرژەوەندییەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێمە لەگەڵ تورکیا لە سەر گەلێ مەسەلەی جۆراوجۆر، بارودۆخی روولەخراپی مافی مرۆڤ لە تورکیا رۆژبەرۆژ ئەوە ئەستەمتر دەکات کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە دەوری سەرەکی تورکیا لەسیاسەتەکانی ناوچەدا بکات.

لەئەنجامدا، جەنابی سەرۆك تکا لە دەوڵەتی تورکیا دەکەم رێگاچارەیەکی سیاسی پەیڕەو بکات بۆ بارودۆخی کورد. ئێوە نابێت رەخنە لە من بگرن کە بۆ باسی کێشەکە دەکەم بەلام رێگاچارەی خۆم ناخەمەڕوو، بەلام هاوڕام لەگەڵ هەندێ لە

بیرۆکەکان بۆ کەمتر کردنەوەی قەیرانەکە. بەبۆچوونی من توخمی سەرەکی ڕێگاچارەی سیاسی بۆ کێشەی کورد لە تورکیا ئەوەیە کە میتودە توندوتیژەکان لە میتودە ناتوندوتیژەکان بۆ داکۆکی کردن لە ئامانجی هاوولاتیانی کوردی تورکیا جیابکرێتەوە. بەهەمان شێوە، PKKش بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسیەکانی، دەبێ دەست لەتوندوتیژی و پێداگرتن لەسەر سەربەخۆیی(کوردستان) هەڵبگرێت. ڕاگەیاندنی ئاگربەستێکی دولایەنە دەتوانێ هەنگاوی یەکەم بێت بۆ پێکهاتنی دیالوگی سیاسی لەگەڵ هێزە کوردە میانەڕەوەکان. لە کەشوهەوایەکی وەهادا داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکەم ئەم هەنگاوانە هەڵبرگرێت:

یەکەم، ڕێگە بە سەرجەم حیزبە سیاسیە ناتوندوتیژەکان بدات لە ژیانی سیاسیدا بەشداری بکەن.

دووەم، کەندوکۆسپەکانی سەر ئازادی ڕادەربڕین، لەوانە تەگەرەکانی یاسای دژەترور لاببات.

سێیەم، حاڵەتی نائاسایی (لە باشووری ڕۆژهەڵات) لاببات.

چوارم، سیستمی "گاردی گوند" هەڵبوەشێنێتەوە.

پێنجەم، هەموو کەندوکۆسپەکانی دەربڕینی زمان و کولتووری کوردی هەڵبگرێت.

شەشەم، کەندوکۆسپەکانی بڵاو بوونەوەی بەرنامەی تەلەڤیزیونی و ڕادیویی و مۆزیک و چاپ و پەخش بە زمانی کوردی لاببات.

حەوتەم، ئینیستیتۆیەکی دەوڵەتی بۆ توێژینەوەی کوردی دابمەزرێنێت و ڕێگا بەوە بدات قوتابخانەکان بە زمانی کوردی پەروەردە بدەن.

هەشتەم، کونفرانسێکی رسمی لە ئاستێکی باڵا بەڕێوە ببات بۆ تاوتوێ کردنی هەموو لایەنەکانی پەیوەندی کورد ـ تورك.

جەنابی سەرۆك بەبۆچوونی من هەنگاوگەلێکی وەها دیموکراسی مەدەنی تورکیا بەهێز دەکات و توندوتیژی ریشەکەش دەکات و کەشەوهەوای سەرکوت لەناو دەبات- کە ژیانی سیاسی و ئابووری لەسەرانسەری تورکیا کپ کردووە- و رەوتی دوو جەمسەر بوونی تورك و کورد پێچەوانە دەکاتەوە و کورد و تورك لێك نزیك دەکاتەوە. هیوادارم دەوڵەتی تورکیا هەوڵ بدات بۆ پاراستنی ئازادی رادەربڕین و میتودگەلی غەیرە سەربازی پەیڕەو بکات بۆ چارەسەر کردنی بارودۆخی دژواری کورد بۆ ئەوەی وڵاتی تورکیا لەمەزیاتر تووشی بشێوی و ئاڵۆزی نەبێت.

## ٢٨ ی تەموزی ١٩٩٤ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

## سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان لەسەر بنەمای ئەخلاقە یا بەرژەوەندییە جوگرافیاییەکان؟

خاتوون ئیلیزابێت فۆرس[1]:

جەنابی سەرۆك، ئەمڕۆ لەیلا زانا لەبەندیخانەدایە و لەگەڵ سزای مەرگ بەرەوڕوویە.
لەیلا زانا لەگەڵ ٦ ڕێبەری کوردی هەڵبژێردراوی دیکە تومەتی خیانەتیان خراوەتە پاڵ و هەموویان لەگەڵ سزای مەرگ بەرەوڕوون. سووچی ئەم ٦ کەسە چییە، جەنابی سەرۆك؟ سووچی ئەوان دروست ئەو کارەیە کە من ئێستا لێرە دەیکەم واتا باسکردن لەکێشەی مافی مرۆڤ.

جەنابی سەرۆك، ئەم پارلمانتارە کوردانە لە عێراقدا نین تا بڵێین ڕەفتاری عێراق لەگەڵ خەڵکی کورد تاوان دژی مرۆڤایەتییە و لەراستیشدا هەروایە. نەخەیر، ئەم پارلمانتارانە لە تورکیان کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لێدەکات و بەشێوازێکی بەرفراوان یارمەتی دەدات و سازوبەرگی سەربازی دەداتێ.
جەنابی سەرۆك، هەرکاتێ کە ئەندامانی کۆنگرێس سەرکووت و ئەشکەنجە و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ پروتستۆ دەکەن، پێمان دەڵێن لەبیرتان نەچێت تورکیا لە رووی ئیستراتژیکیەوە بۆ ئێمە(وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) گرنگە. ئایا ئەخلاقی ئێمە پەیوەندی بە جوگرافیاوە هەیە یا بیروباوڕەکانمان؟
ئێستا کاتی ئەوەیە کۆنگرێس داوای ئازادکردنی ئەم ٦ پارلمانتارە کوردە بکات.

---

[1] Ms. FURSE

## ٤ ی ئابی ١٩٩٤ - ئەنجوومەنی پیران
## دیموکراسی له تورکیا له مەترسیدایه

بەڕێز دیکۆنسینی:
جەنابی سەرۆك، ئەمڕۆ رۆژێکی خەمناکە بۆ دیموکراسی له تورکیا. ئەمڕۆ ٦ پارلمانتاری کورد له لایەن دادگای ئانکاراوە، سزای مەرگیان بۆ دەرکرا بەهۆی دەربڕینی بیروڕا سیاسیەکانیان کە تورکیا وەك خیانەت چاوی لێدەکات. بەگشتی ١٣ پارلمانتاری بەهەق هەڵبژێردراوی سەربە حیزبی DEP لە پارلمان دەرکراون کە ٦ کەسیان لە تورکیا هەڵهاتوون، کەوابوو ئەم ٦ کەسە بێ دەنگ نابن.

جەنابی سەرۆك، سەرم سووڕماوە کە چۆن ئەم شتە لە تورکیا روو دەدات کە دوستێکی وەفادار و هاوپەیمانی ناتۆیە و دەوڵەتەکەی بەشدارە لە CSCE کە کاربەدەستەکانی(CSCE) بەردەوام جەخت لەسەر جێبەجێکردنی دیموکراسی و رێوشوێنە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ دەکەنەوە. ئەم دادگاییکردنە لەبەرچاوی چاپەمەنی جیهان روو دەدات و سەدان پارێزەر، پارلمانتارانی وڵاتانی بیانی، چالاکانی مافی مرۆڤ و کەسانی دیکە دەیانەوێت نیگەرانی خۆیان لەم کردەوەیە دەربڕن و پشتیوانی لە پارلمانتارە کوردەکان بکەن. ئەم دادگایە زێدەباری ئەوەی بەروونی نیشانی دا چۆن ئازادی رادەربڕین و چالاکی سیاسی لە تورکیا سنووردار کراوە، سەرنجی ئێمەی بەرەولای رێگرتن لە دیموکراسی لە تورکیا راکێشا.

جەنابی سەرۆك، من سەرەتا لە پشتیوانی گشتی تورکەکان لە هەڵمەتی دەمارگرژانەی دەوڵەتی تورکیا دژ بە ئەندامانی DEP ترسام بەڵام ئەوەی کە رۆژبەرۆژ روونتر دەبێتەوە ئەوەیە کە بیروڕای گشتی خەڵکی تورکیا بەئاشکرا لە لایەن میدیا سەرەکیەکانی ئەم وڵاتە کە لە کونترۆڵی دەوڵەت یا لایەنە سیاسیەکانی دیکەدایە، چەواشە کراوە. بەنیسبەت مەسەلەی مافی کوردەکان و شەڕ لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، میدیاکان لە پێشەوە شەڕاشۆیی دەکەن یا بەتوندی زانیارییەکان سانسۆر دەکەن. بە باوەڕی من هەتا کاتێك کە میدیا سەرەکییەکانی تورکیا لەکونترۆڵی لایەنە سەربازی و سیاسیەکاندا بن و رۆژنامەنووسان و کەسایەتیەکانی دیکە بێ دەنگ بن، خستنەڕووی زانیاری راست و دروست بۆ بیروڕای گشتی نالوێ.

جەنابی سەرۆك، ئازادی رادەربڕین و چاپەمەنی سنوورنەدار، پێشمەرجی کۆمەڵگا دیموکراتیکەکانە. چاپەمەنیەکانی تورکیا دەبێ بە بەرپرسیارەتییەوە، کێشەکانی کوردەکان و نیگەرانیەکانی دیکە بەنیسبەت مافی مرۆڤ راپۆرت بدەن. دادگایی کردنی DEP هەروەها کەموکوڕییەکانی نزیکایەتی ناراستبینانەی دەوڵەتی تورکیا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردی ئاشکرا کرد کە کۆڵەکەی سەرەکی ئەم سیاسەتە تاوانبار کردنی حیزبە سیاسیە کوردییەکانە. کاتێ کە حیزبەسیاسیەکان قەدەخە دەکرێن، ئەنجامەکەی ئەوەیە کە گروپگەلی نهێنی دروست دەبن و ئەندامانی ئەم حیزبانە دەچنە ناو حیزبە توندڕەوەترەکان. رێگەپێدان بە کوردەکان بۆ پێکهێنانی حیزبگەلی سیاسی یاسایی، رێگایەکە بۆ ئەوەی پێش لە زیادبوونی پشتیوانی لە PKK و گروپە توندڕەوەکانی دیکە بگیردرێت. پەیڕەو وپروگرامی CSCE ی کوپنهاگن بەروونی ئەرك و بەرپرسیارەییەکانی ٥٣ دەوڵەتی بەشدار لەم رێکخراوەیەی

بەنیسبەت چالاکی بێ سنووری حیزبە سیاسیەکان دیاری کردووە. هەڵمەتی دەوڵەتی تورکیا دژ بە حیزبی دیموکرات(DEP ) و حیزبەکانی پێش ئەوە، کۆمەڵێك پرسیاری جیدی دەربارەی بەرپرسیارەتیەکانی دەوڵەتی تورکیا بەنیسبەت ئەم پرەنسیپانە دەخاتەروو.

جەنابی سەرۆك، لەکاتێکدا کە دەستپێکردنی ئەم دادگایی کردنە سیاسییە، رۆژێکی رەشە بۆ دیموکراسی تورکیا بەڵام مرۆڤ دەتوانێت هیوادار بێت کە سەرنجدانی بیرورای گشتی، گوشارەکان لەسەر دەوڵەتی تورکیا زیاد بکات بۆ ئەوەی رێگاچارەیەکی غەیرە سەربازی بۆ قەیرانی کورد بگرێتەبەر و کێشەکانی دیکەی مافی مرۆڤ چارەسەر بکات. وەبیری هاوکارانم دەهێنمەوە کە ٢ کەس لە نوێنەرە کوردەکان لەگەڵ سزای مەرگ رووبەروون، بەهۆی ئەو لێدوانانەی کە لە کومسیونی هلسینکی لێرە لە "کاپیتول هیل[1]" لە بینای "رایبۆرن[2]" دایان.

من بەو ئەنجامە گەیشتوومە کە دەوڵەتیکی دیموکراتی راستەقینە ناتوانێ سزای مەرگ بەسەر پارلمانتارە هەلبژیردراوەکانیدا بسەپێنێت تەنها بەهۆی لێدوانەکانیان یا نووسراوەکانیان کە نەبووەتە هۆی توندوتیژی، جیاییخوازی و رێگاچارەی بەدەر لە چوارچێوەی دیموکراتیك. لەم کاتە دزێوەدا داوا لە هاوکارانم دەکەم پەیوەست بن بە من بۆ ئەوەی نیگەرانی و بێ هیوایی خۆمان لە دەوڵەتی تورکیا دەربرین بەهۆی هەڵمەتە نامەعقولانەکەی بۆ سەرکوتکردنی ئازادی رادەربرین.

---

[1] Capitol Hill

[2] Rayburn Building

ئەوە کە لە تورکیا روو دەدات کردەوەیەکی بێ بەزەییانەی زۆر گەورەیە. ژمارەیەك لەم پارلمانتارانە لە کومسیونی هلسینکی لە کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئامادە بوونە. ئەم پارلمانتارانە خوازیاری رووخاندنی توندوتیژانەی دەوڵەتی تورکیا نەبوونە و هیچ چالاکییەکی خیانەتکارانەیان دژ بە دەوڵەت هان نەداوە، لەگەڵ ئەوەشدا حیزبەکەیان قەدەخە کراوە و خۆیشیان تۆمەتبار کراون و ژمارەیەکیشیان لە تورکیا هەڵاتوون بەهۆی لێدوانەکانیان لەبەردەم کومیتەی کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

جارێکی دیکە سوپاسی دۆستەکەم لە(ئەیالەتی) ڤێرمۆنت[3] دەکەم.

بەڕێز لیهەی[4]:

جەنابی سەرۆك، سپاسی سناتۆری ئەیالەتی "ئاریزۆنا" دەکەم بەبۆنەی بیروبۆچوونەکانی. بەڕێز "دیکونسینی" لە سەرەتای دەستبەکاربوونی کومسیونی "هلسینکی" تا ئێستا تەنها کەسێك بووە کە ئەم مەسەلەیەی خستووەتەڕوو. بەڕێز "دیکونسینی" بەدڵنیاییەوە هەروەك هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران، ئاگاداری بارودۆخەکەیە، نەتەنها بەهۆی هۆگری تاکەکەسی بەمەسەلەکە و ئەو سەفەرانە کە بۆ تورکیا کردوویەتی و ئەوشتانە کە بەچاوی خۆی بینیویەتی، بەڵکو بەهۆی ئەوەش کە سەرۆکی کومیتەی هەڵبژێردراوی هەواڵگری ئەنجوومەنی پیرانە. بەبۆچوونی من ئەنجوومەنی پیران دەبێ گوێ لە قسەکانی بگرێت.

---

[3] Vermont

[4] Mr. LEAHY

## ٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٤ - ئەنجوومەنی نوێنەران
## رێگرتن لەچالاکی رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی لە تورکیا

بەڕێز ستینی هۆیەر، نوێنەری ئەیالەتی مریلەند:

جەنابی سەرۆك، من دەمەوێت کردەوەکانی دەوڵەتی تورکیا پروتستۆ بکەم کە کۆمەڵێك پرسیاری جیدی دەربارەی ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی ئەم دەوڵەتە بەنیسبەت مافی مرۆڤ هێناوەتە ئاراوە. لێکۆڵەری سەرەکیی رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی لە تورکیا، "جاناتان سوگدین[1]" لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە وەك "کەسایەتی نەخوازراو" ناسراوە و ئێستا چوونی ناوبراو بۆ تورکیا قەدەغە کراوە بۆ ئەوەی لەوە زیاتر لە خراپبوونی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە نێو دانیشتوانی کوردی تورکیا نەکۆڵێتەوە.

جەنابی سەرۆك پێویست بەوەناکات من باسی کاری شازی رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی لەسەراسەری جیهان بکەم. من وەك هاوسەرۆکی کومسیونی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا، قەدری لێکولێنەوەکان و راپورتەکانی رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی دەزانم. ئەندامانی ئەم رێکخراوەیە لەسەراسەری جیهان وەك چاو، گوێ و ویژدانی هەوڵە حکومەتی و ناحکومەتیەکان بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ و لەراستیدا پاراستنی ژیانی خەڵك خزمەت دەکەن. لەماوەی چەند ساڵی رابردوودا، دەوڵەتی تورکیا بێزاری خۆی لە سەرنجدانی رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی بە ئەشکنجەی

[1] Jonathen Sugden

بەرفراوان، بارودۆخی بەندکراوە سیاسیەکان و میتودە دڕندەکانی سەرکوتکردنی کوردەکان بەدەستی دەوڵەتی تورکیا دەربڕیوە. ڕێبەرایەتی تورکیا لێکۆڵینەوەکانی ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی بێ بایەخ لەقەلەم دەدا و دەیگوت ئەم لێکۆڵینەوانە ئامانجی سیاسیان لەپشتە و هەمیشە دیدار لەگەڵ کاربەدەستانی ئەم ڕێکخراوەیەی ڕەت دەکردەوە بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕێگای بەوە دەدا لێکوڵەرانی ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی بچنە ناو وڵاتی تورکیا، بەڵام ئێستا ڕێگایان پێ نادات. ئەگەر ڕێبەرانی تورکیا ئێستا لەسەر ئەو باوەڕەن کە لەرێگای پێشپێگرتن لە لێکوڵەرانی مافی مرۆڤ دەتوانن خۆیان لە شەرمەزاربوون و خەجاڵەتبوون رزگار بکەن، بەڵام ئەم جارەش بەجیدی بەهەڵەدا چوونە. ئەم کردەوانە تەنها دەبێتە هۆی زیادبوونی سەرنجی(بیروڕای گشتی) بەو رەفتارانە کە ئەوان هەول دەدەن لە بیروڕای گشتی بیشارنەوە. ئەم مەسەلەیە بەدڵنیاییەوە لە کۆبوونەوەی کونفرانسی پێداچوونەوەی CSCE لە بوداپست دەخرێتەڕوو و یارمەتی دەدات بە داواکاری هەندێ لە دەوڵەتەکان بۆ ئەوەی بەگوێرەی میکانیزمەکانی مافی مرۆڤی موسکۆ لێژنەی چاودێری CSCE بنێرن بۆ تورکیا.

جەنابی سەرۆك، دەوڵەتی تورکیا بەردەوام کێشەکانی مافی مرۆڤ بە ئەنجامی توندوتیژی پارتی کرێکارانی کودستان(PKK ) دەزانێت، ساڵەهای ساڵە دەوڵەتی تورکیا پەیمانی بەستووە کە لەرێگای سەربازییەوە PKK تێکبشکێنێت و لەسەروبەندی خەباتی دژی PKK ، دەوڵەتی تورکیا گوندە کوردنشینەکانی خاپور کردووە و ژیانی ئاژڵداری و کشتوکاڵی گوندنشینەکانی لەناو بردووە و پتر لە یەك

میلیون کوردی له وڵاتی خۆیان ئاواره کردووه. له ئەنجامدا ئەم کردەوانەی دەوڵەتی تورکیا بووەته هۆی زیاد بوونی ئەندامانی PKK.

جەنابی سەرۆك، من لەسەر ئەو باوەڕەم که سەرەڕای بەرژەوەندییه دولایەنه ئیستراتژیك و ئابووریەکانمان لەگەڵ تورکیا، ئێمه دەبێ بەجیدی به سیاسەتی خۆماندا بچینەوه بەنیسبەت دابینکردنی چەك بۆ تورکیا که ئەویش دژی هاووڵاتیانی خۆی کەلکی لێوەردەگرێت. بڕیاری ئەم کۆنگرێسه بۆ کەمکردنەوەی ١٠٪ ی یارمەتی بیانی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەتورکیا بەهۆی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ، نیشاندەری نیگەرانی روولەزیادبوونی ئێمەیه بەنیسبەت ئەم مەسەلەیه بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەم بڕیاره تەنها لەسەر بڕێکی کەم له قەرزەکانی ئەمریکا به تورکیا کار دەکات. تورکیا هەروەها بیلیونها دولار سازوبەرگی بەرگری و یارمەتی دیکه له ئەمریکا وەردەگرێت. ئێستا کاتی ئەوەیه ئێمه ئەم یارمەتیانه کەم بکەینەوە.

## ٨ ی تشرینی یەكەمی ١٩٩٤ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## نامەی پڕ سۆز و هەستی لەیلا زانا بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران

خاتوون ئیلیزابێت فۆرس ، نوێنەری "ئۆریگون[١]":

جەنابی سەرۆك من لە رابردوودا لە ئەنجوومەنی نوێنەران دەربارەی بارودۆخی زۆر دژواری لەیلا زانا قسەم كردووە. لەیلا یەكەمین و تەنها پارلمانتاری ژنی كوردە لە مێژووی توركیا. زانا لە ٢ ی ئادار واتا لە ٧ مانگ لەمەوپێش تا ئێستا لەلایەن كاربەدەستانی توركیا خراوەتە ناو بەندی تاكەكەسی.

تاوانی لەیلا زانا چییە؟ لێدوانی گشتی كە بەهۆی ئەوە دەوڵەتی توركیا دەیەوێت حوكمی مەرگی لەسەر بدات. لەیلا زانا سەرەتا لەلایەن پۆلیسی توركیا لە ١٩٨٨ دەستگیر كرا و بەتوندی ئەشكەنجە كرا بەهۆی بەشداری كردن لە خۆپیشاندانێكی ئاشتیخوازانە كە بەنوێنەرایەتی لەلایەن بەندكراوەكان دژی ئەشكەنجەی دڕندانە و داواكاری بۆ رێزگرتن لە كەرامەتی مرۆڤ و جارنامەی جیهانی مافی مرۆڤ بەڕێوە چووە.

جەنابی سەرۆك، سپاسی ئەندامی كۆنگرێس، بەڕێز "پورتیر" دەكەم بۆ رێبەرایەتی كردنی هەڵمەتی داكۆكی لە لەیلا زانا و ئەو ٥ پارلمانتارە بەحەق هەڵبژێردراوە كە نوێنەری خەڵكی كوردن و دەستگیر كراون. ئێمە وەك كاربەدەستانی هەڵبژێردراو، هەموومان دەبێ دژی شكاندنی كەرامەتی مرۆڤایەتی رابوەستین.

---
[١] OREGON

جەنابی سەرۆك، ئەمە دەقی ئەو نامەیەیە كە لەیلا زانا لە ١٥ ی ئەیلول بۆ منی ناردووە:

خاتوون ئیلیزابێت فورس

ئەنجوومەنی نوێنەران، واشنگتۆن، دی سی

هاوكاری بەڕێز، من لە رۆژنامەكانی توركیادا خوێندمەوە كە ئێوە دەتانەوێت هاوخەمی خۆتان لەگەڵ من دەرببرن. من زۆر خوشحاڵم و دەمەوێت گەرمترین سپاسەكانی خۆمتان پێشكەش بكەم. من یەكەمین و تەنها پارلمانتاری ژنی كورد لە مێژووی توركیام. ئازموونی سیاسی من لەبەرامبەر دەروازەكانی بەندیخانەی توركیا دەستی پێكرد كە هاوسەرەكەم، شارەداری دیاربەكر(شاری كوردنشینی سەرەكی توركیا) بە ماوەی ١٠ ساڵ و ٨ مانگ تێیدا بەندكرابوو. هاوسەری بەندكراوەكان خۆپیشاندانێكی ئاشتیخوازانەیان بەرێكخستن كردبوو دژی دڕندایەتی ئەشكەنجە وداواكاری بۆ رێزگرتن لە كەرامەتی مرۆڤایەتی و جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ . بەهۆی ئەم چالاكیە من لەلایەن پۆلیسی توركیاوە ئەزیەت و ئازار درام و سەرەنجام لە تەموزی ١٩٩٨ دەستگیر كرام.

من بەماوەی ٥٩ رۆژ بەتوندی ئەشكەنجە درام كە ئاسەواری جەستەیی و دەروونی ئەم ئەشكەنجانەم هێشتا پێوە دیارە. من پەیم بەوە برد كە شەڕ و توندوتیژی -كە ئاكامی كۆمەڵگایەكە كە لەسەر بنەمای پێشێلكردنی بایەخەكان و دەسەڵاتپەرەستی و لەناوبردنی خەڵكی لاواز و بێ دەسەڵات دامەزراوە ـ گەلی كورد و توركی گەیاندووەتە ئاستی شەڕی ناوخۆ و لەوانەیە رووداوانی كارەساتێكی كۆمەڵایەتی و ئەخلاقی لێبكەوێتەوە، كەوابوو من بڕیارمدا چالاكانە لە ژیانی سیاسیدا بەشداری

بکەم بە ئامانجی ئەوەی پەیامێکی جیاواز بنێرم لەوانە رێزگرتن لە مرۆڤ و کەرامەتی مرۆڤایەتی و مافە بێ ئەملاولاکانی مرۆڤ و پێویستی دیالوگ دەربارەی کێشە قووڵەکانی کۆمەڵگاکەمان.

لە تشرینی یەکەمی ١٩٩١ من بە ٨٢٪ کۆی دەنگەکان، وەك نوێنەری دیاربەکر لە پارڵمانی تورکیا هەلبژێردرام. یەکەمین هەڵسوکەوتی من لەگەڵ گۆڕەپانی سیاسی تورکیا کە لە ژێر دەسەلاتی ژنەراڵەکان و ئەوکەسانەدا بوو کە حاشایان لە بوونی خەڵکی کورد لە تورکیا دەکرد، ئەو کاتە بوو کە من سوێندم لە پارڵمانی تورکیا خوارد. من بە زمانی کوردی، بە دۆستایەتی و پێکەوەژیانی کورد و تورك لە چوارچێوەی یەکسانی و رێزگرتن لە شوناسی یەکدی سوێندم خوارد بەلاّم لەگەڵ هێرشی توندوتیژانەی میدیاکان روبەڕوو بوومەوە. وەك"جیاییخواز" ، "هاوپەیمانی تروریستان" ، "خائن" و هتد پەنجەیان بەرەولای من راکێشا و وێنەی منیان لە بنکەکانی پولیس وەك تاوانبار هەڵواسی. پاش ئەوە دوو جار هەوڵی کوشتنی من درا کە لە هەردوویان رزگارم بوو، هەر چەند کە لەراستیدا ١٤ کەس لە رێبەرانی نەتەوەیی و ناوچەیی پارتی ئێمە واتا پارتی دیموکراسی ـ DEP ـ پێشتر کوژراون.

لەکاتی گەڕانەوە لە سەفەری ئەورووپا کە تێیدا لەلایەن "فرانسوا میتران"، سەرۆك کۆماری فەرانسا و "ژاکویس دیلۆرس"[٢]"، سەرۆکی کومسیونی کۆمەڵگای ئەورووپا پێشوازیم لێکرا، لە ٢ ی ئاداری ١٩٩٤ من لەگەڵ ٥ پارلمانتاری دیکە دەستگیر کرام. لەوکاتەوە ئێمە لە بەندیخانەی تاکەکەسیداین و بەهۆی لێدوانەکانمان لە تورکیا و لەدەرەوە، لەوانە لێدوانەکانمان لەبەرامبەر کومسیونی هلسینکی تاوانبار کراوین.

---

[٢] Jacques Delors

دەوڵەتی تورکیا دەیەوێت بەبۆنەی بیروڕاکانمان، حوکمی مەرگمان لەسەر بدات. ماوەی ٧ مانگە من لە ژوری تاکەکەسیدام و تەنها لەگەڵ پارێزەرەکانم و چەند کەسێکی ڕێگەپێدراو پەیوەندیم هەیە. سەرەڕای ئەم گیروگرفتانە و خراپبوونی بارودۆخی تەندروستیم، من شێلگیرم کە بەشێوازگەلی ئاشتیخوازانە درێژە بە خەباتەکەم بدەم لەپێناو ئاشتی نێوان کورد و تورك، دیموکراسی و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ. بە باوەڕی من، ئەم پرەنسیپانە کۆمەڵێ بایەخی جیهانین کە دەبێ بەدەر لە جیاوازی زمان و ئایین لەدەوری یەك کۆمان بکاتەوە.

هەرچەشنە پشتیوانییەکی وڵاتە یەکگرتووەکان زۆر گرنگە بۆ ئێمە، بەتایبەت دەمەوێت ئاماژە بە هاوخەمی خوشکانی فیمینیستم(ئەو کەسانە کە بۆ یەکسانی مافی ژن وپیاو خەبات دەکەن) بکەم، ئەو ژنە ئەمریکاییە جێگای ڕێزانە کە خەبات بۆ دیموکراسی، ئاشتی و یەکسانی ئەوەندە بۆیان گرنگە. با هەمووومان پێکەوە سەیری دادگایی کردنی ئێمە بکەین. تکایە لە ڕێگای ئینیستیتوی کوردی پاریس پەیامەکانتان بنێرن بۆ من.

جارێکی دیکە سوپاستان دەکەم و چاوەڕوانی وەڵامی ئێوەم

لەگەڵ ڕێزمدا

لەیلا زانا

## بارودۆخی کوردەکان لە تورکیا

## ٣٠ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز دیکونسینی:

جەنابی سەرۆك، مانگی تشرینی یەکەم من وەك سەرۆکی کومسیونی هلسینکی و کومیتەی هەواڵگری ئەنجوومەنی پیران سەردانی تورکیام کرد. دەمەوێت رۆشنایی بخەمەسەر کۆمەڵێك مەسەلە لەوانە مافی مرۆڤ ، بارودۆخی کورد، کێشەکانی باڵکان و رەوتی ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. پاش ئەم دیدارە من هاوڕێ لەگەڵ سەرۆك کلینتون لە رێورەسمی واژۆکردنی رێککەوتننامەی ئاشتی ئیسرائیل- ئوردون ئامادە بووین کە خاڵی وەرچەرخانێکی مێژووییە بۆ ئاشتی ناوچە و گرنگیی یەکجار زۆری هەیە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو تورکیا.

من لەگەڵ رێبەرانی پارلمان، کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە و نوێنەری رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ دیدارم کرد. بەهەرحال من بێ هیوا بووم لەبەر ئەوەی رێگەیان پێنەدام لەگەڵ پارلمانتارە کوردە زیندانیەکان و بەندکراوە سیاسیەکانی دیکە دیدار بکەم و ئەمە لادانە لەو ئازادییە کە من لەدیدارەکەی ساڵی ١٩٨٩ لەگەڵی روبەڕوو بووم. من نیگەرانی خۆمم دەربڕی بەنیسبەت ئەو زیانە ئابووریە کە لەئەنجامی گەمارۆکانی نەتەوەیەکگرتووەکان دژی عێراق لە تورکیا کەوتووە و لەسەر ئەو باوەڕەم کە دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ زیاتر لە دەوڵەتانی کەنداو- کە زۆرترین قازانجیان لە گوشاری هاوپەیمانان لەسەر سەدام حوسەین

دەستکەوتووە- زیانەکانی تورکیا قەرەبوو بکاتەوە. من هەروەها بۆچوونی خۆمم دەربڕی دەربارەی ئەوەی تورکیا دەتوانێت دەوری یەکلاییکەرەوە لە پێکهاتنی رێکخراوێکی ناوچەیی وەك CSCE بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بگێڕێت ئەگەر رێگاچارەیەکی ناسەربازی بۆ مەسەلەی کورد بدۆزێتەوە. دەوڵەتی تورکیا پێشتر دەوری سەرەکی بینیوە لە پشتیوانی کردن لە CSCE وەك ئامرازێك بۆ پتەوکردنی ئاشتیەکی ناوچەیی چڕوپڕ و درێژخایەن.

جەنابی سەرۆك، نەخوازراوی و ناتوانی رێبەرایەتی تورکیا بۆ پەیڕەوکردنی رێگاچارەیەکی نوێ بۆ کێشەی کورد، شتێکی ئاشکرایە، ئەم مەسەلەیە لە کەڵك وەرگرتنی بەرفراوان لە ئەشکەنجە و سنووردار کردنی ئازادی رادەربڕین رەنگی داوەتەوە. سەرەڕای ئەم گیروگرفتانە من بەهیوای پەرەسەندنی بەرژەوەندییە دولایەنەکانی نێوان تورکیا و ئەمریکا و بایەخە دیموکراتیکە هاوبەشەکان، تورکیام بەجێ هێشت و لەسەر ئەو باوەڕەم کە دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو دەوڵەتی تورکیا دەبێ لەپێناو بەهێزکردنی پەیوەندییە دولایەنەکان کار بکەن.

من لە تورکیا باسی هەوڵە بەردەوامەکانی هێزەکانی ئاسایشی تورکیام کرد بۆ چۆڵکردن و کاولکردنی گوندە کوردنشینەکان لە کاتی شەڕ لەگەڵ PKK . من ئەو کاتە دڵخۆش بووم کە کاربەدەستانی تورکیا بانگەشەی ئەوەیان کرد کە لەم پەیوەندییەدا لێکوڵینەوەیان کردووە، بەڵام تائێستا لێکوڵینەوەیەکی گشتی وەها ئەنجام نەدراوە. من هەروەها باسی کەندوکۆسپەکانی سەر ئازادی رادەربڕینم کرد و وتم کە هەڵوەشاندنی هەندێ لە یاساکان دەتوانێ ببێتە هۆی ئازادی گەلێ لەو بەندکراوانە کە ئێستا بەتاوانی دەربڕینی بیروڕای خۆیان لە بەندیخانەدان.

من هیوای خومم دەربڕی کە دەوڵەتی تورکیا کۆمەڵێك هەنگاوی چڕوپڕ هەڵبگرێت بۆ بەتاواننەزانینی هەموو شێوەکانی بیروڕا دەربڕینی ناتوندوتیژانە بۆ ئەوەی تورکیا ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی خۆی بەگوێرەی CSCE جێبەجێ بکات. من دووپاتم کردەوە کە مافی هاوولاتیانی ئاسایی و پارلمانتارە بەحەق هەڵبژێردراوەکان بۆ دەربڕینی ئازادانەی بیروڕای خۆیان نابێ لەکۆمەڵگایەکی دیموکراتیکدا سنووردار بکرێت. من هەروەها دەربارەی کەڵك وەرگرتنی بەرفراوان و بەردەوام لە ئەشکەنجە باس و گفتگوگۆم کرد.

لەکاتی سەردانەکەی ساڵی ١٩٨٩ ، کاربەدەستانی تورکیا وتیان کە رێوشوێنی چڕوپڕ دەگیردرێتە بەر بۆ کەمکردنەوەی ئەشکەنجە و راهێنانی ئەفسەرانی پۆلیس دەربارەی میتودە گونجاو و قبولکراوەکانی لێپرسینەوە. بەهەرحاڵ ئەمڕۆ بەرزبوونەوەی گرژییەکان و توندوتیژی، خواستی سیاسی و دەستبەجێی دەوڵەتی تورکیای بۆ بنبڕکردنی ئەشکەنجە کەم کردووەتەوە. لایەنگرانی مافی مرۆڤ دەڵێن تۆمەتبارە سیاسیەکان بەشێوەی ئاسایی ئەشکەنجە دەکرێن و دانپێدانانی زۆرەملێ بەشێوازی بەرفراوان بۆ دەرکردنی حوکمی تاوانباران ئەنجام دەدرێت. من پێداگریم لەسەر کاربەدەستانی تورکیا کردەوە کە هەوڵەکانیان دوقات بکەن بۆ چاودێریکردن و قەدەخە کردنی ئەشکەنجە، بەتایبەت لەقۆناخی پێش دادگاییکردن کە تۆمەتبار دەستڕەسی بە پارێزەر نییە.

بەهەرحاڵ بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە ئەشکەنجە روو دەدات. رووداوەکانی ئەم دواییە نیگەرانیەکانی من زیاتر دەکات . لە ٣ی تشرینی دووەم دادگایەکی تورکیا فەرمانی دەستبەسەرداگرتنی"فایلی ئەشکەنجە" ی دەرکرد کە رێکخراوی مافی مرۆڤ وەك

نامیلکە بڵاوی کردبووەوە کە کۆمەڵێك بەڵگەنامەی دەربارەی مەرگ لەبەندیخانە لە ساڵی ١٩٨٠ و ئەشکەنجەی بەندکراوەکانی لەخۆ دەگرت. دادئەستێنەکان شێلگیرن لەسەر تومەتبار کردنی "یاووز ئونەن[1]"(کە لەگەڵ لیژنەی رێکخراوی مافی مرۆڤ کار دەکات) و "فەوزی ئارگون[2]" بە تاوانی پروپاگەندای جیاییخوازانە کە سزاکەی ٢ تا ٥ ساڵ بەندیخانەیە. ئەو ئامرازە توندوتیژانە کە تورکیا بۆ پاراستنی دەوڵەت لە هەڕەشە جیاییخوازانەکان گرتوویەتیەبەر، کۆمەڵگای تورکیای رۆژبەڕۆژ دووجەمسەریتر کردووە. بەرزبوونەوەی ناسیونالیزمی تورك و ئەو روانگەیە کە چاکسازی وەك "دانی پوان(ئیمتیاز) بە تروریزم" لێکدەداتەوە، ئەو کەسانە دەترسێنێت کە باسی ئاشتبوونەوەی کورد و تورك دەکەن.

PKK قازانجی ئەوەی دەست دەکەوێت کە هاوخەمی و پشتیوانی روو لەزیادبوونی ئەو خەڵکە بەدەست بهێنێت کە هیچ رێگاچارەیەکی دیکەیان لەپێشدا نییە. دەوڵەتی تورکیا دەنگە میانەڕەوەکان لەرێگای هەڕەشەی سەرکوت یا تەنانەت هەڕەشەی کوشتن کپ دەکاتەوە. ئەو لیژنەیە کە تورکیایان بەجێ هێشتووە، زۆر نیگەرانن بەنیسبەت ئەوەی ئایا تورکیا دەتوانێت بەرژەوەندی و ئامانجەکانی هاوولاتیانی کوردی خۆی لەچوارچێوەی سیاسی ئێستای تورکیا وەدی بهێنێت یا نا. ساڵەهای ساڵە کە تورکیا بەشیوەیەکی دڕندانە شووناسی کولتووری جیاوازی کورد لە پێناو شووناسی سکولاری تورك سەرکووت دەکات. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە تورکیای ئێستا، تورکیاکەی ٥ ساڵی رابردوو نییە، بەرەوپێشچوونی بەردەوام لەحاشا کردن

[1] Yavuz Onen
[2] Fevzi Argun

لەبوونی کورد (لەباتی بەخشینی هەندێ ئازادی تایبەتی سنووردار بەکوردەکان)، بووەتە هۆی زیادبوونی دەریای بێ متمانەیی لەنێوان کورد و تورك.

راپەڕینی چەکداری و دژکردەوەکانی سوپای تورکیا کێشەکەی گەیاندووەتە ئاستی شەڕی ناوخۆ. کێشەی کورد، مەسەلەیەکی یەکلاییکەرەوەیە بۆ تورکیا و سەرجەم هاووڵاتیەکانی و ئاکام و لێکەوتەی زۆر جیدی و درێژخایەنی بۆ نەتەنها تورکیا بەڵکو بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدواوە دەبێت. کێشە کۆنە چارەسەرنەکراوەکان دیسان لە تورکیا سەرهەڵدەداتەوە و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کێشانە لەئەمڕۆدا، دیموکراسی داهاتووی تورکیا تاڕادەیەکی زۆر دیاری دەکات. بە باوەڕی من دەوڵەتی تورکیا دەبێ رێگاچارەی ناسەربازی بگرێتەبەر بۆ رەواندنەوەی نیگەرانیەکانی هاووڵاتیانی کورد کە پشتیوانی لە توندوتیژی ناکەن و ئێستا بوونەتە قوربانی هەردوو لایەن. لایەنە سیاسیە میانەڕەوەکان(چ لایەنی تورکیا، چ لایەنی کورد) دەبێ بە فەرمی بناسرێن و گوێ بۆ داواکاریەکانیان بگیردرێت و تروریزم شەڕمەزار بکەن . ئەو سیاسەت و هەڵوێستانە کە ناتوانن تروریزم و پاراستنی شێوازەکانی رادەربڕین لەیەك جیا بکەنەوە، هەڕەشە لە بنەماکانی دیموکراسی تورکیا دەکات. راگەیاندنی ئاگربەست هەنگاوی یەکەمە بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانەی کێشەی کورد. دەبێ PKK ئاگربەسێکی یەك لایەنە رابگەیەنێت(هەروەها کە لە ئاداری ١٩٩٣ ئاگربەستی راگەیاند) و دەوڵەتی تورکیاش دەبێ کردەوەی هاوشێوە ئەنجام بدات. تەنها کاتێك مەسەلەی دژواری ئاشتبوونەوەی تورك و کورد چارەسەر دەکرێت کە دەنگی چەکەکان کپ بکرێتەوە. هەتا کاتێك کێشەی کورد بەشێوازی ئاشتیخوازانە

چارەسەر نەکرێت، هەوڵەکانی تورکیا لە گەلێ لە بوارەکانی دیکە، لەوانە هاوکاری و پەیوەندییە نزیکەکانی لەگەڵ هاوپەیمانە رۆژئاواییەکانی دەکەوێتە ناو مەترسی.

## ۲۰ ی کانوونی دووەمی ۱۹۹۵ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەلایەن تورکیاوە بەردەوامە

بەرێز کریستۆفێر سمیت[۱]، نوێنەری ئەیالەتی نیوجرسی:

ساڵەهای ساڵە کە کومسیونی هلسینکی لەنزیکەوە چاودێری دەکات بەسەر پێشهاتەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا. من پشتیوانیم لەهەوڵەکانی کومسیون کردووە و پەیوەست بوومە بە هاوکارانم بۆ باس و گفتگو لەسەر ئەشکەنجە و سەرکوتی ئازادی رادەربڕین و مافە مرۆڤە بنەڕەتیەکانی هاوولاتیانی کوردی تورکیا. من وەك سەرۆکی نوێی کومسیون، بەردەوام دەبم لە قسەو گفتوگۆکردن دەربارەی ئەم پێشهاتە و پێشهاتەکانی دیکە. ئەمرۆ دەمەوێت ناڕەزایەتی خۆم دەرببڕم بەنیسبەت دەستگیری ۷ کەس لە رێبەرانی رێکخراوی مافی مرۆڤ، لقی دیاربەکر لە تورکیا.

دادئەستینەکانی تورکیا دەیانەوێت ئەم کەسانە بەماوەی زیاتر لە دە ساڵ بخەنە بەندیخانە، بە تاوانی بڵاو کردنەوەی پێشێلکاری بەڵگەمەندی مافی ئەو بەندکراوانە کە تاوانی "پروپاگەندای جیاییخوازیان" خراوەتە پاڵ. یەکێ لەم گیراوانە "نیعمەتولا گوندوز"[۲]-ە کە پارێزەرە و سەرۆکی رێکخراوی مافی مرۆڤ، لقی دیاربەکرە و لەمانگی تشرینی یەکەم لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی کومسیونی هلسینکی دیداری

---

[۱] CHRISTOPHER H. SMITH

[۲] Neymetullah Gunduz

كردووه. چهند ههفته لهمهوبهر، چهند كهسی دیكه له چالاكانی مافی مرۆڤ له تۆمهتگهلی هاوشێوه، تهبرهئه كران.

جهنابی سهرۆك، كۆمهڵگای نێونهتهوهیی دهبێ درێژه بدات به سهرنجدان به سنووردارکردنی توندی ئازادی رادهربڕین و كێشهكانی دیكهی مافی مرۆڤ كه بهردهوام متمانهنامهی دیموكراسی توركیا ئاڵۆز دهكات. چهند ساڵه كه ئهندامانی رێكخراوی مافی مرۆڤ لهسهراسهری توركیا بهتایبهت له باشووری رۆژههڵاتی توركیا دهستگیر دهكرێن، تهقهیان لێدهكرێت و نووسینگهكانیان بهزورهملێ دادهخرێت.

لقی دیاربهكری ئهم رێكخراوهیه دوایین رێكخراو بوو كه لهلایهن كاربهدهستانی توركیاوه رێگهی پێدرابوو له ناوچه چالاكی بكات ،بهڵام ئێستا داخراوه. جهنابی سهرۆك رۆژبهرۆژ خراپتربوونی بارودۆخی مافی مرۆڤی دانیشتوانی باشووری رۆژههڵاتی توركیا تهنها دهتوانین وهك تۆقان و توندوتیژی وهسف بكهین. ئازادییهكانی سهرجهم هاووڵاتیانی باشووری رۆژههڵاتی توركیا سنووردار كراوه و بوونه به قوربانی ههر دولا.

جهنابی سهرۆك، رێبهرانی توركیا نیگهرانی خۆیان دهربڕیوه بهنیسبهت ئهو ههوڵانه كه پهیوهستبوونی توركیا به كۆمهڵگای ئهورووپا دهخهنه دواوه، لهگهڵ ئهمهشدا ئهم دهوڵهته درێژه دهدات به پهیڕهو كردنی ئهو سیاسهتانه كه دژی پێوانه نێونهتهوهییهكانی مافی مرۆڤهوه. نارهزایهتی دهربڕینی رێبهرانی توركیا به بڕیاری كۆنگرێسی ئهمریكا بۆ بهستنهوهی یارمهتی سیاسی وڵاته یهكگرتووهكان به توركیا به جێبهجێ كردنی مافی مرۆڤ لهلایهن ئهم دهوڵهته، شتێكی بێ مانایه لهبهر ئهوهی

دەوڵەتی تورکیا ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی خۆی بەنیسبەت مافی مرۆڤ، بەتوندی پێشێل دەکات، لەوانە رێوشوێنەکانی رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا.

جەنابی سەرۆك، داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکەم دەستبەجێ کۆتایی بە کردەوەکانی دژ بەم هەفت چالاکەی مافی مرۆڤ بێنێت و سەرجەم ئەو بەندکراوە سیاسیانە ئازاد بکات کە تەنها بەهۆی دەربڕینی بیروڕاکانیان، ئێستا لە بەندیخانەکانی تورکیا کوێرەوەری دەبینن.

### ۲۰ ی کانوونی دووەمی ۱۹۹۵ - ئەنجوومەنی نوێنەران
### دەوڵەتی تورکیا ٥ قاتی ئەو پارەیە کە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی گەورەی ئاوی GAP خەرج دەکات، بۆ شەڕ لەگەڵ PKK خەرجی دەکات

بەڕێز "هۆیەر"، نوێنەری ئەیالەتی مریلەند:
جەنابی سەرۆك مانگی تشرینی یەکەمی رابردوو، سەرۆکی کومسیونی هلسینکی، بەڕێز دینیز دیکونسینی[1] بەسەرۆکایەتی لیژنەیەك چووە بۆ تورکیا بۆ تاوتوێکردنی گیروگرفتەکانی مافی مرۆڤ لەو ولاتە. ئەندامانی لیژنەکە لە دیاربەکر(گەورەترین شاری ناوچەی زۆرتر کوردنشینی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا) سەردانی نووسینگەکانی لقی ناوچەیی رێکخرای مافی مرۆڤ (HRA ) یان کردووە و لەگەڵ رێبەرانی HRA لە ئانکارا دیداریان کردووە. کومیسیونی هلسینکی هەمیشە لەگەڵ HRA کاری کردووە و کەڵکی لە بلاوکراوە زۆر سودمەند و جێگای متمانەکانی ئەم رێکخراوە وەرگرتووە.
لەکاتی دیدار لەگەڵ لیژنەی کومسیونی هلسینکی، رێبەرانی HRA بە تێروتەسەلی باسی ئەوەیان کرد کە چۆن ئەندامانی رێکخراوەکەیان لەمەترسیەکی گەورەدا کە هەڕەشە لە ژیانیان دەکات، چالاکی دەکەن. ئەندامانی HRA لە سەراسەری ولاتی تورکیا بە تایبەت لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا بەردەوام لە مەترسیدان و لەگەڵ ئازارو ئەزیەت بەرەوروون. ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ئەم

[1] Dennis DeConcini

ڕێکخراوەیە لەلایەن هێزەکانی ئاسایشی تورکیاوە هەڕەشەیان لێکراوە، ڕفێندراون، کوژراون و بێ سەروشوێن کراون. لقی دیاربەکری HRA لەنێو ئەو ١٠ پارێزگا(کوردنشینە) کە حاڵەتی نائاساییان بەسەردا زاڵە، تەنها لقی ئەم ڕێکخراوەیەیە کە هێشتا چالاکی دەکات و لەلایەن کاربەدەستانی تورکیاوە دانەخراوە. ڕێبەرانی HRA لەسەر ئەو باوەڕەن کە کاربەدەستانی تورکیا دەیانەوێت لە دانەخستنی نووسینگەی ئەم ڕێکخراوەیە لە دیاربەکر کەڵك وەربگرن بۆ ئەوەی تەحەمول و مودارای خۆیان لەگەڵ ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ نیشان بدەن. ئێستا تەنانەت گوندی "پوتەمکین"[١] لەلایەن کاربەدەستانی تورکیاوە خراپ کراوە بۆ ئەوەی کەس ڕەخنە لە سیاسەتەکانیان بەنیسبەت کوردەکان نەگرێت.

جەنابی سەرۆك، سێ شەمەی ڕابردوو، تەنانەت ڕێبەرانی لقی دیاربەکری HRA دەستگیر کراون و تاوانی پڕوپاگەندای جیاییخوازیان خراوەتە پاڵ. دادنەستێنەکان هەوڵ دەدەن حوکمی ١٠ ساڵ بەندیخانە بۆ ئەم چالاکانە ببڕنەوە، لەبەر ئەوەی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤیان لە ساڵی ١٩٩٢ بەوردی بڵاو کردووەتەوە. یەکێ لەو کەسانە کە ئێستا لە بەندیخانەدایە و چاوەڕوانی دادگایی کردنە، "نیعمەتوڵڵا گوندوز"ە کە پارێزەرەو لەگەڵ ئەندامانی لێژنەکەی لەگەڵ سەرۆك "دیکونسینی" دیداری کردووە و لە ساڵی ١٩٩٣ سەردانی کومسیونی هلسینکی کردووە. بەڕێز "گوندۆز" زۆر جێگای ڕێزە و وەك پارێزەرێکی شێلگیری مافی مرۆڤ و سەرچاوەی جێگای متمانەی زانیاری دەربارەی پێشێلکرانی مافی مرۆڤ ناسراوە.

---

[١] Potemkin

جەنابی سەرۆك، هەر ئەم دواییانە دەوڵەتی تورکیا دەستی لەکردەوەکانی دژی گروپێك لە چالاکانی ناسراوی تورکیا هەڵگرت. من پێشتر وتوومە و ئێستاش دیسان دووپاتی دەکەمەوە کە ناتوانین وەك دەوڵەتیکی راستەقینەی دیموکرات سەیری تورکیا بکەین مادام کە کەسانێك وەك نیعمەتوڵلا گوندوز، مەهدی زانا، هالیت گەرگەر[٢] و پارلمانتارەکانی پێشوو و کەسانی دیکە بەهۆی کەڵکوەرگرتن لە مافی ئازادی رادەربڕینی خۆیان لە بەندیخانەدا بن.

جەنابی سەرۆك، ئەم دواییانە رۆژنامەیەکی گەورەی تورکیا لە لێکدانەوەیەکدا بڵاوی کردووەتەوە کە دەوڵەتی تورکیا ٥ قاتی ئەو پارەیە کە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی گەورەی ئاوی GAP ـ کە دەڵێن دەبێتە خاڵی وەرچەرخان بۆ پێشکەوتنی(ئابووری) باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا ـ خەرج دەکات، بۆ شەڕ لەگەڵ PKK خەرجی دەکات. دەیان بیلیون دولار بۆ جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتانە خەرج کراوە کە ناوچەی کوردنشین رۆژلەدوای رۆژ کاولتر دەکات و دانیشتووەکانی رۆژبەرۆژ بێزارتر دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا تورکیا بەردەوام لەگەڵ قووڵتربوونی قەیرانە ئابووری و سیاسیەکانی بەرەوڕوویە کە ئەمەش ئاکامی راستەوخۆی سیاسەتە سەرنەکەوتووەکانیەتی بەنیسبەت کوردەکان. هەتا کاتێك رێبەرانی تورك دەنگی گوللە کپ نەکەن و بەشوێن رێگاچارەی ئاشتیخوازانەدا نەگەڕێن بۆچارەسەرکردنی کێشەی کورد، ناتوانین هیچ هیوایەکمان بە ئاشتی، خۆشبەختی یا دیموکراسی لە تورکیادا هەبێ. ئەم پێشبینیە دڵتەنگکەرە بۆ داهاتووی تورکیا، کە دۆست و هاوپەیمانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، هیچ تاکێك لە وڵاتی ئێمە خۆشحاڵ ناکا

---

[٢] Halit Gerger

## ٩ ی شوباتی ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## پەرەسەندنی شەڕی تورکیا لەگەڵ ئازادی رادەربڕین

بەڕێز ئیسمیت، نوێنەری ئەیالەتی نیوجێرسی:

جەنابی سەرۆك، مانگی تشرینی یەکەمی رابردوو، لێژنەیەکی کومسیونی هلسینکی لە ئانکارا لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیا و کەسایەتیەکانی دیکە دیداری کرد. هەموو کاربەدەستانی تورکیا، لەوانە وتەبێژی پارلمان، رۆژنامەی"ئوزگور ئولکە"[1] یان (کە لایەنگری کوردەکانە) دەگەرتە دەستەوە و رایاندەوەشاند بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە بە پێچەوانەی بانگەشەی رەخنەگران، ئازادی رادەربڕین لە تورکیا زیندووە و لە جێی خۆیدایە.

جەنابی سەرۆك، هەفتەی رابردوو کاربەدەستانی تورکیا نیشانیان دا کە ئامادەنین ئازادی رادەربڕین لەلایەن ئەم رۆژنامەیە کە لایەنگری هەست و سۆزی کوردەکانە تەحەمول بکەن. لە ٣ ی شوبات دادگایەکی تورکیا حوکمی داخستنی ئەم رۆژنامەیەی دەرکرد. ئەم شاڵاوە پڕ هەراوهوریایە دژی ئازادی رادەربڕین هەفتەیەك پاش حوکمی دادگا بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ بەناوبانگترین نووسەری تورکیا، "یاشار کەمال"، ئەنجام درا بەهۆی دەربڕینی بیروڕای خۆی بەنیسبەت شێوەی هەڵسوکەوتی دەوڵەتی تورکیا لەگەڵ کوردەکان. ئێستا یاشار کەمال بەپروپاگەندای جیاییخوازی تۆمەتبار کراوە و تەنانەت ئەو کەسانە کە لایەنگری سیاسەتە ئاشتینەخوازەکانی

[1] *Ozgur Ulke*

دەوڵەتی تورکیا بەنیسبەت کوردەکان بوون، ئێستا پرسیار دەکەن کە ئایا دەوڵەتی تورکیا زیادەڕۆیی نەکردووە؟

جەنابی سەرۆك، داخستنی رۆژنامەی "ئوزگور ئولکە"، لوتکەی ئەو خەباتە هاوئاهەنگی کراوەبوو کە هەر لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئەم رۆژنامەیە دەستی پێکرد و رۆژنامە هاوبیرەکانی پێش ئەوە بە زۆر داخرابوون. کاربەدەستانی تورکیا ئەم رۆژنامەیانە سانسۆر دەکرد و هەڵمەتێکی توندوتیژانەیان دژ بەم رۆژنامەیە ئەنجام دەدا. ٢٠ کەس لە راپورتێر و دابەشکارانی رۆژنامەکە بە دەستی"گروپی مەرگەوە" کوژران و لانیکەم ٤ کەسی دیکەیان رفێندراون. تەرمی ئەشکەنجەدراو و گولەبارانکراوی یەکێ لەم راپورتێرانە چەند هەفتە پاش بێسەروشوێن بوونی دۆزرایەوە. لانیکەم ٣٥ کرێکار و رۆژنامەنووسی ئەم رۆژنامەیە خراونەتە بەندیخانە و ٢٣٨ ژمارەی ئەم رۆژنامەیە دەستی بەسەردا گیراوە. هەڵمەتی دەوڵەتی تورکیا دژ بەم رۆژنامەیە لە ٣٠ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ گەیشتە لوتکە واتا ئەو کاتە کە سەرۆك وەزیران، "تانسۆ چیللەر" فەرمانێکی نهێنی دەرکرد (کە پاشان دزەی کردە دەرەوە و بڵاو بووەوە) و داوای کرد کە رۆژنامەکە بەتەواوی لەناو ببرێت. لە ٣ ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٤ چاپخانە و دەفتەری بەڕێوەبەرایەتی ئەم رۆژنامەیە لە ئیستانبول و ئانکارا بە بومب تەقێندرایەوە کە لە ئەنجامیدا یەك کەس کوژرا و ١٨ کەسی دیکە بریندار بوون.

لە ٦ ی تەموزی ١٩٩٥ پۆلیس دەستی کرد بە راوەستان لە بەر دەرگای چاپخانەکە تا بە زووترین کات پاش چاپبوونی رۆژنامەکە، دەستی بەسەردا بگرێت. رۆژنامەکە راستەوخۆ تەسلیم بە دادئەستین دەکرا و ئەویش کتوپڕ دیاری دەکرد کە کام وتار بۆ

بڵاوبوونەوە نابێت. زۆربەی جاران ٣ تا ٤ لاپەڕەی رۆژنامەكە(زۆرتر وتارەكانی پەیوەندیدار بە كردەوەكانی هێزەكانی ئاسایش) سانسۆر دەكرا و شوێنەكەیان هەروا بە بەتاڵی دیسان لە چاپ دەدرایەوە. لە مانگی كانوونی یەكەمەوە ٥ راپورتێری ئەم رۆژنامەیە كە دەستگیر كرابوون و پاشان ئازاد كرابوون، رایانگەیاند كە لە لایەن پۆلیسەوە ئەشكەنجە كراون و پولیس هەوڵی داوە بە دژی سەرنووسەرانی رۆژنامەكە دانپێدانانیان لێ وەربگرێت.

جەنابی سەرۆك، هەفتەی رابردوو وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا راپۆرتی ساڵانەی خۆی دەربارەی مافی مرۆڤ بڵاو كردەوە كە بەگوێرەی ئەوە، بارودۆخی مافی مرۆڤ لە توركیا پاش وڵاتی چین خراپترین بارودۆخە لەنێو وڵاتانی جیهاندا. لەكاتێكدا كە ئەم راپۆرتە نیشان دەدات كە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە توركیا لە ساڵی رابردوو بەشێوەیەكی بەرچاو رووی لە خراپی كردووە، بڵاوبوونەوەی رۆژنامەی "ئوزگور ئولكە" وەك نموونەیەكی ئەرێنی لە ئازادی چاپەمەنی سەیر دەكرا. وتەبێژێكی فەرمی دەوڵەتی توركیا لەوەڵامدا، ئەم راپورتەی بە بێ لایەننەبوون و لەبەرچاو گرتنی زانیاری یەك لایەنە تۆمەتبار كردووە. بەهەرحاڵ هەر كاتێ كە رەخنەی پێشێلكردنی مافی مرۆڤ لە توركیا گیراوە، ئەم دەوڵەتە پێداگری كردووە كە هەنگاوگەلی بەرچاو بۆ باشتر كردنی مافی مرۆڤ هەڵگیراوە و كۆمەڵێك چاكسازی گرنگی دیكەش ئەنجام دەدرێت. بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی كە ئێمە تا ئێستا هەمیشە ئەم لێدوانانەمان لە زمانی كاربەدەستانی توركیاوە بیستووە، وادیارە توركیا نموونەی سیستمێكی ئازاد و دیموكرات نییە.

جەنابی سەرۆك، کاربەدەستانی تورکیا ئێستا رۆژنامەی "ئوزکور ئولکە"یان لە دەستدا نییە تا لەکاتی سەردانی لێژنەکانی دەرەوە، رایبوەشێنن، کەوابوو بەشوێن ئامرازگەلی دیکەدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی نیازپاکی خۆیان لەم پەیوەندییەدا بسەلمێنن.

جەنابی سەرۆك، من پێشنیار دەکەم کاربەدەستانی تورکیا لە باتی ئەوەی هەندێ لە شێوەکانی تایبەت و سنووورداری رادەربڕین تەحەمول بکەن بۆ ئەوەی چاودێرانی بیانی ئارام بکەنەوە، دەبێ هەنگاوی راستەقینە هەڵبگرن بۆ ئەوەی سیاسەتەکانی خۆیان لەگەڵ ئەرك و بەرپەرسیارەتیەکانیان بەنیسبەت مافی مرۆڤ هاوتەریب بکەن. نابێ ئازادی رادەربڕین و مافەکانی دیکە تەنها وەك بەرهەمی هەڵمەتی پەیوەندییە گشتیەکان سەیر بکرێت. ئەگەر کاربەدەستانی تورکیا نایانەوێت بەجیدی کار بکەن بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مافانە و یاساکانیان لەگەڵ رێوشوێنە نێونەتەوەییەکان نەگونجێنن، ناتوانن چاوەڕوانی ئەوە بکەن کە بانگەشەکانیان لەپەیوەندی لەگەڵ مافی مرۆڤ بە هەند وەربگیردرێت. کەوابوو ئیدانەکردنی راپۆرتی مافی مرۆڤی وەزارەتی دەرەوە لە لایەن تورکیاوە، بەهەمان ئەندازە کە بێ مانایە، بەهەمان ئەندازەش شتێکی ئاڵۆزە.

٢٠ ی ئاداری ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی پیران

تاتوێ کردنی گەلاڵە یاسایەك بۆ سنووردار کردنی یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا

بەڕێز داماتۆ[1]:

جەنابی سەرۆك، من ئەمڕۆ دەمەوێت گەلاڵە یاسایەك بخەمەڕوو کە متمانەی ئابووری بەرنامەی یارمەتی بیانی ئێمە زیندوو دەکاتەوە لەڕێگای مسۆگەر کردنی ئەوە کە یەکێ لە گەورەترین وەرگرەکانی یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکان واتا کۆماری تورکیا پابەند بێت بە ڕێوشوێنە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ و رەفتاری مرۆڤی. ئێستا پاش چەند ساڵ دیپلوماسی بێ دەنگی بێ ئاکام، کاتی ئەوە بۆ کۆنگرێس هاتووە کە ڕێبەرایەتی تاوتوێ کردنی مەسەلە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندیدار بە تورکیا بگرێتە دەست، لەوانە کارنامەی خراپی مافی مرۆڤی تورکیا، ڕێگرتنی بەردەوام لە چوونی پێداویستی مرۆڤی بۆ ئەرمەنستان، سەرپێچی کردن لە هاوکاری کردن بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی درێژخایەن و گونجاو بۆ مەسەلەی قوبرس، نکۆڵی کردن لە مافە بنەڕەتیەکانی کەمینەی کورد و ئازارونەزیەتی بەردەوامی کۆمەڵگای مەسیحیەکان لە تورکیا.

ئەو سەدان میلیون دولارە کە وڵاتە یەکگرتووەکان هەر ساڵ دەیدات بەتورکیا، ئەوەندە هێز نەبەخشێت بە ئێمە کە بتوانین دەوڵەتی تورکیا ناچار بکەین گۆڕانکاری

[1] Mr. D'AMATO

ئەرێنی لە هەرکام لەم پێنج تەوەرەدا ئەنجام بدات. لەهەرکام لەم ٥ تەوەرەدا، تورکیا بەردەوام پەیماننامە و رێککەوتننامە نێونەتەوەییەکانی پێشێل کردووە کە خۆیشی واژۆی کردوون، لەوانە جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ ، یاسای کۆتایی کونفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا و کنواسیونی مافی مرۆڤی ئەورووپا. لەپەیوەندی لەگەڵ مافی مرۆڤ تەنها ئەوەندە بەسەکە چاوێك لە راپۆرتی ساڵی ١٩٩٥ ی ئەم دواییەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ بکەین تا پەی بەوە ببەین کە هەوڵی چەندساڵە و تەنانەت دەیان ساڵەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هیچ کاریگەرییەکی لەسەر باشتربوونی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا نەبووە. ئەم راپورتە لەراستیدا بەو ئەنجامە گەیشتووە کە"بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا لە ساڵی ١٩٩٤ زۆر خراپتر بووە".

جەنابی سەرۆك، سەرجەم رێکخراوەکانی چاودێری مافی مرۆڤ بەهۆی پێشێلکردنی بەرفراوان و سیستماتیکی مافی مرۆڤ، لەوانە ئەشکەنجە، تورکیایان شەرمەزار کردووە. رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی، رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، کومیتەی دژە ئەشکەنجەی نەتەوە یەکگرتووەکان، پارلمانی ئەورووپا، گرووپی یاسایی مافی مرۆڤی نێونەتەوەیی، کومیتەی پارێزەرانی مافی مرۆڤ، رێکخراوی پزشکانی سنوورنەناس، رێکخراوی ماڵی ئازاد، پرۆژەی یاسایی مرۆڤایەتی، کۆمەڵەی مافی مرۆڤی تورکیا و رێکخراوەکانی دیکە بە بەڵگە خراپتربوونی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیایان سەلماندووە. ئەم گەلاڵە یاسایە کە من دەمەوێت بیخەمەڕوو، دەیەوێت ئاستی یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا ببەستیتەوە بەئاستی خواستی تورکیا بۆ رێگەدان بە چاودێری کردنی ئازاد و بێ کەندوکۆسپ لە سەر

بارودۆخی مافی مرۆڤ له تورکیا لەلایەن ڕێکخراوه ناوخۆیی و نێونەتەوەییەکانی چاودێری مافی مرۆڤ. ئەو ڕێکخراوانه کە له رابردوودا له چالاکی له تورکیا بەتەواوی بێ بەش کراون بریتین له کۆمەڵەی مافی مرۆڤی تورکیا، کونفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا، ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی و ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ.

لەم پەیوەندییەدا دەمەوێت باسی مافی کوردەکان بکەم. هیچ مەسەلەیەك بەقەد مەسەلەی کورد گرنگ نییه بۆ ئەوەی یارمەتی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا بپچڕێنین. تا ڕۆژی ئەمرۆ تورکیا حاشا له بوونی ١٥ میلیون کورد له تورکیا دەکات. سوپای تورکیا بەشێوازی سیستماتیك پتر له ٢ هەزار کوردنشینی چۆڵ کردووه، پتر له یەك میلیون هاووڵاتی کوردی لەماڵوحاڵی خۆیان دەربەدەر کردووه. قەڵاچۆ کردنی سیستماتیك و بەئەنقەستی شووناسی کورد لەلایەن دەوڵەتی تورکیا بە شێوەگەلی جۆراوجۆر نمونەی زۆر جوانی کومەڵکوژی و دەرکردنی ئەرمەنیەکانه لەسەرەتای ئەم سەدەیە. ئەگەر تورکیا دەیەوێت وەك رابردوو له پیاوەتی باجدەرە ئەمریکییەکان بێبەش نەبێت، دەبێ هەنگاوی بەرچاو هەڵبگرێت بۆ بەفەرمیناسینی تەواوی مافە مەدەنی، کولتووری و مرۆڤیەکانی هاووڵاتیانی کوردی خۆی و نیشان بدات که دەیەوێت بەشێوازی ئاشتیخوازانه کێشەی کورد چارەسەر بکات.

**گەڵاڵە یاسای ٥٧٨ ی ئەنجوومەنی پیران و ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکا بە ڕاوێژ لەگەڵ کۆنگرێس**

بەشی ۱: ناوی یاساکە

ناوی ئەم یاسایە"یاسای قبوڵکردنی مافی مرۆڤ لە تورکیا"یە

بەشی ۲: ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان

کۆنگرێس بەم ئەنجامانە گەیشتووە:

- وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە راپورتی ساڵی ١٩٩٥ ی خۆیدا لەژێر ناوی"بارودۆخی مافی مرۆڤ لە وڵاتان" پێشێلکردنی سیستماتیك و بەرفراوانی مافی مرۆڤ لەلایەن دەوڵەتی تورکیای بە بەڵگە خستووەتەڕوو. بەگوێرەی ئەم راپۆرتە، بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا لە ساڵی ١٩٩٤ زۆر خراپتر بووە.

- رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی، رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، کومیتەی دژە ئەشکەنجەی نەتەوە یەکگرتووەکان، پارلەمانی ئەوروپا، گروپی یاسایی مافی مرۆڤی نێونەتەوەیی، کومیتەی پارێزەرانی مافی مرۆڤ، رێکخراوی پزشکانی سنوورنەناس، رێکخراوی ماڵی ئازاد، پرۆژەی یاسایی مرۆڤایەتی، کۆمەڵەی مافی مرۆڤی تورکیا و رێکخراوەکانی دیکە چاودێری مافی مرۆڤ، بە بەشێوەی بەڵگەمەند پێشێلکردنی بەرفراوان و بەردەوامی مافی مرۆڤ لەلایەن دەوڵەتی تورکیا، لەوانە ئەشکەنجەی بەرفراوانیان خستووەتەڕوو.

- کردەوەکانی دەوڵەتی تورکیا، پێشێلکردنی رێککەوتننامە نێونەتەوەییە جۆراجۆرەکانی مافی مرۆڤە کە خودی تورکیاش واژۆی کردوون، لەوانە جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان، یاسای کۆتایی کونفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا و کونوانسیونی مافی مرۆڤی ئەوروپا.

- دەوڵەتی تورکیا بەردەوامە لە نکوڵی کردن لە بوونی ١٥ میلیون هاووڵاتی کورد لە تورکیا و هێزی سەربازی بەکارهێناوە بۆ لەناوبردنی شووناسەکەیان و پتر لە دووهەزار گوندی کوردنشینی کاول کردووە و زیاتر لە دوو میلیون کوردی ئاوارە و دەربەدەر کردووە.

- تورکیا بەردەوامە لە داگیرکردنی سەربازی نایاسایی قوبرس و کەندوکۆسپی دروست کردووە لەسەر رێگای دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی گونجاو و درێژخایەن بۆ دابەشکردنی قوبرس و دەربەدەر کردنی یونانیەکانی قوبرس لە ئەنجامی داگیرکرانی قوبرس لەلایەن تورکیا لە ١٩٧٤

- دەوڵەتی تورکیا بەردەوامە لە گەمارۆدانی ئەرمەنستان و رێگەنەدان بەگەیشتنی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە ئەرمەنستان.

- تورکیا بەردەوامە لە سنووردار کردنی رێبەرایەتی ئایینی کۆمەڵگای مەسیحی لە تورکیا و نەیتوانیوە ئەم کۆمەڵگایە لە بەرامبەر توندوتیژی بپارێزێت و بەرپرسیارە لە بەرامبەر لەناوبردنی بەرهەمە کوولتووری و هونەرییەکانی ئەم کۆمەڵگاید.

- کۆنگرێس لە بودجەی ساڵی ١٩٩٥ بۆ یارمەتی بیانی، ١٠٪ لە بڕی سەرەکی قەرزی راستەوخۆی ئەمریکا بە تورکیای بڕیوە، بەهۆی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا و بارودۆخی قوبرس. دەوڵەتی تورکیا رایگەیاندووە کە هەر چەشنە یارمەتییەکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رەت دەکاتەوە کە بە بارودۆخی مافی مرۆڤەوە بەسترابێتەوە کە بەگوێرەی رێکخراوە سەربەخۆکانی چاودێری مافی مرۆڤ، ئەم باردۆخە بەردەوام خراپتر بووە.

بهشی ۳ : سنووردار کردنی یارمهتی وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا به تورکیا

الف: ئهگهرهکان : لهو بڕه پارهیه که له ساڵی ماڵی ۱۹۹٦ بۆ یارمهتیدانی تورکیا له بهردستدایه، بهگوێرهی یاسای یارمهتی بیانی ۱۹٦۱ و یاسای کونترۆڵ کردنی هەناردنه دەرەوەی چەك، سهرۆك کۆماری ئهمریکا دهبێت سهرهتا له یارمهتی بێ بهرامبهر(ئهگهر ههبێت) و پاشان له رێگای یارمهتی قهرز بهتورکیا، بڕی ۵۰۰ ههزار دولار لهم یارمهتیه ببڕێت بۆ ههر رۆژێك که تورکیا شهرت و مهرجهکانی بهشی ٤ جێبهجێ نهکات.

چاوپۆشی: سهرۆك کۆمار دهتوانێت چاوپۆشی له بڕیارهکانی بهشی(الف) بکات ئهگهر سهرۆك کۆمار دیاری بکات که ئهم چاوپۆشیه له بهرژهوهندی ئاسایشی نهتهوهیی وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکادایه.

بهشی ٤: شهرت و مهرجهکان

شهرت و مهرجهکانی ئهم بهشه ههڵدهگیردرێت ههرکاتێك که سهرۆك کۆمار بۆ کۆنگرێسی پشتڕاست بکاتهوه که دهوڵهتی تورکیا:

۱ـ رێگه دهدات بهچاودێری ئازاد و بێ سنووری بارودۆخی مافی مرۆڤ لهم وڵاته لهلایهن رێکخراوه ناوخۆیی و نێونهتهوهییهکانی چاودێری مافی مرۆڤ، لهوانه کۆمهڵهی مافی مرۆڤی تورکیا، کونفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئهوروپا، رێکخراوی لێبوردنی نێونهتهوهیی و رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ .

۲ـ مافه مهدهنی، کولتووری و مرۆڤیهکانی هاووڵاتیانی کوردی خۆی بهفهرمی دهناسێت و شاڵاوه سهربازییهکانی دژی هاووڵاتیانی مهدهنی کورد راوهستاندووه و ههنگاوی بهرچاوی ههڵگرتووه بۆ چارهسهرکردنی ئاشتیخوازانهی کێشهی کورد.

٣ـ هەنگاوی بەرچاوی هەڵگرتووە بۆ کشانەوەی تەواوی سوپاکەی لە قوبرس و پشتیوانی خۆی نیشان داوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی قوبرس لەرێگای بە فەرمی ناسینی سەروەری، سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی قوبرس لەگەڵ یاسای بنەڕەتی دیموکراسی لەسەر بنەمای دەسەڵاتداری زۆرینە، سەروەری یاسا و پاراستنی مافەکانی کەمینە.

٤ـ بەتەواوی گەمارۆکانی خۆی لەسەر گەیشتنی یارمەتیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە ئەرمەنستان هەڵگرتووە.

٥ـ کەندوکۆسپە فەرمیەکانی سەر کلیسا و قوتابخانە مەسیحیەکانی هەڵگرتووە و قەشە مەسیحیەکان وەکو پێویست لە بەرامبەر توندوتیژی دەپارێزێت و ماڵ و دارایی کلیسا و قوتابخانە مەسیحیەکان لەبەرامبەر خراپکردن و بە تاڵانبردن دەپارێزێت.

## ٢٣ ی ئاداری ١٩٩٥ - ئهنجوومهنی پیران

## بڕیارنامهی ٩١ ی ئهنجوومهنی پیران دهربارهی توركیا

بهڕێز "پیل[١]" له لایهن خۆی و بهڕێز "جان كیری[٢]" ، بهڕێز "فینگۆلد[٣]" و خاتوون "سنۆ[٤]" ئهم بڕیارنامهیهی ئاماده كردووه كه تهسلیم به كومیتهی پهیوهندییهكانی دهرهوه كرا:

### بڕیارنامهی ٩١ ی ئهنجوومهنی نوێنهران

ـ بهلهبهرچاوگرتنی ئهوهی توركیا وهك دهوڵهتێك كه مهنشووری نهتهوه یهكگرتووهكانی واژۆ كردووه، بهرپرسیاره لهبهرامبهر پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێونهتهوهیی و پهرهپێدانی پهیوهندییه دۆستانهكان لهنێوان دهوڵهتان لهسهر بنهمای رێزگرتن له پرنسیپی مافی یهكسان و چارهی خۆنووسینی گهلان و هاوكاری نێونهتهوهیی له رێگای تهشویق كردن و هاندانی رێزگرتن له مافی مرۆڤ و ئازادییه بنهڕهتیهكانی ههموو مرۆڤێك.

ـ بهلهبهرچاوگرتنی ئهوهی دهوڵهتی توركیا وهك لایهنێك كه پهیماننامهی نێونهتهوهیی مافه مهدهنی و سیاسیهكان و پهیماننامهی نێونهتهوهیی مافه ئابووری، كۆمهڵایهتی و

---

[١] Mr. PELĪ
[٢] Mr. Kerry
[٣] Mr. Feingold
[٤] Ms. Snowe

کولتوورییەکانی واژۆ کردووه و کۆمەڵێك بەرپرسیاریتی فەرمی و زیادەی دیکەی لەئەستۆیە بۆ رەچاو کردنی مافی هەموو خەڵك.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی دەوڵەتی تورکیا وەك ئەندامی رێکخراوی پەیمانی ئاتلانتیکی باکوور(ناتۆ) ئەوەی وەئەستۆ گرتووه کە لە پەیوەندییە نێونەتەوەییەکاندا، دووری بکات لە هەڕەشە کردن یا کەڵکوەرگرتن لە هێزی سەربازی لەهەر مەسەلەیەکدا کە لەگەڵ ئامانجەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان ناتەبا بێت.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی تورکیا وەك ئەندامی "رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا" بەرپرسیارە لەبەرامبەر پاراستنی یەکپارچەیی خاکی وڵاتانی دیکە و پشتیوانیکردن لە مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتیەکان و مافی چارەی خۆنووسینی گەلان.

- بەرلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ۲۱ ی ئاداری ۱۹۹۵ زیاتر لە ۳۵ هەزار سەربازی تورك بە تانك و ئوتومبیلی سەربازی و پشتیوانی هەوایی دەستیان کردووە بە داگیرکردنی باکووری عێراق.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە دەوڵەتی تورکیا رایگەیاندووە کە ئەم داگیرکارییە وەڵامی کردەوەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانە(PKK) و ئەم داگیرکارییە بۆ رەدوونانی گەرمی تیرۆریستەکانە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە راپۆرتەکان نیشان دەدات سوپای تورکیا بە درێژایی ۱۵۰ مایل و قوڵایی ۲۵ مایل چووەتە ناو خاکی عێراق و تا ئێستا سەدان کورد کوژران.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە چاودێرە نێونەتەوەییە سەربەخۆکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هەندێ لەم کوژراوانە، خەڵکی سڤیلی بێ تاوان بوونە و دەوڵەتی تورکیا تۆمەتبار کراوە بە ئەشکەنجەی بەندکراوەکان و چۆڵ کردنی زۆرملێ و کاولکردنی گوندەکان.
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کاربەدەستانی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان پێشنیاری ئەوەیان کردووە کە داگیرکردنی باکووری عێراق لەلایەن تورکیا زیاتر لە سێ هەفتە نەخایەنێت.
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە داگیرکردنی کوردستانی عێراق لە لایەن تورکیاوە لەرووی ماوە و پێوەر و چۆنیەتییەوە، کردەوەیەکی دەستدرێژی نایاساییە و دژی ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی تورکیایە بە گوێرەی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان.
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کردەوەکانی تورکیا هەوڵەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و هەوڵە نێونەتەوەییەکان لە چوارچێوەی "شالاوی دابینکردنی حەسانەوە لە باکووری عێراق" دەخاتە ناو مەترسی و هەڕەشە لە دابینکردنی یارمەتییە مرۆڤدۆستانە زۆر پێویستەکان بۆ کوردەکان لە لایەن ڕێکخراوی ناحکومیەکان دەکات.
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا راپۆرتی داوە کە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا بەگشتی لە ساڵی ١٩٩٤ زۆر خراپتر بووە و زۆربەی ئەم پێشێلکارییانەی مافی مرۆڤ بەتایبەت دژی کوردەکان یا پشتیوانەکانیان ئەنجام دراوە.
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بەگوێرەی راپۆرتی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دەوڵەتی تورکیا لەسەرویەندی خەبات دژی PKK، مافی مرۆڤی

بەتایبەت پێشێل کردووە، لەوانە ئەشکەنجەی نایاسایی، کەڵکوەرگرتن لە هێزی زیادەڕۆیانەی سەربازی و کوشتنی سیاسی و نایاسایی خەڵکی مەدەنی.

کەوابوو ئەنجوومەنی پیران:

١ـ داگیرکردنی باکووری عێراق لە لایەن تورکیا شەرمەزار دەکات و بە داگیرکارییەکی نایاسایی و پێشێلکردنی یاسای نێونەتەوەیی دەزانێت کە دژی بەرپرسیارەتیەکانی تورکیایە بەگوێرەی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان، پەیمانی ئاتلانتیکی باکوور(ناتۆ) و ڕێککەوتننامە نێونەتەوەییەکانی دیکە.

٢ـ داوا لە سەرۆك کۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات دژایەتی توندی وڵاتە یەکگرتووەکان لەگەڵ دەستدرێژی نایاسایی تورکیا دەرببڕێت و دەسنبەجێ و بێ شەرت و مەرج داوای لێبکات لە(باکووری عێراق) پاشەکشە بکات.

٣ـ لەسەر ئەوە پێدادگرێت کە دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، دەستدرێژییە نایاساییەکەی تورکیا شەرمەزار بکات و داوای پاشەکشەی دەستبەجێ و بێ شەرت و مەرجی تورکیا بکات.

٤ـ پێشێلکردنی بەردەوامی مافی کوردەکان لە لایەن تورکیا ئیدانە دەکات.

٥ـ کردەوەکانی PKK دژ بە سوپای تورکیا و ئامانجەکانی دیکە شەرمەزار دەکات.

٦ـ پشتیوانی دەکات لە بەردەوامبوونی شاڵاوی دابینکردنی حەسانەوە و یارمەتیە مرۆڤدۆستانە ناحکومیەکانی دیکە بۆ کوردەکانی باکووری عێراق.

* * *

بەرێز پێل:

جەنابی سەرۆك، ٥ ساڵ لەمەو پێش کاتێ کە هێزەکانی عێراق سنووریان بەزاند و کوێتیان داگیر کرد، کۆمەڵگای نێونەتەوەیی(لە پێشیانەوە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) ئەم دەستدرێژییانە شەرمەزار کرد و رایانگەیاند کە لە بەرامبەریدا رادەوەستن. ئەم هەفتەیە پتر لە ٣٥ هەزار هێزی تورکیا بە بیانووی راوەدوونانی کوردە تروریستەکان، کوردستانیی عێراقیان داگیر کرد. راستیەکەی ئەوەیە کە ئەم کردەوەیەی تورکیا لە پێشێلکردنی یاسای نێونەتەوەیی و داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراق کەمتر نییە.

هەڵوێستی فەرمی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە تورکیا لەگەڵ هەڕەشەی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) روبەڕوویە کە حیزبێکی کوردی جیاییخوازە کە لە تورکیا چالاکی دەکات و بۆ دەوڵەتیکی سەربەخۆی کورد خەبات دەکات. بەهەرحاڵ تورکیا نابێت خەبات دژی PKK بکات بە بەهانەیەك بۆ ئەوەی کوردستانی عێراق بەشێوازێکی بەرفراوان داگیر بکات و مافی هاوولاتیانی بێ گوناهی کورد لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا بەردەوام پێشێل بکات.

هیچ رێگایەك نییە بۆ ئەوەی هێزەکانی تورکیا بتوانن کوردەکانی تورکیا و کوردەکانی عێراق لە باکووری عێراق لەیەك جیا بکەنەوە و هەروەها کوردە چەکدارەکان و ئاوارە مەدەنیە بێ گوناهەکان لەیەك جیا بکەنەوە. لەئەنجامدا، کوردە بێ گوناهەکان ـ چ کوردەکانی تورکیا ، چ کوردەکانی عێراق ـ بە دەستی هێزەکانی تورکیا دەکوژرێن و دەتوقێنرێن و ترور دەکرێن.

بە باوەڕی من ئەمە لەبنەڕەتدا راستە کە تورکیا هەوڵ دەدات شێوازی هەڵسوکەوتی خۆی لەگەڵ مەسەلەی کورد ئاڵۆزتر و تیرەوتارتر بکات. راستیەکەی ئەوەیە کە

ئازموونی خۆبەڕێوەبردنی کورد له باکووری عێراق، هەڕەشەیە بۆ شووناسی تورکیا و لاوازی دەکات. تورکیا به داگیرکردنی باکووری عێراق نیشانی دا که نیگەرانی یەکپارچەیی خاکی عێراقە و تەنها دەیەوێت کونترۆڵی کوردەکانی له دەستدابێت.

وادیارە که ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گلۆپی سەوزی بۆ ئەم کردەوە سەربازییەی سەرۆك وەزیرانی تورکیا، "چیللەر" هەڵکردووە. لەمەزیاتر هیچ گومان لەوەدا نییە که سوپای تورکیا سازوبەرگ و پێداویستیە سەربازییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ شەڕی دڕەندەی خۆی لەگەڵ کوردەکان بەکار دێنێت. سیاسەتی سەربازیچێتی تورکیا بەنیسبەت کوردەکان، بەدوورە له رەفتاری شارستانی.

ئێستا کاتی ئەوەیە که ولاتە یەکگرتووەکان هەڵوێستێکی بەپرەنیسپانە دژ به تورکیا بگرێت و دژایەتی خۆی لەگەڵ داگیرکرانی کوردستانی عێراق له لایەن تورکیاوە رابگەیەنێت و دابینکردنی سازوبەرگی سەربازی به تورکیا رابوەستێنێت. ئەگەر ئەم ئوپەراسیونەی تورکیا له ۳ تا ۵ هەفتەی داهاتوودا درێژەی هەبێت، زۆر بەهەڵەداچووین ئەگەر بڵێین که مەبەستی تورکیا تەنها راوەدوونانی(PKK) یە. ئێمە دەبێت ئەم داگیرکارییە بەو شێوەیە که لەراستیدا هەیە واتا وەك دەستدرێژییەکی ئاشکرا و هەڕەشەیەك بۆ ئاشتی نێونەتەوەیی، شەرمەزار بکەین. لەم پەیوەندییەدا من ئەمرۆ لەگەڵ ستاتۆر "جان کێری"، سناتۆر "فینگوڵد" و سناتۆر "سنۆ" ئەم بڕیارنامەیەمان خستەڕوو بۆ ئەوەی ئەم ئامانجە وەدی بهێنین.

جەنابی سەرۆك، داوا له سەرجەم هاوکارەکانم دەکەم پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەن.

## ٢٨ ی ئاداری ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا لە زمانی لیژنەی مافی مرۆڤەوە

بەڕێز "سمیت"، نوێنەی ئەیالەتی نیوجێرسی:

جەنابی سەرۆك، سەرەتای ئەم مانگە، ئەندامانی لیژنەی مافی مرۆڤی کۆنگرێسی ئەمریکا لە سەفەرەکەیان بۆ دۆزینەوەی راستیەکان لە تورکیا گەڕانەوە. بارودۆخی مافی مرۆڤ لە وڵاتی تورکیا لەم ساڵانەی دواییدا زۆر خراپتر بووە، سەرەڕای لێدوانەکانی پێچەوانەی رێبەرانی تورکیا.

ئێستا ناکۆکیە ناوخۆییەکانی تورکیا گەیشتووەتە لوتکە و هەڕەشە لە یەکهەڵوەشانەوەی کۆمەڵگای فرەئەتنیکی تورکیا دەکات و لەهەمان کاتدا سەراسەری ناوچە ناسەقامگیر دەکات. خەباتی تورکیا دژی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) بووەتە ئامرازێك بۆ ئەوەی تورکیا لەم دواییانە باکووری عێراق داگیر بکات و کەندوکۆسپەکانی سەر دەربڕینی بیروڕای لایەنگری لە کوردەکان و چالاکی سیاسی ئاشتیخوازانە پەرە پێبدات. لە کاتێکدا کە PKK درێژە بە چالاکیەکانی دەدات و زیاتر پشتیوانی خەڵك بەرەولای خۆی رادەکێشێت، متمانەنامەی دموکراتیکی تورکیا رۆژ بە رۆژ زیاتر دەچێتە ژێر پرسیار.

جەنابی سەرۆك، داوا دەکەم ئێستا راپورتی لیژنەی رێکخراوی مافی مرۆڤی کۆنگرێس بخرێتە بەر دەستی هاوکارانم کە گەلێ لە گیروگرفتەکانی مافی مرۆڤ لە

تورکیای دەستنیشان کردووە و کۆمەڵێك پێشنیاری سودمەندی خستووەتەڕوو دەربارەی ئەوەی چۆن دەوڵەتی تورکیا ئەم گیروگرفتانە چارەسەر بکات.

* * *

راپورتێك دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا، ٢ ی ئاداری ١٩٩٥

١ـ کورتە

رێکخراوی مافی مرۆڤ (کە پێشتر رێکخراوی مافی مرۆڤی کۆنگرێس بووە) لێژنەیەکی راستی دۆزەرەوەی مافی مرۆڤی ناردووە بۆ تورکیا کە لە ٢٥ ی شوبات تا ١ ی ئاداری ١٩٩٥ لەو وڵاتە ماوەتەوە.

ئەم لێژنەیە لە لایەن بەڕێز کنیت بلاکویل[١]، ئەندامی لێژنەی بەڕێوەبەران و نوێنەری پێشوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کومسیونی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان(UNHRC) سەرپەرەشتی کراوە و بەڕێز دەیڤید ل فیلیپس[٢]، سەرۆکی ئەم رێکخراوەیەشی لەخۆ گرتووە. ئامانجی ئەم سەفەرە، لێکوڵینەوە لەسەر پێشێلکارییە راپۆرتدراوەکانی مافی مرۆڤ لە لایەن دەوڵەتی تورکیا بووە، بەتایبەت پێشێلکردنی مافی هاووڵاتیانی کورد. ئەم لێژنەیە هەروەها لە کردەوە توندوتیژانەکانی(PKK)ش کۆڵیوەتەوە کە رێکخراوێکی سەربەخۆخوازە کە خەباتی چەکداری دەکات دژی دەوڵەتی تورکیا. ئەم لێژنەیە بەگوێرەی ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆی، راپۆرتێکی ئامادە کردووە و تەسلیمی کردووە بە

١ Kenneth Blackwell
٢ David L. Phillips

كاربەدەستانی ژنێڤ، ئەندامانی كۆنگرێسی وڵاتە یەكگرتووەكان، پارڵمانی ئەورووپا و پارڵمانی هەركام لە دەوڵەتە ئەورووپاییەكان.

بەشی ۲: بەرنامە

لێژنەكە سەردانی ئیستانبول، دیاربەكر و ئانكارای كردووە و بۆ وەرگرتنی بیروڕای جۆراوجۆر لەگەڵ كاربەدەستانی توركیا لە ئیدارەی سەرۆك وەزیران، وەزارەتی داد، وەزارەتی كاروباری دەرەوە، ئەنجوومەنی ئیشتمانی باڵای توركیا، بەرپرس و جێگری بەرپرسی ناوچەی نائاسایی و كارمەندانی سەربازی توركیا قسە و گفتوگۆی كردووە. لێژنەكە هەروەها لەگەڵ نوێنەرانی كۆمەڵەی مافی مرۆڤی توركیا، رێكخراوی مافی مرۆڤی توركیا، كۆمەڵەی پارێزەرانی دیاربەكر، كاربەدەستانی HADEP ، پارلمانتارێكی DEP ، پارێزەرانی پارلمانتارانی DEP ، پارلمانتارە كوردە پێشووەكان و هاووڵاتیانی كورد دیداری كردووە.

داواكاری فەرمی ئێمە بۆ دیدار لەگەڵ لەیلا زانا و ئەحمەد تورك (پارلمانتارانی بەندكراو) و ئەندامانی رێكخراوەكانی تۆڕی مافی مرۆڤی نێو پارلمان(IPN ) لە لایەن كاربەدەستانی توركیاوە رەت كرایەوە.

سەرەڕای دڵنیاكردنەوەكانی بەرپرسی ناوچەی نائاسایی، بازگە سەربازییەكان پێشیان لە سەفەری ئێمە بۆ گوندە كوردنشینەكانی دەوروبەری دیاربەكر گرت و نووسینگەی كۆمەڵەی مافی مرۆڤی دیاربەكر داخراو ٤ كەس لە ئەندامانی دەستگیر كران لە ماوەی ٢٤ كاتژمێر پاش كۆبوونەوەی لێژنەكە لەگەڵ نوێنەرانی كۆمەڵەكە.

بەشی ۳: كورتەیەك لەو گیروگرفتانە كە لە توركیا بینیومانە

کاربەدەستانی تورکیا بەشێوەی سیستماتیك مافی هاوولاتیانی تورکیا، لەوانە هاوولاتیانی کورد پێشێل دەکەن. یاسای دژە تیرور و زاڵکردنی بارودۆخی نائاسایی، رێگای بۆ پێشێلکردنی بەرفراوانی مافی مرۆڤ ، بەتایبەت لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا خۆش کردووە. کاربەدەستانی تورکیا دەڵێن ئامانجیان خەبات دژی تروریزمە، بەلام بەهەرحاڵ مافی گەلێ لە خەلکی سڤیل لە ئەنجامی خەباتی نێوان دەوڵەتی تورکیا و PKK پێشێل دەکرێت. بەهەرحاڵ دەبێ سەرنج بەوە بدەین کە PKK ئەم دواییانە داوای"رێگا چارەی مەدەنی" بۆ کێشەی کورد کردووە و سنوورەکانی تورکیای بەفەرمی ناسیوە.

دەوڵەتی تورکیا لەسەر ئەو باوەڕەیە کە هەموو ئەو کەسانەی کە بەشوێن مافە سیاسی و کولتوورییەکانی کوردەکان و مافی ئازادی دەربڕینی بیروڕا بۆ کوردەکاندان، "جیاییخواز" و لایەنگری PKK ن. کاربەدەستانی تورکیا زیاتر لەیەك هەزار گوندی کوردنشینیان بە تۆمەتی پێگەی ئوپەراسیونەکانی PKK کاول کردووە. چاودێرانی مافی مرۆڤ نموونەکانی گرتنی سەرەڕۆیانە، ئەشکەنجە، کوشتنی نایاسایی و سنووردارکردنی ئازادی رادەربڕینیان راپۆرت داوە. لەمە زیاتر پارلمانتارە کوردەکان کە بەشێوەیەکی دیموکراتیك وەك ئەندامی پارلمان هەڵبژێردراون، خراونەتە بەندیخانە و حوکمی"پروپاگەندای جیاییخوازی" و پشتیوانی لە"گروپێکی چەکدار" یان لەسەر دراوە، لەکاتێکدا کە لە راستیدا ئەوان داکۆکیان لە مافی خەڵکەکەیان کردووە. هەروەها کۆمەڵێك کێشەی جیدی لە سیستمی دادی تورکیادا هەیە.

بەشی چوارم: کورتەی ئەنجامی لێکولینەوەکان

وەزارەتی ناوخۆی تورکیا ئاشکرای کردووە کە ١٠٤٦ گوند لە ناوچەی نائاسایی چۆڵ کراون. چاودێرانی مافی مرۆڤ دەڵێن چەند هەزار گوند کاول کراون و خانووەکانیان لەگەڵ بنەماڵەکان سووتێندراون، تەنانەت راپۆرت دراوە کە دەوڵەتی تورکیا گازی کیمیایی دژ بەم گوندیانە بەکارهێناوە. دەوڵەتی تورکیا خۆی پشتڕاستی کردووەتەوە کە ٩٤٠ چەکدار کوژراون. بەهەرحاڵ راپۆرتەکانی دیکە دەڵێن کە هەزاران کەس کوژراون. ئێستا ژمارەی دانیشتوانی دیاربەکر لەئەنجامی ئاوارەبوونی ئەو خەڵکە کە پەنایان بۆ ئەم شارە هێناوە، لە ١/٢ میلیون کەس تێپەڕیوە.

پارلمانتارانی سەربە DEP لە دادگایەکدا کە بە وتەی گەلێ لە چاودێران"دادگایەکی شانۆگەری" بووە، مەحکوم کراون. دەوڵەتی تورکیا ئاشکرای کردووە کە ٨٦٨٢ بەندکراو بەگوێرەی یاسای دژە ترور(کە رێگە بە دەستگیر کردنی سەرەڕۆیانەی تۆمەتباران دەدات) حوکمیان لەسەردراوە. گەلێ لەم کەسانە کە دەستگیر کراون و هەروەها ئەو کەسانە کە بێ سەروشوێن کراون، تەنها هەوڵیان داوە بەشێوەی ئاشتیخوازانە لە مافی ئازادی رادەربڕین، دامەزراندنی کۆڕوکۆمەڵەکان یا مافەکانی دیکەی مرۆڤ کە لە کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا بە فەرمی ناسراوە، کەڵك وەربگرن. کۆمەڵەی مافی مرۆڤی تورکیا نمونەکانی کوشتنی نایاسایی و ئەشکەنجەی ئەو کەسانەی راپورت داوە کە بە تاوانی سیاسی لە بەندی تاکەکەسیدا بوونە. ئێستا ٢٥٠ سکاڵا دژ بەم کردەوانە لە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا و کومسیونی مافی مرۆڤی ئەورووپا تۆمار کراوە.

یاسای دادی تورکیا هیچ مافێك بۆ پێداچوونەوە بەسەر ئەو حوکمانە قبوڵ ناکات کە بەگوێرەی یاسا لە حاڵەتی نائاساییدا دەرکراون. یاسای دژە تیرور کە لە ساڵی ١٩٩١

پەسەند کراوە، گەلێ لە ئازادییە مەدەنیەکانی سنووردار کردووە، لەوانە دەستڕاگەیشتنی پارێزەر بەو کەسانە کە لەبەندیخانەدان. ڕێوشوێنەکانی یاسای دژە تیرور و حاڵەتی نائاسایی، ئازادی رادەربڕینیشی سنووردار کردووە. ئێدارە دەوڵەتیەکان، چاودێرانی مافی مرۆڤ، رۆژنامەنووسان، پارێزەران و پرۆفسورەکان ئازارونەزیەت دەدەن و دەیانخانە بەندیخانە. یاسای دژە تیرور، بەتایبەت ماددەی ٨ بەرفراوان و ناڕوون داڕێژراوە و بووەتە هۆی پێشێلکردنی بەرفراوانی خەڵکی سڤیلی بێ گوناه.

لەمە زیاتر دادگای یاسای بنەڕەتی تورکیا، پارتی DEP ی قەدەخە کردووە کە ئامرازی دەربڕینی شووناسی کوولتووری کورد بوو و داکۆکی لەسەرجەم مافەکانی هاووڵاتیانی کورد دەکرد. لە دو ساڵی رابردوودا ٢٦ کەس لە ئەندامانی DEP و HADEP کوژراون و لەم هەڵبژاردنەی دواییەدا نووسینگەکانی DEP بە بومب تەقێنراونەتەوە. یاسای چاپەمەنی ڕێگە دەدات بە داخرانی بڵاقۆکەکان بە حوکمی دادگا و دەڵێت سەرنووسەرەکان بەرپرسیارن لەبەرامبەر ناوڕۆکی وتارەکانیان و ١٩ رۆژنامەنووس بەگوێرەی یاسای دژە ترور دادگایی کراون. لە ٣ ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٤ بینای رۆژنامەی "ئوزگور یولکە"(کە بە لایەنگری لە PKK ناسراوە) بە بومب تەقێندرایەوە و ئێستا هیچ رۆژنامە، تەلەڤیزیون یا رادیۆیەکی سەربەخۆ بە زمانی کوردی پەخش وبڵاو نابێتەوە.

بەنیسبەت مافی کوولتوورییەوە، یاسای بنەڕەتی تورکیا، کورد وەك کەمینەیەکی نەتەوەیی، نژادی یا ئەتنیکی بە فەرمی ناناسێت و دوسەد کورد لە کاتی جەژنی نەورۆز لە دیاربەکر دستگیر کران. لە ئاکامی ئەم ئاکۆکیە، هاووڵاتیانی کوردی

تورکیا لە مافە دیموکراتیکەکان و هەروەها دەربڕینی کارای ئامانجە سیاسی و کوواتوورییەکانیان بێ بەش کراون. ئەنجامی ئەم سیاسەتە توندڕەوتر بوونی کوردەکانە کە ئەمەش دەبێتە هۆی خراپتر بوونی بارودۆخی ئاسایش لەسەراسەری تورکیا و ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان دەبن بە لایەنگری حیزبی ئیسلامگرای"ریفاء".

بەشی پێنجەم: پێشنیارەکان

کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەبێ لە رێگای تەشویقکردنی دیالوگی نێوان کاربەدەستانی تورکیا و نوێنەرە رەواکانی خەڵکی کورد، باشتربوونی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا هان بدات. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، دەبێ حوکمی لێبوردن بۆ پارلمانتارانی سەربە DEP دەربکرێت بۆ ئەوەی بتوانن لە دیالوگێکدا بەشداری بکەن بۆ کەمبوونەوەی ئاڵۆزییەکان و ئاساییبوونەوەی پەیوەندییەکانی نێوان کاربەدەستانی تورکیا و هاووڵاتیانی کوردی تورکیا. لە چوارچێوەی دەسەڵاتی UNHRC ، گروپی کاری دەستگیرکردنی سەرەڕۆیانە و راپورتێرانی تایبەتی ئەشکەنجە و ئازادی رادەربڕین، دەبێ لە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا بکۆڵنەوە. دەوڵەتی تورکیا، "راپورتێری تایبەتی لە سێدارەدانی" بانگهێشت کردووە سەردانی تورکیا بکات و دەبێ لە داهاتوویەکی نزیکدا بەشێوەیەکی گونجاو سەفەری تورکیا بکات. دەبێ کۆمەڵێك هەوڵ لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەورووپاوە بدرێت بۆ دانانی کۆمەڵێك کەندوکۆسپ بۆ فرۆشتنی پێداویستی و سازوبەرگی سەربازی بە تورکیا کە لەوانەیە دژی هاووڵاتیانی سڤیل بەکاری بهێنێت.

وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەورووپا هەروەها دەبێ مامەڵەی بازرگانی و کەمکردنەوەی باجی گومرگ ببەستنەوە بە جێبەجێ کردنی رێوشوێندکانی مافی

مرۆڤ لە لایەن تورکیاوە. دەبێ کومەڵێك بەرنامەی یارمەتیدەرانە بۆ سەروەری یاسا لە نێوان ئەندامانی پارلمانی تورکیا، پارلمانی ئەوروپا و کۆنگرێسی ولاتە یەکگرتووەکان دابنرێت بۆ ئەوەی دامەزراوە دیموکراتیکەکان بەهێز بن و یارمەتی بە چاکسازی لە یاسای بنەڕەتی و یاساکانی دیکەدا بکەن. یاسای دژە ترور دەبێ هەموار بکرێت بۆ ئەوەی مافی هاوولاتیانی کورد پێشێل نەکرێت و لە هەمان کاتدا مافی دەولەت بۆ پاراستنی یەکپارچەیی خاکەکەی بپارێزرێت. دەبێ تۆڕی ئەلیکترونیکی کامپیوتری لە نێوان TGNA و لیژنەکانی پارلمان لە ولاتانی دیکە دابمەزرێت.

ئەم پێشنیارانە بۆ ئەوەیە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بتوانێت بەتەواوی ئاگاداری خراپتر بوونی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا بێت. نووسەرانی ئەم راپۆرتە هیوادارن لە رێگای دیالۆگ بۆ ئاشتەوایی، ئاشتی، خۆشبەختی و دیموکراسی بۆ سەرجەم هاوولاتیانی کۆماری تورکیا ببوژێتەوە.

## ٢٨ ی ئاداری ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی پیران
## داگیرکرانی باکووری عێراق لە لایەن تورکیا

بەڕێز جان کێری[1]:

جەنابی سەرۆك، من سپاسی سناتۆری ئەیالەتی رۆدئیسلەند[2] دەکەم بۆ پشتیوانە سەرەکیەکەی لە مەسەلەی داگیرکرانی باکووری عێراق لە لایەن تورکیا و خوشحاڵم کە منیش پەیوەست دەبەم بە هەوڵەکانی ناوبراو وەك پشتیوانی سەرەکی بڕیارنامەی ژماری ٩١ی ئەنجوومەنی نوێنەران کە .داگیرکردنی عێراق لە لایەن تورکیا شەرمەزار دەکات.

لە ٢٠ ی ئادار، نزیکەی ٣٥ هەزار سەربازی تورکیا سنووری باکووری عێراقیان بەزاند و هێرشێکی گەورەیان کردە سەر گریلا کوردەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK). هەر چەند کە سەرۆك وەزیرانی تورکیا، "تانسۆ چیللەر[3]" داکۆکی لەم داگیرکارییە کردووە و وەك کردەوەی رەوای خۆپاراستن لەقەڵەمی داوە ، بەڵام سروشت و پێوەری داگیرکاری باکووری عێراق بە دەستی تورکیا، ئەم هەڵێنجاندنەی سەرۆك وەزیرانی تورکیا بە درۆ دەخاتەوە.

کەوابوو ئەم بڕیارنامەیە داوا لە سەرۆك کلینتۆن دەکات دژایەتی توندی خۆی لەگەڵ ئەم داگیرکارییەی تورکیا دەربېڕێت و داوا بکات ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە

[1] Mr.JOHN KERRY
[2] Rhode Island
Tansu Ciller[3]

یەکگرتووەکان ئەم داگیرکارییە شەرمەزار بکات و داوای کشانەوەی دەستبەجێ و بێ شەرت ومەرجی هێزەکانی تورکیا بۆ ناو خاکی تورکیا بکات. ئەم داگیرکارییەی تورکیا بەپێچەوانەی بەرپرسیارەتیەکانی ئەم دەوڵەتە بەگوێرەی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوی هاوکاری و ئاسایشی ئەورووپایە چونکە ئەم مەنشورانە تورکیا بەرپرسیار دەکات کە رێز لە یەکپارچەیی خاکی وڵاتانی دیکە بگرێ و پشتیوانی لە مافی مرۆڤ ، ئازادییە بنەڕەتیەکان و مافی چارەی خۆنووسینی سەرجەم گەلان بکات.

من و گەلێ لە هاوکارانم پشتیوانی لە هەڵمەتی تورکیا دەکەین بۆ شکستپێهێنان بە PKK کە دە ساڵە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتیکی سەربەخۆی کورد خەبات دەکات. بەڵام بەهەرحاڵ سروشت و دڕندەیی تاکتیکەکانی سەرۆك وەزیران، "چیللەر" و سوپای تورکیا بۆ خەبات دژی PKK قابلی قبوڵ نییە، بێ سوودە و سەرکەوتوو نابێت. ئەم داگیرکارییە جگە لەوە کە پێشێلکردنی بنەماکانی یاسای نێونەتەوەییە، کێشەی PKKش خراپتر دەکات، لە باتی ئەوەی ئارامی بکاتەوە. لەمەزیاتر ئەم کردەوەیەی تورکیا زیانی جیدی بە پێگەی ئەم وڵاتە لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەگەیەنێت. بۆ وڵاتیك وەك تورکیا کە بە دوای ئەوەدایە قەناعەت بە جیهان ـ و بەتایبەت یەکێتی ئەورووپا ـ بهێنێت کە پابەندە بە دیموکراسی، سەروەری یاسا و رێزگرتن لە مافی مرۆڤ ، داگیرکردنی عێراق و هەڵمەتی بەردەوامی سەربازی بۆ لەناوبردنی PKK ، پابەندبوونی تورکیا بەم پرەنسیپانە دەباتە ژێر پرسیار و کۆمەڵێك پرسیاری رەوا دەربارەی سروشت و چەندایەتی و چۆنایەتی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ تورکیا دەهێنێتە ئاراوە.

من لەوە دەترسم کە تورکیا ببێ بە قوربانی ئەو وەسواسە کە لە ڕێگای توندوتیژی و تۆڵەسەندنەوە دەتوانێ لەگەڵ تیرۆریزم خەبات بکات، لەکاتێکدا کە ئەم کردەوانەی تورکیا لە کردەوەکانی PKK خراپترە. سوپای تورکیا بەشێوەی سیستماتیک گوندە کوردنشینەکانی چۆڵ کردووە و گەلێ لە هاووڵاتیانی کوردی لە ماڵ و زێدی خۆیان قەڵاچۆ کردووە. ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ، پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤی تورکیا، لەوانە ئەشکەنجە و تیروری سیاسییان بە بەڵگە خستووەتەڕوو. کردەوەکانی سوپای تورکیا بووەتە هۆی لەناوچوون و وێرانبوونی ماڵ و ژیانی خەڵکی بێ گوناح و زیاتربوونی پشتیوانی کوردەکان لە PKK .

من لەوە دەترسم پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتی ئێمە و تورکیا خراپ ببێت، ئەگەر تورکیا هەنگاوی بەرچاو هەڵنەگرێت بۆ باشترکردنی بارودۆخی مافی مرۆڤ و دەست لە هەڵمەتی سەربازی هەڵنەگرێت و ڕێگاچارەیەکی دیکە بۆ کێشەی کورد نەدۆزێتەوە. دانپێدانانی تورکیا بەوە کە هاووڵاتیانی کورد کۆمەڵێك مافی مەدەنی، کولتووری، سیاسی و مرۆڤیان هەیە، یەکەمین هەنگاوە لەم پەیوەندییەدا و دانپێدانەنان بەم مافانە کارێکی بێ عەقڵانەیە(کە کارێکی واش لە تورکیا ناوەشێتەوە) چونکە تورکیا دەبێ پابەند بێت بە بنەماکانی دیموکراسی، سەروەری یاسا و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ . کارێکی بێ عەقڵانەیە ئەگەر تورکیا بەشوێن ڕێگاچارەی سەربازیدا بگەڕێت بۆ کێشەی کوردەکان کە یەك لە ٥ی دانیشتوانی تورکیا(١٥ میلیون کەس) پێکدەهێنن.

تورکیا لەمێژە هاوپەیمانی وەفادار و متمانەپێکراو و پڕبایەخی ناتۆیە. تورکیا هەر وەك هەموو دەوڵەتەکانی دیکە، خەباتێکی دژوار دەکات بۆ پێناسەکردنی دەوری

دیپلوماتیك، ئاسایش و ئابووری خۆی لە سەردەمی پاش "شەڕی سارد" ، بۆ گێڕانی ئەم دەورە پێویستی بەوەیە لەگەڵ PKK و پەرەسەندنی بناژۆخوازیی توندوتیژانەی ئیسلامی خەبات بکات.

بەهەرحاڵ ئەم کێشانە - هەر چەند دژواریش بن - بە هیچ شێوەیەك ڕەوایی نابەخشێت بە داگیرکردنی باکووری عێراق و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بۆ تورکیا ڕوونی بکاتەوە کە ڕەفتارێکی وەها زیان بە پەیوەندییەکانمان دەگەیەنێت و ناتەبایە لەگەڵ ئامانجی دیموکراسی، مافی مرۆڤ و سەروەری یاسا.

## ۳۰ ی ئاداری ۱۹۹۵ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## تورکیا دەبێ هێرشە دڵڕەقانەکانی دژبە گەلی کورد رابوەستێنێت

بەڕێز " بابی، روش"[۱]، نوێنەری ئەیالەتی ئیلۆنوێز:

جەنابی سەرۆك، من ئەمڕۆ دەمەوێت ئەوپەڕی نیگەرانی و دڵساردی خۆم دەرببڕم بەنیسبەت کردەوەکانی ئەم دواییانەی دەوڵەتی تورکیا.

دەوڵەتی تورکیا جارێکی دیکە بڕیاری داوە نارەزایەتیەکانی دەوروبەری سنوورەکانی بە هێزی سەربازی چارەسەر بکات لە باتی ئەوەی لەگەڵ ئەو کەسانە دابنیشێت کە تەنها دەیانەوێت لە سەرکووتی هەمەلایەنەی تورکیا رزگاریان بێت. ئێوە لە رۆژانی داهاتوودا لە دەوڵەتی تورکیا دەبیسن کە ئەم هێرشی دواییە بۆ ناوچەکانی ژێر کونترۆڵی کوردەکان لە عێراق تەنها ئامانجی راوەستاندنی هێرشی کوردە راپەڕیوەکانە بۆ تورکیا.

ئێمە نابێت فریوی ئەم قسانەی دەوڵەتی تورکیا بخۆین. ئایا ئەوە رەوایە کە وڵاتیك بەفەرمی حاشا لە بوونی گروپێك بکات کە نزیکەی ۲۰٪ سەرجەم دانیشتووەکانی پێك دەهێنێت. هاوولاتیانی کورد بەهۆی ئەوەی بەتایبەت لە لایەن یاسای تورکیاوە ناپارێزرێن، بوونەتە قوربانی سیاسەتی هەڵاواردن، تۆقاندن، ئازار و ئەزیەت و تەنانەت کوشتن و بڕینی دەوڵەتی تورکیا. دەوڵەتی تورکیا بە دەیان جار لە لایەن نەتەوەیەکگرتووکان، رێکخراوی چاودێری هلسینکی و رێکخراوی لێبووردنی

---

[۱] BOBBY L. RUSH

نێونەتەوەییەوە شەرمەزار کراوە بەهۆی حاشا کردن لە ئازادییە مەدەنییە بنەڕەتیەکانی کوردەکان، لەوانە مافی ئازادی چارەی خۆنوسین و مافی ئازادیی دەربڕینی میراتە کوولتوورییە دەولەمەندەکەیان.

جەنابی سەرۆك ئەم بارودۆخەی ئێستا، شتێکی نوێ و جیاواز نییە. هەزاران کەس لە کوردەکانی تورکیا ئێستا لە باکووری عێراق دەژین، لە بەر ئەوەی ساڵی پار لە دەستی ئازار و ئەزیەتی کاربەدەستانی تورکیا لەو وڵاتە هەڵاتن. ژیانی ئەم(ئاوارانە) تێکچووە، بەهۆی هێرشە بەدەوامەکانی تورکیا بۆ سەر میرات، کوولتوور و لە راستیدا بوونیان. ئەم خەڵکە لەمێژە لە دولاوە لە ناو ئاگردا گیریان خواردووە. ئەم خەڵکە تەنها بەشوێن ئازادی هەلبژاردنی شووناسی جیاوازی خۆیانن. لانیکەم دەتوانین بڵێین کە ئەم دەوڵەتە رێگە بەم خەڵکە نادات کەڵك لە مافە زۆر سەرەتاییەکانیان وەربگرن.

بەهەرحاڵ جەنابی سەرۆك، خۆمانیش تارادەیەك سزاواری سەرزەنشین بەهۆی قەیرانی بەردەوامی باکووری عێراق. دەوڵەتی تورکیا بڕێکی زۆر یارمەتی مادی لە وڵاتە یەکگرتووەکان وەردەگرێت و ئێمە و هاوپەیمانەکانمان بڕێکی زۆر سازوبەرگی سەربازی دەدەین بەتورکیا. ئەم چەکانە لەپێشا بۆ پاکتاوکردنی گوندەکان و کوشتنی ژن و منداڵی بێ گوناح کەڵکیان لێوەردەگیرێت. ئێمە دەبێ چاو لە رێبەرایی دەوڵەتی ئاڵمانیا بکەین و کۆتایی بە فرۆشتنی چەك بە تورکیا بهێنین.

جەنابی سەرۆك بەبۆچوونی من دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان دەبێ بەسیاسەتی خۆیدا بچێتەوە بەنیسبەت یارمەتیدانی تورکیا، بەهۆی مێژووی رەفتاری تورکیا لەگەڵ ئەرمەنستان و گروپە ئەتنییەکانی قوبرس. چالاکیەکانی ئێستای دەوڵەتی تورکیا لە

ناوچە شاخاوییەكانی(باكووری) عێراق، دەبێ پرسیاری زۆرتر لای ئێمە دروست بكات بەنیسبەت ئامانجە گرنگترەكانمان لەو ناوچەیە.

جەنابی سەرۆك ، توركیا مافی ئەوەی هەیە سنوورەكانی خۆی بپارێزێت بەڵام بەهەرحاڵ ئەم مافە نابێتە پاساو بۆ ئازارو ئەزیەتدانی بەردەوامی خەڵكی سڤیلی بێ گوناح. ئێمە پشتیوانیمان لە مافی كوردەكانی عێراق بۆ سەربەخۆیی لە رژێمی بەغداد كردووە. ئێستا سەربازەكانی ئێمە لەباكووری عێراقن و كوردەكان لە بەرامبەر سوپای عێراق دەپارێزن. بەهەرحاڵ جەنابی سەرۆك، ئێمە دەبێ مافی سەرجەم كوردەكان بپارێزین، بێ لەبەرچاو گرتنی ئەوەی لەكام وڵاتدا لەدایك بوونە.

وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هۆشداری داوە بە دەوڵەتی توركیا كە چاوی لە كردەوەكانیەتی. من دەمەوێت ئەوەش زیاد بكەم كە دەبێ سەراسەری جیهان لە نزیكەوە چاودێری ئەم بارودۆخە بكات. ئەم چاودێرییە نەتەنها دەوڵەتی توركیا بەرپرسیار دەكات، بەڵكوو ناچاریشی دەكات ئامانج و كردەوە بیانیەكانی سەرلەنوێ هەڵبسەنگێنێتەوە.

## ٥ ی نیسانی ١٩٩٥ - ئەنجوومەنی پیران
## تورکیا دەبێ لەباکووری عێراق پاشەکشە بکات

بەڕێز پێل:

جەنابی سەرۆك، لە ٢٣ ی ئادار من هاورێ لەگەڵ سناتۆر "کێری"، "فینلگۆڵد" و "سنۆ" بڕیارنامەی ٩١ ی "ئەنجوومەنی پیران" مان ئامادە کرد بۆ شەرمەزار کردنی داگیرکردنی باکووری عێراق لە لایەن تورکیاوە.

لەوکاتەوە سناتۆر "جۆزیف بایدن[١]"، "داماتۆ[٢]"، "ساربانز[٣]" و "سیمۆن[٤]"یش بوونەتە پشتیوانی ئەم بڕیارنامەیە. بە بوونی پیشتیوانییەکی بەهێزو بێ لایەنی وەها هیوادارم کە بتوانم ئەم بڕیارنامەیە بۆ پەسەندکردن، تەسلیم بە ئەنجوومەنی پیران بکەم. هەتا ئەمڕۆ من دەمەویست هەندێ گۆڕانکاری لەم بڕیارنامەیە ئەنجام بدرێت بەڵام ئێستا بەهۆی سەرقاڵبوونی ئەنجوومەنی پیران(بەتایبەت سەرقاڵبوون بە گیروگرفتەکانی هەمواركردنی گەڵاڵەی قەرزەکانی ئوردۆن و پێویستبوونی ناردنی ئەم بابەتە بۆ سەرۆك کۆمار بەزووترین کات) بە بۆچوونی من ئێستا باش نییە ئەم گەڵاڵەیە بۆ هەموار کردن تەسلیم بە(کومسیونی) سیاسەتی دەرەوە بکرێت.

بەهەرحاڵ من هێشتا زۆر نیگەرانم بەنیسبەت ئۆپەراسیونی سەربازی بەردەوامی تورکیا لە باکووری عێراق و دەمەوێت ئێستا باسی بکەم.

---

[١] Biden
[٢] D'AMATO
[٣] Sarbanes
[٤] Simon

له چەند رۆژی رابردوودا من کاتی ئەوەم هەبوو تا بەدواداچوونەوەی ئەم مەسەلەیە بکەم لە ئاستی پلەبەرزترین کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو تورکیا. من لەم پەیوەندییەدا نامەم لەگەڵ سەرۆك کۆمار و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ئاڵوگۆڕ کردووە و هەر سەرلەبەیانی ئەمڕۆ من و ئەندامانی دیکەی کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا دیدارمان کرد.

بەتایبەت من لە بوونی بەردەوامی سوپای تورکیا لە کوردستانی عێراق و دیاری نەکردنی رۆژێك بۆ کشانەوە لە کوردستانی عێراق زیزم. تورکیا دەبێ ئێستا پاشەکشە بکات. رەفتاری سەرکوتکەرانەی تورکیا لەگەڵ کوردەکانی خۆی هەزاران کەس لە هاووڵاتیانی کوردی ناچار کردووە هەڵبێن بۆ باکووری عێراق. هێرشەکانی تورکیا ژیانی هەزاران کەسی لە هاووڵاتیانی کوردی سڤیلی باکووری عێراقی خستووەتە ناو مەترسی. بەبۆچوونی من هێرشی تورکیا، پێشێلکردنی یاسای نێونەتەوەییە کە دەبێ کۆتایی پێبێت. لەمەزیاتر راپورتەکان نیشان دەدات کە تورکیا کۆمەڵێك گیروگرفتی بۆ دەستڕاگەیشتنی نوێنەرانی رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی فریاگوزاری وەك رێکخراوی "خاچی سووری نێونەتەوەیی" بە ناوچەی شەڕ دروست کردووە. هەروەها تورکیا دەستڕاگەیشتنی رۆژنامەنووسان بە ناوچە سەرەکیەکانی شەڕەکەی سنوودار کردووە. لانیکەم تورکیا دەبێ دەستبەجێ هەنگاو هەڵبگرێت بۆ پاراستنی خەڵکی سڤیل و ئاوارەکان.

دەبێ بڵێم کە لە کاتی راوێژەکانم لەگەڵ دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان لەم پەیوەندییەدا خۆشحاڵ بووم کە ببینیم نیگەرانیەکانم پشتڕاست دەکرێتەوە و هەوڵی هاوئاهەنگ دەدرێت بۆ رەواندنەوەی نیگەرانیەکانم. سەرۆك کۆماری ئەمریکا دڵنیای

کردمەوە کە کاربەدەستانی ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە واشنگتۆن و ئانکارا هەر ڕۆژ تورکیا دەخەنە ژێر گۆشار تا ژیانی خەڵکی سڤیلی بێ گوناح بپارێزێت و بە زووترین کات، کە بۆی دەکرێت پاشەکشە بکات.

وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ئەوەی پشتڕاست کردووەتەوە کە تورکیا پێشی لە چوونی ڕۆژنامەنووسان و ڕێکخراوە ناحکوومیەکان بۆ ناوچە گرتووە و منی ئاگادار کردەوە کە ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەرزترین ئاستدا کار دەکات بۆ ئەوەی ئەم بارودۆخە باش بکات. من خۆشحاڵ بووم کە ئاگادار بوومەوە کە کاربەدەستانی باڵوێزخانەی ولاٌتە یەکگرتووەکان لە تورکیا ئەم هەفتەیە سەردانی کوردستانی عێراقیان کردووە و "تالبوت[5]" و "هۆلبروك"[6] سەفەر دەکەن بۆ ئانکارا و لەوێ باسی نیگەرانیەکانمان دەکەن. من چاوەڕوانی ڕاپۆرتەکەیانم.

من پێشوازی لە گۆڕینی سیاسەتی ئیدارەی ئەمریکا بەنیسبەت لایەنە کێشەخولقێنەرەکانی ئەم داگیرکاریە دەکەم. وادیارە ئیدارەی ئەمریکا زۆرتر خوازیاری ئەوەیە کە ڕەفتارو هاناکانی تورکیا بباتە ژێر پرسیار و لەسەر ئەم مەسەلە کێشەخولقێنەرانە لەبەرامبەر تورکیادا ڕابوەستێت. هەرچەند کە من ئێستاش هەوڵ دەدەم بۆ ئەرەی بە زووترین کات(کە دەست بدات) ئەم بڕیارنامەیە پەسەند بکرێت، بەلاٌم لەسەر ئەو باوەڕەم کە سیاسەتی ولاٌتە یەکگرتووەکان بە ئاراستەیەکی ڕاستدا دەچێت.

---

[5] Secretary Talbott

[6] Secretary Holbrooke

## ٢٤ ی گوڵانی ١٩٩٥ - ئەنجوومەنی نوێنەران

## راپورتێك دەربارەی یارمەتیە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا بۆ شەڕ دژی کوردەکان

تورکیا: دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕی ٦/٣ بیلیون دولار چەك و پێداویستی سەربازی داوە بە تورکیا لە نێوان ساڵی ١٩٨٤ و ١٩٩٣ و ٧٦٪ ی سەرجەم ئەو چەکانەی کە تورکیا لە نێوان ١٩٨٧ و ١٩٩١ کڕیویە، لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە دابین کراوە کە ئەم هەڵسەنگاندنە لە نێوان ١٩٩١ و ١٩٩٣ گەیشتووەتە ٨٠٪ .

زۆربەی ئەو چەکانە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داویەتی بە تورکیا بەخەرجی باجی هاووڵاتیانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دابین کراوە کە بەشێکە لە بەرنامەی یارمەتی بەرفراوانی سەربازی کە لە ئەنجامیدا وڵاتە یەکگرتووەکان زیاتر لە ٥ بیلیون دولار یارمەتی داوە بە تورکیا لە نێوان ساڵی ١٩٨٦ و ١٩٩٥ . تورکیا هەروەها بەشێکی زۆری ئەم چەکانەی بە بەلاش یا بە کەمترین بەها لە ئەمریکا وەرگرتووە کە بەشێکە لە بەرنامەی"تاوڕێژگەی" ناتۆ بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی چەکە زیادەکان بەگوێرەی پەیماننامەی هێزە هاوپەیمانەکان لە ئەورووپا(CFE).

سەرەنجام ئەوە کە هەندێ سیستمی بەرهەمهێنانی چەکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەگوێری رێککەوتننامەکانی پێکەوەبەرهەمهێنان و مۆڵەتبەخشین لەگەڵ کومپانیاکانی وڵاتە یەکگرتووەکان لە تورکیا بەرهەمدەهێنرێت ، لەوانە کومپانیای

وەبەرهێنەری فڕۆکەی شەڕکەری ١٦ـ F ی Lockheed و کومپانیای وەبەرهێنەری نەفەرهەڵگری زرێپۆشی ١١٣ ـ M .

کۆمەڵێك راپۆرت لە چاپەمەنیەکانی تورکیا و چاپەمەنیە نێونەتەوەییەکان بڵاو بووەتەوە کە نیشان دەدات دەوڵەتی تورکیا بەشێوەیەکی بەرفراوان چەکەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بۆ شەڕ لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا بەکارهێناوە. دەوڵەتی تورکیا سیستمە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەوانە فڕۆکەی شەڕکەری ١٦ ـ F ، ٤ ـ F ، ٥ ـ F ، ١٠٤ ـ F و کوپتەریCobra [١] و Black Hawk [٢]، بومبی هێشوویی و تانکی ٦٠ ـ M و نەفەرهەڵگری زرێپۆشی ١١٣ـ Mی بەکارهێناوە لە شەڕەکەی لەگەڵ PKKدا کە لە ساڵی ١٩٨٤ وە دەستی پێکردووە و بووەتە هۆی کوژرانی زیاتر لە ١٥ هەزار کەس.

بەهەرحاڵ بێ لەبەرچاوگرتنی روانگەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بەنیسبەت PKK ، زۆربەی چاودێرە سەربەخۆکان لەسەر ئەوە هاوڕان کە ئیستراتژیی سیاسی ـ سەربازی دەوڵەتی تورکیا بۆ بومبارانکردن و چۆڵکردنی تەواوی گوندەکانی باشووری رۆژهەلات، بووەتە هۆی سەرکوت و پێشێلکردنی بەردەوامی مافی مرۆڤی خەڵکی سڤیل. رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ راپۆرتی داوە کە تا تشرینی یەکەمی ١٩٩٤ ، دەوڵەتی تورکیا زیاتر لە ١٤٠٠ گوندی کاول کردووە و چەند سەدهەزار کەسی لە ئاکامی شەڕەکەی لەگەڵ PKK دەربەدەر و ئاوارە کردووە. لەم شەڕەدا تورکیا

---

[١] کوبرا

[٢] داڵی رەش

کەڵك لە چەك و سازوبەرگی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەرگرتووە، بۆ نمونە لە مایسی ١٩٩٣ تورکیا چۆمی "کارلیۆڤا"ی[٣] بە فڕۆکەی ٤ ـ F و کوپتەری "کۆبرا" بۆمبارد‌مان کردووە کە لە ئەنجامدا ٤٤ شەڕوانی کورد کوژراون . لە کانوونی دووەمی ١٩٩٤ تورکیا هێرشی کردە سەر خاکی عێراق بۆ بۆمبارانکردنی کەمپەکانی PKK بە بومبی هێشوویی و بومبی ٥٠٠ و ٢٠٠٠ پوندی بە فڕۆکەی ١٦ ـ F و ٤ ـ F تەقاندووە.

داگیرکردنی باکووری عێراق لە لایەن دەوڵەتی تورکیا لە ئاداری ١٩٩٥ دوایین بەشی هەوڵەکانی تورکیایە بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد لە رێگای سەربازییەوە. وتەبێژێکی دەوڵەتی توریکا بە شانازییەوە هێرشی تورکیا بۆ خاکی عێراق بە ٣٥٠٠٠ سەربازەوە بە"گەورەترین ئوپەراسیونی سەربازی لە مێژووی کۆماری تورکیا" وەسف کردووە. بەداخەوە تورکیا هێرشی کردووەتە سەر ئەو بەشە لە خاکی عێراق کە وڵاتە یەکگرتووەکان وەك بەشێك لە "ئوپەراسیونی دابینکردنی حەسانەوە"ی نەتەوە یەکگرتووەکان، "ناوچەی دژە فڕین"ی تێدا دەپارێزێت کە هەوڵێکە بۆ پاراستنی کوردەکانی عێراق لەبەرامبەر رژێمی سەدام حوسەین.

بەهۆی ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەورەترین دەوڵەتی دابینکەری چەك و یارمەتی سەربازییە بۆ تورکیا، سەرۆك وەزیرانی تورکیا، "تانسۆ چیللەر" پێش ناردنی سەرباز بۆ عێراق، بەتەلەفۆن ئەم ئوپەراسیونەی بۆ سەرۆك کلینتۆن روون کردووەتەوە. وتەبێژی کوشکی سپی، "مایك مەککوری[٤]" رایگەیاند کە سەرۆك

[٣] Karliova valley
[٤] Mike McCurry

کۆماری ئەمریکا شرۆڤەکەی "چیللەر"ی قبوڵ کردووە دەربارەی ئەوەی کە ئەم هێرشە تەنها بە بنکەکانی PKK لە باکووری عێراق سنووردار بێت و سەرۆك کلینتۆن رایگەیاندووە کە"دەرك بە پێویستی مامەڵەی شێلگیرانەی تورکیا لەگەڵ گروپە راپەڕیوەکان دەکات".

لەکردەوەیەکی دیکەدا(کە لەوانەیە ببێتە هۆی مشتومڕ لە داهاتوودا) سەرۆك کلینتۆن و پنتاگۆن(وەزارەتی بەرگری ئەمریکا - وەرگێڕ) فەرمانیان داوە بە کارمەندانی سەربازیی ولاتە یەکگرتووەکان لە باکووری عێراق کە پێش لە چالاکی فڕۆکەکانی تورکیا لە"ناوچەی دژە فڕین" نەگرن. کاتێك کە راپۆرتێرێك لە وتەبێژی پنتاگۆن، "دنیز بۆکس[٥]" پرسیاری کردووە کە ئایا پنتاگۆن پێی ناخۆش نییە کە هاوپەیمانەکەی ولاتە یەکگرتووەکان (تورکیا) هەر ئەو خەڵکە دەچەوسێنێتەوە کە ئەمریکا ساڵەهای ساڵە هەوڵ دەدات لە بەرامبەر رژێمی عێراق بیانپارێزێت، "بۆکس" لەوەڵامدا وتوویەتی کە تورکیا زۆر بەپارێزەوە کار دەکات بۆ ئەوەی هێرشەکانی لەسەر بنکەکانی PKK چڕ بکاتەوە، و کاتێك کە لە "بۆکس" پرسیار کرا کە بۆچی ولاتە یەکگرتووەکان پێشی لە چالاکی تورکیا لە ناوچەی دژە فڕین نەگرتووە، "بۆکس" تەنها ئەوەی بۆ ماوەتەوە کە بڵێت:

"ئەم کارە باشتر بوو بۆ ئەوەی ئەم کەسانە(واتا هێزی سەربازی ولاتە یەکگرتووەکان کە ئۆپەراسیونی دابینکردنی حەسانەوە ئەنجام دەدەن) نەکەونە ناو مەترسی".

ئەو ئەنجامە دڵساردکەرە کە مرۆڤ دەتوانێت لە وەڵامەکەی "بۆکس" دا پەی پێببات ئەوەیە کە" لەراستیدا "پنتاگۆن" لەوە ترساوە کە ئەگەر هێزەکانی ولاتە

[٥] Dennis Boxx

یەکگرتووەکان ناوچەی دژە فڕینیان بەرووی سوپای تورکیا دابخستبایا، هێزەکانی تورکیا بە هەمان ئەو فڕۆکانە کە خودی ئەمریکا داویە بە تورکیا، هێرشی هەواییان دەکردە سەر سەربازانی وڵاتە یەکگرتووەکان" . کەوابوو وتەبێژی "پنتاگۆن" ئەوەی پشتڕاست کردووەتەوە کە تورکیا لەپێشەوە هەڕەشەی لە ئەمریکا کردووە کە پێش لە هێرشەکەی بۆ عێراق نەگرێت و بهێڵێت بێ گیروگرفت بچێتە پێشەوە.

هەروەها کە ئوپەراسیونە گەورە دژە کوردەکەی ئەم دواییەی تورکیا نیشانی دا هێرشی تورکیا بۆسەر باکووری عێراق بە پشتبەستنی تەواو بە سازوبەرگی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجام دراوە. راپۆرتەکانی ئەورووپا نیشانی داوە کە شەڕی هەوایی تورکیا دژی PKK (و ژمارەیەك لە کوردە سڤیلەکان و کەمپی ئاوارەکان) لە باکووری عێراق بە فڕۆکە جەنگییەکانی دروستکراو لە وڵاتە یەکگرتووەکان وەك فڕۆکەی "مکدونالد لاگلاس" ی ٤ ـ F[٦] ، فڕۆکەی" لوکهید"ی ١٠٤ ـ F[٧] و "لوکهید مارتین" ی ١٦ ـ F[٨] ئەنجام دراوە. هەروەها دەوڵەتی تورکیا بۆ هێرشەکەی بۆ سەر عێراق لە سیستمە هەواییەکانی دیکەی وڵاتە یەکگرتووەکان وەك کوپتەری تۆپداری "تیکسترون ـ بیلی کوبرا[٩]" و تکنولوژی هاوپەیانان و فڕۆکەی ئەفەرهەڵگری "سیکورسکی بلەك هاوك [١٠]" کەڵکی وەرگرتووە.

وڵاتە یەکگرتووەکان لەسەر بنەمای ئەوە پشتیوانی لە هێرشی تورکیا بۆ باکووری عێراق دەکات کە تورکیا دڵنیای کردووەتەوە کە بە دیقەتەوە تەنها بە ئامانجی

---

[٦] McDonnel Douglas F-4
[٧] the Lockheed F-104
[٨] the Lockheed Martin F-16
[٩] the Textron-Bell Cobra helicopter gunship
[١٠] Sikorsky Black Hawk

ڕامالّینی بنکەکەکانی PKK له عێراق ئوپەراسیونی بەرگری ئەنجام دەدات و هیچ زیانێك ناگەیەنێت (یا زیانی کەم دەگەیەنێت) به هاووڵاتیانی سڤیلی کورد. بەڵام ڕاپورتی چاپەمەنیەکان که له ناوچەی ئوپەراسیونەکەوه دێت ئەم بانگەشەیەی تورکیای بەجیدی بردووته ژێر پرسیار.

شەڕی بەردەوامی تورکیا لەگەڵ PKK هەم له باکووری عێراق و هەم له باشووری ڕۆژهەلاّتی تورکیا تادەچێت زیاتر ڕەنگی شەڕەکەی ئەمریکا له ڤییەتنام بەخۆوه دەگرێت. واتا ئەم شەڕە، هەوڵێکی بێ سوودی دووبەرەکینێوەر و له کۆتاییدا سەرنەکەوتووه بۆ زاڵبوون بەسەر بزووتنەوەیەکی ناسیونالیست(PKK) به شێوەگەلی سەربازی.

له ۲ ی نیسان "جان پۆمفرێت"[11] له شرۆڤەیەکی هەواڵ له ڕۆژنامەی *واشنگتۆن پۆست* له ژێر ناوی "ڕاوکردنی کوردەکان له لایەن تورکیاوه: کەوتنەناوەی زەلکاوێك" باسی ئەو زەلکاوەی کردووه که سەربازانی تورکیا له باکووری عێراق تێیکەوتوون له بەر ئەوەی ناتوانن شەڕوانانی PKK له خەڵکی سڤیلی کورد(هەم کوردەکانی تورکیا و هەم کوردەکانی عێراق) لەناوچه لەیەك جیا بکەنەوه. "جان پۆمفرێت" دەنووسێت: "تورکیا بەباوەش کردن به ڕێگاچارەی سەربازی بۆ ئەو مەسەلەیه که خۆی " به مەسەلەی تروریزم"ی دادەنێت، سوپاکەی خۆی دەخاته ناو زەلکاوی خولانەوه لەبازنەی نەحسی" هێرش و پاشەکشه"دا که دوای ئەوه شەڕوانه کوردەکان دژه هێرش دەکەنه سەر تورکیا و جارێکی دیکه هێرشەکان دەستپێدەکاتەوه.

---

[11] John Pomfret

وەها کە کاربەدەستانی رۆژئاوا دەڵێن، ئەم بازنەیە تەنها دەبێتە هۆی بەتاڵبوونی خەزانەی دارایی دەوڵەت(کە ئابوورییەکەی نەخۆشە) و بەڕێوەچوونی ئۆپەراسیونی هاوشێوە دژ بە راپەڕیوان لە ناو تورکیا. کارمەندێکی رۆژئاوایی کە بۆ رێکخراوێکی فریاگوزاری کار دەکات بە "پۆمفرێت" ی وتووە کە:

" تورکیا ناتوانێت ئۆپەراسیونێکی تروریستی لەناو ببات کە لە هەموو لایەکەوە هێرش دەکات. ئەمە وەك ئەوە وایە هەوڵ بدەیت مێشێك بە پیك بکوژیت".

سەربازانی تورکیا وتوویانە کەوتوونەتە ناو زەلکاوێك وەك ئەوەی هێزەکانی ولاتە یەکگرتووەکان لە ڤیەتنام، چونکە ناتوانن دوست لە دوژمن جیا بکەنەوە. سەربازێکی تورك بە رۆژنامەی *واشنگتۆن پۆست*ی وتووە ئێمە کێشەیەکی گەورەمان هەیە لەبەر ئەوەی نازانین کێ گوندنشینە و کێ PKK یە. ئێمە ناتوانین هیچ بکەین".

بەداخەوە بەپێچەوانەی قسەکانی ئەم سەربازە، هێزەکانی تورکیا کاری زۆریان لە باکووری عێراق ئەنجام داوە، لەوانە کوشتن و دەربەدەرکردنی هاوولاتیانی سڤیلی کورد کە بەڵگەکەکانی لە دەستماندایە. ئێستا بە هیچ شێوەیەك ناتوانین ئاگاداری ئەوە ببینەوە کە ئەم کوشتنوبڕینانە تەنها چەند رووداوێك بووە یا بەشێکە لە کۆمەڵێك دەستدرێژی دیکە، لەبەر ئەوەی فەرماندەکانی سوپای تورك پێش لەچوونی رۆژنامەنووسەکان و کارمەندانی رێکخراوە فریاگەزارییەکان بۆ ناوچەی شەڕ دەگرن.

لەکۆتایی مانگی ئادار لە هەفتەی دووەمی داگیرکارییەکەی تورکیا، دانیشتوانی گوندی "بەشیلە" [12] لە(باکووری) عێراق وتوویانە کە گوندەکەیان لە لایەن هێزەکانی تورکیاوە بومباران کراوە و لەگەڵ زەوی تەخت کراوە. فەوزی رەشید کە جووتیارێکی

[12] village cf Beshile

تەمەن ٤٣ ساڵەیە کە هێرشی تورکیای بە چاوی خۆی بینیوە، ئەم هێرشەی بۆ راپورتێری(ئاژانسی دەنگوباس)ی "روەیتێرز" وەها وەسف کردووە:

" سەرەتا فڕۆکەکان گۆندەکەمانی بومبباران کرد، پاش چەند رۆژ سەربازەکان هاتن و خانووەکانیشمانیان سووتاند. دوێنێ دیسان هاتنەوە و بە روکێت و هاوەن هێرشیان کردەوە سەر گوندەکەمان".

بانگەشەی تورکیا دەربارەی ئەوەی تەنها هێرش دەکاتە سەر PKK ، لە لایەن "کونگرەی نیشتمانی عێراق" و رێکخراوی کوردەکانی عێراق(کە کونترۆلی زۆربەی ئەو ناوچانەی لەدەستدایە کە لە لایەن تورکیاوە داگیر کراوە) رەت کراوەتەوە. ئەم رێکخراوانە رایانگەیاندووە کە لە رۆژی یەکەمی داگیرکارییەکە"سەربازانی تورك سەدان ئاوارەیان بە تۆمەتی لایەنگری لە پارتی کرێکارانی کوردستان دەستگیر کردووە".

هەرچەند کە ئیدارەی کلینتۆن بەفەرمی پێداگری لەسەر هەڵویستی خۆی، کردووە کە داگیرکارییەکەی تورکیا لەرووی ماوە و پێوەرەوە دەبێ سنووردار بێت، بەڵام ئەو بەرواره کە "تانسۆ چیللەر" سەرۆك وەزیرانی تورکیا لەکاتی دیدارەکەی لە واشنگتۆن لە ١٩ ی نیسان بۆ پاشەکشەی تورکیا دیاری کرد، تێپەڕ بوو و تورکیاش پاشەکشەی نەکرد. بەشێك لەهێزەکانی تورکیا لە کۆتایی نیسانی ١٩٩٥ پاشەکشەیان کرد بەڵام لانیکەم ١٠ هەزار سەربازی تورك ئێستا لە ناو خاکی عێراقدا ماونەتەوە و کۆمەڵێك بیروبۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی ئەوەی کە ئایا سەرجەم سەربازانی تورکیا لە ناوچە پاشەکشە دەکەن یا نا؟

بەپێچەوانەی سیاسەتی دەوڵەتی ئاڵمانیا کە لە وەڵامی هێرشی تورکیا بۆ سەر عێراق، بە هەموو شێوەیەك ناردنی چەك بۆ تورکیای راوەستاندووە، هەڵویستی ئیدارەی کلینتۆن بەنیسبەت مەسەلەی کورد ئەوەیە کە"تورکیا راست دەکات و راست ناکات". پیشەسازی چەکی وڵاتە یەکگرتووەکان بەشێوەی فەرمی لایەنی تاکتیکەکانی دەوڵەتی تورکیای گرتووە، هەروەها کە لە لێکدانەوەکەی جۆیل جانسۆن[١٣]، لوبیستی سەرەکی "کۆمەڵەی پیشەسازی کەشوهەوا"دا دەردەکەوێت کە دەڵێت" بەرنامەی سەربازی تورکیا لە بەرنامەی هێزە ناوچەیی و جیهانیەکانی دیکە جیاواز نییە کە بەهەمان شێوەی تورکیا کاریان کردووە". جانسۆن دەڵێت:

" دەبێ ئەوە بزانین کە تورکیا خۆی تاکتیکی Roning Tonderی دانەهێناوە. ئێمە کەڵکمان لە فرۆکەی ٥٢ ـ B وەرگرت بۆ سەرکوتکردنی شەڕی گریلایی لە ڤیەتنام. روسەکان چەکی زۆر قورسیان لە ئەفغانەستان بەکارهێنا و ئیسرائیل فرۆکەی ١٦ ـ F ی لە باشووری لوبنان بەکارهێناوە. لەوانە کەسانێك بڵێن کە کاشکای ئەم شەڕانە رووی نەدابایا. لەوانەیە هەندێ کەس کە جێگایان خۆشە بڵێن ئەم چوار دەوڵەتە هەڵەیان کردووە. وتنی ئەم شتە لێرەوە ئاسانە بەڵام ئەگەر لەوێ بیت و سەربازەکانت کاوێژ بکەن، شتی وا ناڵێیت".

ئەگەر ساتێك قەزاوەتی ئەخلاقی لەسەر بومبارانە قورسەکان وەك کەرەستەیەکی شەڕیکی مودێرن بخەینە لاوە، دەبێ بڵێین وتەکەی "جانسۆن" خاڵیکی ستراتژیکی زۆر سەرەکی لەخۆ دەگرێت: "لە دوو لە سێی ئەو نموونانە کە "جانسۆن" دەیهێنێتەوە واتا ئەفغانستان و ڤیەتنام، تاکتیکیRoning Tonder لە لایەن زلهێزەکانەوە

---

[١٣] Joel Johnson

کەڵکی لێوەرگیرا و له هەر دووشیان زلهێزەکان سەرەنجام له رووی سیاسی و سەربازییەوه به دەستی هێزێکی ناسیونالیستی بچووك بەڵام ورەبەرزترەوه هەرەسیان هێنا. تەنانەت هاوپەیمانه وەفادارەکانی رژێمی ئێستای تورکیا ئێستا شتێکی لێدەزانن که مۆچیاری "چیللەر"ی سەرۆك وەزیرانی تورکیا دەکەن که دەست له ئیستراتژیی سەربازی ئێستای خۆی بەنیسبەت بزووتنەوەی جیاییخوازی کورد هەڵبگرێ.

له وەڵامی هاوارو دادی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دژی تاکتیکەکانی دەوڵەتی تورکیا دژ به PKK ، ئیدارەی کلینتۆن بەردەوام پێداگری لەسەر تورکیا کردووه که بومباران و چۆڵکردنی بێ فەرق و جیاوازی سەرجەم گونده کوردنشینەکان رابوەستێنێت. کۆنگرێس به درووشمدان رانەوەستاوه و ١٠٪ له یارمەتی سەربازی وڵاته یەکگرتووەکانی به تورکیا له ساڵی ١٩٩٥ کەم کردووەتەوه بەهۆی پێشێلکردنی مافی خەڵکی کورد. له کانوونی یەکەمی ١٩٩٤ رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ راپورتێکی له ژێر ناوی"بومبه هێشووییەکانی وڵاته یەکگرتووەکان به تورکیا؟" بڵاو کردووەتەوه که تێیدا داوای کردووه بەرنامەی دابینکردنی بومبی هێشوویی ٨٧ - CBU له لایەن وڵاته یەکگرتووەکان به تورکیا هەڵبوەشێنێتەوه، لەبەر ئەوەی لەوانەیه تورکیا ئەم چەکانه دژی خەڵکی سڤیل بەکاربهێنێت. لەئاکامی ئەو گوشاره که ئەم راپۆرته دروستی کرد، فرۆشتنی بومبی هێشوویی جارێ راوەستاوه. سەرەڕای ئەم هەوڵانه بۆ سنووردارکردنی دابینکردنی چەك له لایەن وڵاته یەکگرتووەکان بۆ شەڕی تورکیا دژ به PKK ، وڵاته یەکگرتووەکان بەردەوام یەکێ لەو دەوڵەتانەیه که چەك دەدات به تورکیا و تاکتیکه جەنگییه نامرۆڤییەکانی تورکیا بەردەوامه.

له هەفتەی یەکەمی مانگی مایسی ۱۹۹۵ کاربەدەستانی تورکیا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە سەرجەم سەربازەکانیان لە باکووری عێراق بردووەتە دەرەوە بەڵام "چیللەر"ی سەرۆك وەزیرانی تورکیا رایگەیاندووە کە بە هیچ شێوەیەك لە مافی داگیرکردنی دووبارەی ناوچە چاوپۆشی ناکات ئەگەر تورکیا لەگەڵ چالاکی زۆرتری PKK لەوێ رووبەڕوو بێتەوە. تا ئێستا هەوڵەکانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بۆ پێشگرتن لە کەڵکوەرگرتنی تورکیا لەو چەکانە کە لە دەوڵەتانی دیکە کڕیویەتی، هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە لەسەر سیاسەتی "چیللەر" بەنیسبەت کێشەی کورد. "چیللەر" لە سەرەتای مانگی نیسان بە ئەندامانی دەوڵەتە ئیتیلافیەکەی وتووە:

"ئێمە تەنها یەك شت دەڵێین بەو دەوڵەتانە کە هەڕەشە لە ئێمە دەکەن کە کەڵك لە چەکەکانیان وەرنەگرین( لە کاتێکدا کە دەبێ پشتیوانی لە ئێمە بکەن)، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە لە هەموو بارودۆخێکدا لە مافی بەرگریکردن لە خۆمان کەڵك وەردەگرین. ئێوە دەتوانن چەکمان نەدەنێ ".

لەگەڵ رێزمدا

سینتیا مەککینری[١٤]، ئەندامی کۆنگرێس

[١٤] Cynthia McKinney

## ۲۱ ی ئەیلولی ۱۹۹۵ ـ ئەنجوومەنی پیران
## هەموار کردنی یاسای یارمەتی ئابووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا

### هەموارکردنی ژمارە ۲۷٤۷

له شوێنێکی گونجاو له گەڵاڵە یاسای یارمەتی ئابووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا ئەم برگەیە زیاد بکرێت: لە کۆی یارمەتی مادی وڵاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا لە ژێر ناوی"یارمەتی ئابووری" دەبێ زیاتر لە ٥٪ ی یارمەتیەکە بدرێت بە رێکخراوە ناحکوومیەکان بۆ ئەوەی لە پرۆژەکانی ۱۰ پارێزگای باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا کە ئێستا لە بارودۆخی ناتاساییدان، خەرجی بکەن و دەبێ تەنها بۆ ئەو پرۆژانە کەڵکی لێوەربگرن کە بۆ پێشخستنی ئابووری، پێکەوەهەڵگرتنی کولتووری و ئەتنیکی و چالاکی مافی مرۆڤ تەرخان کراوە و پشتیوانیکردن لە پێشکەوتن و چالاکی رێکخراوە ناحکوومیەکان.

بەرێز "پێل":

جەنابی سەرۆك، من ئەم پێشنیارە دەخەمەڕوو بۆ زیادکردنی ئەو بەندە کە دەبێ بەشێکی بچووك لە کۆی یارمەتی گشتی ئێمە بە تورکیا بدرێت بە رێکخراوە ناحکوومیەکان بۆ ئەنجامدانی چالاکی ئاشتیخوازانە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا کە هەژارترین ناوچەی ئەم وڵاتەیە. بەتایبەت بەگوێرەی ئەم برگە زیادکراوە دەبێ زیاتر لە ٥ میلیون دولار لە یارمەتیەکانی ئێمە بە تورکیا تەرخان بکرێت بۆ ئەو پرۆژانە کە بۆ پێشکەوتنی ئابووری، پێکەوەهەڵکردنی کولتووری و ئەتنیکی و چالاکی مافی

مرۆڤ دارێژراون و پشتیوانی لە پێشکەوتن و چالاکی ڕێکخراوە ناحکوومەیەکان لە باشووری ڕۆژهەڵات دەکەن.

ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا هەر لە کۆنەوە کوردنشین بووە و دانیشتووەکانی بە دەستی سوپای تورکیا گیریان خواردووە. سەرەتای ئەم هەفتەیە ڕاپورتێکم دەربارەی تورکیا خستەڕوو کە ئەندامانی ستافی کەمینەی کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە ئامادەیان کردووە. ئەم ڕاپورتە کە لەسەر بنەمای سەفەری ستافی ئەم کومیتەیە لە مانگی ئاب بۆ تورکیا ئامادە کراوە، بە کۆمەڵێك ئەنجام گەیشتووە، لەوانە ئەوە کە زۆربەی بەرپرسیارەتییەکانی سەرکووتی بەردەوامی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە ئەستۆی دەوڵەتی تورکیایە. ئەم راپۆرتە پشتڕاستی کردووەتەوە کە "چیللەر"، سەرۆك وەزیرانی تورکیا لەگەڵ کۆمەڵێ کێشەی سیاسی جیدی بەرەوڕوویە بەهۆی شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵ کێشەی کورد، ئەم ڕاستیە پێشهاتەکانی ئەم چەند ڕۆژەی دواییەی لێکەوتووەتەوە کە بووەتە هۆی ڕووخانی حکوومەتەکەی "چیللەر".

بەهەرحاڵ لە کۆتاییدا دەوڵەتی تورکیا نەیتوانیوە ـ یا نەیویستووە ـ جیاوازی دابنێت لە نێوان هەڕەشەی ڕاستەقینەی PKK و مافە ڕەواکان و ئامانجەکانی گەلی کورد. لە ئەنجامدا تورکیا دیالۆگی سیاسی لەگەڵ نوێنەرانی ناتوندوتیژی کورد ڕەت دەکاتەوە و هەڵمەتێکی سەربازی بێ فەرق و جیاوازیی زۆر توندوتیژانە ئەنجام دەدات بۆ لەناوبردنی ئەو شتە کە خۆی یەك لایەنانە بە هەڕەشە بۆ یەکپارچەیی وڵاتەکەی دایدەنێت. دەوڵەتی تورکیا بە "تروریست زانینی" سەرجەم کوردەکان، ڕێگای دەربڕینی ئاشتیخوازانەی مافە کوولتووری و سیاسیەکانی کوردەکانی داخستووە.

کەوابوو لەئەنجامدا تورکیا بەشێوازێکی نەخوازراو یارمەتی بە ئامانجی PKK دەدات. بە باوەڕی من گرنگە کە تورکیا تەشویق بکرێت ڕێگای ڕادەربڕینی ئاشتیخوازانەی کوردەکان و گروپەکانی دیکە بکاتەوە.

یەکێ لە وەڵامەکانی ئێمە بە پێشێلکارییە بەردەوامەکانی مافی مرۆڤ لە لایەن تورکیاوە ئەوە بووە کە یارمەتیەکانمان بەم وڵاتە بپچڕێنین. لە ڕاستیدا هەروەها کە لەوانەیە گەلێ لە هاوکارانم بزانن، ئەنجوومەنی نوێنەران دەنگی داوە بە کەمکردنەوەی پارەی پشتیوانی وڵاتە یەکگرتووەکان لە تورکیا بۆ ۲۱ میلیون دولار. من پێشنیار دەکەم ئێمە ڕێگەیەکی جیاواز بگرینەبەر و بڕیاری ئەوە بدەین کە بەشێك لە یارمەتیە ئابووریەکانمان تەرخان بکەین بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا تا لە ڕێگای ڕێکخراوە ناحکومیەکانەوە پێداویستە ڕاستەقینە ئابووریەکانی ئەو ناوچەیە دابین بکەن.

ستافی کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە سەردانی دیاربەکری کرد کە یەکێ لە شارە سەرەکیەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیایە و بەشێوەگەلی جۆراوجۆر سەمبولی ئەو کێشە ئەتنیکیانەیە کە لە تورکیادا هەیە. ئەم شارە بووەتە پەناگای ئەو کوردە گوندنشینانە کە لە لایەن سوپای تورکیاوە ناچار کراون شاروگوندەکانی خۆیان لە دەورووبەری دیاربەکر چۆڵ بکەن و شاروگوندەکانیان لە لایەن سوپای تورکیاوە کاول کراوە. بەگوێرەی هەندێ لە هەڵسەنگاندنەکان، ژمارەی دانیشتوانی دیاربەکر لە ماوەی ٥ ساڵی ڕابردوودا لە ۳۰۰ هەزار کەس گەیشتووە بە یەك میلیون و پانسەد هەزار کەس.

هەرچەند کە کاربەدەستانی تورکیا، دانیشتوانی ناوچە و هەندێ لە چاودێرە سەربەخۆکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گرژی و ئاڵۆزییەکان لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا کەمی کردووە، بەڵام وادیارە نارامیەکەی ئێستا لەرزۆکە بەهۆی چالاکی تاقەتیرۆکێن و هەندێ جار سەرکوتکارانەی هێزەکانی ئاسایشی تورکیا کە مافی مرۆڤیش بە توندی پێشێل دەکەن. بەبۆچوونی من، ئەم پێشنیارەی من بۆ هەموارکردنی یاسای یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا، کاریگەری ئەرێنی دەبێت لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی باشتربوونی بارودۆخی ئابووری لە ناوچەی زۆر ناسەقامگیری باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا.

ئەم هەموارکردنە هەروەها پەیامێکی گرنگ دەنێرێت بۆ تورکیا ـ کە لەگەڵ کێشەی پێکهێنانی دەوڵەتی نوێ بەرەورِوویە ـ کە پێویستە کێشە سەرەکیەکانی دیکە چارەسەر بکات وەك بەفەرمی نەناسینی کولتوور و ئەتنیکی کوردەکان و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە باشووری رۆژهەڵات. کاربەدەستانی تورکیا باسی پێویستی زیادکردنی سەقامگیری باشووری رۆژهەڵات دەکەن، بەڵام سەقامگیری راستەقینە تەنها بە پێکەوەهەڵکردنی رۆژبەرۆژ زیاتر دەستەبەر دەبێت و پێشنیاری هەموارکردنی ئەم یاسەیە هەوڵێکە لە پێناو ئەم ئامانجەدا.

## ١٧ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## دادپەروەری بۆ ئالێزا مارکوس

بەڕێز جان ئیدوارد پۆرتێر:

جەنابی سەرۆك، خۆشحاڵم و ئاسودەم کە لە ٩ ی تشرینی دووەم ، دادگای ئاسایشی دەوڵەتی تورکیا بەتێکڕای دەنگ بڕیاری تەبرەئەکردنی(بەبێ گوناهزانین) "ئالیزا مارکوس[1]"ی هاووڵاتی ئەمریکای دەرکرد. لە ئاکامی داکۆکی تەواو لە "ئالیزا مارکوس"، دادپەروەری دەستەبەر بوو.

خاتوون "مارکوس" قەد لە شوێنی ئەنجامدانی سووچدا دەستگیر نەکراوە و هیچ سووچێکی نەکردووە. تاوانی خاتوون "مارکوس" تەنها ئەوەیە کە ڕاستیەکانی هەڵمەتی سەربازی بێ وچانی سوپای تورکیا بۆ چۆڵکردن و کاول کردنی گوندە کوردنشینەکانی ڕاپورت داوە.

تاوانی خاتوون "مارکوس" ئەوەیە کە تەنها کاری خۆی ئەنجام داوە و باشیش ئەنجامی داوە. تەبرەئە کردنی خاتوون "مارکوس" هێمایەکی دڵخۆشکەرە کە تورکیا لەوانەیە بیەوێت چاکسازی لە ڕەفتارەکانیدا بکات.

بەهەرحاڵ ئەمە تەنها هەنگاوێکی بچووکە بۆ بڕینی ڕێگایەکی دوورودرێژ. سنووردار کردنی ئازادی ڕادەبڕین، نووسین و چالاکیە ئاشتیخوازانەکانی دیکە، پێشێلکردنی ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی تورکیایە بەنیسبەت مافی مرۆڤ . ڕوونە کە گۆڕانکاری

[1] Aliza Marcus

تەنها ئەو کاتە دەستەبەر نابێت کە "ئالیزا مارکوس"ەکان تەبرەئە بکرێن، بەڵکو ئەوکاتە دەستەبەر دەبێت کە هەر لە سەرەتاوە دەستگیر نەکرێن.

## نامه‌ی ئه‌ندامانی كۆنگرێس بۆ سه‌رۆك كۆماری ولاته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا بۆ پشتیوانی له"پارلمانی كورد له ده‌ره‌وه‌ی ولات"
## ٦ی تشرینی یه‌كه‌می ١٩٩٥

كۆنگرێسی ولاته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا

ئه‌نجوومه‌نی نوێنه‌ران

واشنگتۆن دی سی ٢٠٥١٥

٦ی ئوكتوبری ١٩٩٥

جه‌نابی ویلیام ج كلینتۆن[1] ، سه‌رۆك كۆماری ولاته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا

كۆشكی سپی

كێشه‌ی كورد یه‌كێ له كێشه هه‌میشه‌ییه‌كانه كه دۆزینه‌وه‌ی رێگاچاره‌یه‌ك بۆ ئه‌م كێشه‌یه سیاسه‌تمه‌دارانی تووشی سه‌رله‌شێواوی كردووه. ژماره‌یه‌ك له ئێمه له ئه‌ندامانی كۆنگرێس ئه‌م دواییانه له‌گه‌ڵ دوو كه‌س له پارلمانتاره كورده‌كان دیدارمان كرد كه له چوارچێوه‌ی لیژنه‌یه‌كدا سه‌ردانی كۆنگرێسیان كرد و كۆمه‌ڵێك پێشنیاری گرنگیان ده‌رباره‌ی بارودۆخی ئێستا خسته‌ڕوو. . ئێمه له ئۆفیسی خۆمان پێشوازیمان لێكردن و بینیمان كه مرۆڤگه‌لێكی پاك و راستگۆن. ئه‌م دوو كه‌سه بریتیبوون له به‌ڕێز "ره‌مزی كارتال[2]" و به‌ڕێز "جۆرج ئاریۆ[3]".

[1] William J. Clinton
[2] Mr. Remzi Kartal
[3] Mr. George Aryo

بەڕێز "کارتال" لە تشرینی یەکەمی ١٩٩١ وەك نوێنەری شاری کوردنشینی "وان" لە پارلمانی تورکیا هەڵبژێردراوە بەڵام بە هۆی ئەوەی داوای چارەسەرکردنی سیاسی کێشەی کوردی کردبوو، لە حوزەیرانی ١٩٩٤ لە پارلمان دەرکرا و تاوانی خیانەتی خرایە پاڵ و ناچار کرا تورکیا بەجێ بهێڵێت.

بەڕێز "ئاریۆ" کەسایەتییەکی ئاسووری- کریستیانییە کە لەدایکبووی کوردستانە و لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا تووشی کێشە بووە بە هۆی ئەوەی کاربەدەستانی تورکیای بردبووە ژێر پرسیار بە هۆی تەحەمول نەکردنی مافە ئایینی و کولتوورییەکانی ئەو ئاسوورییانە کە لە تورکیا دەژین. بەڕێز "ئاریۆ" ئەو راستییەی بۆ ئێمە ئاشکرا کرد کە گەلێ لە ئاسوورییە کریستییانەکان لە ئەنجامی شەڕدا ماڵوحاڵی خۆیان بەجێ هێشتووە و کلیساکانیان ئێستا کراوە بە شوێنی خەوتنی سەربازە تورکەکان.

هەردووی ئەم بەڕێزانە ئێستا لە ئەورۆپا دەژین و وەك رێبەرگەلێك کە لە کۆمەڵگای خۆیاندا رێزیان لێدەگیردرێت ئێستا بەشێکن لە" پارلمانی کورد لە دەرەوەی وڵات" کە ئەم دواییانە کراوەتەوە.

پارلمانی هەڵبژێردراوی کورد لە دەرەوەی وڵات نوێنەری یەك میلیون کوردە کە ئێستا لە دەرەوەی وڵات لە ئەوروپا دەژین. بەڕێز "کارتال" و بەڕێز "ئاریۆ" ئێمەیان دڵنیا کردەوە کە ئەم پارلمانە بە شوێن رێگاچارەیەکی سیاسیدایە بۆ کێشەی کورد و دەتوانی دەورێکی گرنگ بگێڕێت بۆ راوەستاندنی شەڕ لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا.

جەنابی سەرۆك کۆمار، ئێمە لە سەر بنەمای هەندێ هۆکار لە سەر ئەو باوەڕەین کە ئەم دوو بەڕێزە بە راستۆگۆییەوە بە شوێن ریگاچارەیەکی ئاشتیخوازانەدان بۆ کێشەی

كورد. ئێمە دەبێ لە رێگای بەفەرمی ناسینی پارلمانی كورد لە دەرەوەی وڵات دەرفەتێكیان پێبدەین بۆ ئەوەی ناكۆكی كورد و تورك لە رێگای ئاشتیخوازانە چارەسەر بكەن. دیالۆگ لە نێوان نوێنەرانی ئەم دوو گەلە لەیەك نامۆ بووە واتا "پارلمانی كورد لە دەرەوەی وڵات" و دەوڵەتی توركیا ئەگەر لە لایەن وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاوە تەشویق بكرێت و لە لایەن كۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە پشتیوانی لێبكرێت پێدەچێت بتوانێت ببێت بە تەنها هیوا بۆ سەقامگیربوونی ئاشتی لە ناوچە.

ئێمە سپاستان دەكەین ئەگەر بە زووترین كات وەلامی ئێمە بدەنەوە و نیازی خۆتان دەرببڕن بۆ كار كردن لەگەڵ "پارلمانی كورد لە دەرەوەی وڵات" لە پێناو ئاشتی لە توركیا.

لە گەڵ رێزماندا

ئەندامانی كۆنگرێس:

جان ئیدوارد ئۆرتێر[4]، رابێرت ئی ئاندروز[5]، ئانا طي ئیشۆ[6]، جەیمز ئەي ترافیكینت[7]، ئیستیبان ئیدوارد تۆریز[8]، جۆرج ئی براون[9]، ئیدۆلفوس تاونز[10]، فرانك ئالۆن[11]، كارولین ب مالۆنی[12]، ئاندرو جاكوبز[13]، ئیلیزابیت فۆرس[14]

[4] John Edward Porter
[5] Robert E. Andrews
[6] Anna G. Eshoo
[7] James A. Traficant, Jr
[8] Esteban Edward Torres
[9] George E. Brown, Jr
[10] . Edolphus Towns
[11] Frank Pallone, Jr

## ۲۷ ی تشرینی دووەمی ۱۹۹۵ - ئەنجوومەنی پیران
## پێشێلکردنی مافی مرۆڤ له ئێران

بەڕێز داماتۆ:
جەنابی سەرۆك، من ئەمڕۆ دەمەوێت داخ و پەژارەی خۆم دەربڕم بەنیسبەت پێشێلکاری دژێوی مافی مرۆڤ له ئێران و وەبیری هاوکارانم بهێنمەوە کە من بەهۆی پێشێلکردنی بەردەوامی مافە بنەڕەتیەکانی هاوولاتیانی ئێران له لایەن دەوڵەتی ئێران، گەڵاڵە یاسایەکم پێشنیار کردووە بۆ زیادکردنی گوشاری ئابووری لەسەر رژێمی نایاسایی ئێران. رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لەسەراسەری جیهان پێشێلکردنی مافی مرۆڤی ژنان و کەمینە ئایینی و ئەتنیکیەکانیان له لایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە بەدرێژایی ساڵان شەرمەزار کردووە.
دەوڵەتی ئێران بە تاوانی زیناح، حوکمی لەسێدارەدان بۆ ژنان دەردەکات و پاشان حوکمی لەسێدارەدانەکەیان بەم شێوەیە جێبەجێ دەکات کە دەیانخاتە ناو تەلیس و تەلیسەکە دەبەستێ و لەسەر بینای ۱۰ قات فڕێیان دەداتە خوارەوە. ئێران وڵاتێکە کە هێشتا حوکمی بەردباران تێیدا جێبەجێ دەکرێت و تەنانەت یاسایەکی توندی هەیە بۆ گەورەیی و بچووکی ئەو بەردانە کە دەبێ له هاوولاتیانی تاوانبار بدرێت و ناهێڵێت بە بەردی گەورە له تاوانبار بدرێت بۆ ئەوەی تاوانبار زوو نەمرێت و ناهێڵێت

---
[12] Carolyn B. Maloney
[13] Andrew Jacobs, Jr.
[14] Elizabeth Furse

به بەردی بچووكیش لێیان بدرێت بۆ ئەوەی مەرگەكەی درێژە بكێشێت. گەورەیی و بچووكی بەردەكان لەپێشەوە دیاری دەكرێت بۆ ئەوەی تاوانبار زەجركوژ بكرێت و بەهۆی برینەكانەوە بمرێت. ئێران وڵاتیكە كە دەوڵەتەكەی بەردەوامە لە كەڵكوەرگرتن لە هێزی ئاسایش(كە بەتەواوی سەربازییە) بۆ ئازارو ئەزیەتكردن و تۆقاندنی خەڵك لە شەقامەكان، و رۆژنامەكان دادەخات بەهۆی بلاّو كردنەوەی كاریكاتوری رێبەری بالاّی(كۆماری ئیسلامی).

لە وڵاتی ئێران ئەگەر كەسێك بیەوێت خۆی بۆ هەڵبژاردنەكان كاندید بكات، دەبێ سەرەتا پشتیوانی خۆی لە دەوڵەت بسەلمێنێت.

جەنابی سەرۆك، ئێران دەوڵەتیكە كە هەموو ساڵێك لە لایەن نوێنەری تایبەتی كومیتەی مافی مرۆڤی نەتەوە یەكگرتووەكانەوە شەرمەزار دەكرێت بەهۆی كەڵكوەرگرتنی سیستماتیك لە ئەشكەنجە، دەستگیركردنی سەرەڕۆیانە و كوشتن. ئەم كردەوانە لە وتارێكدا كە ٥ ساڵ پێش لە هەواڵنامەیەكدا لە پاریس بلاّو بووەوە ("مادنیوز"، ژمارە ٤ ، ٣ ی كانوونی یەكەمی ١٩٩٠ ، پێشێلكارییەكانی مافی مرۆڤ لە ئێران) وەسف كراوە. هەروەها "بنیادی دیموكراسی بۆ ئێران" كە گروپێكی لایەنگری مافی مرۆڤە، ئەم دواییانە راپورتێكی بلاّو كردووەتەوە كە نێردراوە بۆ ئوفیسی كاركەی من كە داوا دەكەم بخرێتە بەر دەستی هاوكارانم.

جەنابی سەرۆك، دەمەوێت سەرنجی ئێوە بەرەولای چەند نمونەیەك لە پێشێلكارییەكانی مافی مرۆڤ لە لایەن رژێمی مەلاكان لە ئێران دەربارەی سەركوتی كەمینە ئایینی و ئەتنیكیەكان رابكێشم.

هەروەها کە لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٩٥ ی ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕاپورتی شوباتی ١٩٩٤ ی نوێنەری تایبەتی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ مافی مرۆڤ لە ئێراندا هاتووە، هێزەکانی ئاسایشی ئێران چالاکانی کورد، بەلووچ، تورکمان و کەمینە ئەتنییەکانی دیکە سەرەڕۆیانە دەستگیر دەکەن و لە بەندیخانەکاندا سووکایەتیان پێدەکەن و سزای زاڵمانەیان بەسەردا دەسەپێنن، لەوانە ئەشکەنجە و کوشتن.

بەهەمانشێوە هەروەها کە ڕاپورتەکەی شوباتی ١٩٩٥ ی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەربارەی مافی مرۆڤ ئاماژەی پێکردووە، ڕژێمی مەلاکان بەفەرق و جیاوازی لەگەڵ هاووڵاتیانی ئایینەکانی دیکە(کە سەر بە ئایینی زاڵی شیعە نین) هەڵسوکەوت دەکات. بەهاییەکان، جولەکەکان و موسڵمانە سوننەکان تەنها بە تاوانی ئایینەکەیان لە ساڵی ڕابردوودا دەستگیر کراون و هەندێکیان لەسێدارە دراون. لەڕاستیدا، کۆماری ئیسلامی سیاسەتێکی بەئەنقەست پەیڕەو دەکات بۆ سەرکوتکردنی مافی کەمینەی سوننە، بەتایبەت ئەندامانی عەشیرە بەلوچەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران.

لە ١ ی شوباتی ١٩٩٤ کۆمەڵێك ئالۆزی و بشێوی لە زاهیدان، مەشهەد و "خاف" ڕوویدا پاش ئەوە کە کرێکارانی شارەوانی، مزگەوتێکی سوننەکانیان لە ناوچەی زاهیدان خراپ کرد. لە ١٠ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٣ هێزەکانی سوپای پاسدارانی ئێران هێرشیان کردە سەر دانیشتووانی بەلووچی گوندی "ڕوبات" و بۆ ڕزگارکردنی ئەندامێکی خۆیان بە ناوی "حاجی پیراد"، ئاگریان لە ٥٠ خانوو بەردا. نوێنەری تایبەتی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ مافی مرۆڤ لە ٢ ی شوباتی ١٩٩٤ ڕاپورتی دا کە ٢٠ بەلووچ لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٢ و شوباتی ١٩٩٣ لە بەندیخانەی زاهیدان

لەسێداره دراون، ئەمه لەکاتێکدایه که ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی راپورتی داوه که ٤٢ بەلووچ، لەوانه چەند منداڵ له نێوان تشرینی دووەمی ١٩٩١ و مایسی ١٩٩٢ لەسێداره دراون.

جەنابی سەرۆك، به باوەڕی من ئەم رەفتارەی کۆماری ئیسلامی نیشان دەدات که ئێمه لەگەڵ رژێمێکی نایاسایی روبەڕووین که ئاگاداری خەڵکەکەی خۆی نییه، کەوابوو دەوڵەتیك که وەها رەفتار لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی دەکات، چۆن رەفتار لەگەڵ کەسانی دیکه دەکات؟

ئێران ولاتێکی گۆشەگیره و لەسەراسەری جیهان وەك دەوڵەتێکی رەزیل سەیر دەکرێت و جیهانی شارستانی له کردەوەکانی بێزاره. هەتا کاتێك که ئەم رژێمه شەڕنگێزه تروریسته به دەسەلاتی رەشی خۆی بەردەام بێت له سزادانی خەڵکی ئێران، ئەم بارودۆخه بەردەوام دەبێت. دیکتاتورەکانی ئێران دەبێ بزانن که دەستدرێژییەکانیان و چەوساندنەوەی خەڵکی باشی ئێران بەردەوام نابێت و رۆژێك دێت که دەبێ وەلامی کردەوەکانیان بدەنەوە. لەکاتێکدا که دیکتاتورەکان درێژه به دەسەلاتداری له ئێران دەدەن، گەمارۆکان ڕێگایەکی روونه بۆ بەردەوامبوونی گوشارەکان لەسەر ئێران بۆ ئەوەی نەتوانێت دەستدرێژی بکاته سەر جیهانی دەرەوە و خەڵکەکەی خۆی.

ئێمه دەست لەم مەسەلانه هەڵناگرین. جێگای داخه که رژێمی ئێران وەك ولاتیکی شارستانی رەفتار ناکات و زمانی ئەوەنده درێژه. ئەگەر ئێران دەست لەم کردەوه دڕندانانه هەڵنەگرێت، ئێمه ناچارین درێژه به گەمارۆدانان لەسەر ئەم دەوڵەته بدەین.

***

راپۆرتی "بنیادی دیموکراسی بۆ ئێران"، ٢٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٥

بابەت: لەسیدارەدان و دەستگیرکردنی کوردەکان لە ئێران

"بنیادی دیموکراسی بۆ ئێران" نیگەرانە بەنیسبەت راپۆرتەکانی ئەم دواییانەی کوردستانی ئێران دەربارەی لەسێدارەدانی ١٠ کورد و دەستگیرکردنی لانیکەم ٢٦ کوردی دیکە. بە وتەی "حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران"(DPIK) کە حیزبێکی نەیاری(کۆماری ئیسلامییە) ١٠ بەندکراوی سیاسی کورد بەتۆمەتی لایەنگری لە DPIK(PDKI دروستە= وەرگێڕ) لە لایەن رژێمی ئێرانەوە لە کۆتایی مانگی ئەیلوول لەسێدارە دراون یا لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەست داوە. ٦کەس لەم بەندکراوانە دانیشتووی گوندە کوردنشینەکانی ناوچەی "ماکوو"ی رۆژئاوای ئێران بوونە کە پاش یەك ساڵ راگرتن لە بەندیخانەی ئوورومیە، لە لایەن"گرووپی تەقەوە" وە دەستدرێژی گوللەیان کراوەتە سەر. ٣ کەسی دیکە لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەست داوە. کەسی دەیەم کە کوردێکی گوندنشین بە ناوی "رەشید ئەبوبەکری" بووە، لە ٢١ ی ئەیلول لە بەندیخانەی ئوورومیە لەسێدارە دراوە. هەمووی ئەم کەسانە بە تاوانی لایەنگری لە گرووپێکی سیاسی ئوپوزسیونی نایاسایی دەستگیر کراون و لەسێدارە دراون.

لەسەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ، چاپەمەنیەکانی ئێران راپۆرتیان دا کە لە هەمان ماوەدا ٣٤٥ کەس لە ناوچەی ئوورومیە دەستگیر کراون و بە تاوانی لایەنگری لە DPIK لەسێدارە دراون. لە ٧ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٥ ، DPIK ناوی ٢٦ هاوولاتی کوردی ئاشکرا کردووە کە ٢ مانگ پێش لەوە بە تاوانی هاوکاری لەگەڵ

گروپێکی سیاسی نایاسایی ئوپوزوسیون له ناوچەی ئورمیه و سەڵماس له باکووری ڕۆئاوای ئێران دەستگیر کراون. ناوی ئەو کەسانه که دەستگیر کراون بریتیه له:

١ـ ئەصغەر دەربازی، کوڕی عومەر، لەدایکبوویی گوندی "بەرازی"

٢ـ عەزیز هایاوانی، کوڕی شینۆ، لەدایکبوویی گوندی "بەرازی"

٣ـ پەرویز عەزیزی، کوڕی حوسێن، لەدایکبوویی گوندی "بەرازی"

٤ـ دینۆ ئیبراهیمی، کوڕی ساڵح، لەدایکبوویی گوندی "بەرازی"

٥ـ صلاح الدین فەغاپوور، کوڕی ساڵح، لەدایکبوویی گوندی "بەرازی"

٦ـ قەمەر میرزایی، کوری تەیمور، لەدایکبووی گوندی "دۆستان"

٧ـ صالح ئەمینی، کوڕی خاڵید، لەدایکبووی گوندی "گۆزەك"

٨ـ یونس ئەمینی، کوڕی ساڵح، لەدایکبووی گوندی "گۆزەك"

٩ـ ناجی محمدی، کوڕی محمد، لەدایکبووی گوندی "گۆزەك"

١٠ـ عومەر محمدی، کوڕی تەیمور، لەدایکبووی گوندی "گۆزەك"

١١ـ دوکتور شیروان، کوڕی مستەفا، لەدایك بووی گوندی "هەراکلان"

١٢ـ صادق علیزادە، کوڕی ئەبووبەکر، لەدایکبووی گوندی"هەراکلان"

١٣ـ ئەفشار لال ـ کوڕی عەبدالرحمان، لەدایکبووی گوندی "کەلەڕەشی خوارەوە"

١٤ـ شەفیق حەکاری، کوڕی ڕەزا، لەدایکبووی گوندی "کەلەڕەشی خوارەوە"

١٥ـ بەکره حەکاری، کوڕی سولتان، لەدایکبووی گوندی "کەلەڕەشی خوارەوە"

١٦ـ تەقسیم میرزایی، کوڕی میرزا، لەدایکبووی گوندی "تاریکان"

١٧ـ نورالدین تاهیری، کوڕی جەهانگیر، لەدایکبووی گوندی "تاریکان"

١٨ـ فەرهاد زارع، کوڕی سەیدە، لەدایکبووی گوندی "شەڕوانی"

١٩ـ تاج الدین فەغازادە، کوری صادق، لەدایکبووی گوندی "شەڕوانی"

٢٠ـ ناصر زارچ، کوڕی مەلا سولتان، لەدایکبووی گوندی "شەڕوانی"

٢١ـ ماجید حوسینی، کوڕی مەلا سەید، لەدایکبووی گوندی "شەڕوانی"

٢٢ـ نوسرەت حەسەنزادە، کوڕی خالێد، لەدایکبووی گوندی "شەڕوانی"

٢٣ـ فەیسەل زارع، کوڕی تەمۆ، لەدایکبووی گوندی "شەڕوانی"

٢٤ـ صادق ماجیدی، کوڕی مامۆ، لەدایك بووی گوندی "حەماملەر"

٢٥ـ زاهیر ئەحمەدی، لەدایك بووی گوندی "گۆران"

٢٦ـ ئەحمەد سولتانی، کوری سەمە، لەدایکبووی گوندی "ئیسلام ئاباد"

***

"بنیادی دیموکراسی بۆ ئێران" لەسێدارەدانی خەڵك بەهۆی بیروڕای سیاسی شەرمەزار دەکات و داوا لە راپورتێری تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ مافی مرۆڤ دەکات کە لەم راپورتانە بکۆڵێتەوە. ئەم بنیادە هەروەها گرتنی بەکۆمەڵی هاووڵاتیانی کورد لە لایەن کاربەدەستانی ئێران وەك هەوڵێکی ئاشکرا بۆ بێبەشکردنی هاووڵاتیان لە مافی رەوای دەربڕینی ئاشتیخوازانەی بیروڕا سیاسیەکانیان شەرمەزار دەکات.

## ١٢ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران دژایەتی کردنی فرۆشتنی موشەکی پێشکەوتوو بە تورکیا

بەڕێز کریستۆفێر سمیت، نوێنەری ئەیالەتی نیوجێرسی:

جەنابی سەرۆك، لە ١ی کانوونی یەکەم "ئاژانسی یارمەتی ئاسایشی بەرگری"(DOD)، کومیتەی کاروباری نێونەتەوەیی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئاگادار کردووەتەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکان ١٢٠ سیستمی تاکتیکی موشەکی(ATACMS) دەفرۆشێت بە تورکیا. لەراستیدا هەر وەك بومبێکی هێشوویی گەورەی رێنوێنیکراو، هەر موشەکێکیATACMS تا مەودای ١٠٠ مایل کار دەکات و زیاتر لە ٩٥٠ بومبی بچووکی لەگەڵدایە. گەلێ لەو تەقەمەنیانە کە پاش کەوتنەخوارەوە ناتەقن، لەسەر زەویدا دەمێننەوە و دەبن بە هەڕەشە بۆ گیانی خەڵکی سڤیل.

من ئەمرۆ دەمەوێت نیگەرانی توندی خۆم دەرببڕم دەربارەی فرۆشتنی ئەم بومبانە بە تورکیا و دەڵێم ئەم کارە مەعقول نییە و کاتەکەی گونجاو نییە. من هەروەها دەمەوێت ئاماژە بە ئاکام و ئەنجامەکانی فرۆشتنی ئەم موشەکانە بە تورکیا بکەم و جەخت لەسەر مەترسی پشتیوانی سەربازی بێ شەرت و مەرجی وڵاتە یەکگرتووەکان لە رژێمی ناسەقامگیری تورکیا بکەمەوە کە مافی هاووڵاتیانی خۆی بەردەوام بەتوندترین شێوە پێشێل دەکات.

جەنابی سەرۆك، نیگەرانی سەرەکی من لە فرۆشتنی ئەم مەشەکانە بە تورکیا ئەوەیە کە رژێمی تورکیا ئەم موشەکانە دژ بە هاوولاتیانی خۆی بەکار دەهێنێت لە بەر ئەوەی هەڵمەتێکی بێ بەزەییانە دژ بە گریلا کوردەکان بەرێوە دەبات. سوپای تورکیا لە وەلامی هێرشەکانی گریلا کوردەکان، هەزاران کوردی کوشتووە ، ژمارەیەکی بێ پایانی دیکەی ئەشکەنجە کردووە و سەقەت کردووە، ٣ هەزار گوندی کوردنشینی کاول کردووە و ٣ میلیون کەسی لە ماڵوحاڵی خۆیان ئاوارە کردووە.

لە ٢٠ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٥، رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ لە راپۆرتێکی ١٧١ لاپەڕەییدا، بەتێروتەسەلی باسی کەڵکوەرگرتنی بەرفراوانی تورکیا لە سازوبەرگە سەربازییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی لە هەڵمەتە سەربازییەکەی دژ بە کوردەکان کردووە کە بووەتە هۆی کوژران و لەناوچوونی خەڵکی سڤیل. ئەو کردەوە دلڕەقانانە کە لەم راپورتەدا باسکراوە، مرۆڤ دەتۆقێنێت. ئەم راپورتە ئاماژەی بە وتەکانی ٢٤ شاهیدی عەینی کردووە کە راستی راپۆرتەکەی حوزەیرانی ١٩٩٥ ی وەزارەتی دەرەوە دەسەلمێنێت کە ئەویش لە ئەنجامدا دەڵێت تورکیا لە سازوبەرگە سەربازییەکانی ولاتە یەکگرتووەکان کەڵکی وەرگرتووە بۆ پێشێلکردنی مافی مرۆڤی خەڵکی سڤیل.

## ٢٠ ی كانوونی یەكەمی ١٩٩٥ ـ ئەنجوومەنی پیران
## فرۆشتنی موشەك بە توركیا

بەڕێز لاری پریزلێر[١]:

جەنابی سەرۆك، ڕۆژی دوشەممە، ١٨ ی كانوونی یەكەم، دوستی هێژام لە ئەیالەتی نیویورك، سناتۆر "داماتو" و من نامەیەكمان نارد بۆ وەزیری دەرەوە، "وارنێر كریستوفێر[٢]" و داوامان لێكرد ئیدارەی كلینتۆن بە بڕیاركەیدا بچێتەوە بۆ فرۆشتنی ١٢٠ سیستمی موشەكی تاكتیكی سەربازی(ATACMS) بە دەوڵەتی توركیا. بەداخەوە دوێشەو ئاگادار بوومەوە كە ئیدارەی كلینتۆن دەیەوێت ئەم سیستمە بفرۆشێت بە توركیا.

دەتوانم بڵێم كە ئیدارەی كلینتۆن لانیكەم ئەم كارەی بێ ڕاوێژ كردن ئەنجام داوە. من بەتوندی داوا لە ئیدارەی كلینتۆن دەكەم بە بڕیارەكەیدا بچێتەوە یا لانیكەم كۆمەڵێك شەرت و مەرجی روون و لێبڕاوانە بۆ كەڵكوەرگرتنی توركیا لەم چەكانە دابنێت. فرۆشتنی چەك بە توركیا جێگای متمانە نییە و بە گشتی جێگای نیگەرانیە لەبەر ئەوەی دەوڵەتی توركیا لە رابردوودا بەردەوام چەك و سازوبەرگی سەربازی وڵاتە یەكگرتووەكان و ناتۆی بەكارهێناوە بۆ گەیشتن بە سیاسەت و ئامانجە سەربازییەكانی كە ئەم ئامانجانە لە بەرژەوەندی ئێمەدا نییە.

---

[١] Mr. PRESSLER
[٢] Warren Christopher

هەروەها کە هەموومان ئاگادارین، دەوڵەتی تورکیا لە ساڵی ١٩٧٤ لە سازوبەرگە سەربازییەکانی ناتۆ کەڵکی وەرگرت بۆ داگیرکردنی دوورگەی قوبرس. ئێستا پاش دو دەیە، قوبرس هێشتا بووە بە دوو بەش کە بەشێکی، ٣٥ هەزار سەربازی داگیرکەری تورکیای تێدایە. چارەسەربوونی کێشەی قوبرس بۆ من زۆر گرنگە و مەسەلەیەکە کە بەرژەوەندی بەهێز و بێ لایەنانەی ئێمەی تێدایە. ئیدارەی کلینتۆن رایگەیاندووە کە دەیەوێت هەوڵی جیدی بدات بۆ یەکگرتنەوەی قوبرس. نازانم چون فرۆشتنی چەك لە لایەن ئێمە بە تورکیا، خزمەت بەم ئامانجە(یەکگرتنەوەی قوبرس) دەکات؟ بە بۆچوونی من بەداخەوە هیچ خزمەتێك بەم ئامانجە ناکات.

من هەروەها لەوە نیگەرانم کە فرۆشتنی چەك بە تورکیا ببێتە هۆی درێژبوونەوەی کێشەی نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجان. بێ گومان(هەروەها کە پێشتر سەلمێندراوە) تورکیا سازوبەرگە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و ناتۆی داوە بە ئازەربایجان و ئازەربایجانیش ئەم سازوبەرگەی دژ بە دانیشتوانی سڤیلی ناوچەی گەمارۆدراوی "ئەگرونو ـ قەرەباخ" بەکارهێناوە. بە بۆچوونی من فرۆشتنی چەك بە تورکیا دژی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانە کە دەڵێت نابێت کڕیاری ئەم چەکانە، ئەم چەکانە بدات بە لایەنێکی سێیەم. بەڵام تورکیا چ دڵنیاییەکی بە ئێمە داوە کە پابەند بێت بەم سیاسەتەی وڵاتە یەکگرتووەکان ؟

سەرەنجام من لەوە نیگەرانم کە فرۆشتنی ئەم موشەکانە بە تورکیا ببێتە هۆی درێژبوونەوەی توندوتیژی نێوان سوپای تورکیا و کوردەکان. ئەوە دە ساڵە کە دەوڵەتی تورکیا شەڕیکی دڕندانە دژی خەڵکی کورد بەڕێوە دەبات. ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ (HRW) هەڵیسەنگاندووە کە ئەم شەڕە بووەتە هۆی کاولبوونی ٢ هەزار

گوند و کوژرانی ١٩ هەزار کورد، لەوانە هەزاران خەڵکی مەدەنی، زیاتر لە دو میلیون کوردی دیکەش لە ماڵو حاڵی خۆیان ئاوارە بوونە.HRW هەروەها راپۆرتی داوە کە لە میانەی ٢٩ پێکدادان لەساڵی ١٩٩٢ تا ١٩٩٥، سوپای تورکیا فڕۆکە بۆمبهاوێژ و کۆپتەرەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بەکارهێناوە بۆ هێرشکردنە سەر گوندەکان و ئامانجەکانی دیکە. لەمە زیاتر، تورکیا لە هەڵمەتەکەی دژ بە هەزاران گوندی کوردنشین، کەڵکی لە چەکە بچووکەکان و نەفەرهەڵگرە زرێپۆشەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و ناتۆ وەرگرتووە.

روونە کە ئەم نموونانە کە زیاتر لە دوو دەیەیە بەردەوامە، دژی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی ئێمە و هەروەها دژی بەها ئەخلاقیەکانە.

ئێستا کە ئێمە لەگەڵ ئەم نیشانە و بەڵگانە رووبەڕووین، سەرۆك کۆمار دەیەوێت سیستمی ATACM ١٢٠ بدات بە سوپای تورکیا. بەڵام ATACM چییە؟ لە بنەرەتدا پەیڕەوو بەرنامەی ناوخۆی سوپای ئەمریکا دەڵێت ATACM "موشەکێکی بالستیکی کانوینشنالی سیرفەیس تو سیرفەیس"ە[٣] کە لە دەزگای تەقێنەری ٢٧٠ M دەتەقێنرێت. هەر موشەکێك کڵاوەیەکی هەیە کە تێکەڵێك لە ٩٥٠ دانە بومبی بچووکی هێشوویی تێدایە کە دەتوانێت بەخێراترین کات بەسەر ناوچەیەکی بەرفراواندا بتەقێتەوە. ئاکام و ئەنجامەکانی کەڵکوەرگرتن لە ATACM لەمێشکی ئێمەدا ناگونجێت. ئەم جۆرە موشەکانە لەوانەیە بۆ لەکارخستنی ئامانجە جۆراوجۆرە مرۆڤی و مادییەکان بەشێوەیەکی خێرا بەکار ببرێت.

---

[٣] conventional surface-to-surface ballistic missile

گوندە کوردنشینەکان و گرووپە کوردە بەرێکخستنکراوەکان بە ئاسانی دەبن بە ئامانجی هێرشی موشەکە بالستیکەکان. ئەمە تراژیدییەکی تۆقێنەرە.

ئیدارەی کلینتۆن وابیر دەکاتەوە کە ئەم موشەکانە بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی ئەو دوو هێزە کە لەسەر سنووری تورکیا ـ ئێران و تورکیا ـ عێراقدان، پێویستە. بەڵام بە بۆچوونی من ئەم موشەکانە پێویست نییە، چونکە ١- تورکیا هاوپەیمانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە و ئەندامی ناتۆیە.

٢- بنکەی سەربازی هەوایی "ئینجیرلیك" لە تورکیایە کە ئێمە لەوێوە"ناوچەی دژەفڕین" لە باکووری عێراق دەپارێزین و

٣- تورکیا بەشدارە لە هەنگاوی"ئاشتی دایتۆن"[٤] لە بۆسنیا.

بەباوەڕی من گرینگی ئیستراتژیکی تورکیا بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەورووپا بەسە بۆ پێشگرتن لە هەر چەشنە کردەوەیەکی سەربازی بێ عەقڵانەی ئێران یا عێراق. ئەگەر وڵاتی ئێمە دەتوانێت جیهان وەگەڕ بخات بۆ دەرکردنی عێراق لە وڵاتیکی بچووك وەك کوێت، بیری لێبکەنەوە کە وەڵامی ئێمە بە دەستدرێژی عێراق یا ئێران بۆ سەر تورکیا چۆن دەبێت. کەوابوو شتێکی روونە کە هەڵێنجاندنی ئیدارەی ئێمە بۆ پاساوهێنان بۆ فرۆشتنی موشەك بە تورکیا شتێکی بێ بنەمایە. لەراستیدا من هیچ هۆکارێکی متمانەپێکراوی سیاسی، ئابووری یا ئیستراتژیکی نابینم بۆ فرۆشتنی سیستمی ATACM بە تورکیا.

جەنابی سەرۆك، هەر ئەم مانگی پێشووە، کۆنگرێس هەنگاوێکی بەهێزی هەڵگرت دژی دەستدرێژی تورکیا لە ناوچە و دەنگی دا بە کەمبوونەوەی پشتیوانی ئابووری

[٤] Dayton

مادی ولاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا. ئەمە هەنگاوێکی گرنگە. دۆستی بەڕێزم لە ئەیالەتی نیویورك، سناتۆر "داماتۆ" و من پشتیوانی لە پەسەند کردنی گەلاڵە یاسایەکی دیکە دەکەین بۆ هەڵگرتنی هەنگاوی زیاتر لەم پەیوەندییەدا. هیوادارم کە ئێمە لە کۆنگرێس هەموومان لەسەر ئەوە رێکبین کە دەبێ بەهایەکی زیاتر بسەپێنین بەسەر پشتیوانی ئابووری و سەربازی ولاتە یەکگرتووەکان لەسەر هاوپەیمانەکانمان، بەتایبەت هاوپەیمانەکانمان لە ناتۆ و ئەم بەهایەش، بەرپرسیارێتی ئەخلاقی کەڵکوەرگرتن لە یارمەتیەکانی ولاتە یەکگرتووەکان ئەمریکایە. من نازانم فرۆشتنی موشەکی بالستیك بە تورکیا لە لایەن ئیدارەی کلینتۆن، چۆن لەگەڵ تەنانەت رێوشوێنە سەرەتاییەکانی ئەم بەرپرسیارەتیە ئەخلاقیە دێتەوە. ئێمە دەبینین کە کۆمەڵێك هەنگاو دارێژراوە بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی لە ناوچە کێشەدارەکان وەك "بوسنیا هەرزگوین"، ئیرلەندای باکوور، قوبرس و رۆژهەلاتی ناوەڕاست. بەهەرحاڵ پێویستە ئیدارەی ئەمریکا زۆر سەرنج بدات بە کۆتاییهێنان بە توندوتیژی لە کوردستان و "ئەگرونۆ ـ قەرەباخ".

فرۆشتنی ۱۲۰ دانە ATACM بە تورکیا، ولاتی ئێمە بە ئاراستەیەکی هەڵەدا دەبات و لەوانەیە ببێتە هۆی گەرمتربوونی شەڕەکە و کەوتنی زەرەر و زیانی زیاتر لە هەردوولا. کەوابوو ئێستا کە ئیدارەی کلینتۆن رایگەیاندووە دەیەوێت سیاسەتی فرۆشتنی چەك بە تورکیا پەیڕەو بکات، داوایان لێدەکەم بەبڕیارەکەیاندا بچنەوە. ئەگەر ئیدارەی کلینتۆن دەیەوێت فرۆشتنی چەك بە تورکیا تەواو بکات: داوا دەکەم لانیکەم کۆمەڵێك شەرت و مەرج دابنێت بۆ شێوەی کەڵکوەرگرتن لەم چەکانە. بەکورتی ئێمە دەبێ بەو شەڕت و مەرجە ئەم موشەکانە بدەین بە تورکیا کە تەنها بۆ

بەرگری کردن لە وڵاتەکەی بەکاریان بهێنێت و ئەم موشەکانە نەبن بە هەڕەشە بۆ خەڵکی یونان و قوبرس.

لەمەزیاتر دەوڵەتی تورکیا دەبێ بەڵێن بدات کە هیچکام لەم موشەکانە نەدات بە ئازەربایجان، و سەرئەنجام نابێت کەڵك لەم موشەکانە وەربگیردرێت بۆ درێژکردنەوەی توندوتیژی لە کوردستان. ئیدارەی کلینتۆن لانیکەم دەبێت پێداگری لەسەر ئەم شەرت و مەرجانە بکات و روونی بکاتەوە کە پابەندنەبوون بەم شەرت و مەرجانە دەبێتە هۆی نەمانی یارمەتی ئابووری و سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا لە داهاتوودا.

جارێکی دیکە لەسەر ئەو باوەڕەم کە فرۆشتنی ئەم چەکانە بە تورکیا، سیاسەتێکی خراپە، هەڵەیە. بەهەرحاڵ ئەگەر ئیدارەی کلینتۆن دەیەوێت بەشوێن ئەم سیاسەتەدا بچێت، دەبێ لانیکەم روونی بکاتەوە کە کەڵکوەرگرتن لەم چەکانە تەنها بە بەرگری کردن لەخۆ سنووردار بێت. ئەگەر ئێمە دەمانەوێت ئەم حبە تاڵە قوت بدەین، ئیدارەی کلینتۆن دەبێ هەوڵ بدات تاڵییەکەی کەم بکاتەوە.

***

ئەمە دەقی ئەو نامەیەیە کە ئێمە لەم پەیوەندییەدا ناردوومانە بۆ وەزیری دەرەوە، "وارێن کریستۆفێر".

ئەنجوومەنی پیرانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

واشنگتۆن دی سی، ١٨ ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٥

بەڕێز" وارن م کریستۆفێر"، وەزیری دەرەوە

واشنگتۆن، دی سی

جەنابی وەزیری دەرەوە:

ئێمە دەمانەوێت دژایەتی توندی خۆمان دەربڕین لەگەڵ بڕیاری ئیدارەی کلینتۆن بۆ فرۆشتنی ١٢٠ دانە موشەکی زەوی بە زەوی(ATACMS) بە تورکیا. هەروەها کە خۆتان باش ئاگادارن، زیاتر لە یەك دەیەیە کە دەوڵەتی تورکیا شەڕیکی دڕندانە دژ بە خەڵکی کورد بەڕێوە دەبات. بەگوێرەی زانیارییەکانی ئەم دواییانەی ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ (HRW) لەئەنجامی ئەم شەڕەدا، ١٩ هەزار کەسی سەربازی و مەدەنی کوژراون، ٢ هەزار گوند کاول بووە و زیاتر لە ٢ میلیون کەس لە ماڵ و حاڵی خۆیان ئاوارە بوونە.

ئەوەی کە بووەتە هۆی قووڵتربوونی نیگەرانی ئێمە، ئەوەیە کە دەوڵەتی تورکیا لەم چەکانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کەڵکوەردەگرێت بۆ ئەنجامدانی ئەم کردەوە بێبەزەییانە دژبە کوردەکان و درێژکردنەوەی شەڕەکەی لەگەڵ خەڵکی کورد. بەتایبەت ڕاپۆرت دراوە کە لە میانەی ٢٩ پێکداداں لە نێوان ١٩٩٢ و ١٩٩٥ ، سوپای تورکیا کەڵکی لە فڕۆکە بومبهاوێژ و کوپتەرەکانی ئەمریکا وەرگرتووە بۆ هێرشکردنە سەر گوندەکان و ئامانجە مەدەنیەکان. لەمە زیاتر تورکیا لە چەکە سووکەکان و نەفەرهەڵگرە زرێپۆشەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و ناتۆ کەڵکی وەرگرتووە بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتی دژەهێرش دژی هەزاران گوندی کوردنشین.

کوردەکان تەنها کەسانێك نین کە بوونەتە ئامانجی هێرشی ئەو چەك و سازوبەرگە سەربازییانە کە ناتۆ و وڵاتە یەکگرتووەکان داویانە بە تورکیا. لەڕاستیدا کارنامەی

دەوڵەتی تورکیا لەم بیست ساڵەی دواییە مرۆڤ دەتۆقێنێت. نموونە بەرچاوەکەی ئەوەیە کە تورکیا لە کاتی داگیرکردنی دوورگەی قوبرس(کە ئێستا بووە بە دوو بەش) لە چەك و سازوبەرگە سەربازییەکانی ناتۆ کەڵکی وەرگرت. لەمە زیاتر تورکیا چەکەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و "ناتۆ"ی داوە بە ئازەربایجان و ئازەربایجانیش ئەم چەکانەی دژ بە دانیشتوانی مەدەنی ئەرمەنی هەرێمی "نەگرونۆ ـ قەرەباخ*" بەکارهێناوە.

کەوابوو ئێستا کە ئێمە لەگەڵ ئەم مێژووە بەرەوڕووین، سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەیەوێت ۱۲۰ ATACMS بدات بە تورکیا کە هەرکامیان دەتوانێت ۹۵۰ دانە بومبی هێشوویی بچووك لە کڵاوەکەی خۆیدا هەڵبگرێت. سوپای تورکیا دەتوانێت بەم چەکانە هێرشێکی موشەکی بالستیکی دڵتەزێن دژ بە خەڵکی کورد ئەنجام بدات. هەروەها ئەنجامێکی دڵتەزێنی هاوشێوەی لێدەکەوێتەوە ئەگەر هەرکام لەم موشەکانە بکەوێتە دەستی ئازەرییەکانی ئازەربایجان یا بەرەو قوبرس یا یونان ئاراستە بکرێت.

جەنابی وەزیر، ئیداری کلینتۆن هەنگاوی گەورەی هەڵگرتووە بۆ سەقامگیربوونی ئاشتی لە ناوچە کێشەدارەکان وەك بوسنیا هەرزگوین، ئیرلەندای باکوور، قوبرس و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بەهەرحاڵ پێویستە ئیدارەی کلینتۆن بەپەرۆشبوونی توندی

---

*هەرێمی نەگرونی- قەرەباخ کە دەکەوێتە نێوان وڵاتی ئازەربایجان و ئەرمەنستان کوردنشینە و سەردەمی خۆی(ساڵی ۱۹۲۳ تا ۱۹۳۱) دەوڵەتی خودموختاری "کوردستانی سوور" لەم هەرێمە دامەزراوە. بەداخەوە لە ئاکامی شەری نێوان ئازەربایجان و ئەرمەنستان لە سەر ئەم هەرێمە، گەلێك لە کوردەکان ئەو هەرێمەیان بەجێ هێشتووە و بۆ ناوخۆی ئەرمەنستان کۆچیان کردووە.(وەرگێڕ)

ئێمە نیشان بدات بۆ کۆتایی پێهاتنی توندوتیژی لە کوردستان و هەرێمی"ئەگرونۆ - قەرەباخ".

بە تەیار کردنی تورکیا بە ١٢٠ سیستمی ATACMS، ئێمە پەیامێکی پێچەوانەی(هەنگاوە ئاشتیخوازانەکانمان) دەنێرین و ئاگری کەوتنی زەرەر و زیان لە هەردوولا تیژتر دەکەین. ئێستا کاتی ئەوەیە کە ولاَتە یەکگرتووەکان هەڵوێست بگرێت بۆ سەقامگیربوونی ئاشتی لە سەراسەری ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بەم هۆیە، ئێمە داوا لە ئیدارەی کلینتۆن دەکەین کە بە بڕیارەکەیدا بچێتەوە بۆ فرۆشتنی سیستمی موشەکی زەمین بە زەمین بە تورکیا.

سپاستان دەکەین ئەگەر ئەم مەسەلە گرنگە بە هەند وەربگرن.

لەگەڵ ڕێزماندا

لاری پریزلێر[٥]

ئالفۆن م داماتۆ[٦]

---

[٥] Larry Pressler.

[٦] Alfonse M. D'AMATO

## ٢٢ ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٥- ئەنجوومەنی نوێنەران
## فرۆشتنی سیستمی موشەکی ATACMS بە تورکیا

بەڕێز "پالۆن"[1]، نوێنەری ئەیالەتی نیوجێرسی:

جەنابی سەرۆك، ئەمڕۆ، یا تا ناوەڕاستی هەفتەی داهاتوو، وەزارەتی بەرگری ئەمریکا، نامەی LOA لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا واژۆ دەکات بۆ تەواوکردنی فرۆشتنی ١٢٠ سیستمی موشەکی ATACMS بە تورکیا. ATACMS "موشەکێکی بالستیکی نیمچە هۆشیاری کانونیشناڵی زەوی بە زەوی"یە کە بۆمبی هێشوویی دژە نەفەر و دژەمادە لە کڵاوەکەیدایە کە دەتوانێ بەخێرایی لە ناوچەیەکی ١٥٠ مەتریدا بڵاو بێتەوە. تورکیا لەمێژە سیستمی تەقاندنی چەند جۆرەی راکێتی هەیە کە دەتوانێ ئەم چەکە مەترسیدار و خراپکارانەی پێ بتەقێنێ. ئەم موشەکانە ٩٥٠ دانە بومبی بچووکی تێدایە کە هەندێکیان دەستبەجێ ناتەقنەرە و لەسەر زەویدا دەمێننەوە و مەترسی دروست دەکەن بۆ خەڵکی سڤیل، لەوانە منداڵان.

جەنابی سەرۆك، فرۆشتنی ئەم چەکانە، کارێکی هەڵەیە بە وڵاتیکی هەڵە لە کاتێکی هەڵەدا. سەرەتای ئەم مانگە من و بەڕێز "بیلیریکایز"[2]، نوێنەری ئەیالەتی فلوریدا نامەیەکمان نارد بۆ سەرۆك کۆمار کە ٣٥ کەس لە ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران سەر بە هەر دوو حیزب (کۆماریخواز و دیموکرات) واژۆیان کردبوو و تێیدا داوامان لە

[1] Mr. PALLONE
[2] Mr. Bilirakis

سەرۆك كلینتۆن كردبوو كە بە بڕیاری فرۆشتنی ئەم چەكانە بە توركیا بچێتەوە، بەهۆی ئەوەی ئێمە بەتوندی نیگەرانین بەنیسبەت شێوەی كەڵكوەرگرتن لەم چەكانە. رەفتاری ناوخۆیی و نێونەتەوەیی دەوڵەتی توركیا ـ لەوانە هەڵمەتە بەردەوامەكانی دژی خەڵكی كورد، داگیركردنی باكووری قوبرس و گەماروودانی ئەرمەنستان ـ ئێمەی بەتوندی نیگەران كردووە كە فرۆشتنی ئەم چەكەماڵوێرانكەرانە بە ئەم دەوڵەتە دەبێتە كارەسات و نەهامەتییەكی مرۆڤی.

ئەمڕۆ من پەیوەست دەبەم بە هاوكارانم، بەڕێز توریسیلی[٣] و بەڕێز بیلیریكاس بۆ خستنەڕووی بڕیارنامەی ١٢٤ لە ئەنجوومەنی نوێنەران كە هەستی كۆنگرێس دەردەبڕێت دەربارەی ئەوەی سەرۆك كۆمار دەبێ فرۆشتنی سیستمی ATACMS بە دەوڵەتی كۆماری توركیا هەڵبواسێتەوە هەتا ئەو كاتە كە ئەم دەوڵەتە هەنگاوی گرنگ و چڕوپڕ هەلبگرێت بۆ كۆتاییهێنان بە داگیركردنی قوبرس، لابردنی گەمارۆكان لەسەر ئەرمەنستان، راوەستاندنی شەڕە بەردەوامەكانی لەگەڵ خەڵكی كورد و پێشكەوتن لە پاراستنی مافی مەدەنی و مافی مرۆڤ لە توركیا.

جەنابی سەرۆك، لانیكەم دەتوانین بڵێین فرۆشتنی ئەم چەكانە بە توركیا لەم كاتەدا ، شتێكی سەرسوڕهێنەرە. گەڵاڵە یاسای ئوپەراسیونەكانی دەرەوە، بچڕاندنی یارمەتی ئابووری بەم وڵاتە لەخۆ دەگرێت. ئەم شەرت و مەرجە كە بێ لایەنانە لە لایەن هەر دوو حیزبەكەوە پشتیوانی لێدەكرێت، لە وەڵامی نیگەرانیەكانی سەرەوە پەسەند كراوە. بەباوەڕی ئێمە ئەو پەیامە كە ئێمە دەمانەوێت لە رێگای ئەم شەرتومەرجە

---

[٣] Mr. Torricelli

بینێرین، به پەسەندکردنی بڕیاری نوێ بۆ فرۆشتنی سازوبەرگی سەربازی لەم کاتەدا دەچێتە ژێر پرسیار.

دەوڵەتی ئانکارا وابیر دەکاتەوە کە ئەمریکا پێشێلکردنی توندی یاسای نێونەتەوەیی و ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی تورکیا، بەجیدی ناگرێت و تەنها کۆمەڵێك کردەوەی سەمبولیکی سنووردار ئەنجام دەدات. کارنامەی سەربازی تورکیا لەگەڵ چاوەڕوانیەکانی ئێمە لە وەرگرانی چەك لە وڵاتە یەکگرتووەکان ، بەتایبەت ئەندامانی ناتۆ، نایەتەوە. پرۆژەی سەربازی مافی مرۆڤ، ئاماژەی بە نمونە جۆراوجۆرەکانی کەڵکوەرگرتنی بێ فەرق و جیاوازی هێزەکانی تورکیا لەم چەکانە لە ناوچە کوردنشینەکان کردووە. ئێمە هەروەها نیگەرانین بەنیسبەت ئەوەی کە تورکیا چەکەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و ناتۆ دەدات بە کۆماری ئازەربایجان.

بە قەناعەتی ئێمە دەبێ فرۆشتنی چەك بە تورکیا بەتەواوی هەڵبوەشێتەوە و لە نامەکەماندا بۆ سەرۆك کۆمار ئێمە پێشنیارمان کردووە کە لانیکەم کومەڵێك شەرت و مەرجی بەهێز دابنرێت بۆ شێوەی کەڵکوەرگرتن لەم چەکانە و و گوازتنەوەیان بۆ وڵاتانی دیکە و ئەم شەرت و مەرجانە بەتوندی جێبەجێ بکرێت.

جەنابی سەرۆك، رێکخراوەکانی ئەرمەنی ـ ئەمریکایی، یونانی ـ ئەمریکایی و کورد ـ ئەمریکایی و هەروەها رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ ، "کۆمەڵەی جیهانێکی حەزلێکراو" و فدراسیونی زانستوانانی ئەمریکا بەتوندی دژایەتیان کردووە لەگەڵ فرۆشتنی ئەم چەکانە بە تورکیا. تورکیا بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێویستی بە ATACMS هەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڕەشەی تانکەکانی سوریا، عێراق و ئێران. بەڵام یونان، دراوسێی لای رۆژئاوای تورکیا ، نیگەرانیەکی قووڵی هەیە

بەنیسبەت ئەو هەڕەشەیە کە لە ئەنجامی ئەم چەکە هێرشبەرانە دێتە ئاراوە. لە کێبەرکێی چەك لە ناوچە، تورکیا پلەی باشی بەدەست هێناوە لەبەر ئەوەی جێتی شەڕکەری ١٦ ـ F و کوپتەری شەڕکەر و موشەکی دژە چەکی زرێپۆشی هەیە. لەمە زیاتر تورکیا لە ماوەی ٥ ساڵی رابردوودا زیاتر لە یەك هەزار دانە تانکی تەنها لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کڕیوە.

دەوڵەتی تورکیا دژی کوردەکان لە ناوخۆی تورکیا شەڕ دەکات و هێرشی کردووەتە سەر ناوچە کوردنشینەکانی عێراق کە لە ئەنجامدا هەزاران مەدەنی بریندار بوونە و میلیونەها کەس ئاوارە بوونە. ئەم شەڕە زاڵمانەیە بەشێکە لە هەوڵی گشتی تورکیا بۆ نکوڵی کردنی تەواو لە بوونی گەلی کورد وەك کیانێکی جیاواز لە تورکیا. گەلێك کەس نیگەرانن کە ئەم موشەکانە وەك بەشێك لەم هەڵمەتە سەربازییە کەڵکیان لێوەربگیردرێت و ببێتە هۆی کارەسات بۆ خەڵکی سڤیل.

رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ بەردەوام تورکیا شەرمەزار دەکەن بەهۆی پێشێلکردنی پڕگرۆتینی مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانی هاووڵاتیەکانی. سەرەتای ئەمساڵ رۆژنامەنووسێکی ژنی ئەمریکایی لە تورکیا خرایە بەندیخانە بەهۆی ئەوەی هەڵمەتی تورکیا دژ بە کوردەکانی راپۆرت دابوو، بەڵام "الحمدوللا" ئازاد کرا. بەداخەوە کۆتاییەکی خۆشی وەها لە ئارادا نییە بۆ ئەو رۆژنامەنووس و چالاکە ئازانەی مافی مرۆڤ لە تورکیا کە هەوڵ دەدەن راستیەکانی رووداوەکانی تورکیا بگەیەنن بە گوێی هاووڵاتیانی خۆیان و جیهانی دەرەوە. ئەم رۆحە ئازانە لەبەندیخانەدا کەوتوون و هیچکەس جگە لە چەند دۆستێك و پشتیوانێك سەرنجیان پێنادات.

جەنابی سەرۆك، من زۆر نیگەرانم و زۆر دڵساردم بەنیسبەت بێدەنگبوونی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا (یەکێ لەوانە دەوڵەتی ئێمە) لەبەرامبەر پێشێلکردنی بەردەوامی یاسا و ڕێوشوێنە نێونەتەوەییەکان لە لایەن تورکیاوە. هەر ئەم هەفتەی پێشووە یەکێتی ئەورووپا سەرەڕای دژایەتی توندی گەلێ لە یاسادانەران و چالاکانی ئەودیوی ئاتلانتیك، پشتڕاستی کردەوە کە تورکیا پابەندە بە ڕێوشوێنەکانی یەکێتی ئەورووپا کە ئەمەش هەنگاوێکە بۆ بەئەندامبوونی تەواوی تورکیا لە یەکێتی ئەورووپا.

ئێمە بۆ وا دەکەین؟ بەداخەوە ئێمە تەنها چاومان لە سەرکەوتنی سیاسەتی خۆمانە، بەواتای دیکە ئێمە بەرژەوەندییە ئابووری یا ئیستراتژیکیەکانمان لە سەرووی بایەخە(ئەخلاقیەکانمان) داناوە. هەڵێنجاندنی دەوڵەتی ئێمە بۆ ئەم ڕەفتارە ئەوەیە کە ئێمە پێویستمان بە تورکیایە لەبەر هەڵکەوتە ئیستراتژیکەکەی وەك قەڵغانێك لەبەرامبەر بناژۆخوازە ئیسلامیەکان.

باشە، سەرەتا ئەوە بڵێم کە بە باوەڕی من ئێمە دەتوانین لە ڕێگای ئامرازگەلی ئەرێنی دیکە(نە فرۆشتنی چەك) بگەین بەم ئامانجانە. بەڵام ئەو پرسیارەش لە مێشکمدایە کە ئایا ئێمە هەڵەیەکی ئیستراتژیکی تۆقێنەرمان نەکردووە و زەبرمان لە ناوبانگی ئەمریکا نەداوە کە بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو بایی بیلیونها دولار، پێشکەوتووترین چەکەکانی خۆمان داوە بە ڕژێمێك وەك تورکیا کە زۆر سەقامگیر نییە و هەر ئانوساتێك لەوانەیە هەڵبوەشێتەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەوەی لەوانەیە زۆر درەنگ بێت بۆ ڕاوەستاندنی ئەم چەکفرۆشتنە هەڵەیە، داوا لە هەموو هاوکارانم دەکەم لەگەڵ من و ئەندامانی دیکەی ئەم ئەنجوومەنە کار بکەن بۆ ڕاوەستاندنی پێشێلکارییەکانی ڕژێمی تورکیا و

پشتیوانیکردن لە دراوسێکانی تورکیا و دانەمەزراندنی سیاسەتی دەرەوە لەسەر بنەمای بەدشەرتیەکانی دەوڵەتی تورکیا.

## ٢٥ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٦ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## پشتیوانی لە ئاشتی، دیموکراسی و دادپەروەری بۆ سەرجەم هاووڵاتیانی تورکیا، لەوانە کوردەکان

بەڕێز کریستوفێر ئیسمیت[١]، نوێنەری ئەیالەتی نیوجیرسی:
جەنابی سەرۆك، من ئەمڕۆ دەمەوێت بڕیارنامەیەك بخەمەڕوو بۆ کۆتاییپێهاتنی ئاشتیخوازانەی شەڕی نێوان دەوڵەتی تورکیا و گریلا کوردەکان. ئەم شەڕە بەردەوامە بنەماکانی دەوڵەتی تورکیا و پەیوەندییە دولایەنەکانمان خراپ دەکات و ئارەزووی وڵاتە یەکگرتووەکان و دەوڵەتی تورکیا بۆ دروستکردنی پەیوەندی درێژخایەن و مسۆگەر لەگەڵ کێشەو گرفت روبەڕوو دەکاتەوە.
کۆتاییپێهاتنی ئەم شەڕە، دیموکراسی لە تورکیا(بە قازانجی خەڵکی تورکیا) بەهێز دەکات و یارمەتی دەدات بە نەمانی توندوتیژی، و ئابووری لەرزۆکی تورکیا پێش دەخات و سەقامگیری ناوچە پتەو دەکات.
جەنابی سەرۆك، نیوەی کوردەکانی جیهان واتا ٢٥ میلیون کورد لە تورکیا دەژین و لە سەدەی رابردودا ٢٨ راپەڕینی کورد لەم وڵاتە رووی داوە. لە ساڵی ١٩٨٤ وە زیاتر لە ٢٠ هەزار کەس لە ئەنجامی شەڕی نێوان هێزەکانی ئاسایشی تورکیا و هێزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) و گروپە بناژۆخوازە ئیسلامیەکان کوژراون. لە ماوەی ٣ ساڵی رابردوودا هێزەکانی ئاسایش زیاتر لە ٢٦٥٠ گوندیان لە

[١] CHRISTOPHER H. SMITH

باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا چۆڵ یا کاول کردووە و زیاتر لە ٣ میلیون کەسیان ئاوارە کردووە.

کاربەدەستانی ئاسایشی تورکیا گوندنشینەکانیان کۆ کردووەتەوە و بە کۆمەڵ دەستگیر کردووە و ترساندووە و لێیانیانداوە. "گروپی مەرگ" کە وەها کە باس دەکرێ، لەگەڵ هێزەکانی ئاسایش و بناژۆخوازە ئیسلامیەکان لە پەیوەندیدایە، بەرپرسیاری کوشتن و بێسەروشوێنکردنی سەدان کەسە. مانگ نییە راپورت بڵاو نەبێتەوە دەربارەی ئەوەی ئەو کەسانە کە تاوانی سیاسیان خراوەتە پاڵ لە بەندیخانەکاندا دەکوژرێن و ئەشکەنجە دەکرێن. ٨ پارێزگا لە باشووری رۆژهەڵات بەردەوام لە بارودۆخی نائاساییدان و کاربەدەستە مەحەلیەکان تێیاندا چالاکی سیاسی و راگەیاندنەکان سنووردار دەکەن.

جەنابی سەرۆك، دەوڵەتە یەك لە دوای یەکەکانی تورکیا بەردەوام وەك دیاردەیەکی تروریستی سەیری( PKK) یان کردووە کە دەیەوێت تورکیا لەیەك هەڵبوەشێنێتەوە و وڵاتی تورکیا بە هێڵگەلی ئەتنیکی دابەش بکات. دەوڵەتی تورکیا دەستی سوپاکەی ئاوەڵا هێشتووەتەوە بۆ وەڵامدانەوە بە PKK. رەفتارە سەرکوتکەرانەکەی ئەم دەوڵەتە دەنگە سیاسیە رەواکانی کوردەکانیشی کپ کردووە.

جەنابی سەرۆك، لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، خەڵك ناچارن لە نێوان پشتیوانی لە گریلاکان و تولەسەندنەوەی ئاسایشی تورکیا یەکێکیان هەڵبژێرن و ئەو کەسانە کە لایەنگری لە دەوڵەتی تورکیا دەکەن لە لایەن PKK وە لەسێدارە دەدرێن. ١١ ساڵ توندوتیژی، کورد و تورکەکانی وەك دوو جەمسەر لەیەك جیا کردوەتەوە و مەترسی ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە کۆمەڵگای تورکیا بە هێڵگەلی ئەتنیکی دابەش بکات.

کوردەکان لەگەڵ سەرکووتی سوپا روبەڕوون و رۆژبەرۆژ زیاتر پشتیوانی لە PKK دەکەن. تورکەکانیش رۆژبەرۆژ زیاتر لە توندوتیژییەکانی PKK توڕە دەبەن و مافی هاوولاتیانی کورد تەحەمول ناکەن.

جەنابی سەرۆك، هیچ کەس حاشا لە دەوری سەرەکی تورکیا لە پاراستنی بەرژەوەندییە ئیستراتژیك، سیاسی و ئابووریەکانی ولاتە یەکگرتووەکان لەم ناوچە هەستیارە ناکات. بەهەرحاڵ ناتوانایی دەوڵەتە یەك لە دوای یەکەکانی تورکیا بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی کورد بووەتە کەندوکۆسپ بۆ باشتربوونی پەیوەندییەکان و چارەسەربوونی کێشەکانی مافی مرۆڤ و پێشکەوتنی دیموکراسی لە تورکیا.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە دۆستان و پشتیوانە راستەقینەکانی تورکیا داوا لە هەر دوولای ئەم شەڕە(دەوڵەتی تورکیا و PKK) بکەن کە دەست لە توندوتیژی هەڵبگرن و کێشەکانیان بە ئاشتی و دیموکراسی لە چوارچێوەی یەکپارچەیی خاکی کۆماری تورکیا چارەسەر بکەن. دوابەدوای هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییە، دەوڵەتی تورکیا خۆی لە بێچارەییەکی بەردەوامدا دەبینێت. چاودێران لەسەر ئەو باوەڕەن کە لەوە ناچێت هیچکام لە دەوڵەتە نوێکانی تورکیا سیاسەتێکی نوێ بەنیسبەت کێشەی کورد بگرنە بەر، بەهۆی زاڵبوونی هەستە ناسیونالیستیەکانی تورکەکان و ترس لە سەرنەکەوتن لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا. لەمە زیاتر سوپای تورکیا پشتیوانی لە بەردەوامبوونی شەڕ لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا دەکات، هەر چەند کە ئەم سیاسەتە هەرەسی هێناوە و هیچ ئاکامێکی جگە لە پتەوتر بوونی پشتیوانی خەلکی ناوچە لە PKK بەدواوە نەبووە.

جەنابی سەرۆك، ئێمه له ئەزموونەکانمان له پەیوەندی لەگەڵ PLO(ڕێکخراوی ئازادی فەلەستین) و ئیسرائیل، ANC و ئەفریقیای باشوور و IRA و بریتانیا فێری ئەوە بووین که ڕەوتی ئاشتبوونەوە هەرچی زووتر دەست پێبکات، خوێنڕێژی و ئێش و ئازارەکان کەمتر دەبێتەوە.

جەنابی سەرۆك، توندوتیژی، کێشەی PKK و دەوڵەتی تورکیا چارەسەر ناکات. دەبوایا زۆر پێشتر له ئێستا، دیالۆگ دەستی پێبکردبا بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە.

جەنابی سەرۆك، دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان هەمیشە ڕێنیشاندەر بووە بۆ پێشکەوتنی ئاشتی له ناوچە ئاڵۆزەکان، کەوابوو دەبێ ئێمه بەرپرسیارێتی خۆمان نیشان بدەین بۆ تەشویقکردنی چارەسەربوونی ئەم شەڕە خوێناوی و ماڵوێرانکەرە.

ئەم بڕیارنامەیە که من و بەڕێز "ستین هۆیەر"، ئەندامی پایەبەرزی کەمینەی کومسیونی هلسینکی دەیخەینەڕوو، هەنگاوێکی سەرەتایی گرنگە له پێناو ئەم ئامانجەدا. داوا له هاوکارانم دەکەم پەیوەست بن بە ئێمه بۆ پشتیوانی کردن لەم بڕیارنامەیە.

### بڕیارنامەی ١٣٦ ی ئەنجوومەنی نوێنەران

ـ بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی له ساڵی ١٩٨٤وە، شەڕی سەربازی له باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەستی پێکردوە و سەراسەری ناوچە له ساڵی ١٩٨٧ وە کەوتووەتەناو حاڵەتی نائاسایی

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی قوربانیانی مرۆڤی ئەم شەڕە زۆر بووە و زیاتر لە ۲۰ هەزار کەس گیانیان لەدەست داوە و زیاتر لە ۳ میلیون کەس ئاوارە بوونە و زیاتر لە ۲٦٥۰ گوندی کوردنشین کاول بووە

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئازادی رادەربڕین لە تورکیا لە لایەن یاساوە سنووردار کراوە کە دەربڕینی ناتوندوتیژانە بە سووچ دەزانێت و لە ئەنجامدا رۆژنامەنووسان، نووسەران، کەسایەتییە ئاکادیمیکەکان، چالاکانی مافی مرۆڤ و کەسانی دیکە وەك زیدانی سیاسی خراونەتە بەندیخانە

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی لە ۲ ساڵی رابردوودا، ۱۳ ئەندامی کوردی پارلمانی تورکیا بە تۆمەتی دەربڕینی بیروڕای سیاسی خۆیان یا پەیوەندی لەگەڵ پارتی نایاسایی کرێکارانی کوردستان(PKK) لە پارلمان دەرکراون، خراونەتە بەندیخانە یا دوور خراونەتەوە

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی هاوولاتیانی کوردی تورکیا لە کۆمەڵێك مافی بنەڕەتی تایبەتی سیاسی و مەدەنی بێبەش کراون وەك مافی بەشداری تەواو و ئازادانە لە ژیانی سیاسی، مافی پەروەردە بە زمانی زگماکی و مافی نووسین و بلاو کردنەوەی چاپەمەنی بە زمانی کوردی

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی شەڕی نێوان گریلا کوردەکان و هێزە چەکدارەکانی تورکیا لە سەراسەری ناوچە سنوورییەکانی تورکیا بلاو بووەتەوە و هەڕەشەیە بۆ سەقامگیری ناوچە

ـ بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی پەرەسەندنی شەڕ و ناکۆکییەکان، هەڕەشەی گەورە دەروست دەکات بۆ سەقامگیری ئابووری و ئاشتی سیاسی ئێستا، و پێش لە چەسپانی دیموکراسی دەگرێت

ـ بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی دەوڵەتی تورکیا پێش لە چالاکی رێکخراوە مرۆڤدۆستە مەحەلی و نێونەتەوەییەکان، لەوانە کومیتەی نێونەتەویی خاچی سوور دەگرێت

ـ بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی تروریزم هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ مافی مرۆڤ و یاسای نێونەتەوەیی

ـ بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی رێبەرانی تورکیا بەرپرسیارن بۆ ئاواکردنی کۆمەڵگایەکی دیموکرات و پێشکەوتێنکی بەرچاویان لەپێناو ئەم ئامانجەدا بەدەست هێناوە.

ـ بەلەبەرچارگرتنی ئەوەی دەوڵەتی تورکیا رازی بووە بە رێزگرتن لە رێککەوتننامە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ، لەوانە جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤی نەتەوەیەکگرتووەکان، کنوانسیونی ژنێڤ و یاسای کۆتایی هلسینکی

ـ بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی تورکیا وەك ئەندامی رێکخراوی پەیمانی ئاتلانتیکای باکوور(ناتۆ) و رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا ، شەریکێکی ئیستراتژیکی و ئابووری گرنگی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە.

ـ بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی بەرژەوەندییە درێژخایەنە ئابووری و ئیستراتژیکییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بەهۆی شەڕی بەردەوام لە تورکیا لە مەترسیدایە.

ـ بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی پاش ١١ ساڵ، رێبەرانی گریلایی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) پێشنیاری چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانەی کێشەکەیان کردووە و وتوویانە بۆ ئەم ئامانجە چەك دادەنێن.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی كێشەی كورد لە توركیا، ڕێگاچارەی سەربازی نییە و تەنها ڕێگاچارەیەكی سیاسی ئاشتیخوازانە دەتوانێ ئاشتی، سەقامگیری، دیموكراسی تەواو و خۆشبەختی لە توركیا دەستەبەر بكات
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی ڕێگاچارەییەكی وەها دەبێ لە چوارچێوەی یەكپارچەیی خاكی كۆماری توركیا جێبەجێ بكرێت

كەوابوو ئەنجوومەنی نوێنەران(بە ڕەزامەندی ئەنجوومەنی پیران) پەسەندی كرد كە كۆنگرێس لە سەر ئەو بیروباوەڕەیە كە:

١- دەوڵەتی توركیا دەبێ دەستبەجێ سەرجەم بەندكراوە سیاسیەكان ئازاد بكات و كەندوكۆسپەكانی سەر ئازادی ڕادەربڕین لاببات و بەمشێوەیە ڕێگا بۆ ئەوە خۆش بكات كە هاووڵاتیانی توركیا، لەوانە هاووڵاتیانی كورد بەو مافە سیاسی و كولتوورییانە شاد ببنەوە كە خەڵك لە سەرجەم وڵاتە دیموكراتیكەكاندا هەیانە

٢- سەرۆك كۆماری ئەمریكا دەبێت لە هەموو دەرفەتێكدا دەوڵەتی توركیا تەشوێق بكات هەنگاو هەڵبگرێت بۆ كۆتاییپێهێنان بە شەڕی چەكداری لەو وڵاتە

٣- پارتی كرێكارانی كوردستان(PKK) دەبێ ئاگربەست ڕابگەیەنێت و پشتیوانی خۆی دووپات بكاتەوە بۆ چارەسەركردنی كێشەكە بە شێوازی دیموكراتێك و لە چوارچێوەی یەكپارچەیی خاكی كۆماری توركیا

٤- دەوڵەتی توركیا دەبێ ئاگربەست ڕابگەیەنێت و جەخت لەسەر ئەو دروشمە بكاتەوە كە كۆماری توركیا لەسەری دامەزراوە واتا "ئاشتی لە نێوخۆ، ئاشتی لە جیهان"

٥ـ بۆ راوەستاندنی ناكۆكیەكان، دەبێ كومیتەی نێونەتەوەیی خاچی سوور و رێكخراوە مرۆڤدوست و چاودێرەكانی دیكە رێگەیان پێبدرێت بچنە ناو باشووری رۆژهەڵاتی توركیا

٦ـ دەوڵەتی توركیا دەبێ هەنگاو هەڵبگرێت بۆ كەمكردنەوەی بواری رووداني پێكداداني زۆرتر لە داهاتوودا، لەوانە:

الف ـ رێگا بە سەرجەم حیزبە سیاسیەكان بدات(كە پابەندن بە پرەنسیپی ناتووندوتیژی) لە ژیانی سیاسی توركیا بەشداری بكەن

ب ـ حاڵەتی نائاسایی لە باشووری رۆژهەڵاتی توركیا هەڵبگرێت

ج ـ سیستمی میلیشیایی"گاردی گوند"-ە كان هەڵبوەشێنێتەوە

د ـ سەرجەم كەندوكۆسپەكانی سەر پەخشی بەرنامە بە زمانی كوردی لە تەلەڤیزیون، رادیۆ، چاپ، موسیقا و میدیاكانی دیكە هەموار بكات

ه ـ رێگە بە پەروردە بە زمانی كوردی لە قوتابخانەكاندا بدات

و ـ میكانیزمەكانی راوێژ دابمەزرێنێت بۆ وشككردنی سەرچاوەی شەڕەكە و ئیستراتژی گونجاو دابنێت بۆ چارەسەركردنی قەیرانی ئێستای باشووری رۆژهەڵاتی توركیا

٧ـ سەرۆك كۆماری ئەمریكا دەبێ یارمەتی تەكنیكی دابین بكات بۆ جێبەجێبوونی شەرت و مەرجەكانی بڕگەكانی ١ تا ٦ .

## ئەنجوومەنی نوێنەران ـ ٣١ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٦
## پشتیوانی له ئاشتی و دیموکراسی له تورکیا: پشتیوانی له بڕیارنامەی ١٣٦

بەڕێز هۆیەر، نوێنەری ئەیالەتی مریلەند:

جەنابی سەرۆك، ٢٥ ی کانوونی دووەم من پەیوەست بووم بە سەرۆکی کۆموسیونی هلسینکی، بەڕێز "کریس سمیت" بۆ خستەڕووی بڕیارنامەی ١٣٦ ی کۆنگرێس - ئەنجوومەنی نوێنەران کە خوازیاری کۆتاییپێهاتنی ئاشتیخوازانە بە کێشەی نێوان دەوڵەتی تورکیا و میلیشیا کوردەکانە. داوا لە هاوکارانم دەکەم پشتیوانی لەم بڕیارنامە گرنگە بکەن کە ئامانجی کۆتاییپێهێنانە بە بازنەی تۆقێنەری توندوتیژی و ترور کە لە ئەنجامیدا ئەم هەموو خەڵکە لە دەیەی ڕابردوودا کوژراوە و کاریگەری نەرێنی داناوە لەسەر ئەو هەوڵانە کە دەوڵەتی تورکیا دەبێ ئەنجامی بدات بۆ گەیشتن بە دیموکراسییەکی تەواو.

جەنابی سەرۆك، زیاتر لە ١٠ ساڵە هاووڵاتیانی تورکیا، بەتایبەت هاووڵاتیانی دانیشتووی باشووری ڕۆژهەڵات بوونەتە قوربانی کردەوەکانی دەوڵەتی تورکیا کە دەیەوێت بە هەموو بەهایەك(بە وتەی خۆی) ترووریزم ریشەکێش بکات. زیاتر لە ٢٠ هەزار کەس لە شەڕی نێوان هێزەکانی ئاسایش، پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) و گروپە ئیسلامیە توندئاژۆ نادیارەکان کوژراون. سەربازانی تورك لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا بە زۆر زیاتر لە ٢٦٥٠ گوندی کوردنشینیان چۆل یا کاول کردووە و بەرهەمی کشتوکاڵی کوردەکانیان سووتاندووە و

مەڕومالاّتەکانیان کوشتووە و زیاتر لە ٣ میلیون کەسیان ئاوارە کردووە. هاووڵاتیانی کورد دەستگیر دەکرێن، ئەشکەنجە دەدرێن، دەکوژرێن و بێ سەروشوێن دەکرێن، بێ ئەوەی هیچ ئاسەوارێك بەشوێنیاندا جێمابێت.

جەنابی سەرۆك، سەرەتای ئەم مانگە رۆژنامەکانی ئەوروپا وێنەی رەنگی سەربازە تورکەکانیان بلاّو کردەوە کە سەری بڕاوی گریلا کوردەکانیان گرتبوو بە دەستەوە. ئەم وێنە ترسناك و دزێوانە کە نیشاندەری دڕندەیی و پڕ رق وکینەبوونی ئەم شەڕەیە، ناکۆکیەکانی نێوان کوردەکان و دەوڵەت قووڵتر دەکات. لەهەمان کاتدا ئەم وێنانە نیشان دەدات کە پێویستە بە زووترین کات رەوتی ئاشتبوونە دەست پێبکات. توندوتیژی و تووریزم ئەم کێشەیە چارەسەر ناکات و تەنها دیالۆگە کە دەتوانێت کۆتایی بە تاڵی و کوێرەوەرییەکانی ١٢ ساڵ شەڕ بێنێت. بڕیارنامەی ١٣٦ ی ئەنجوومەنی نوێنەران ـ ئەنجوومەنی پیران یارمەتی بە کۆتاییپێهاتن بە توندوتیژی و دەستپێکردنی هەوڵەکان بۆ ئاشتبوونە و لێکتێگەیشتن دەدات.

جەنابی سەرۆك، من و بەڕێز "ئیسمیت"، سەرۆکی کومسیونی هلسینکی، نامەیەك دەنێرین بۆکاربەدەستانی رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا(OSCE) و داوایان لێدەکەین دەستپێشخەری بکەن و پشتیوانی لە هەوڵەکان بکەن بۆ چارەسەربوونی ئەم کێشەیە لە تورکیا. بە باوەڕی ئێمە، OSCE دەبێ کۆمەڵێك میکانیزمی درێژخایەن دابنێت بۆ چاودێریکردن بە سەر پێشێلکاری مافی مرۆڤ و یارمەتی بدات بە وشکبوونی سەرچاوەی ناکۆکیەکان و داوا بکات کە سەرۆکی OSCE نوێنەریکی تایبەت بنێرێت بۆ پێشخستنی پرسوڕا دەربارەی چۆنیەتی و چەندایەتی چالاکیەکانی OSCE لە داهاتوودا لە تورکیا. ئێمە هەروەها داوامان لە سەرۆکی ئەنجوومەنی

OSCEله پارلمانی ئەوروپا کردووه که لێژنەیەك بنێرێت بۆ تورکیا بۆ یارمەتیدان بەم کاره. OSCE دەوری یەکلاییکەرەوەی بینیوه له پێشگرتن له شەڕ و ناوبژیوانی کردن و چاودێری کردن بەسەر مافی مرۆڤ له یوگسلاڤیای پێشوو، قەفقازیا، دەوڵەتانی ناوچەی بالتیك و شوێنەکانی دیکه. بوونی OSCE له تورکیا به تایبەت یارمەتیدەر دەبێت بۆ رێکخراوه ناحکوومیه مەحەلیەکان، گروپە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ(لەوانه کومیتەی نێونەتەوەیی خاچی سوور) و تەنانەت رۆژنامەنووسان که کاربەدەستانی تورکیا رێگایان پێنادەن ئازادانه لەم ناوچەیه چالاکی بکەن.

جەنابی سەرۆك، تورکیا و ئیسرائیل تەنها وڵاتانی دیموکراتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستن. تورکیا هاوپەیمانی ناتۆیه و ئەندامی OSCE یه. ناتوانایی دەوڵەتی تورکیا بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانه و دیموکراتیانەی کێشەی کورد، بنەما دیموکراتیکەکانی تورکیا دەخانه ناو مەترسی، ئابووری لاوازی تورکیا وشك دەکات، هەڕەشەیه بۆ سەقامگیری ناوچه و پەیوەندی نزیکتری تورکیا لەگەڵ ئەوروپا و وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا تووشی گیروگرفت دەکات. دەوڵەتی ئێمه یارمەتی داوه به چارەسەربوونی کێشەکان له رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، باڵکان و شوێنەکانی دیکه.

جەنابی سەرۆك، ئەگەر بەڕاستی ئێمه بایەخ به پەیوەندییه ئیستراتژیك، ئابووری و سیاسیەکانمان دەدەین لەگەڵ تورکیا ـ که به بوچوونی من دەبێ بایەخیشی پێبدەین ـ دەبێ هەر ئێستا دەست بەکاربین بۆ یارمەتیدان به کۆتاییپێهاتنی ئەم شەڕه دڕندەیه. لەراستیدا بەهۆی ئەم پەیوەندی و شەریکبوونەی تورکیا و وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکایه که ئێمه دەمانەوێت یارمەتی بدەین به کۆتاییپێهاتنی ئەم کێشەیه.

جەنابی سەرۆك، داوا لە هاوکارانم دەکەم پشتیوانی لە بڕیارنامەی ١٣٦ بکەن. بە باوەڕی من ئەم بڕیارنامەیە یەکەمین هەنگاوی هاوسەنگ و هۆشمەندانەیە کە دەوڵەتی ئێمە دەتوانێت و دەبێت هەڵیبگرێت بۆ یارمەتیدان بە چارەسەربوونی ئاشتیخوازانەی کێشەی دژوار و دووبەرەکینێرەوەی کورد لە تورکیا. داوا لە هەموو ئەو هاوکارانە دەکەم کە بایەخ بە مافی مرۆڤ و پەیوەندییەکانمان لەگەڵ تورکیا دەدەن کە پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەن. ئێمە دەبێ یارمەتی بدەین بە راوەستانی توندوتیژی.

## ئاگربەستی دووەمی PKK و دەوڵەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا
## (نامەی ئەندامانی كۆنگرێس بۆ سەرۆك كۆماری وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا)
## ٢٥ی ئاداری ١٩٩٦- ئەنجوومەنی نوێنەران

كۆنگرێسی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا

ئەنجوومەنی نوێنەران

واشنگتۆن، دی سی ٢٠٥١٥

بەڕێز جەنابی ویلیام. ج . كلینتۆن

كۆشكی سپی

بەڕێز جەنابی سەرۆك كۆمار

له ٢٣ی كانوونی دووەمی ١٩٩٦، ئێوە وتتان "ئێمە دەتوانین و دەبێ ببین بە باشترین ئاشتیپارێزی جیهان".

ئێمە داواتان لێدەكەین یارمەتی بدەن بە چەسپانی ئاشتی بۆ كوردەكان كە دژی سەركوتی زاڵمانەی دەوڵەتی توركیا له باشووری رۆژهەڵاتی توركیا خەبات دەكەن. له وڵاتی ئێمە گەلێك كەس ئاگاداری ئەوە نین كە ئەم كێشەیە بووەتە هۆی كاولبوونی زۆربەی ناوچەكانی هەرێمی كوردنشین لەو وڵاتە. بەداخەوە ئەو چەكوچۆڵە كە وڵاتە یەكگرتووەكان دەیدات بە سوپای توركیا، هیچ یارمەتییەك بە سارێژبوونی ئەم نەهامەتییە نادات.

بڕیارنامەی ١٣٦ی خولی ١٠٤ی کۆنگرێس ئاماژە بەوە دەکات کە" زەرەرو زیانی مرۆڤی ئەم کێشەیە زۆرە و لە ئەنجامیدا زیاتر لە ٢٠ هەزار کەس کوژراون و زیاتر لە ٣میلیون خەڵکی سیڤیل ئاوارە و دەربەدەر بوونە و زیاتر لە ٢٦٥٠ گوندی کوردنشین کاول بووە".

جەنابی سەرۆك، دەکرێت ئەم شەڕە کوتایی پێبێت. گەلی کورد ئاشتی دەوێت و ڕێبەرایەتی (بزووتنەوە) چەکداریەکەی لە ١٥ی دیسامبری١٩٩٥ ئاگربەستێکی یەکلایەنەی ڕاگەیاندووە بۆ ئەوەی ڕێگای دژوار بەڵام پێویستی ئاشتی هەموار بکات. زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی تورکیا و دۆستە ڕاستەقینەکانیشیان لە سەراسەری جیهان خوازیاری ئاشتین، تەنها ڕێبەرایەتی دەوڵەتی تورکیایە کە پیداگری لە سەر شەڕ دەکات.

جەنابی سەرۆك، ئێمە داواتان لێدەکەین دابینکردنی چەکوچۆڵ بۆ تورکیا ڕابوەستێنن تا ئەو کاتە کە دەوڵەتی تورکیا کۆتایی بە هەڵسوکەوتی خراپ لە گەڵ کوردەکان بهێنێت و بەڵێنی ئەوە بە ئیدارەکەی ئێوە بدات کە ئەم خەڵکە نامۆبووە ئاشت دەکاتەوە.

جەنابی سەرۆك، ئێمە داواتان لێدەکەین ئەم هەلە هیوابەخشە بقۆزنەوە، کە دەگونجێت لەگەڵ تێڕوانینی ئێوە بۆ پێکهاتنی جیهانێکی بەدوور لە کێشە گەورەکان.

ئێمە دەمانەوێت لە وڵاتی کوردەکان، کوشتن و بڕین کۆتایی پێبێت و ئاشتی سەقامگیر بێت و ماڤە سیڤیلەکانی کوردەکان بپارێزرێت.

لەگەڵ ڕێزماندا

ئەندامانی کۆنگرێس:

جان ئیدوارد پۆرتێر[1]، ئیستیپان ئیدوارد تۆریس[2]، مایکێل بیلیریکائیس[3]، مۆریك هینچی[4]، فرانك پالۆن[5]، ئیدۆلفۆس تاونس[6]، کارولین مالۆنی[7]، ئانا ئیشۆ[8]، ڕۆبیرت .ئی. ئاندرۆ[9]، ویلیام .ئۆ. لیپینسکی[10]، فرانك .ر. ۆلف[11]، گاری. ل. ئاکیرمەن[12]، چارلز .ئی. شامیر[13]، ئیلیزابێت فۆرس[14]، ڕۆبیرت. گ. توریسیلی[15]

[1] John Edward Porter
[2] Esteban Edward Torres
[3] Michael Bilirakis
[4] Maurice Hinchey
[5] Frank Pallone
[6] Edolphus Towns
[7] Carolyn Maloney
[8] Anna Eshoo
[9] Robert E. Andrews
[10] William O. Lipinski
[11] Frank R. Wolf
[12] Gary L. Ackerman
[13] Charles E. Schumer
[14] Elizabeth Furse
[15] Robert G. Torricelli

## ٢٧ ی ئاداری ١٩٩٦ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

## تورکیا سازوبەرگە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژ بە کوردەکان بەکار دەهێنێت

بەڕێز هامیلتۆن، نوێنەری ئەیالەتی ئیندیانا:

جەنابی سەرۆك، لە ٨ ی ئەیلوولی ١٩٩٥ نامەیەکم نارد بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، کریستۆفر کە تێیدا کۆمەڵێك پرسیارم خستەڕوو دەربارەی شێوەی کەڵکوەرگرتن و کەڵکوەرگرتنی خراپی تورکیا لە سازوبەرگە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان. سەرەتای ئەمساڵیش دەربارەی هەمان مەسەلە نامەیەکم نارد بۆ وەزارەتی دەرەوە و ئەوانیش لە بەرواری ٢٩ ی شوباتی ١٩٩٦ وەڵامی منیان دایەوە. ئێستا دەمەوێت وەڵامی نامەکەی وەزارەتی دەرەوە بە نامەکەی مانگی ئەیلوولی خۆم بخەمەڕوو کە دەربڕی هەڵوێستی ئیدارەی ئەمریکایە بەنیسبەت بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا و پەیوەندیی بە مەسەلەی کەڵکوەرگرتنی تورکیا لە سازوبەرگە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە هەیە.

بەهۆی ئەوەی بە باوەڕی من بیروبۆچوونەکانی ئیدارەی ئەمریکا زانیاری دەدات بە ئەندامانی دیکەی ئەنجوومەن و سودمەندە بۆ فورمولە کردنی شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم مەسەلە گرنگە، لێرە دەقی نامەکەی خۆم و وەڵامەکەی ئیدارەی ئەمریکا دەخەمەڕوو:

وەزارەتی دەرەوە

واشنگتۆن، ٢٩ ی فوریەی ١٩٩٦

بەڕێز "لی هامیلتۆن"[1]، ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

ئەمە وەڵامی نامەکەی ئێوەیە کە ٨ ی ئەیلولی ١٩٩٥ دەربارەی مافی مرۆڤ لە تورکیا ناردوتانە بۆ کریستۆفر، وەزیری دەرەوە. هەروەها کە ئێمە لە وەڵامە ناڕاستەوخۆکەی ١ی تشرینی دووەمی ١٩٩٥دا ئاماژەمان پێکردووە، ئێوە کۆمەڵێك کێشەی جیدیتان لە نامەکەتاندا خستووەتەڕوو. سپاستان دەکەین کە ئەوەندە کاتتان دا بە ئێمە تا ئەم وەڵامە ئامادە بکەین. ئێوە لە نامەکەتاندا ئاماژەتان بەوە کردبوو کە مەسەلەی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە تورکیا، جێگای نیگەرانی جیدی کۆنگرێسە. ئێمە ستایشی نیگەرانی ئێوە و هاوکارانتان دەکەین بەنیسبەت ئەم مەسەلانە. مشتومڕەکان، راپۆرتەکان و راگەیاندننامەکانی کۆنگرێس، رێگایەکی پڕبایەخە بۆ ئەوەی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان نیگەرانی خۆی بەنیسبەت مافی مرۆڤ لە تورکیا نیشان بدات.

هەروەها کە ئێمە پەیرەوی لە ئامانجەکانمان لە تورکیا دەکەین، ئەوەش گرنگە کە دەرك بەو کێشانە بکەین کە تورکیا لەگەڵی روبەڕوویە. پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) رایگەیاندووە کە ئامانجی سەرەکیی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردە لەسەر بەشێك لە خاکی ئێستای تورکیا. لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە نیگەرانین بەنیسبەت شێوازی ئۆپەراسیونی تورکیا لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا.

---

[1] LEE HAMILTON

هەروەها کە ئێمە لە راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوە دەربارەی مافی مرۆڤ و راپۆرتی تایبەت- کە مانگی حوزەیران دەربارەی بارودۆخی باشووری رۆژهەڵات تەسلیم بە کۆنگرێسمان کردووە- باسمان کردووە، ئەم ئوپەراسیونانەی تورکیا بووەتە هۆی کوژرانی خەڵکی سڤیل و چۆڵکردن و سووتاندنی گوندەکان.

ئێوە پرسیارتان کردووە کە ئیدارەی وڵاتە یەکگرتووەکان چی دەکات دەربارەی ئەو زانیاریانە کە لەوانەیە سوپای تورکیا سازوبەرگە سەربازییە بەرگرییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان دژی خەڵکی سڤیل بەکار بهێنێت لە کاتی ئوپەراسیونەکانی دژی PKK . ئێمە لە راپورتی مانگی حوزەیراندا لەژێر ناوی "بانگەشەکانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە لایەن تورکیا و بارودۆخی قوبرس" باسی ئەم مەسەلانەمان لە بنەمادا کردووە. ئەم راپۆرتانە بەتوندی ئێمە زیز دەکات. ئێمە بەردەوام هۆشداریمان داوە بە دەوڵەتی تورکیا کە لە کاتی ئوپەراسیونە سەربازییە رەواکانی، دووری بکات لە هێرشکردنە سەر خەڵکی سڤیل و غەیرە سەربازی. ئێمە روونمان کردووەتەوە کە بەگوێرەی یاسای یارمەتی بیانی و یاسای کونترۆڵی هەناردنە دەرەوەی چەك، ئێمە بەردەوام رەچاوی بارودۆخی مافی مرۆڤ دەکەین بۆ ئەوەی ئایا سازوبەرگی سەربازی بفرۆشین بەو وڵاتە یا نا.

بەلەبەرچاوگرتنی چالاکیەکانی "گروپی مەرگی" تورکیا لە باشووری رۆژهەڵات، هەروەها کە ئێمە لە راپورتی حوزەیرانی رابردوودا ئاماژەمان پێکردووە، ئێمە کۆمەڵێك راپورتمان بەدەست گەیشتووە کە دەوڵەتی تورکیا دەستی هەیە لەم چالاکیە مرۆڤکوژانانەدا. لەم پەیوەندییەدا ژمارەیەك لە تروریستانی حیزبوڵڵای تورکیا ئێستا لەبەردەم دادگادان بەهۆی تیوەگلان لە". کوشتنە گومانناوییەکاندا". بەگوێرەی

راپۆرتی بنیادی متمانەپێکراوی مافی مرۆڤی تورکیا، ئەم جۆرە کوشتنانە لە ساڵی ۱۹۹۵ زۆر کەمی کردووە.

ئێمە بەردەوام بە تورکەکانمان وتووە کە سەر ئەو باوەڕە نین کە تەنها رێگاچارەی سەربازی کۆتایی بە کێشەکانی باشووری رۆژهەلات دەهێنێت و پێداگریمان لە سەریان کردووە کە بەشوێن رێگاچارەی سیاسی و کۆمەڵاتیدا بن کە لە درێژخایەندا سەرکەوتوو دەبێت. ئەم رێگاچارانە، مافی یەکسانی تەواو ـ لەوانە مافی کوولتووری و زمانی ـ بۆ سەرجەم هاوولاتیانی تورکیا ـ لەوانە کوردەکان- لەخۆ دەگرێت. ئێمە دلخۆش بووین بە کردەوە روولەزیاد بووەکانی(تورکیا) بۆ بەخشینی ئەم مافانە بە کوردەکان، بۆ نمونە دادگای پێداچوونەوەی بالای تورکیا لە تشرینی یەکەم بڕیاری دا کە ئەندامانی کوردی پێشوی پارلمانی تورکیا سووچیان نەکردووە کە بە زمانی کوردی سوێندیان خواردووە و شریتی رەنگاورەنگی کوردیان لەبەر کردووە و وتوویانە کە زمانی تورکی بۆ ئەوان زمانێکی بیانییە.

ئەم بڕیارەی دادگای پێداچوونەوە لە بارەی ئەم مەسەلانە ـ کە زۆر هەستیارە لە تورکیا ـ لەوانەیە گلۆپێکی سەوز هەڵبکات بۆ دادگاکانی خوارەوە و یارمەتی بدات بە پێشکەوتنی مافەکانی کوردەکان. بە باوەڕی ئێمە ئەو مەسەلەیە گرنگە کە ئەو کەسانە کە دەربەدەر بوونە، قەرەبوو بکرێنەوە و بتوانن بێ ترس بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان و ئەگەر بارودۆخی ئاسایش رێگە بەگەڕانەوەیان نەدات، ئەوە گرنگە کە گوندنشینان قەرەبوو بکرێنەوە و لە شوێنەکانی دیکە نیشتەجێ بکرێن. ئێمەش، وەك ئێوە، نیگەرانین کە تورکیا نەیتوانیوە پێداویستیەکانی دەربەدەربووان دابین بکات و دەوڵەتی نوێی تورکیا تەشوێق دەکەین کە هەڵبسێت بە دابینکردنی پێداویستەکانیان.

له درێژخایەندا پێویسته که دیالوگ له نێوان دەوڵەتی تورکیا و نوێنەره کوردەکان ئەنجام بدرێت بۆ ئەوەی رێگاچارەیەکی درێژخایەن بۆ کێشەی باشووری رۆژهەڵات بدۆزنەوە. پێویسته ئەوانه که هەڵدەسەن به داکۆکی له کوردەکان، به دڵپاکی و خێرخوازییەوه کار بکەن. لەم پەیوەندییەدا ئێوه پرسیارتان کردووه که ئایا ئەندامانی پێشووی پارلمانی تورکیا سەربه پارتی DED که مافی پارێزراوبوونیان لێسەندراوەتەوه و هەڵهاتوون بۆ ئەورووپا، دەتوانن ببن به نوێنەری کوردەکان. بەداخەوه هەندێ لەم پارلمانتارانه چوونەته ریزی"پارلمانی کوردستان له دەرەوی وڵات" (KPIE) که PKK پێداویستیەکانی دابین دەکات و له کونترولی PKK دایه. کەوابوو ئێمه ناتوانین پشتیوانی لەوه بکەین که تورکیا لەگەڵ KPIEO وتووێژ بکات. هەندێ لایەنی وتووێژی رەوا هەن که دەوڵەتی تورکیا دەتوانێت نیگەرانیەکانی کوردەکانیان لەگەڵدا باس بکات. هەرچەند پارتی دموکراتی گەل(HADEP) که لایەنگری کوردەکانه، نەیتوانیوه ١٠٪ ی سەرجەم دەنگەکانی تورکیا بەدەست بهێنێت بۆ ئەوەی کورسی له ئەنجوومەنی نیشتمانی باڵای تورکیا بەدەست بهێنێت، بەڵام باش توانیویەتی هەڵمەتی هەڵبژاردن بەرێوه ببات و ژمارەیەکی زۆر له دەنگەکانی له باشووری رۆژهەڵات بەدەست هێناوه.

لەمه زیاتر حیزبەکانی دیکه، سیاسەتمەداران، کەسایەتیه ئاکادیمیکەکان، بازرگانان و رۆژنامەنووسانیش توانیان نیگەرانیەکانی کوردەکان له کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنی ئەم دواییه بخەنەڕوو. ئەمانه کۆمەڵێ پێشهاتی ئەرێنین و هەروەها کۆمەڵێك نیشانەی دیکه هەیه که پێداگرتنی ئێمه لەسەر مەسەلەی مافی مرۆڤ لەگەڵ تورکەکان، سەرکەوتوو بووه. هەموارکردنی یاسای بنەڕەتی له هاوینی رابردوو، بەشداری

سیاسی(هاوولاتیانی تورکیا)ی بەشێوەگەلی جۆراوجۆر پەرەپێداوە، لەوانە مافی دەنگدانی کەسانی ژوور ١٨ ساڵ و ئەوانە کە دانیشتووی دەرەوەی تورکیان. هەروەها بزاڤێکی دیکە لە ئارادایە بۆ بەخشینی دەسەلاتی زۆرتر لە دەوڵەتی ناوەندی بە دەسەلاتدارانی مەحەلی. هەروەها لە ٢٧ ی ئوکتوبر، دەوڵەتی تورکیا ـ بە تەشویقی ولاتە یەکگرتووەکان و ئەورووپا ـ ماددەی ٨ ی یاسای دژە تێروری هەموار کرد کە دەوڵەتی تورکیا کەڵکی لێوەردەگرت بۆ سنووردارکردنی ئازادی رادەربڕین. لە ئەنجامی ئەم پێداچوونەوەیەدا زیاتر لە ١٣٠ کەس لە بەندیخانە ئازاد کراون و گەلێ لەوانەی کە چارەنووسیان لە بەندیخانەدا دیار نەبوو، حوکمیان لەسەر دراوە.

کاربەدەستانی ولاتە یەکگرتووەکان درێژە دەدەن بە چاودێریکردنی نزیك بەسەر پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا. چاودێرییەکانی ئێمە لەسەر بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا ئەنجامی هەوڵە بەردەوام و زیادەکانی بالوێزخانەی ولاتە یەکگرتووەکان لە تورکیا و بالوێزخانەی ولاتانی دیکە لە ولاتە یەکگرتووەکانە کە ئاگاداری مەسەلەکەن. کاربەدەستانی ئێمە بەشێوەی رێکوپێك لەگەڵ کاربەدەستانی هەڵبژێردراوی دەوڵەتی تورکیا و پارلمانی تورکیا دیدار دەکەن. ئێمە هەروەها لەگەڵ رەخنەگرانی دەوڵەتی تورکیا ـ لەوانە NGO نێونەتەوەیی و ناوخۆییەکانی تورکیا، کۆمەڵەی مافناسان، پارێزەران و پزشکان و و چالاکانی دیکەی مافی مرۆڤ ـ قسە دەکەین. کاربەدەستانی ولاتە یەکگرتووەکان بەردەوام سەردانی باشووری رۆژهەلات دەکەن و لەوێ لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت و پارتە کاریگەرەکان دیدار دەکەن. ئێمە هەروەها بەردەوام پشتیوانی لە گۆڕینی بارودۆخەکە دەکەین لە رێگای پشتیوانیکردن لەو کەسانە کە پابەندەن بە مافی مرۆڤ و چاکسازی دیموکراتیك، لەوانە

NGO کانی تورکیا. ئەمە هەوڵێکی درێژخایەنە کە پێویستی بە تێوەگلانی بەردەوام هەبە. خاڵی گرنگ کە دەبێ لە پێشەوە بیزانین ئەوەیە کە هێزی راستەقینە بۆ ئاڵوگۆڕی دموکراتیك لە تورکیا دەبێ لە نێو خودی هاووڵاتیانی تورکیاوە هەڵبسێت و ئامانجی ئێمە دەبێ ئەوەبێ کە تا ئەو شوێنە کە پێماندەکرێت، یارمەتیان بدەین.

هیوادارم ئەم زانیاریانە سودمەند بێت. ئەگەر هەست دەکەن لەم بەیوەندییەدا دەتوانم زانیاری زۆرترتان پێبدەم، بەخاترجەمییەوە پەیوەندیم لەگەڵ بگرن.

لەگەڵ رێزمدا

ویندی شێرمان[1]

جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری کۆنگرێس

***

کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، ئەنجوومەنی نوێنەران

واشنگتۆن، ٨ ی ئەیلوولی ١٩٩٥

بەڕێز وارنێر کریستۆفێر، وەزیری دەرەوە

وەزارەتی دەرەوە، واشنگتۆن، دی سی

بەڕێز جەنابی وەزیر

سپاس بۆ وەڵامەکەتان لە ١٥ ی ئاب بە نامەکەی ٢٩ ی حوزەیران ەن دەربارەی شێوەی کەڵکوەرگرتن و خراپ کەڵکوەرگرتنی تورکیا لە سازوبەرگە سەربازییەکانی

[1] WENDY R. SHERMAN

وڵاته یهکگرتووهکان . دهمهوێت درێژه به دهربڕینی بیروڕاکانم بدهم و چهند پرسیارێك له پاڵ دوو هێڵی گشتیدا بخهمهڕوو.

یهکهم: من هێشتا زۆر نیگهرانم بهنیسبهت کهڵکوهرگرتنی تورکیا له سازوبهرگه سهربازییهکانی وڵاته یهکگرتووهکان له باشووری رۆژههڵاتی تورکیا و ئهو راپورتانه که دهڵێن تورکیا کهڵکی خراپ لهم چهکانه وهردهگرێت و گوندهکانی پێ وێران دهکات و بێ فهرق و جیاوازی تهقه له خهڵکی سڤیل دهکات. ئهم پێشێلکاریانه دهتوانێت ببێتههۆی پشتیوانی نهکردنی کۆنگرێس له تورکیا. ئێوه له وهڵامی نامهکهی مندا ئاماژهتان بهوه کردووه که پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ، لهپاڵ مافی خۆپاراستن، رێگا بهوه دهدات که تورکیا سازوبهرگه سهربازییه بهرگرییهکانی وڵاته یهکگرتووهکان بهکار بهێنێت، بهڵام وڵاته یهکگرتووهکان لهو راپۆرتانه دهترسێت که به گوێرهی ئهوانه ژمارهیهکی زۆر له خهڵکی سڤیل له سهروبهندی ئۆپهراسیونهکانی دهوڵهتی تورکیا دژ به PKK کوژراون.

لهم پهیوهندییهدا چهند پرسیارێکم ههیه:

ـ ئێوه راست و دروست دهتانهوێت چی لهم راپۆرتانه بکهن؟

ـ ئایا سیاسهتی وڵاته یهکگرتووهکان ئهوهیه که بۆ نموونه به تورکیا بڵێت" کاتێ که ئێمه راپۆرتی کاولکردنی گوندهکان یا کوژرانی خهڵکی سڤیل دهبینین، پێمان باش نییه و ناتوانین ئهم پێشێلکارییانه به کهڵکوهرگرتن له سازوبهرگه سهربازییهکانی وڵاته یهکگرتووهکان تهحهمول بکهین؟

ـ ئیستراتژی وڵاته یهکگرتووهکان چییه بۆ مسوگهرکردنی ئهوهی ئهم کردهوانه کۆتایی پێبێت؟

هەروەها کۆمەڵێك پرسیاری دیکەم هەیە دەربارەی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەرامبەر تورکیا لە پەیوەندی لەگەڵ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا.

ئێستا هاوسۆزی و هاوخەمییەکی زۆر لە کۆنگرێس هەیە بەنیسبەت بارودۆخی دژواری کوردەکان لە تورکیا. من شك نابەم هیچ ئەندامێکی کۆنگرێس لە جیابوونەوەی کوردەکان یان هەڵوەشانەوەی تورکیا پشتیوانی بکات، بەڵکوو ئەندامانی کۆنگرێس بەتوندی پشتیوانی لە مافی یەکسان، لەوانە مافە کولتووری و زمانیەکان بۆ سەرجەم هاووڵاتیانی تورکیا، لەوانە کوردەکان دەکەن. ئەندامانی کۆنگرێس نیگەرانن لە پشتبەستنی بەردەوامی دەوڵەتی تورکیا بە هێزی سەربازی بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کوردەکان لە باشووری ڕۆژهەڵات و دەیانەوێت وڵاتە یەکگرتووەکان دەوری چالاکانەتر بگێڕێت بۆ هاندانی وتووێژ لە نێوان گرووپێکی زۆر لە هاووڵاتیانی تورکیا بۆ کۆتاییپێهێنان بە توندوتیژی. من لەوە نیگەرانم کە ئەگەر ئەم بارودۆخەی ئێستا بەردەوام بێت، سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنیسبەت تورکیا تووشی کێشە بێت.

ئەم هاوینە هەمووارکردنێك لە یاسای یارمەتی بیانی لە ئەنجوومەنی نوێنەران پەسەند کرا کە یارمەتیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیای سنووردار دەکرد، بەهۆی ئەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران لەوە نیگەران بوو کە ئەگەر مەسەلەی مافی مرۆڤ بەشێوەیەکی گونجاو چارەسەر نەکرێت، کۆمەڵێك کێشەی دیکە سەرهەڵدەدات. من دەرك بەوە دەکەم کە سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان ئەوەیە کە پشتیوانی لە یەکپارچەیی خاکی تورکیا بکات و پشتیوانی لە چاکسازی دیموکراتیك لە تورکیا

بکات بۆ باشتربوونی بارودۆخی مافی مرۆڤ و وشککردنی سەرچاوەی پشتیوانی لە PKK . باشە، بەڵام لەم پەیوەندییەدا چەند ئەم پرسیارێکم هەیە:

ـ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیەوێت چی بکات بۆ بەرەوپێشبردنی هەوڵەکان لە تورکیا بۆ هەموار کردنی ماددەی ٨ ی یاسای دژە ترور؟

ـ سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان و بارودۆخی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا چی بەسەر دێت ئەگەر هاتوو هەوڵەکان بۆ هەموار کردنی مادەی ٨ ی یاسای دژە ترور سەرنەکەوت یا دەستی لێهەڵگیرا.

ـ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیەوێت چی بکات بۆ پێشکەوتنی هەوڵەکان بۆ دەستەبەربوونی مافی یەکسان بۆ کوردەکان لە تورکیا؟

- ئایا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە مافە سیاسی، کولتووری و زمانیە رەواکانی هاووڵاتیانی کوردی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دەکات؟ کاردانەوەی ئێوە چیە لەبەرامبەر لێدوانەکانی ئەم دواییانەی کاربەدەستانی پایەبەرزی تورکیا کە وتوویانە پەرەپێدان بەم مافانە، ئامانجی سەرەکی ئەوان نییە؟

ـ لە دیالۆگەکەی ئێمە لەسەر مافی مرۆڤ، ئایا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گوشار دەخاتە سەر دەوڵەتی تورکیا و فەرماندەیی گشتی سوپای تورکیا کە دەست هەڵبگرن لە تاکتیکەکانیان دژ بە خەڵکی سڤیلی کورد وەك چۆڵکردنی زۆرەملێی و سووتاندنی گوندە کوردنشینەکان؟

ـ دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان دەیەوێت چی بکات لەگەڵ ئەو بانگەشانە کە دەوڵەتی تورکیا پشتیوانی لە چالاکیەکانی "گروپە مرۆڤکوژەکان" دەکات(یا چالاکیەکانیان

تهحهمول دهكات) كه تا ئێستا سهدان چالاكی كوردیان له باشووری رۆژههڵاتی توركیا كوشتووه.

ـ سیاسهتی وڵاته یهكگرتووهكان چییه بهنیسبهت دیدار و ههڵسوكهوت لهگهڵ پارلمانتاره كوردهكانی باشووری رۆژههڵاتی توركیا، بێ لهبهرچاوگرتنی ئهوه كه ئایا ئێستا دهتوانن كورسی له ئهنجوومهنی نیشتمانی بهدهست بهێنن یا نا؟

ـ ئایا وڵاته یهكگرتووهكانی ئهمریكا پشتیوانی دهكات له وتووێژهكانی نێوان دهوڵهتی توركیا و پارلمانتاره كوردهكان كه ئێستا له دهرهوهی وڵاتن. به بۆچوونی ئێوه دهوڵهتی توركیا دهبێ لهگهڵ كێ وتووێژ بكات.

ـ وڵاته یهكگرتووهكانی ئهمریكا دهیهوێت چ جۆره میكانیزمێكی سیاسی پێشبخات له نێوان دهوڵهتی توركیا و ناسیونالیسته كوردهكان بۆ ئهوهی توركیا تهشویق بكات تهنها پشت به ڕێگاچارهی سهربازی نهبهستێت.

چاوهڕوانی وهڵامی ئێوهم.

**لهگهڵ ئهوپهڕی ڕێزمدا**

**لی هـ هامیلتۆن**

**ئهندامی پایهبهرزی ئهنجوومهنی نوێنهران سهربه پارتی دیموكرات**

## ١٠ ی ئەیلوولی ١٩٩٦ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

## تورکیا: دەوڵەتی نوێ، سەرکووتی دێرین

بەڕێز کریستۆڤێر ئیسمیت، نوێنەری ئەیالەتی نیوجێرسی:

جەنابی سەرۆك، لە ماوەی ئەم چەند هەفتەیەی دواییەدا، دەوڵەتی نوێی تورکیا بەهەمان شێوەی دەوڵەتانی پێشووی خۆی، ئەرکە نێونەتەوەییەکانی خۆی بەنیسبەت مافی مرۆڤ و بەڵێنەکانی پێشووی خۆی بۆ جێبەجێکردنی ڕێوشوێنەکانی یەکێتی ئەوروپا، پشتگوێ دەخات.

لە ٢٦ ی ئاب، ٤١ ئەندامی "حیزبی دیموکراتی گەل"(HADEP) لەوانە ڕێبەرایەتی ئەم حیزبە، تۆمەتی پەیوەندی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) یان خراوەتە پاڵ. لە هەمان ڕۆژدا، دوو سەرنووسەری ڕۆژنامەی تورکیش *دەیلی* نیوز تۆمەتی" زیانگەیاندن بە پرستیژی هێزە چەکدارەکان"یان خراوەتە پاڵ بەهۆی بڵاوکردنەوەی"هەڵسەنگاندنێکی بیروڕای گشتی". لە ٣ ی ئەیلوول، ئاکین بیردال[1]، سەرۆکی کۆمەڵەی مافی مرۆڤی تورکیا دەستگیر کرا بەهۆی بەشداریکردن لە لیژنەیەك کە وتووێژی کردووە بۆ ئازادکردنی سەربازانی تورکیا کە PKK دەستگیری کردوون.

جەنابی سەرۆك، دەوڵەتی تورکیا هەنگاوەکانی چڕ کردووەتەوە بۆ ناڕەوا کردن و نایاسایی کردنی HADEP کە تەنها حیزبی سیاسی کوردەکانی تورکیایە. زیاتر لە

[1] Akin Birdal

١/٢ میلیون دەنگدەری کورد له هەڵبژاردنی کۆتایی کانوونی یەکەم پشتیوانیان له HADEP کردووه، و ڕۆژ به ڕۆژ زیاتر وەك ناوبژیوان له شەڕی خوێناوی نێوان هێزەکانی دەوڵەت و گریلا کوردەکان سەیر دەکرێت. لەگەڵ ئەمەشدا هەر وەك نموونەکانی پێشووی خۆی، حیزبی دیموکراتی گەل(HADEP) که ١٣ کەس له پارلمانتارەکانی به تاوانی ڕادەربڕین خراونەته بەندیخانه یا دوور خراونەتەوه، ئێستا بووه به ئامانجی هێرش دەوڵەت.

له مانگی حوزەیران دابەدوای کۆبوونەوەیەکی ئەم حیزبه که تێیدا ئاڵای تورکیا دڕاندراوه، ٢٨ کەس له ئەندامانی ڕێبەرایەتی HADEP دەستگیر کراون و لەو کاتەوه له بەندیخانەدان بێ ئەوەی سووچەکەیان ڕوون بکرێتەوه و سەرەڕای ئەوەی که ڕایانگەیاندووه هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ ڕووداوی دڕیانی ئاڵای تورکیا نەبووه. دوابەدوای ئەم ڕووداوه، ٣ کەس له ئەندامانی HADEP کوژراون و نووسینگەکانی حیزب له "ئیزمیر" تەقێندراونەوه. دو کەس لەوانه که ئاڵاکەیان دڕاندووه، تۆمەتی خیانەتیان خراوەته پاڵ و لەوانەیه لەگەڵ سزای مەرگ بەرەوڕوو ببنەوه.

جەنابی سەرۆك، هیستریای[٢] ناسیونالیستی تورك دەربارەی ڕووداوی ئاڵاکه، هەروەها ئاکام و ئەنجامی نەرێنی بۆ پارلمانتارێکی پێشووی DEP به ناوی "سیری ساکیك"[٣] به دواوه بووه که وتوویەتی: "گەلێك که دەیەوێت ڕێزی تایبەت له ئاڵاکەی بگیردرێت، دەبێ خۆیشی ڕێز له ئاڵای گەلانی دیکه بگرێت". دادنەستێنی تورکیا

---

[٢] hysteria(هیستریا جۆره نەخۆشییەکی دەروونییه- وەرگێڕ)

[٣] لێره وەك Sirri Sakik ناوبراوه بەڵام سەلیم ساداك ڕاسته (وەرگێڕ).

ئەم لێدوانەی بە"هاندانی جیاییخوازی" لە قەڵەم داوە و بەگوێرەی ماددەی ٨ ی یاسای دژە تیرور تۆمەتباری کردووە.

جەنابی سەرۆك، لەوانەیە ئێوە بڵێن کە ماددەی ٨ ، پاییزی رابردوودا هەموار کرا بۆ ئەوەی نیگەرانیەکانی ئەورووپا دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا کەم بکرێتەوە کە پێشمەرجی چوونی تورکیایە بۆ ناو یەکێتی ئەورووپا. لەو کاتەوە چەند کەس بەگوێرەی مادەی ٨ ی نوێ و هەموارکراو، خراونەتە بەندیخانە و سەدان کەسی دیکە لەگەڵ کۆمەڵێك کەندوکۆسپی هاوشێوەی دیکە رووبەڕوو بوونەتەوە.

جەنابی سەرۆك، مەسەلەی رۆژنامەی *تورکیش دەیلی نیوز* نیشان دەدات کە چۆن رۆژنامەنووسە بەناوبانگەکانیش لەگەڵ سەرکوتی بەردەوام رووبەڕوون. "ئیلنور جەویك[٤]" کە بەشداری لە کۆبوونەوەیەکی کومسیونی هلسینکیدا کردووە دەربارەی هەڵبژاردنەکانی تورکیا، و "هایری بیرلەر[٥]" حوکمی ٦ ساڵ بەندیخانەیان لەسەر دراوە بەهۆی بڵاوکردنەوەی ئەنجامەکانی هەڵسەنگاندنی بیروڕای گشتی دەربارەی ئاڵتێرناتیڤەکانی دەوڵەت دوابەدوای هەڵبژاردنەکانی ساڵی رابردوو.

جەنابی سەرۆك، مەسەلەی دیکە، کێشەی سەرۆکی کۆمەڵەی مافی مرۆڤ (HRA) ، بەڕێز"ئاکین بیردال"ە کە بەشداری لە کۆبوونەوەکانی کومسیونی هلسینکی لە ١٩٩٥ کردووە. ئەم کۆمەڵەیە و سەرۆکەکەی، "ئاکین بیردال" وەك سەرچاوەیەکی بایەخداری زانیاری دەربارەی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا، خەڵاتی جۆراوجۆریان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەورووپا وەرگرتووە. هەر لە

---

Ilnur Cevik [٤]
Hayri Birler [٥]

سەرەتای دامەزراندنەوە، چالاکانی HRA لەگەڵ سەرکووتی توندی دەوڵەت ڕووبەڕوو بوونەتەوە، ١٥ لقی HRA لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا داخراون، چالاکان و ڕێبەرەکانی بە دەستی گروپە مرۆڤکوژەکان(کە حکوومەت پشتیوانیان لێدەکات) کوژراون و سەدان ئەندامی دەستگیر کراون و خراونەتە بەندیخانە. بەهەرحاڵ پاساوی نامەعقوڵی دەوڵەت بۆ گرتنی ئەم کەسانە، وای لە کاربەدەستانی حکوومەتی تورکیا کردووە کە زیاتر لە حەد ساتساتی و وەسواسی بن.

"ئاکین بیرداڵ" بەشداری کردبوو لەو لیژنەیە کە هەوڵی دەدا بۆ ئازادکردنی ئەو سەربازە تورکانە کە PKK بە دیلی گرتبوون. ئەم لیژنەیە ـ کە هەندێ لە پارلمانتارانی سەربە حیزبی دەسەڵاتداری"ریفاه" سەرۆکایەتی دەکرد و کۆمەڵێك چالاکی ناسراوی مافی مرۆڤی لەخۆ دەگرت ـ بە ماوەی چەند هەفتە لە چاپەمەنیەکاندا و ناوخۆی حکوومەت باسی لێدەکرا. ئەم کارەی لیژنە(هەرچەند سەرکەوتوو نەبوو) ئەو بیروبۆچوونەی بەهێزتر کرد کە لەوانەیە سوپای، تورکیا بە هەڵسوکەوتی تەنها و تەنها سەربازی خۆیدا بچێتەوە لە بەرامبەر راپەڕینی کورد.

ئەم بیروبۆچوونە لە نێو گروپە دەسەڵاتدارەکان شڵەژاویی زۆری دروست کرد و سەرەنجام فەرمانی دەستگیر کردنی ئەندامانی لیژنەیان دەر کرد. هەرچەند دەوڵەت لە ٥ ی ئەیلوول ئەندامانی لیژنەکەی ئازاد کرد، بەڵام هێشتا دیار نییە ئایا بەگوێرەی مادەی ١٦٩ ی یاسای سزا، تاوانی یارمەتیدان بە ڕێکخراوێکی نایاساییان دەخرێتە پاڵ کە سزاکەی ٥ ساڵ بەندیخانەیە.

جەنابی سەرۆك، ئەم ڕووداوانەی دواییە، رەوتی سەرکووتی ڕۆژانەی تورکیا نیشان دەدات. هیچکام لەو کەسانە کە لەم ڕووداوانەدا تۆمەتبار کراون، کردەوەی

توندوتیژیان ئەنجام نەداوە، بەڵکوو تەنها تاوانیان ئەوەیە کە بێ دەنگ نەبوونە لە بەرامبەر توندوتیژی دەوڵەتی و سیاسەتی حکومەتی تورکیا کە بووەتە هۆی بەرەوامبوونی شەڕێکی خوێناوی ناوخۆیی. ئەگەر نموونەی دادگایی کردنی پارلمانتارانی پێشوو و کەسانی دیکە دووپات بێتەوە، پشتیوانی لە PKK زیاد دەبێت.

جەنابی سەرۆک، هاوپەیمانی گرنگی ئێمە واتا تورکیا لەگەڵ قەیرانێکی جیدی چەند رەهەندی روبەڕوویە. ئەگەر ئێمە دەمانەوێت یارمەتی تورکیا بدەین کە ئەم قەیرانە چارەسەر بکات، دەبێ شێلگیربین لەسەر پشتیوانیکردن لە رێگاچارەی سیاسی بۆ کێشەکە کە تا ئێستا لە ئەنجامیدا زیاتر لە ٢١ هەزار کەس کوژراون و زیاتر لە ٣ میلیون کەس لە ناوخۆی تورکیا ئاوارە بوونە. رووداوەکانی ئەم دواییانەی باکووری عێراق، سەقامگیری ناوچەی خستووەتە ناو مەترسی کە بەهۆی راپەڕینی کورد لە تورکیا ئاڵۆزتر بووە. روونە کە رێبەرانی تورکیا هەر کاتێ پێویستیان بە هاوکاری دەوڵەتانی رۆژئاوا بێت، تۆزێ پابەند دەبن بە ئەرکەکانی خۆیان بە نیسبەت مافی مرۆڤ، و تا کاتێك ئەم سیاسەتە درێژە پێدەدەن کە دەوڵەتانی رۆژئاوا چاردێری بکەن بەسەر پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ بۆ ئەوەی ئامانجە ئابووری و ئاسایشیەکانی خۆیان بەرەو پێش بەرن. هاوپەیمانەکانی تورکیا دەبێ هەموو هەوڵێك بدەن بۆ پشتیوانیکردن لە قوربانیانی ئەم جۆرە دیموکراسیە سەیروسەمەرەیەی تورکیا.

جەنابی سەرۆك، داوا لە هاوکارانم دەکەم دژی کەندوکۆسپەکانی سەر ئازادی رادەربڕین لە تورکیا قسە بکەن و جارێکی دیکە داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکەم

سەرجەم ئەو کەسانە ئازاد بکات کە بەهۆی دەربڕینی ناتوندوتیژانەی بیروڕا خراونەتە بەندیخانە، لەوانە ئەندامانی HADEP و پارلمانتارانی پێشووی DEP .

## ٢٤ ی ئەیلوولی ١٩٩٦ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## حوكمی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا دژ بە توركیا بۆ سووتاندنی گوندە كوردنشینەكان

بەڕێز كریستۆڤێر ئیسمیت:

جەنابی سەرۆك، لە ١٦ ی ئەیلوول دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا بۆ یەكەم جار حوكمی دەركرد كە دەبێ دەوڵەتی توركیا ئەو گوندنشینە كوردانە قەرەبوو بكاتەوە كە خانووەكانیان بەدەستی هێزەكانی ئاسایشەوە رووخێنراون و رایگەیاندووە كە سووتاندنی خانووەكان، پێشێلكردنی كنوانسیونەكانی مافی مرۆڤی ئەورووپایە. دادگا هەروەها بەو ئەنجامە گەیشتووە كە دەوڵەتی توركیا دەستێوەردانی كردووە لە مافی داوای پێداچوونەوی هاووڵاتیانی توركیا لە كومسیونی مافی مرۆڤی ئەورووپا.

جەنابی سەرۆك، ئێستا زیاتر لە ١٥٠ فایل كە ٤٠٠ كەس دەگرێتەوە، تەسلیم بە كومسیونی ئەورووپا كراوە. ئەم فایلانە پەیوەندیان بە كاولكرانی گوندە كوردنشینەكان، كوشتنی نایاسایی، بێ سەروشوێن كردن، دەستدرێژی و ئەشكەنجەوە هەیە. پێشتر ٥٦ فایلی وەها لە لایەن كومسیونی ئەورووپاوە وەرگیراوە و هەندێكیان كەوتوونەتە نێو رەوتی كاری دادگای ئەورووپا.

جەنابی سەرۆك، رۆژبەرۆژ زیاتربوونی ئەو فایلانە كە دژی توركیا تۆمار دەكرێن و لە لایەن دادگای ئەورووپاوە وەردەگیرێن و هەروەها ناوەرۆكی هەركام لەم فایلانە، هیچ گومان لەوەدا ناهێڵێتەوە كە دەوڵەتی توركیا نەتەنها هەڵمەتی توندوتیژی دژ بە

هاووڵاتیانی خۆی ئەنجام دەدات، بەڵکوو هەوڵیش دەدات پێشێلکارییەکانی خۆی بە ترساندن و تۆقاندن و پڕوپاگەندا بشارێتەوە. سەرەتای ئەمساڵ، ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤی هلسینکی ڕاپورتێکی ئاشکرا کرد کە تێیدا ئاماژە بە هەوڵەکانی دەوڵەتی تورکیا کرابوو بۆ پێشگرتن لە خەڵك بۆ ئەوەی بە شوێن فایلەکانیاندا بچن لە کومیسیون و دادگای ئەوروپا. ئەم ڕاپورتە گەلێ ڕووداوی جۆراجۆری ئاشکرا کرد دەربارەی ئەوەی دەوڵەت دەستدرێژی دەکاتە سەر داواکاران و ئەندامانی بنەماڵە و پارێزەرەکانیان و ئەشکەنجەیان دەدات و دەیانکوژێت بۆ ئەوەی نەهێڵێت بەشوێن فایلەکانیاندا بچن.

جەنابی سەرۆك، کاربەدەستانی تورکیا دەسەڵاتی دادگای ئەورووپا و مافی هاووڵاتیانی تورکیایان(بۆ داوای پێداچوونەوە لەم دادگایە دەربارەی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ) بەفەرمی قبول کردووە، بەڵام دوابەدوای شەپولی یەکەمی حوکمدان دژ بە تورکیا، کاربەدەستانی حکومەت بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە ڕەوتی دادگا هەڵە بووە و ڕەخنەیان لە دادگاکە گرتووە کە حوکمەکانی حوکمگەلی سیاسین. مانگی تەموزی ڕابردوو، لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا(OSCE) لە ئیستوکهولم، ئەندامانی لیژنەی تورکیا ڕازی بوون بەوە کە لیژنەیەکی ئەم ئەنجوومەنە بانگهێشت بکەن بۆ تورکیا. یەك هەفتە پاش ئەوە، نوێنەری تورکیا لە OSCE لە ڤییەننا ڕایگەیاند کە دەوڵەتی تورکیا بۆ مەسەلەی بانگهێشتێکی وەها هاوکاری ناکات. تورکیا نەتەنها بانگهێشتکردنی OSCEی جارێکی دیکە پشگوێ خست بەڵکوو هەوڵەکانی کومیتەی نێونەتەوەیی خاچی

سوور(ICRC) ی دیسان رەت کردەوە بۆ باسکردنی مەسەلەی چالاکی ئەم رێکخراوەیە لەو ناوچانەی تورکیا کە شەڕ و ئاژاوەی تێدایە.

جەنابی سەرۆك، ئەم جۆرە حوکمانەی دادگای ئەورووپا تەنها یەك لە هەزارانە. لەمێژە کاربەدەستانی تورکیا، بوونی راستەقینەی کورد بە فەرمی ناناسن، و هاووڵاتیانی تورکیا بەهای ئەم زیانە ئابوورییە و سیاسەتە خوێناویەی تورکیا دەدەن. ئابووری و پێشکەوتنی سیاسی بەهۆی قەیرانی باشووری رۆژهەڵات و رەهەندە مرۆڤیەکانی راوەستاوە: ٢١ هەزار کەس گیانی خۆیان لە دەستداوە، ٣ هەزار گوند کاول کراون و نزیکەی ٣ میلیون کەس بە دەستی سەربازانی تورکیا لە زێدی خۆیان لە ناوچە کوردنشینەکان ئاوارە بوونە.

سەرەڕای ئەو شتانەی کە کاربەدەستان و داردەستەکانیان لە میدیاکاندا بانگەشەی دەکەن، کەندوکۆسپەکانی سەر ئازادی رادەربڕین و میدیاکان لە تورکیا هەر بەردەوامە. دەوڵەتی تورکیا دەبێ لە هەموو دەرفەتێك کەڵك وەربگرێت بۆ ئەنجامدانی چاکسازی راستەقینە. ئەگەر ئێمە دەمانەوێت پەیوەندییەکانمان لەگەڵ تورکیای هاوپەیمانمان لە ناتۆ بە شێوەیەکی درێژخایەن و قووڵ پێشبخەین، سیاسەتمەدارانی ئێمە نابێ درێژە بەو سیاسەتە بدەن کە مافی مرۆڤ بکەن بە قوربانی بەرژەوەندییە ئابووری و ئیستراتژیکەکان.

## مافی چارەی خۆنووسین بۆ کورد
## ١ی گوڵانی ١٩٩٧- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز فیلنێر[1]، نوێنەری ئەیالەتی کالیفۆرنیا:
جەنابی سەرۆك ، دەمەوێت سەرنجی هاوکارانم بەرەولای بارودۆخی دژواری کوردەکان ڕابکێشم.
کورد گەلێکی کۆن و کەونارە کە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لە سەرزەمینێك بە ناوی کوردستان دەژی و گەلێکی سەربەرزە کە نفوسی نزیکەی ٣٠ میلیۆن کەسە و ئەمڕۆ گەورەترین نەتەوەیە لە جیهاندا کە لە مافی چارەی خۆنووسین بێبەشە.
کوردەکان هەزاران ساڵە لە سەرزەمینی ئیستای خۆیان نیشتەجێن .پادشا کوردە "گوتییەکان" پتر لە ٤هەزار ساڵ لەمەوپیش بە سەر ئێران و میزۆپۆتامیادا فەرمانڕەواییان کردووە. "شۆڕشی نئۆلۆتیك" ٧هەزار ساڵ پیش لە زایینی مەسیح سەرەتا لە کوردستان رووی داوە واتا ٣٥٠٠ساڵ پێش لەوەی "شۆڕشی نئۆلۆتیك"[2] لە ئەورووپا روو بدات.

---

[1] Mr. FILNER

[2] نئولۆتیك (چاخی بەردینی نوێ) بەو چاخە دەڵێن کە مرۆڤ دەستی بە کشتوکاڵ و خۆماڵی کردنی هەندێ لە گیانلەبەران و پیکهێنانی گوند کرد و توانی بەسەر دەوروبەری خۆیدا زاڵ بێت. (وەرگێڕ)

هەندێ لە سەرەتاییترین شارو گوند و ئەو شوێنانە که مرۆڤ لە مێژوودا تییدا نیشتەجێ بووە لە کوردستان دۆزراونەتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا کورد یەکێ لە گەورەترین نەتەوەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستە کە لە دەسەلاتداری بە سەر هەموو خاکەکەی خۆی بێبەشە. کوردستان کۆلۆنییەکی(موستەعمەرە) نێونەتەوەییە کە دەوڵەتانی تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا بەسەریدا دەسەلاتداری دەکەن.

گەلی کورد بەدەستی ئەم چوار رژێمە دەچەوسێنرێتەوە. نیوەی خاکی کوردستان و دوو لە سێی دانیشتوانی کوردستان لە کوردستانی بن دەستی تورکیان. ئەم داگیرکارییە لە ساڵی ١٩٢٣ لە لایەن پەیماننامەی "لۆزان"ەوە رەوایەتی پێبەخشرا کەحاشای لەو بەڵێنە کرد کە پەیماننامەی "سێڤر" لە سەرەتای ١٩٢٠بە کورد و ئەرمەنییەکانی دابوو. پەیماننامەی"سێڤر" بڕیاری دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆیی کوردی لە سەرزەمینی کوردستان دوابەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی دابوو. پەیماننامەی "لۆزان" رەوایەتی بەخشی بە کۆمەلکوژی ئەرمەنییەکان بە دەستی تورکیا (کە پێشتر لەوە روییدابوو) و رێگای بۆ هەڵمەتی هەنگاو بە هەنگاوی کۆمەلکوژی کوردەکان لە ساڵێنی دواتر خۆش کرد.

دەوڵەتە یەك لە دوای یەکەکەکانی تورکیا بەرپرسیاری زەنجیرەی دوورو درێژی پاکتاوی رەگەزین. مێژوونوس "جەیمز تاشجیان[3]" هەڵیسەنگاندووە کە پتر لە دوو میلیون و سەد و بیست هەزار یونانی، نەستوری، مارونی، سەریانی، بولگاری ، ئیزەدی، جاکۆبیت و ئەرمەنی لە سەد ساڵی نێوان ١٨٢٢ و ١٩٢٢ بە دەستی تورکەکان بە کۆمەڵ کوژراون. "جەیمز تاشجیان" جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم ئامارە

[3] James Tashjian

ئەو ٥٠٠هەزار کوردە لە خۆ ناگرێت کەلە هەمان فەترەدا کوژراون، دوور خراونەتەوە یا دەربەدەر کراون. لە نێوان ١٩٢٥ و ١٩٣٨یەك میلیۆن کوردی دیکە قڕ کران ، ئەمە لە کاتیکدایە کە سەرجەم دانیشتووانی ئەرمەنی ژێر دەسەڵاتی تورکەکان واتا پتر لە یەك میلیۆن و ١٢٠ هەزار کەس پێشتر قەڵاچۆ کرابوون.

ئەمڕۆش کۆماندۆ تایبەتەکانی تورکیا لە راستیدا بۆ بڕینی سەری گریلا کوردەکان و کەسانی دیکە خەڵات کۆ دەکەنەوە ، واتا هەر ئەو کارە کە بە سەر قوربانییە ئەرمەنییەکانیاندا هێنا، هیچ گومان لەوەدا نییە کە دەیانەوێت هەمان ئەو چارەنووسە کە بە سەر ئەرمەنییەکانیاندا هێنا بە سەر کورد و ئامانجە نەتەوەیەکانیدا بهێنن.

"تیمی کردەوە تایبەتەکانی تورکیا " روومەتی خۆیان بە رەنگی سەوز و سپی بۆیاخ دەکەن. پیداویستییەکانی ئەم تیمە تایبەتە و ٨٠٪ی پێداویستییەکانی سوپای تورکیا لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا( زۆربەی بە مەسرەفی خەڵکی باجدەرەی ئەمریکا ) دابین دەکرێت.

ئەمڕۆ تەنانەت ئەندامە کوردەکانی پارلّمانی تورکیا لە بەندیخانەدان کە نموونەی سەرەکییان "لەیلا زانا"یە کە وەرگری خەڵاتی ئازادی ساخارۆڤە. ئاندرێ ساخارۆڤ[4] لە ساڵی ١٩٨٩داکۆکی لە کوردەکان کرد و رایگەیاند :

"خەباتی تراژدیکی گەلی کورد کە نەوەندەی خایاندووە، لە پرەنسیپی مافی چارەی خۆنورسینی گەلان سەرچاوە دەگریت، کەوابوو خەباتێکی رەوایە".

---

[4] Andrei Sakharov

ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، ڕێکخراوی چاودێری هلیسینکی، ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی و گەلێ گروپی مافی مرۆڤی دیکە لەم ساڵانەی دواییدا سەرنجی زۆریان داوە بە پێشێلکردنی مافی کوردەکان لە لایەن تورکیاوە. ئەم ڕێکخراوانە ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ساڵی ١٩٨٤ـەوە پتر لە ٢٠ هەزار کەس کوژراون، پتر لە ٣ هەزار گوند کاول کراون و دانیشتووانی کوردی تورکیا لەگەڵ ئەشکەنجە، کوشتن و برین، دەربەدەر کردن و گرتن و زیندانی کردن ڕووبەڕوو بوونەتەوە.

سەرکوتی کوردەکان بە دەستی ڕژێمی سەدام حوسەین لە عێراق شتێکە کە بیروڕای گشتی زۆرتر ئاگادارییەتی. پتر لە ٢٠٠ هەزار کورد دوابەدوای شەڕی ئێران و عێراق کوژران و لە سی ساڵی ڕابردوودا پتر لە ٤ هەزار گوندی کوردنشین بە دەستی هێزەکانی عێراق کاول کراون. سێ تەن بەڵگەنامە و بەڵگەی دیکە دەربارەی شالاوی "ئەنفال" دوابەدوای شەڕی ئێران و عێراق لە دەستی وڵاتە یەکگرتووەکاندایە. من داوا لە وەزارەتی دەرەوە دەکەم ئەم بەڵگەنامانە ئازاد بکات بۆ ئەوەی لایەنە پەیوەندیدارەکان توێژینەوەی گشتی لە سەر بکەن. بە باوەڕی من ئەم بەڵگەنامانە ئەو تاوانانە پشتڕاست دەکەنەوە کە ڕژێمی عێراق دژی مرۆڤایەتی لە کوردستان ئەنجامی داوە.

باش دەبێت ئەگەر ئێمە مەسەلەی یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بە دەوڵەتانی دیکە بە ڕیزگرتن لە مافی مرۆڤ ببەستینەوە و دژی ئەیار کردنی ئەو دەوڵەتانە بە پێداویستی سەربازی ڕابوەستین کە ئەم پێداویستیانە بۆ سەرکوتی خەڵکەیان بەکار دێنن. وڵاتە یەکگرتووەکان قەد نابێت ڕێگا بەوە بدات جارێکی دیکە چەکی

کیمیایی دژی کوردەکان یا هەرکەسێکی دیکە بەکار ببردرێت، هەروەها کە لە ئاداری ۱۹۸۸ شاری کەوناری کوردنشینی هەڵەبجە بەم چەکانە کیمیاباران کرا و پتر لە ٥ هەزار خەلکی سڤیلی کورد کە زۆربەیان ژن و مندال بون، کوژران.

جەنابی سەرۆك، ئیستا کاتی ئەوەیە سیاسەتی لەمێژینەی خۆمان بگۆڕین و بوونی کوردستان و ماف و ئازادی دانیشتووانەکەی بە فەرمی قبووڵ بکەین کە هەموو مرۆڤێك بێ ناوێزە دەبێ هەیبێت. ئێمە دەبێت لە دەستڕۆیشتوویی خۆمان کەلکوەربگرین بۆ ئەوەی یارمەتی بدەین بەچارەسەربوونی کێشەی ناوخۆیی کوردەکان و پشتیوانی لە یەکگرتوویان بکەین بۆ ئەوەی کوردەکان بگەن بە مافی چارەی خۆنووسین. ئێمە دەبێ کۆتایی بەوە بێنین کە لە روانگەی قازانج و بەرژەوەندی کومپانیا نەوتییەکان و خزمەتکردن بە مانۆڕی زلهیزەکان سەیری نەتەوەکان بکەین. ئێمە دەبێ هەناردنە دەرەوەی چەکە کیمیاییەکان قەدەخە بکەین.هەم عێراق و هەم تورکیا چەکی کۆمەلکوژیان دژی کوردەکان بە کار هێناوە کە ولاتە یەکگرتووەکان داویەتی پێیان. ئێمە بەردەوام چەکی هێشوویی دەفرۆشین بە تورکیا و تورکیاش بەردەوام ئەم چەکانە بۆ بومبارانکردنی گوند و ناوچە کوردنشینەکان بەکار دێنێ.

ئێرانیش بەردەوام کوردەکان لە ولاتەکەی سەرکووت دەکات. باوکی شا کە لایەنگری فاشیستەکان (مەبەستی فاشیستەکانی ئالمانیای هیتلەرییە- وەرگێڕ) بوو و لە سالی ۱۹٤۱ لە لایەن دەولەتە هاوپەیمانەکان لە سەر دەسەلات لابرا، سیاسەتی یەکجێنشین کردنی عەشیرەتە رەوەندەکانی گرتە بەر کە بووە هۆی لەناوچوونی گەلێ لە عەشیرەتە کوردەکان و غەیرە کوردەکان. رژێمی خومەینی دەستبەجێ پاش گەیشتن بە دەسەلات لەئێران لە ۱۹۷۹ کوردەکانی سەرکووت کرد، و رێبەرانی حیزبە کوردە

سەرەکییە نەیارەکانی دەسەڵاتی رژیمی ئێران یەك لە دوای یەك بە دەستی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی لە ئەورووپا کوژران.

سەرکووتی کوردەکان بە دەستی رژیمی ئێران کەمتر لە ئەمریکا سەرنجی پێدراوە و نیگەرانی بە نیسبەت پێشێل کردنی مافی مرۆڤ لە لایەن ئەو رژیمەوە پشتگوێ خراوە.ئێمە دەبێ کۆتایی بەوە بێنین کە وەك هەرەشەیەك بۆ سەقامگیری وڵاتان سەیری ئازادی کوردەکان بکەین و دەبێ پیشوازی لە ئازادیان بکەین.

مایکیل وان واڵت وان پراگ[5] ، راوێژکاری دالایی لاما[6]، رێبەری تەبەت[7] دەڵێت:

"هەڵوەشانەوەی کتوپڕ لە بۆسەی هەموو ئەو وڵاتانەدایە کە خەڵکی خۆیان لە مافی چارەی خۆنووسین بێبەش کردووە. ئێمە نابێت پرسپیکتیڤێکی درێژخایەن کە پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی هەموو گەلان زامن دەکات بکەین بە قوربانی بەرژەوەندی کورتخایەنی ئابووری و سیاسی. بەفەرمی ناسینی جیهانیی مافی چارەی خۆنووسین، خاڵی وەرچەرخان و لە راستیدا هۆکاری پێکهاتنی جیهانێکی ئاشتیخواز و سەقامگیری راستەقینەیە".

بە وتەی دادوەر "ویلیام داگلاس"کە نزیکەی ٥٠ ساڵ لەمەو پێش سەردانی کوردەکانی کردووە، کوردەکان وتەیەکیان هەیە کە دەڵێت:"جیهان گوڵێکی سوورە، بۆنی بکە و بیدە بە دۆستەکانت".

کوردستان سەرچاوەی ئاو، نەوت، گاز و بەرهەمی کشتوکاڵی زۆری هەیە و دەتوانێت ئەم سەرچاوانە لەگەڵ گەلانی دەوروبەری خۆی لە جیهان دابەش بکات،

---

[5] Michael van Walt van Praag
[6] Dalai Lama
[7] Tibet

بەڵام سەرەتا دەبێت سەرکوتی کوردەکان کۆتایی پێبێت و کوردەکان بتوانن کاروباری خۆیان بەڕیوە ببەن و خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن و کونترۆڵی سەرچاوەکانیان بگرنە دەست.

جان ئێف کنیدی[8]، سەرۆك کۆماری پیشووی ئەمریکا راست دەڵێت:

"هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەگەر پێش بە دەستیوەردانی هەموو دەوڵەتەکان لە چارەی خۆنووسینی گەلان بگیردرێت، ئاشتی باشتر دەستەبەر دەبێت."

وایت ئایزینهاوێر[9] جەخت لە سەر ئەو خاڵە دەکاتەوە کە:

" مافی هەموو گەلان بۆ پێکهێنانی سیستمی دەوڵەتی و ئابووری خۆی، مافێکی حاشاهەڵنەگرە.هەوڵی گەلان بۆ سەپاندنی جۆری سیستمی دەوڵەتی خۆیان بە سەر گەلانی دیکە شتێکی قبوڵنەکراوە".

ئێمە دەبێ ئەم پرەنسیپانە بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ کوردەکان وە ئامانجەکانیان بە کار ببەین. یارمەتی سەربازیی وڵاتە یەککگرتووەکان بە تورکیا دەبێ بەوە ببەسترێتەوە کە تورکیا بە سیاسەتەکانیدا بچێتەوە بە نیسبەت کوردستان. ئێمە دەبێ پشتیوانی لە دەستپێشخەرییەکانی کوردەکان بۆ چارەسەر کردنی ئاشتیخوازانەی ناکۆکییەکان لە پەیوەندی لەگەڵ داگیرکرانی کوردستان بکەین.

لە هەمووی گرنگتر ئێمە دەبێ مافی چارەی خۆنووسینی کوردەکان بە فەرمی قبوڵ بکەین، ئەو مافە کە بۆ گەلی ئازادیخوازی ئەمریکا پیرۆزە و هەموو گەلانی جیهان دەبێ هەیانبێت.

---

[8] John F. Kennedy

[9] Dwight D. Eisenhower

جەنابی سەرۆك، من پاشان له کاتێکی گونجاودا زۆرتر باسی ئەم مەسەلەیه دەکەم.

***

بەڕێز فرانك پالۆن:
جەنابی سەرۆك، منیش دەمەوێت زۆرتر سەرنجی هاوکارانم بەرەولای بارودۆخی دژواری گەلی کورد رابکێشم و سپاسی هاوکارم له ئەیالەتی کالیفورنیا، بەڕێز "فیلنێر" دەکەم بۆ ئەوەی ئەم کاتەی تەرخان کرد بۆ باسکردن لەسەر تراژیدیای بەردەوامی مرۆڤی له ناوچه شاخاوییەکانی کوردستان.
نزیکەی نیوەی نفووسی کۆمەڵگای کورد له نێو سنووری کۆماری تورکیا دەژین که لەو وڵاتەدا سووکایەتیان پێدەکرێت و مافه بنەڕەتیه مرۆڤییەکانیان پێشێل دەکرێت. لانیکەم یەك له چواری دانیشتووانی تورکیا، کوردن ، لەگەڵ ئەمەشدا له تورکیا کوردەکان لەگەڵ سیاسەتی تاواندنەوەی زۆرەملێ که له یاسای بنەرەتی تورکیادا تۆمار کراوه، بەرەورووون.
تا ئێستا ٣١٢٤ گوندی کوردنشین کاول کراوه و زیاتر له ٣ میلیون کەس له دانیشتووەکانی ئاوارەی ناوخۆی کوردستان یا دەرەوەی کوردستان کراون. هاوکات لەگەڵ ئەوەی بارودۆخی گەلی کورد له عێراق، ئێران و سوریاش دڵتەزێنه، من دەمەوێت سەرنجی تایبەتی هاوکارانم تەنها بەرەولای بارودۆخی کوردەکان له تورکیا رابکێشم بەچەند هۆی بنەڕەتی: پێش له هەمووشتێك تورکیا هاوپەیمانی سەربازی وڵاته یەکگرتووەکانی ئامریکایه و ئەندامی ناتۆیه و ساڵێنه بیلیونەها دۆلار یارمەتی سەربازی و ئابووری(له گیرفانی هاووڵاتیانی باجدەری ئەمریکا) لەوڵاته

یەکگرتووەکانی ئامریکا وەردەگرێت. هەروەها تورکیا ئاواتی ئەوەیە کە بەشداری بکات لە رێکخراو و ئینیستیتۆ رۆژئاواییە سەرەکیەکان وەك یەکێتی ئەوروپا.

جەنابی سەرۆك، بە باوەڕی من زۆربەی خەلکی ئەمریکا پێخوشحال دەبن کە بزانن ولاتی تورکیا کە ئەوەندە یارمەتی لە دلاوەلایی ئەمریکا وەردەگرێت، تاوانبارە بە پێشێلکردنی یاسای نێونەتەوەیی و مافی مرۆڤ. منیش هاوڕێ لەگەڵ گەلێ لە هاوکارەکانم گەمارۆی نایاسایی تورکیا لەسەر ئەرمەنستان، سەرپێچیکردنی لە وەئەستۆگرتنی ژینوسایدی ئەرمەنیەکان لە ١٩١٥ ـ ١٩٢٣، داگیرکردنی نایاسایی قوبرس و مانۆڕە سەربازییە هەڕەشەلێکەرەکانی لە دەریای "ئیژە" ئیدانە دەکەم. رەفتاری دڕندانەی تورکیا لەگەڵ ١٥ میلیون کورد کە لە تورکیا دەژین، هۆکارێکی گەورەیە بۆ ئەوەی یارمەتی سەربازی و ئابووری ولاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بە تورکیا بپچڕێت یان لانیکەم کۆمەلێك شەرتومەرجی توند بۆ ئەم یارمەتیبە دابنرێت. ئەگەر تورکیا دەیەوێت لە بەشداری لە رێکخراوە رۆژئاواییەکان ـ کە لە سەر بنەمای دیموکراسی و مافی مرۆڤ دامەزراون ـ قازانج بکات، دەبێ رێز لەو رێککەوتنامانە بگرێت کە واژۆی کردوون.

جەنابی سەرۆك، دەمەوێت لە لایەن گەورەترین قوربانیانی سیاسەتی زالمانە - نامەعقولەکەی دەولەتی تورکیا دژ بە کوردەکان چەند قسەیەك بکەم. خاتوون لەیلا زانا لە سالی ١٩٩١ وەك نوێنەری زێدی خۆی واتا دیاربەکر لە پارلمانی تورکیا هەلبژێردرا و ٨٤٪ ی کۆی دەنگەکانی بەدەست هێنا. لەیلا زانا یەکەم کورد بوو کە سنووری سەر زمانی کوردی لە پارلمانی تورکیا شکاند و بەم هۆیە پاشان دادگایی کرا و حوکمی لەسەر درا. لەیلا زانا ئەم قسانەی هێنابووە سەر زمان:

"من بۆ برایەتی گەلی كورد و تورك، سوێند بەم یاسایە بنەڕەتیە دەخۆم".

له ١٧ ی مایسی ١٩٩٣ ، لەیلا زانا و هاوكارەكەی، ئەحمەد تورك لە كومسیونی هلسینكی كۆنگرێسی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا شایەتیان دا و دادگای توركیا ئەم شایەتیدانەی دژ بەوان بەكارهێنا. لە ٢ ی ئاداری ١٩٩٤، مافی پارێزراوبوونی لەیلا زانا وەك ئەندامی پارلمان هەڵوەشایەوە و دەستگیر كرا، خرایە بەندیخانە، دادگایی كرا و لە دادگایەكی یەكلایەنە حوكمی ١٥ ساڵ بەندیخانەی لەسەردرا.

لەیلا زانا كە ٣٥ ساڵیەتی و دایكی دوو منداڵە ئێستا ساڵی سییەمی ١٥ ساڵ بەندیخانەكەی لە بەندیخانەی ئانكارا، پایتەختی توركیا، تێپەر دەكات. پارلمانی ئەوروپا ڕێزی لە خەباتە ناتوندوتیژانەكەی لەیلا زانا بۆ ئالوگۆڕی دیموكراتیك لە توركیا گرتووە و بە تێكڕای دەنگ، خەڵاتی ئاشتی "ساخاروف"[10] ی ساڵی ١٩٩٥ ی پێبەخشیوە و دوو جار بۆ وەرگرتنی خەڵاتی ئاشتی "نوبیل"[11] كاندید كراوە.

من ئاگادارم هەندێ لە هاوكارەكانم دەیانەوێت لە لایەن "لەیلا زانا"وە نامەیەك بنێرن بۆ سەرۆك كۆماری ئەمریكا، هیوادارم زۆربەی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران، پشتیوانی لە پارلمانی ئەوروپا بۆ داكۆكیكردن لە مافی مەدەنی و مرۆڤی ئەم شێرەژنە بكەن. ئەركی ئێمەیە كە پشتیوانی ئەخلاقی لە لەیلا زانا بكەین و پێداگری لەسەر باڵوێزمان لە ئانكارا بكەین كە مەسەلەی خاتوون زانا لەگەڵ پایەبەرزترین كاربەدەستانی توركیا باس بكات.

---

[10] Sakharov Peace Prize
[11] Nobel Peace Prize

جەنابی سەرۆك، منیش هاوڕێ لەگەڵ ئەندامانی ئەنجوومەن و هەرکەسێك کە ئێستا چاوی لە ئێمەیە، پشتیوانی دەکەم لە ئامانجە بنەڕەتیەکانی خاتوون زانا و گەلی چەوساوەی کورد لە تورکیا: شووناسی کورد دەبێ بەفەرمی بناسرێت، قسەکردن و نووسین و خوێندن بە زمانی کوردی دەبێ ببێ بە یاسایی، دەبێ سەرجەم مافە کولتوورییەکانیان ڕێزی لێبگیردرێت، دەبێ سەرجەم ئەو مافانە کە یاسای بنەڕەتی دایناوە، بدرێت بە حیزبە سیاسیە کوردەکان و دەبێ لێبووردنی گشتی بۆ سەرجەم بەندکراوە سیاسیەکان دەربکرێت.

جەنابی سەرۆك، ئێمە زۆربەی جاران لە ئیدارەی خۆمان و داکۆکیکارانی دیکەی تورکیا دەبیسین کە دەڵێن ماشاڵڵا کۆماری تورکیا چەندە دیموکراتە، بەڵام دەبینین کە ئەم دەوڵەتە بەناودیموکراتە چۆن ڕەفتار لەگەڵ ئەم پارلمانتارە بەهەق هەڵبژێردراوە دەکات تەنها بە تاوانی ئەوە کە بە زمانی زگماکی خۆی قسەی کردووە و داکۆکی لە مافی گەلەکەی کردووە.

جەنابی سەرۆك، ئەم بارودۆخە نابێ بەردەوام بێت، ساڵەهای ساڵە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بە ئاشکرا لایەنگری لە تورکیا دەکات و دەبیسین کە دەڵێن تورکیا لەرووی ئیستراتژیکیەوە بۆ ئێمە گرنگە و هەڵکەوتەکەی بۆ ئێمە یەکلاییکەرەوەیە. من ئەم حیساباتە بەتەواوی ڕەت ناکەمەوە بەڵام ئێمە ناچارین هاوسەنگییەك لە نێوان ئەم فاکتورانە و هەندێ حیساب و هۆکاری زۆر گرنگی دیکە رابگرین. تورکیا بەردەوام بیلیۆنها دولار خەرج دەکات بۆ بەدەستهێنانی سیستمی چەکی پێشکەوتوو، نەتەنها لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەڵکوو لە فەرانسا، روسیا و دەوڵەتانی دیکەش. زۆربەی ئەم چەکانە پاشان کەڵکی لێوەردەگیردرێت بۆ سەرکووتکردن و توقاندنی

خەڵکی کورد، ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەم هاووڵاتیانە دەبێ لە لایەن هێزە چەکدارەکانی وڵاتەکەیانەوە بپارێزرێن و نەبن بە قوربانی ئەو هێزە چەکدارانە. هەروەها تورکیا پێگەیەکی پیشەسازی بەهێزی نییە و لە گەلێ لە ناوچە سەرەکیەکان ژێرخانی ئابوورییەکەی لاوازە. کەوابوو بۆ تورکیای هاوپەیمانز، سەرچاوە سنووردارەکانی خۆی ئەوەندە بەفیڕۆ دەدات بۆ کڕینی چەکی پێشکەوتوو تا دژی هاووڵاتیە کوردەکانی بەکاری بهێنێت، لەکاتێکدا کە دەتوانێت بەم سەرچاوانە قوتابخانەی باشتر دروست بکات و ڕەوشی تەندروستی و خزمەتگوزارییەکانی دیکە باشتر بکات کە ئەم کارە خۆی یارمەتی دەدات بە پێکەوەگونجانی تورکیا لەگەڵ دەوڵەتانی ڕۆژئاوا کە تورکیا بۆ خۆیشی ئاواتی ئەمەیە.

جەنابی سەرۆك، هەفتەی رابردوو من فەرمانێکی تایبەتم لەم ئەنجوومەنەدا دەرکرد دەربارەی یادکردنەوەی ژینوسایدی ئەرمەنیەکان لە ١٩١٥ ـ ١٩٢٣ بە دەستی ئیمپراتۆری تورکی عوسمانی. هەر دوێنێ من پەیوەست بووم بە ئەندامانی کۆمەڵگای ئەرمەنی ـ ئەمریکایی بۆ ڕێوڕەسمی بەرزراگرتنی ساڵیادی فەرمانی ژینرساید. ئێمە بە یادکردنەوەی ئەم بەشە بەڵگەمەندەی مێژوو ـ کە تورکیا بەردەوام بە فەرمی حاشای لێدەکات ـ ئەوە وەبیری خەڵك دەهێنێتەوە کە گرنگی یادکردنەوەی رابردوو لەوەدایە کە پێش لە ڕوودانی تراژیدیگەلی هاوشێوە لە داهاتوودا بگرین.

جەنابی سەرۆك، ئێمە ئێستا تراژیدییەکی هاوشێوە دەبینین لە کوردستان، هەرچەند کە ئەوە راستە کە گەلی کورد ئەوەندەی ئەرمەنییەکان رەشەکوژ نەکراوە (کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا روویدا). ئەمڕۆ تا رادەیەك تەکنولوژی راگەیاندن لە ڕێگای وێنەی سەتەلایتەکان و پەیوەندییە خێراکان ناهێڵێت دەوڵەتی تورکیا کوردەکان

ڕەشەکوژ بکات، بەڵام لێکچوونی تایبەت لە نێوان ئەم دوو مەسەلەیەدا هەیە، بەهۆی ئەوەی هەوڵێکی هاوئاهەنگ لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە دەدرێت بۆ ئەوەی بوونی گەلێکی غەیرە تورك کە چەند سەدەیە لە ناوچە دەژی، بسڕێتەوە.

جەنابی سەرۆك، دەمەوێت بە وتەیەکی لورد ئێریك ئاویبووی[12]، سەرۆکی گروپی مافی مرۆڤی "ئەنجوومەنی لۆردەکان"ی بریتانیا کۆتایی بە قسەکانم بێنم کە ئەم دواییانە سەردانی کوردستانی تورکیا و عێراقی کردوو. "ئاویبووری" لە زمانی مێژوونووسی ڕۆمی ساڵی ٨٤ ی زایینی،" تاسیتوس"[13] وتەیەك دەگێڕێتەوە دەربارەی سەرکەوتنی ڕۆم بەسەر بریتانیادا و ئەویش ئەوەیە کە: "ڕۆمیەکان، بەریتانیایان کاول کرد و ناویان نیا ئاشتی".

جەنابی سەرۆك، با ئێمە کێشەکە چارەسەر بکەین، نە ئەوە ڕێگە بەوە بدەین کە سەراسەری خاکی کوردستان کاول بکرێت و نەتەوەی کورد لەناو بچێت.

---

[12] Lord Eric Avebury
[13] Tacitus

## ۳۰ ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۷ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## بارودۆخی دڵتەزێنی مافی مرۆڤ لە تورکیا

بەڕێز کریستۆفێر ئیسمیت:

جەنابی سەرۆك، دوێنێ ژمارەیەك لە هاوکارانم لە کومسیونی هلسینکی ـ بەڕێزان هۆیەر[1]، مارکی[2]، کاردین[3] و سالمۆن[4] ـ پشتیوانیان لە من کرد بۆ ئامادەکردنی بڕیارنامەیەك بۆ دەربڕینی هەستی کۆنگرێس دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە کۆماری تورکیا و خواستی ئەم دەوڵەتە بۆ ئەوەی ببێت بە خانەخێوی(میواندار) کۆبوونەوەی داهاتووی سەرۆك وەزیران یا سەرۆك کۆمارانی دەوڵەتانی بەشدار لە ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا(OSCE). تورکیا ـ کە لە ساڵی ۱۹۷۵ وە ئەندامی OSCE یە ـ یەك ساڵ پێش پێشنیاری ئەوەی کرد کە ببێت بە خانەخێوی کۆبوونەوەی داهاتووی ئەم ڕێکخراوەیە.

ماوەیەکی کورت پاش ئەوەی تورکیا ئەم پێشنیارەی خستەڕوو، من و سناتۆر "داماتۆ"، هاوسەرۆکی کومسیونی هلسینکی لە ۲۲ ی تشرینی دووەمی ۱۹۹٦ نامەیەکمان نووسی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، کریستۆفێر[5] بۆ ئەوەی نیگەرانییەکانمان دەربارەی پێشێلکاری مافی مرۆڤ لە تورکیا بخەینەڕوو و داوامان

---

[1] Hoyer
[2] Markey
[3] Cardin
[4] Salmon
[5] Christopher

لێکرد پێشنیارەکەی تورکیا رەت بکرێتەوە، هاتا کاتێك کە بارودۆخی مافی مرۆڤەکەی باشتر بکات. ئێمە لە ١٥ ی تەموزی١٩٩٧ نامەیەکیشمان نووسی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەو کاتی ئەمریکا، مادلین ئالبرایت و نیگەرانی خۆمان دەربڕی بەنیسبەت بەرەوپێشنەچوونی مافی مرۆڤ لە تورکیا. بەداخەوە تورکیا ئەو دەرفەتەی لە کیسدا کە شێلگیربوونی خۆی نیشان بدات بۆ ئەوەی ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی خۆی بەنیسبەت OSCE لە ماوەی ١١ مانگی رابردوودا جێبەجێ بکات.

بێ ئاماژەکردن بە لیستی دووروودرێژی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤی تورکیا، لەوانە ئەشکەنجە، جێگای خۆیەتی بڵێین کە کارنامەی تورکیا دەربارەی جێبەجێکردنی رەهەندە مرۆڤیەکانی ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی OSCE لاواز بووە. کومیتەی پاراستنی رۆژنامەنووسان، بەڵگەنامەکانی ئەو راستیەی خستووەتەڕوو کە لانیکەم ٤٧ رۆژنامەنووسی تورکیا ـ کە زۆرترین ژمارەیە لە نێو وڵاتان لە سەراسەری جیهان ـ لە بەندیخانەدان. ٤ پارلمانتاری پێشووی سەربە حیزبی تازە قەدەخەکراوی "پارتی دیموکراتی گەل"(DEP) کە لایەنگری کوردەکانە، لەوانە لەیلا زانا هێشتا لە بەندیخانەدان. تورکیا هەڵمەتێکی دەستدرێژیکارانەی ئەنجام داوە بۆ قەڵاچۆکردنی رێکخراوە نادەوڵەتیەکان لەساڵی رابردوودا.

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەو ئەنجامە گەیشتووە کە کۆمەڵێك کێشەی جیدی مافی مرۆڤ لە تورکیا هەیە و ئەم پێشێلکارییانە تەنها سنووردار نییە بە باشووری رۆژهەڵات کە تێیدا تورکیا زیاتر لە ١٠ ساڵە لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) شەڕ دەکات.

جەنابی سەرۆك، هەفتەی رابردوو کۆنگرێس رێزی لە زۆر پیرۆز، بارتۆلومیڤ[٦]، رێبەری باوەڕمەندانی ئورتودوکس[٧] لە سەراسەری جیهان گرت. شوێنی ئوسقوفی ئەعزەمی مەسیحیەکانی جیهان کە لە ئیستانبولە ـ ئەو شارە کە تورکیا پێشنیاری کردووە ببێ بە خانەخێوی کۆبوونەوەی داهاتووی OSCE ـ تووشی گیروگرفتی زۆر بووە. ئوسقوفی ئەعزەم بەردەوام داوای ئیزنی لە تورکیا کردووە کە سمیناری ئورتودوکسەکان لە دوورگەی هالکی[٨] سەرلە نوێ بکاتەوە کە لە دەیەی ١٩٧٠وە بە دەستی کاربەدەستانی تورکیا داخراوە، سەرەڕای ئەوەی کە تورکیا بەگوێرەی OSCE بەرپرسیارە کە"رێگە بدات بە پەروەردەی تاکەکەسی ئایینی لە ئینیستیتۆ گونجاوەکاندا". بالۆیزخانەی تورکیا لێرە لە واشنگتۆن ئەم سەردانەی(ئوسقوفی ئەعزەمی) بە "دەرفەتێکی زۆر باش بۆ پتەو کردنی پەیوەندییە نزیکەکانی لێکتێگەیشتن، دۆستی و هاوکاری لە نێو خەڵك- سەر بە بیروبڕوا و ئەتنیکی جۆراوجۆر- وەسف کردووە". بەداخەوە دەوڵەتی تورکیا بەگوێرەی ئەم بیروبۆچوونە، لەگەڵ باوەڕمەندانی ئوسقوفی ئەعزەم و ئورتودوکس لە تورکیا هەڵسوکەوت ناکات.

جەنابی سەرۆك، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بەرەوپێشچوونی دیموکراسیەکی راستەقینە لە تورکیا بەگوێرەی پاراستنی مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتیەکان تەشویق بکات. ئەوانە کە چاوی خۆیان لە حەنای پێشێلکارییە جیدی و بەردەوامەکانی مافی مرۆڤ بەستووە، کەندوکۆسپن لەسەر رەوتی دیموکراسیزاسیون لەو وڵاتە گرنگە. تورکیا بەهۆی ئەوەی لە چواررێگای ئەورووپا، قەفقاز، ئاسیای ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی

---

[٦] His All Holiness Bartholomew

[٧] Orthodox believers

[٨] island of Halki

ناوەڕاستدا هەڵکەوتووە دەتوانێ دەوری سەرەکی لە پێشهاتەکان لە ئەورووپا و ئەولای ئەورووپا بگێڕێ. بەڵام بۆ ئەوەی تورکیا ببێ بە مۆدێلی دەورگێڕێکی کاریگەر و ئەرینی ـ هەروەها کە هەندێ کەس دەڵێن تورکیا دەتوانێ ببێ بە نموونە بۆ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست ـ دەبێ بارودۆخی ناوخۆی وڵاتەکەی قایم و سەقامگیر بکات. بەپێچەوانەوە، گیروگرفتەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا تەنها ڕێگای چوونی تورکیا بۆ ناو ئەورووپا ئەستەمتر دەکات.

جەنابی سەرۆك، هەروەها دەبێ لەبیرمان بێت کە تورکیا بۆ OSCE نامۆ نییە و تورکەکان منداڵی ساوای OSCE نین. سەرۆك کۆماری ئێستای تورکیا، سولەیمان دمیرل، پەیمانی کۆتایی هلسینکی ١٩٧٥ ی واژۆ کردووە. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە تورکیا ئەرکەکانی خۆی بەنیسبەت مافی مرۆڤ جێبەجێ بکات کە لە ماوەی ٢٢ ساڵی ڕابردوودا بە ئازادی قبول کردووە. قازانج و پرستیژی خانەخێویکردن لە کۆبوونەوەی OSCE دەبێ بۆ ئەو دەوڵەتانە بێت کە پشتیوانی شێلگێرانەی خۆیان لە پرەنسیپ و ڕێوشوێنەکانی هلسینکی ـ بەتایبەت ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ ـ بە وتە و بە کردەوە نیشان داوە.

ئەمە شتێکی نوێ نییە لە OSCE دا. کاتێ کە لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠ دەوڵەتی سۆفیەت وتی دەیەوێت ببێت بە خانەخێوی کونفرانسی مافی مرۆڤی هلسینکی، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و گەلێ لە وڵاتانی دیکە پێداگریان کرد کە پێش ئەوەی ڕازی بن بە پێشنیارەکەی "کرملین"[٩]، سۆفیەت دەبێ بارودۆخی مافی مرۆڤی باشتر بکات. ئەم سیاسەتە یارمەتی دا بە باشتربوونی بەرچاوی

---

Kremlin's proposal.[٩]

کارنامەی مافی مرۆڤی تورکیا. ئێستا ئێمە دەبێ چاوەڕوانیەکی وامان لە تورکیای هاوپەیمانمان بێت. بۆ سەرەتا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ پێداگری لەسەر تورکیا بکات کە پارلمانتارە بەندکراوەکانی DEP ، لەوانە لەیلا زانا و هەروەها ڕۆژنامەنووسان و کەسانی دیکە کە بەهۆی دەربڕینی ناتوندوتیژانەی بیروڕای خۆیان دەستگیر کراون، ئازاد بکات و کۆتایی بە لێپرسینەوە لەگەڵ کارمەندانی پسپۆڕی پزشکی و NGO کان بهێنێت کە یارمەتی بە قوربانیانی ئەشکەنجە و پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ دەدەن. تورکیا دەبێ ماددەی ۸ ی یاسای دژە تیرور و مادەی ۳۱۲ ی یاسای سزادان و مادەکانی دیکە بسڕێتەوە کە پرەنسیپی ئازادی رادەربڕین پێشێل دەکەن و بە تەواوی ڕێز لە مافی مەدەنی، سیاسی و کولتووری هاووڵاتیانی تورکیا، لەوانە ئەتنیکی کورد بگریت و لێپرسینەوەی توندوتول لەگەڵ ئەو کەسانە بکات کە خەڵکیان ئەشکەنجە کردووە، لەوانە هێزەکانی ئاسایش.

هۆکاری سەرەکی بۆ چارەسەرکردنی ئەم نیگەرانیە و نیگەرانیە سەرەکیەکانی دیکەی مافی مرۆڤ ، خواستی سیاسییە. پێشهاتەکانی تورکیا لە ماوەی چەند ڕۆژی رابردوودا، بارودۆخی خراپی مافی مرۆڤ لە تورکیا نیشان دەدات. هەفتەی رابردوو "ئەسبەر یەگموردەرلی"[10] بە تاوانی لێدوان لە ساڵی ۱۹۹۱ حوکمی زیاتر لە ۲۳ ساڵ بەندیخانەی لەسەر درا. بڕیاری خانەخێوی کردن لە کۆبوونەوەی داهاتووی OSCE پێویستی بە هەڵسەنگاندنی سەرجەم دەوڵەتانی ئەندامی OSCE ، لەوانە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات.

[10] Esber Yagmurdereli

جەنابی سەرۆك، ئەم بڕیارنامەیە کە ئێمە دەیخەینەڕوو داوای رەتکردنەوەی یەکجارەی پێشنیاری خانەخێوی تورکیا لە کۆبوونەوەی OSCE ناکات، بەڵکو داوا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات تاوتوێکردنی ئەم پێشنیارە رەت بکاتەوە هەتا ئەوکاتە کە تورکیا ئەو ئەرك و بەرپرسیارەتیانەی OSCE جێبەجێ نەکات کە بە کەیفی خۆی وەئەستۆی گرتووە، لەوانە چارەسەرکردنی گونجاوی ئەو نیگەرانیانە دەربارەی مافی مرۆڤ کە من ئەمڕۆ باسم کرد. بڕیارنامەکەی ئێمە داوا لە سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەکات تا ١٥ ی نیسانی ١٩٩٨ هەرچەشنە باشتربوونێکی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا راپورت بدات. ئێمە بەتایبەت دەبێ پێداگری بکەین لەسەر جێبەجێکردنی باشتری پەیمانی کۆتایی هلسینکی و پەیماننامەکانی دیکەی OSCE.

جەنابی سەرۆك، بە کورتی ئاواتی تورکیا بۆ خانەخێوی کردن لە کۆبوونەوەی OSCE دەبێ ببەسترێتەوە بە هەنگاوەکانی دەوڵەتی تورکیا بۆ باشترکردنی بارودۆخی دڵتەزێنی مافی مرۆڤ لەو وڵاتە و تەنها بەڵێن و دروشم لەم پەیوەندییەدا بەس نییە.

جەنابی سەرۆك، نامەیەك لەم پەیوەندییەدا لە نێوان کموسیونی هلسینکی و وەزارەتی دەرەوە ئاڵوگۆڕ کراوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

کومسیونی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا

واشنگتۆن، دی سی، ١٥ ی تەموزی ١٩٩٧

بەڕێز خاتوون مادلین کوربیل ئالبرایت[11]، وەزیری دەرەوە

---

[11] Madeleine Korbel Albrigh

ئێمە دەمانەوێت دژایەتی شێلگیرانەی خۆمان دووپات بکەینەوە(و زیاتر شی بکەینەوە) بەنیسبەت ئەوەی تورکیا ببێت بە خانەخێوی کۆبوونەوەی، رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا(OSCE) و داوا لە وەزارەتی دەرەوە(کە هاوڕایە لەگەڵ ئێمە) دەکەین کە رازی نەبێت بە پێشنیاری تورکیا بۆ ئەوەی کۆبوونەوەی داهاتوی OSCE لە ئیستانبول بەڕێوە بچێت. هەروەها بە بیروبۆچوونی ئێمە دانانی خشتەیەکی کاتیی لە قۆناخی پێشهاتەکانی ئێستای OSCE، پێویست نییە و پێشنیار دەکەین بەجیدی تاوتوێی ئەوە بکرێت کە ئایا بارودۆخ بەو وڵاتانە رێگا دەدات کە خانەخێوی کۆبوونەوەکەی OSCE بکەن یا نا؟

تشرینی دووەمی رابردوو، کۆماری تورکیا ـ کە یەکێ لە دەوڵەتانی ئەندامی راستەقینەی OSCE یە ـ سەرەتا پێشنیاری کرد ئیستانبول ببێت بە شوێنی بەڕێوەچوونی کۆبوونەوەی داهاتووی OSCE . ئەو کاتە ئێمە نامەیەکمان نووسی بۆ وەزیری دەرەوە، کریستۆفێر و داوامان لێکرد وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم پێشنیارە رەت بکاتەوە. بەهەرحاڵ بڕیاردان لەسەر ئەم مەسەلەیە دوا خرا بۆ ئەوکاتە کە کۆبوونەوەی وەزیرانی رێکخراوی کوپنهاگن ـ کە دیاری کراوە ئەم کانوونی یەکەمە بەڕێوەبچێت ـ و "پەیمانی لێسبۆن" بانگهێشتەکەی تورکیا لەبەرچاو بگرێ.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێ رازی بێت بە بەڕێوەچوونی کۆبوونەوەی OSCE لە تورکیا هەتا ئەوکاتە کە تورکیا پارلمانتارانی بەندکراوی پارتی دیوکراتی گەل(DEP) و رۆژنامەنووسان و گیراوانی دیکە ئازاد نەکات، کە بەهۆی دەربڕینی ناتوندوتیژانەی بیورای خۆیان دەستگیر کراون و کۆتایی نەهێنێت بە لێپرسینەوە و ئازار و ئەزیەتدانی ئەو کارمەندە پسپۆڕە تەندروستیانە کە یارمەتی

دەدەن بە قوربانیانی ئەشکەنجە و پێشێلکارییەکانی دیکەی مافی مرۆڤ ، و دەست نەکات بە لێپرسینەوەی توندوتۆڵ لەگەڵ ئەو کەسانە ـ لەوانە هێزەکانی ئاسایش ـ کە بەرپرسیاری ئەشکەنجەی خەڵکن. لەمە زیاتر، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ داوا لە دەوڵەتی تورکیا بکات کە هەنگاوی زیاتر هەڵبگرێت بۆ باشترکردنی بارودۆخی مافی مرۆڤ، لەوانە هەڵوەشانەوەی ماددەی ٨ ی یاسای دژە تیرور و مادەی ٣١٢ ی یاسای سزا و یاساکانی دیکە کە پرەنسیپی ئازادی رادەربڕین پێشێل دەکەن و رێز گرتنی تەواو لە مافە مەدەنی، سیاسی و کولتوورییەکان کەمینە ئەتنییەکان، لەوانە کەمینەی کورد مسۆگەر بکات.

بەداخەوە هیچ نیشانەیەك بەدی ناکرێت کە تورکیا لە کاتی ناردنی نامەکەی ئێمە بۆ وەزارەتی دەرەوە لە ٨ ی مانگی رابردوو تا ئێستا، ئەرکەکانی خۆی بەنیسبەت رێوشوێنەکانی OSCE لە پەیوەندی لەگەڵ مافی مرۆڤ باشتر جێبەجێ کردبێت و سەرەڕای هەندێ ئاڵوگۆڕ لە یاسای تورکیا، راستییەکەی ئەوەیە کە ئەنانەت ئەم پێشنیارە نێوەنجیانە نەکەوتووەتە بواری جێبەجێکردن بۆ باشترکردنی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا. تورکیا بەردەوام رێوشوێنەکانی OSCE بەتوندی پێشێل دەکات و ئەو گیروگرفتانە کە لیژنەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کۆبوونەوەی پێداچوونەوەی OSCE لە مانگی تشرینی دووەمی رابردوو خستوویەتیەڕوو، هەروا بەردەوامە. شاهیدە پسپۆڕەکان لە کۆبوونەوەی ئەم دواییەی کومسیون جەختیان کردووەتەوە لەسەر ئەشکەنجەی بەردەوام، بەڵگەمەند و بەرفراوان لە لایەن هێزەکانی ئاسایشی تورکیا و سەرنەکەوتنی دەوڵەتی تورکیا بۆ هەڵگرتنی هەنگاوی شێلگیرانە بۆ سەرراست کردنەوەی ئەم پێشێلکارییە توندانەی شەڕت و مەرجەکانی OSCE و

یاسای مرۆڤیی نێونەتەوەیی. تەنانەت کەمکردنەوەی کاتی گیرانی ئەو کەسانە کە تاوانی تایبەتیان خراوەتە پاڵ، نەیتوانیوە پێش لە ئەشکەنجە بگرێت. راستیەکەی ئەوەیە کە ئەم ئاڵوگۆڕە تەنها لەسەر کاغەزدا ماوەتەوە و کاربەدەستانی تورکیا بەگشتی خۆیانی لێدەبوێرن.

هەروەها کە یەکێ لە کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تورکیا بینیویەتی و بۆ ئەندامانی کومسیونی هلسینکی باس کردووە، کەسی دەستبەسەرکراو بەماوەی چەند رۆژ لە ژوری تاکەکەسیدا رادەگیرێت. کاربەدەستانی تورکیا هەروەها بەردەوامن لە تۆمارکردنی سکاڵا لەسەر ئەو کەسانە کە هەوڵ دەدەن یارمەتی قوربانیانی ئەشکەنجە بدەن، هەر وەك مەسەلەی "دوکتۆر تۆفان کوسە"[12].

سەرەڕای پێداچوونە بەسەر یاسای دژە تیرور، شەرت و مەرجەکانی ئەم یاسایە بەردەوام دژ بە نووسەران، رۆژنامەنوسان، بڵاوکەران، سیاسەتمەداران، موسیقازانان و خوێندکاران بەکار دەبردرێت. ئەوانە کە سکاڵا دژی ئەم کەسانە تۆمار دەکەن پشت بە مادەی ٣١٢ ی یاسای سزا دەبەستن کە"هاندانی رەگەزی یا دوژمنایەتی ئەتنیکی قەدەخە دەکات". پیاوانی سەر بە حکوومەت بەردەوامن لە تۆقاندنی چاودێرانی مافی مرۆڤ . بەگوێرەی راپورتێك کە ئەم دواییانە کومیتەی پاراستنی رۆژنامەنووسان بڵاوی کردووەتەوە، ٧٨ رۆژنامەنووس لە سەرەتای ١٩٩٧ وە خراونەتە بەندیخانە کە زۆرترین رێژەیە لە نێو وڵاتانی جیهاندا.

گەلێ لە پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ دژ بە کوردەکان ئەنجام دراوە کە بەگشتی و لە رووی سیاسیەوە داوای شووناسی کوردی خۆیان دەکەن. ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە و

[12] Dr. Tufan Kose

کوولتووری کوردی له مانگی حوزەیران له لایەن پولیسەوە داخراون بۆ ئەوەی پێش له فێرکردنی زمانی کوردی بگرن. لەمە زیاتر، ٤ پارلمانتاری پێشووی حیزبی دیموکراتی لایەنگری کوردەکان(DEP) که ئێستا قەدەخه کراوه واتا لەیلا زانا، هاتیپ دیجلە، ئورهان دوغان و سەلیم سەداك که ٣ ساڵ له ١٥ ساڵ زیندانەکەیان تێپەڕ کردووه، هێشتا له بەندیخانەی" ئولوجانلاری" [١٣]ئانکارا بەندکراون. یەکێ لەو تاوانانەی که خراوەته پاڵ لەیلا زانا ئەوەیه که له بەردەم کومسیونی هلسینکی ئامادە بووه.

کومیتەی پارێزەرانی مافی مرۆڤ نیگەرانی خۆیان دەربڕیوه به نیسبەت مەسەلەی حەسەن دوغان[١٤] که ئەندامی حیزبی دیموکراتی گەل(HAPEP) و پارێزەری مافی مرۆڤه که هەر وەك گەلێ له ئەندامانی دیکەی ئەم حیزبه دەستگیر کراوه و سکاڵای لەسەر تۆمار کراوه. دەوڵەتی تورکیا بەهەمان شێوه هەڵمەتێکی دەستدرێژیکارانه پەیڕەو دەکات بۆ قەڵاچۆ کردنی رێکخراوه نادەوڵەتیەکان، لەوانه ناوەندی مافی مرۆڤی تورکیا و کۆمەڵەی مافی مرۆڤ . کۆمەڵەی خەبات دژی لەسێدارەدان له سەرەتای مانگی مایس داخراوه و هەروەها کونفرانسێکی ئاشتی داخراوه که NGO نێونەتەوەییەکان و NGO کانی تورکیا پشتیوانیان لێدەکرد. نووسینگەکانی کۆمەڵەی مافی مرۆڤ له دیاربەکر، مەلاتیه[١٥]، ئیزمیر[١٦]، قونیه[١٧] و ئورگا[١٨] هێرشیان کراوەته سەر و داخراون.

---

[١٣] Ankara's Ulucanlar Prison

[١٤] Hasan Dogan

[١٥] Malatya.

[١٦] Izmir

[١٧] Konya

[١٨] Urga

هەروەها کە خودی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە راپورتەکەی خۆیدا دەربارەی مای مرۆڤ لە تورکیا ئاماژەی پێکردووە: "دەوڵەتی تورکیا نەیتوانیوە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە ساڵی ١٩٩٥ باشتر بکات و لە ئەنجامدا کارنامەکەی هەر وەك خۆی ماوەتەوە و تەنانەت لە هەندێ رووەوە خراپتر بووە". لەکاتێکدا کە کاربەدەستانی مەدەنی تورکیا بەگشتی پابەندن بە یاسا و رێز لە مافی مرۆڤ دەگرن، هێزەکانی ئاسایش درێژە دەدەن بە ئەشکەنجە، بەکارهێنانی لەرادەبەدەری هێز و پێشێلکارییەکانی جیدی دیکەی مافی مرۆڤ . بەداخێکی زۆرەوە، رێبەرانی تورکیا، لەوانە سەرۆك کۆمار "دمیرل" ـ کە خۆی لە لایەن تورکیاوە پەیمانی کۆتایی هلسینکی ١٩٧٥ ی واژۆ کردووە ـ نەیانتوانیوە وەکو پێویست نیگەرانیە دێرینەکان بەنیسبەت مافی مرۆڤ برەوێننەوە.

جەنابی وەزیری دەرەوە، قازانج و پرستیژی خانەخێوی کردن لە کۆبوونەوەی OSCE دەبێ بەو دەوڵەتانە ببەخشرێت کە پشتیوانی خۆیان لە پرەنسیپ و رێوشوێنەکانی کومسیونی هلسینکی ـ بەتایبەت رێزگرتن لە مافی مرۆڤ ـ لە کردەوە و دروشمدا نیشان دابێ و بە لەبەرچاوگرتنی کارنامەی دلتەزێنی مافی مرۆڤ لە تورکیا، نابێ رێگە بەوە بدرێت کە ئەم وڵاتە ببێ بەخانەخێوی ئەم کۆبوونەوەیە.

لەوانەیە هەندێ کەس وا هەڵێنجاندن بکەن کە رێگەپێدان بە تورکیا بۆ ئەوەی ببێ بەخانەخێوی کۆبوونەوەی OSCE ، لەوانەیە لە رووی سیاسیەوە ببێ بە هاندەر بۆ ئەوەی تورکیا ئاڵوگۆڕی ئەرێنی لە رەفتاری خۆیدا ئەنجام بدات، بەڵام ئێمە لەسەر ئەم قەناعەتە نین، بەتایبەت بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە دەوڵەتی تورکیا لە ماوەی ئەم ٨ مانگەی پاش خستنەڕووی پێشنیاری خانەخێوی لە کۆبوونەوەی OSCE نەیتوانیوە

بارودۆخی مافی مرۆڤ باش بکات. ئێمە وەبیرتان دەهێنینەوە کە تا ئێستا چەند کونفرانس لە ئاستی بەرزدا لە تورکیا بەڕێوەچووە بێ ئەوەی کاریگەرییەکی بەرچاوی بەسەر سیاسەت یا کردەوەکانی مافی مرۆڤی دەوڵەتی تورکیاوە هەبووبێ. تەنها بەڵێن بۆ باشترکردنی مافی مرۆڤ نابێ بەس بێت. ئاواتی تورکیا بۆ خانەخێوی لە کۆبوونەوەی OSCE دەبێ ببەسترێتەوە بەهەڵگرتنی هەنگاوی چڕوپڕ لە لایەن تورکیاوە بۆ باشترکردنی کارنامەی دڵتەزێنی مافی مرۆڤ لەو وڵاتە.

سپاستان دەکەین ئەگەر بیروبۆچوونەکانمان لەسەر ئەم مەسەلە گرنگە بە هەند وەربگرن و چاوەڕوانی وەڵامی ئێوەین.

لەگەڵ ڕێزمان

کریستۆفێر هـ ئیسمیت

هاوسەرۆکی کومسیونی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا

ئالفۆنس داماتۆ

سەرۆکی کومسیونی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا

* * *

وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

واشنگتۆن، دی سی، ١٣ ی ئابی ١٩٩٧

بەڕێز کریستۆفێر هـ ئیسمیت

هاوسەرۆکی کومسیونی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا، ئەنجوومەنی نوێنەران

من لە لایەن وەزیری دەرەوە وەڵامی نامەکەی ١٥ ی تەمووزی ئێوە دەدەمەوە دەربارەی نیگەرانیەکانتان بەنیسبەت ئەوەی لەوانەیە تورکیا ببێ بەخانەخێوی کۆبوونەوەی داهاتووی رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا(OSCE ).

وەزارەتی دەرەوە شەریکی نیگەرانیەکانی ئێوەیە دەربارەی کارنامەی مافی مرۆڤی تورکیا. دەبێ هەموو دەوڵەتانی بەشدار لە OSCE پابەندبن بە پرەنسیپەکانی پەیمانی کۆتایی هلسینکی و رێوشوێنەکانی دیکەی OSCE ، لەوانە رێزگرتن لە مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان. دەوڵەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەردەوام سەرنجی داوە بە کێشەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا و داوای لە تورکیا کردووە کە ئەم کێشانە چارەسەر بکات و بە هیچ شێوەیەك چاوپۆشی نەکردووە لە ناتوانایی تورکیا ـ یا دەوڵەتانی دیکەی بەشدار لە OSCE ـ بۆ جێبەجێ کردنی رێوشوێنەکانی OSCE . بەهەرحاڵ OSCE ئامرازێکیشە بۆ چارەسەرکردنی کەموکوڕییەکانی مافی مرۆڤ.

هەروەها کە ئێوە لە نامەکەتاندا ئاماژەتان پێکردووە، مەسەلەی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا لە کۆبوونەوەی ئالۆگۆڕی بیروڕای OSCE لە مانگی تشرینی دووەم خراوەتەڕوو و لە داهاتووشدا لە کۆبوونەوەگەلێکی وەهادا دەخرێتەڕوو هەتا ئەوکاتە تورکیا ئەوە نیشان بدات کە هەنگاوی چڕوپڕی هەڵگرتووە بۆ باشترکردنی کارنامەکەی مافی مرۆڤی. بەڕێوەچوونی کۆبوونەوەی OSCE لە تورکیا دەتوانێ دەرفەتێك بێ بۆ ئەوەی گوشار بخرێتە سەر تورکیا کە کارنامەی مافی مرۆڤەکەی باش بکات. هەروەها کە ئێوە لە نامەکەتاندا ئاماژەتان پێکردووە، دەوڵەتی تورکیا کۆمەڵێك هەوڵی داوە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوچەییەکان لە رێگای هەڵگرتنی

کەندوکۆسپەکانی سەر ئازادی رادەربڕین و پەرەپێدانی چاکسازییە یاساییەکان کە ئەگەر بەتەواوی جێبەجێ بکرێت، کێشەی ئەشکەنجە هێدی هێدی چارەسەر دەکات. ئەم ئامرازانە تەنها هەنگاوی یەکەمە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان. ئێمە بەتایبەت دڵخۆش بووین بە هەڵوێستی ئەرێنی دەوڵەتی نوێی تورکیا ـ کە ۱۲ ی تەمووز گەیشتووە بە دەسەڵات ـ بەنیسبەت چارەسەرکردنی کێشەکانی مافی مرۆڤ . هەروەها کە ئێوە دەزانن، ٥٤ دەوڵەتی بەشدار لە OSCE ، ئەو مەسەلەیە تاوتوێ دەکەن کە کام دەوڵەت دەبێ ببێ بە خانەخێوی کۆبوونەوەکەی ئەم رێکخراوە، و هەروەك سەرجەم بڕیارەکانی OSCE ، هەر چەشنە بڕیارێك دەربارەی ئەم مەسەلەیە، لە رێگای دەنگدان ئەنجام دەدرێت کە دەرچوونی ئەم بڕیارنامەیەش ماوەیەك دەخایەنێت. لەهەمان کاتدا، وەزارەتی دەرەوە پێشوازی لە بیروبۆچوونەکانی ئێوە دەکات و نیگەرانیەکانی ئێوە دەربارەی شوێنی بەڕێوەچوونی کۆبوونەوەی OSCE تاوتوێ دەکات. من پێشوازی لە هەوڵە بەردەوامەکانی ئێوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەکەم و سپاسی نامە سودمەندەکەتان دەکەم. ئێمە سپاسی نامەکەتان دەکەین و هیواداریین کە ئەم زانیاریانە سودمەند بێت.

ئەگەر هەر چەشنە پرسیارێکی دیکەتان لەم پەیوەندییەدا هەبوو، بێ هیچ دوودڵیەك پەیوەندیمان لەگەڵ بگرن.

لەگەڵ رێزمدا

باربارا لارکین[19]

جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری کۆنگرێ

---

[19] Barbara Larkin

## نامەی ١٥٣ كەس لە ئەندامانی كۆنگرێسی ولاّتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە بیل كلینتۆن، سەرۆك كۆماری ئەمریكا بۆ ئازادكردنی لەیلا زانا

## ٣٠ی تشرینی یەكەمی ١٩٩٧

بەرێز جەنابی سەرۆك كۆمار

ئێمە دەمانەوێت سەرنجی ئێوە بەرەولای بارودۆخی تراژدیكی لەیلا زانا رابكێشین كە یەكەمین ژنی كوردە كە لە مێژوودا وەك ئەندامی پارلمانی توركیا هەڵبژێردراوە. خاتوون زانا كە دایكی دوو منداڵە، لە ئوكتوبری ١٩٩١ بە زۆرینەی دەنگ وەك نوێنەری شاری كوردنشینی دیاربەكر لە پارلمانی توركیا هەڵبژێردرا. "زانا" لە ئاداری ١٩٩٤ لە ناو پارلمان لە لایەن كاربەدەستانی توركیا دەستبەسەر كرا و دوابەدوای ئەوە بە تاوانی ئەو شتە كە كاربەدەستانی توركیا وەك "لێدوانی جیاییخوازانە" ناویان لێدەبرد، ئازار و ئەزیەت درا و لە مافی ئازادی رادەربرین بۆ داكۆكیكردن لە مافی گەلی كورد بێبەش كرا و لە دیسامبری ١٩٩٤ حوكمی ١٥ ساڵ بەندیخانەی بۆ برایەوە و ئیستاش لە بەندیخانەی ئانكارادایە.

یەكێ لەو تاوانانە كە خراوەتە پاڵ خاتوون زانا ئەوەیە كە ساڵی ١٩٩٣ لێرە لە واشینگتۆن لەبەرامبەر كومیسیونی هلیسینكی كۆنگرێسی ولاّتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ئامادە بووە. بە باوەڕی ئێمە ئەوە زۆر زوڵمە كە هەرچەند كە خاتوون زانا لە سەر داوای ئەندامانی كۆنگرێس بەشداری لەم كومیسیونەدا كرد بەلاّم ئەم بەشداریكردنە، بوو بە یەكێ لە هۆكارەكانی بەندكرانی ناوبراو.

هەوڵدانی خاتوون زانا بۆ ئاڵوگۆڕی دیموکراتیك لە تورکیا بە شێوەی ئاشتیخوازانە لە لایەن پارلمانی ئەورووپاوە ڕێزی لێگیراوە و بە تێکڕای دەنگ خەڵاتی ئاشتی"ساخارۆڤ"ی ساڵی ١٩٩٥ی پێبەخشیوە. لەمە زیاتر "ڕێکخراوی لیبۆرنی نیونەتەوەیی" و "ریکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ" نیگەرانی خۆیان لە چارەنووسی خاتوون زانا دەربڕیوە.

جەنابی سەرۆك کۆمار، تورکیا شەریکێکی گرنگی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکایە ، ئەندامی ناتۆیە و یەکێ لە وەرگرە سەرەکییەکانی یارمەتی بیانی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکایە، بەڵام هەڵسوکەوتی خراپ لەگەڵ هاووڵاتیانی کورد و نوێنەرە بەهەق هەڵبژێردراوەکانی ئەم خەڵکە قابلی قبووڵ نییە. خاتوون زانا بە هۆی ئەوەی بە زۆرینەی دەنگ لە لایەن هاووڵاتیانی کوردەوە وەك نوێنەری پارلمان هەڵبژێردراوە، ئەو ڕەوایەتییەی هەیە نوێنەرایەتی ئەو خەڵکە بکات بەڵام دەوڵەتی تورکیا هەوڵێکی بێویژدانانەی داوە بۆ ئەوەی پێش لە خانوون زانا بگرێت .

دەنگی خاتوون زانا نابێت کپ بکرێت . مەسەلەی خاتوون زانا تەنها یەکێ لەو نموونە زۆراندیە کە دەوڵەتی تورکیا کەڵك لە هێزی دەوڵەتی وەردەگرێت بۆ ئەوەی بەهۆی بیروباوەڕە سیاسییەکانیان، هەڵسەکەوتی خراپ لەگەڵ خەڵك بکات.

ئێمە داوا لە ئێوە و ئیدارەکەتان دەکەین مەسەلەی خاتوون زانا لەگەڵ پلەبەرزترین کاربەدەستانی تورکیا بخەنە بەرباس و داوای ئازادی دەستبەجێ و بێ شەرتومەرجی ناوبراو بکەن، بۆ ئەوەی ئێمە جارێکی دیکە لێرە لە وڵاتەکەمان پێشوازی لێبکەین.

لەگەڵ ڕێزماندا

ئەندامانی کۆنگرێس:

1- Rep. Neil Abercrombie (D-1st HI)
2- Rep. Gary Ackerman (D-5th NY)
3- Rep. Bob Andrews (D-1st NJ)
4- Rep. Howard Berman (D-26th CA)
5- Rep. Michael Bilirakis (R-9th FL)
6- Rep. Earl Blumenauer (D-3rd OR)
7- Rep. David Bonior (D-10th MI)
8- Rep. George Brown (D-42nd CA)
9- Rep. Sherrod Brown (D-13th OH)
10- Rep. Ken Calvert (R-43rd CA)
11- Rep. Walter Capps (D-22nd CA)
12- Rep. Julia Carson (D-10th IN)
13- Del. Donna Christian-Green (D-VI)
14- Rep. Bob Clement (D-5th TN)
15- Rep. James Clyburn (D-6th SC)
16- Rep, Jerry F. Costello (D-12th IL)
17- Rep. Christopher Cox (R-47th CA)
18- Rep. William Coyne (D-14th PA)
19- Rep. Michael Crapo (R-2nd ID)
20- Rep. Elijah Cummings (D-7th MD)
21- Rep. Randy Cunningham (R-51st CA)
22- Rep. Pat Danner (D-6th MO)
23- Rep. Danny Davis (D-7th IL)
24- Rep. Peter DeFazio (D-4th OR)
25- Rep. Diana DeGette (D-1st CO)
26- Rep. William Delahunt (D-10th MA)
27- Rep. Rosa DeLauro (D-3rd CT)
28- Rep. Ron Dellums (D-9th CA)
29- Rep. Peter Deutsch (D-20th FL)
30- Rep. Norman Dicks (D-6th WA)
31- Rep. John Dingell (D-16th MI)

32- Rep. Julian Dixon (D-32nd CA)
33- Rep. Lloyd Doggett (D-10th TX)
34- Rep. Eliot Engel (D-17th NY)
35- Rep. Anna Eshoo (D-14th CA)
36- Rep. Lane Evans (D-17th IL)
37- Del. Eni Faleomavaega (D-AS)
38- Rep. Sam Farr (D-17th CA)
39- Rep. Harris Fawell (R-13th IL)
40- Rep. Vic Fazio (D-3rd CA)
41- Rep. Bob Filner (D-50th CA)
42- Rep. Floyd Flake (D-6th NY)
43- Rep. Mark Foley (R-16th FL)
44- Rep. Barney Frank (D-4th MA)
45- Rep. Bob Franks (R-7th NJ)
46- Rep. Elizabeth Furse (D-1st OR)*
47- Rep. Sam Gejdenson (D-2nd CT)
48- Rep. Wayne Gilchrest (R-1st MD)
49- Rep. Benjamin Gilman (R-20th NY)
50- Rep. Gene Green (D-29th TX)
51- Rep. Luis Gutierrez (D-4th IL)
52- Rep. Tony Hall (D-3rd OH)
53- Rep. Jane Harman (D-36th CA)
54- Rep. Earl Hilliard (D-7th AL)
55- Rep. Maurice Hinchey (D-26th NY)
56- Rep. Peter Hoekstra (R-2nd MI)
57- Rep. Tim Holden (D-6th PA)
58- Rep. Darlene Hooley (D-5th OR)
59- Rep. Stephen Horn (R-38th CA)
60- Rep. Steny Hoyer (D-5th MD)
61- Rep. Jesse Jackson, Jr. (D-2nd IL)
62- Rep. William Jefferson (D-2nd LA)
63- Rep. Eddie Bernice Johnson (D-30th TX)
64- Rep. Marcy Kaptur (D-9th OH)

65- Rep. Sue Kelly (R-19th NY)
66- Rep. Joseph Kennedy II (D-8th MA)
67- Rep. Patrick Kennedy (D-1st RI)
68- Rep. Barbara Kennelly (D-1st CT)
69- Rep. Carolyn Kilpatrick (D-15th MI)
70- Rep. Ron Klink (D-4th PA)
71- Rep. Dennis Kucinich (D-10th OH)
72- Rep. Nick Lampson (D-9th TX)
73- Rep. Tom Lantos (D-12th CA)
74- Rep. James Leach (R-1st IA)
75- Rep. Sheila Jackson Lee (D-18th TX)
76- Rep. John Lewis (D-5th GA)
77- Rep. Ron Lewis (R-2nd KY)
78- Rep. Sander Levin (D-12th MI)
79- Rep. William Lipinski (D-3rd IL)
80- Rep. Nita Lowey (D-18th NY)
81- Rep. Zoe Lofgren (D-16th CA)
82- Rep. Carolyn Maloney (D-14th NY)
83- Rep. Thomas Manton (D-7th NY)
84- Rep. Edward Markey (D-7th MA)
85- Rep. Matthew Martinez (D-31st CA)
86- Rep. Robert Matsui (D-5th CA)
87- Rep. Carolyn McCarthy (D-4th NY)
88- Rep. Joseph McDade (R-10th PA)
89- Rep. Jim McDermott (D-7th WA)
90- Rep. James McGovern (D-3rd MA)
91- Rep. Cynthia McKinney (D-4th GA)
92- Rep. Michael McNulty (D-21st NY)
93- Rep. Martin Meehan (D-5th MA)
94- Rep. Carrie Meek (D-17th FL)
95- Rep. Robert Menendez (D-13th NJ)
96- Rep. George Miller (D-7th CA)
97- Rep. Patsy Mink (D-2nd HI)

98- Rep. Joe Moakley (D-9th MA)
99- Rep. James Moran (D-8th VA)
100- Rep. Constance Morella (R-8th MD)
101- Rep. Sue Myrick (R-9th NC)
102- Rep. Jerrold Nadler (D-8th NY)
103- Rep. Richard E. Neal (D-2nd MA)
104- Del. Eleanor Holmes Norton (D-DC)
105- Rep. David Obey (D-7th WI)
106- Rep. John Olver (D-1st MA)
107- Rep. Major Owens (D-11th NY)
108- Rep. Frank Pallone (D-6th NJ)
109- Rep. Michael Pappas (R-12th NJ)
110- Rep. William Pascrell (D-8th NJ)
111- Rep. Ed Pastor (D-2nd AZ)
112- Rep. Donald Payne (D-10th NJ)
113- Rep. Nancy Pelosi (D-8th CA)
114- Rep. John Porter (R-10th IL)*
115- Rep. Glenn Poshard (D-19th IL)
116- Rep. David Price (D-4th NC)
117- Rep. Deborah Pryce (R-15th OH)
118- Rep. Lynn Rivers (D-13th MI)
119- Rep. Steven Rothman (D-9th NJ)
120- Rep. Lucille Roybal-Allard (D-33rd CA)
121- Rep. Edward Royce (R-39th CA)
122- Rep. Bobby Rush (D-1st IL)
123- Rep. Loretta Sanchez (D-46th CA)
124- Rep. Bernard Sanders (I-VT)
125- Rep. Charles Schumer (D-9th NY)
126- Rep. Jose Serrano (D-16th NY)
127- Rep. David E. Skaggs (D-2nd CO)
128- Rep. Christopher Shays (R-4th CT)
129- Rep. Brad Sherman (D-24th CA)
130- Rep. Louise Slaughter (D-28th NY)

131- Rep. Christopher Smith (R-4th NJ)
132- Rep. Linda Smith (R-3rd WA)
133- Rep. Pete Stark (D-13th CA)
134- Rep. Louis Stokes (D-11th OH)
135- Rep. James Talent (R-2nd MO)
136- Rep. Karen Thurman (D-5th FL)
137- Rep. John F. Tierney (D-6th MA)
138- Rep. Esteban Torres (D-34th CA)*
139- Rep. Edolphus Towns (D-10th NY)
140- Rep. James Traficant (D-17th OH)
141- Rep. Jim Turner (D-2nd TX)
142- Del. Robert Underwood (D-GU)
143- Rep. Fred Upton (R-6th MI)
144- Rep. Nydia Velazquez (D-12th NY)
145- Rep. Peter Visclosky (D-1st IN)
146- Rep. Maxine Waters (D-35th CA)
147- Rep. Melvin Watt (D-12th NC)
148- Rep. Henry Waxman (D-29th CA)
149- Rep. Curt Weldon (R-7th PA)
150- Rep. Frank Wolf (R-10th VA)*
151- Rep. Lynn Woolsey (D-6th CA)
152- Rep. Albert Wynn (D-4th MD
153- Rep. Sidney R. Yates (D-9th IL)

(ئەو کەسانە کە هەستێرە لە سەر ناویان دانراوە، دەستپێشخەربوونە بۆ هەوڵی
ناردنی ئەم نامەیە بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا)

## ٧ ی تشرینی دووهمی ١٩٩٧ ـ ئهنجوومهنی نوێنهران
## شووناسی کورد له تورکیا دهبێ به فهرمی بناسرێت

بهڕێز فرانك پالۆن:

جهنابی سهرۆك، دهمهوێت لهسهر مهسهلهیهك قسه بکهم: یهکهم دهبێ بڵێم که هاوکارم له ئهیالهتی کالیفورنیا، بهڕێز "شیرمهن"[١] باسی دو مهسهلهی کرد که منیش دهمهوێت به کورتی ئاماژهی پێبکهم.

بهڕێز "شیرمهن" باسی ئهوهی کرد که زانکۆی کالیفورنیا له لوس ئانجلیس(UCLA) کورسی توێژینهوه تورکیهکانی کردووهتهوه که خهرجهکهی دهوڵهتی تورکیا دابینی دهکات. منیش ههر وهك جهنابی "شیرمهن" نیگهرانی توندی خۆم دهردهبڕم بهنیسبهت ئهوهی وڵاتیك وهك تورکیا کهڵکی خۆاپ لهم زانکۆ سهرهکیه خاوهن پرستیژه وهربگرێت. له ئهیالهتی "نیوجیرسی"ش که من نوێنهریی، بارودۆخێکی هاوشێوه ههیه و زانکۆی پرینسیتۆن[٢] بهرنامهیهکی تۆێژینهوهی دامهزراندووه که دهوڵهتی تورکیا خهرجهکهی دابین دهکات. له ئهنجامدا ئهو زانیارییانه که بۆ ئهم بهرنامهی تۆێژینهوهیه کهڵکی لێوهردهگیرێت له بنهڕهتدا حاشا له کۆمهڵکوژی ئهرمهنیهکان دهکات، چونکه مێژووی ئیمپراتوری عوسمانی و کۆماری تورکیا له بنهمادا حاشا له ڕوودانی ژینوسایدی ئهرمهنیهکان دهکات.

---

Mr. Sherman [١]
[٢] Princeton University

من ـ و هەروەها بەڕێز "شیرمەن" ـ لەوە نیگەرانین كە بە دامەزرانی ئەم كورسیانە یا ئەم بەرنامە توێژینەوانە لە شوێنە جۆراوجۆرەكانی وڵاتی ئەمریكا، لەوانە لە زێدی خۆم لە پرینسیتۆن، دەوڵەتی توركیا لەم بەرنامە توێژینەوانە كەڵك وەردەگرێت بۆ ئەوەی لە بنەمادا حاشا لە مێژوو و راستیەكانی ژینوسایدی ئەرمەنیەكان بكات. لە راستیدا ئەمە هەلپەرەستییەكی گوستاخانەیە و هەوڵدانێكی گوستاخانەیە لە لایەن دەوڵەتیكی بیانیەوە بۆ ئەوەی زانكۆیەكی ئەمریكی بەكاربهێنێت بۆ نكوڵیكردن لە ژینوسایدی نەتەوەی ئەرمەن كە لە مێژوودا سەلمێندراوە.

دەوڵەتی توركیا بەم كارەی خۆی، كورسی زانستی دانەمەزراندووە، بەڵكوو ئەمە تەنها و تەنها پڕوپاگەندایە. ئەمە وەك ئەوە وایە كە دەوڵەتی ئاڵمانیا داننەنێت بە ئەنجامەكانی هولوكاست[3] لە بەرنامە توێژینەوەییەكانی نازییەكان لە زانكۆیەكی ئەمریكیدا. تەنیا جیاوازی نێوان ئەم دووانە لەوەدایە كە ئاڵمانیا لانیكەم بەرپرسیارەتیەكانی هۆلوكاستی وەئەستۆ گرتووە و داوای لێبووردنی لە خەڵكی جولەكە كردووە. بەڵام دەوڵەتی توركیا مێژوویەكی دیكەی بۆ خۆی دارڕشتووە و هەر لە بنەمادا حاشا لەوە دەكات كە شتێ بە ناوی ژینوسایدی ئەرمەن رووی دابێت.

من تەنها دەمەوێت ئەمڕۆ پەیوەست بم بە كۆمەڵگای ئەرمەنی لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بۆ ئەوەی داوا لە كاربەدەستانی UCLA بكەم كە بە هەمان شێوە كە من نزیكەی ساڵێ لەمەو پێش لە زانكۆی پرینسیتۆن كردم ، پێش

---

[3] وشەی هۆلۆكاست بە واتای سووتاندنە و لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بەو شاڵاوە دەگوترێت كە نازییەكان بە سەركردایەتی هیتلەر بۆ قەڵاچۆكردنی جوولەكەكان لە كاتی جەنگی دووەمی جیهانی بەڕێوەیان برد كە تێیدا بە میلیۆنەها جولەكە لە كۆرەكاندا سووتینران. (وەرگێڕ)

له هەوڵی تورکیا بۆ سەرگەرمکردنی جوانانی ئەمریکا له ڕێگای پروپاگەندای ریوزنیویست[4] له ژێر ناوی"توێژینەوەی زانستی" بگرن. ئێمە دەبینین کە دەوڵەتی تورکیا رۆژبەرۆژ زیاتر خەرجی مادی ئەم بەرنامە توێژینەوانە یا کورسیانە لە زانکۆ جۆراوجۆرەکانی ئەمریکا دابین دەکات بە ئامانجی ئەوەی له بنەڕەتدا حاشا له ژینوسایدی ئەرمەنیەکان بکات.

هەروەها کە بەڕێز "شیرمەن" و هاوکاری دیکەمان له ئەیالەتی کالیفورنیا، بەڕێز باب فیلنێر[5](کە خۆی هۆکاری سەرەکی ئەم هەوڵەیە) ئاماژەیان پێکرد، گروپێ له کوردەکانی ئەمریکا چەند رۆژێکە لەسەر پلەکانی بینای کۆنگرێس مانیان له خواردن گرتووە بۆ ئەوەی تراژیدیای بەردەوام له ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان زەق بکەنەوە کە تێیدا دەوڵەتی تورکیا بە هەمان شێوە کە نکۆڵی له ژینوسایدی ئەرمەنیەکان دەکات، هەوڵ دەدات نە تەنها کوردەکان تاك تاك بکوژێت بەڵکوو له مافی قسەکردن بە زمانەکەیان، فێربوونی کولتوورەکەیان و پەروەردە بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکان بێ بەشیشی کردوون. ئەم مانگرتنە کە له لایەن پشتیوانانی خەڵکی تورکیا، لەوانە

---

[4] ئەم دەستەواژەیە لە ریشەی لاتینی Revisere وەرگیراوە و لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بە واتای بەریان بەرەو پێداچوونەوە بەسەر بیروبۆچوونەکاندایە. لە بنەڕەتدا ئەم دەستەواژەیە بۆ بیروبۆچوونەکان و رێبازە سیاسییەکانی سوسیالیستەکانی کۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی ٢٠ بەکاردەبرا کە پێداچوونەوەیان بە سەر هەندێ لە بیروبۆچوونەکانی کارل مارکس دەربارەی خەبایەتی چینایەتی و داهاتووی سەرمایەداری کرد و لە باتی شۆڕشخوازی، لایەنگری ئاڵوگۆڕی بەرەبەرە و ئارام لە سەرمایەداری بەرەو سوسیالیزم بوون.(وەرگێڕ)

[5] Bob Filner

چالاکی مافی مرۆڤ ، خاتوون کامیرۆن پۆرتێر[٦] کە هاوسەری نوێنەری بلیمەتی ئەیالەتی ئیلونویز، بەڕێز "جان پورتێر"[٧]-ە، بەرێکخستن کراوە. من تەنها دەمەوێت ستایشی لەخۆبردوویی، ئازایەتی و بەرخۆدانی ئەم مانگرتووانە بکەم کە سەرەڕای ساردبوونی هەوای واشنگتۆن، هێشتا کۆڵیان نەداوە.

هەینی رابردوو من هاوڕێ لەگەڵ گروپێك لە هاوکارانم لە هەر دوو ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی پیران لەگەڵ مانگرتووان و پشتیوانەکانیان دیدارمان کرد. ئەو رۆژە کۆنگرێسمەن "شیرمەن" و کۆنگرێسمەن "فیلنێر" لەگەڵ من بوون. هەموو رۆژێك کە ئێمە لە پاڵ ئەم مانگرتووانەدا تێپەر دەبین کە خۆیان کردووە بە قوربانی بۆ ئاشتی و مافی مرۆڤ، ئەو کەسە باوێژدانانەمان وەبیر دێتەوە کە داکۆکی لە بارودۆخی دژواری کورد دەکەن و دژی ئەو دەوڵەتانە هەڵوێست دەگرن کە دەیانچەوسێننەوە، بەتایبەت دەوڵەتی کۆماری تورکیا.

جەنابی سەرۆك، بەتایبەت دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم کە هەروەها کە ئێمە لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردراوین بۆ ئەوەی کارێکیان بۆ ئەنجام بدەین، هیوادارم خاتوون لەیلا زانا لەبیر نەکەین کە لە لایەن خەڵکەکەیەوە وەك ئەندامی پارلمانی تورکیا هەڵبژێردراوە، بەڵام مافی ئەوەی نییە داکۆکی لە خەڵکەکەی بکات و یەکێ لە گەورەترین قوربانیانی سیاسەتە زاڵمانە، نامەعقوڵە، دژە کوردەکانی دەوڵەت تورکیایە.

---

[٦] Cameron Porter

[٧] Mr. John Porter

جەنابی سەرۆك، من تەنها دەمەوێت پشتیوانی بکەم لە ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە و هەر کەسێك کە هاوخەمە لەگەڵ ئامانجە بنەڕەتیەکانی خاتوون لەیلا زانا و ئەو کەسانە کە لە دەرەوەی ئەم بینایە مانیان لە خواردن گرتووە و گەلی سەرکووتکراوی کورد لە تورکیا . شووناسی کورد دەبێ بە فەرمی بناسرێت، دەبێ رێگەبدرێت بە قسە کردن و نووسین و خوێندن بە زمانی کوردی، دەبێ سەرجەم مافە کولتوورییەکان ببخشرێ بە کورد، دەبێ سەرجەم ئەو مافانە کە یاسای بنەڕەتی دایناوە، بدرێ بە حیزبە سیاسیە کوردەکان و لێبوردنێکی گشتی دەربکرێت بۆ سەرجەم بەندکراوە سیاسیەکان.

جەنابی سەرۆك، ئەو رووداوانە کە ئەمڕۆ ئێمە لە کوردستاندا دەیبینین، بەچەند شێوە لە شێوەکان، پێشەکیەکە بۆ هەمان ئەو ژینوسایدە کە تورکەکان دژ بە گەلی ئەرمەنی لە ۸۰ ساڵ لەمەوبەر ئەنجامیان دا.

جارێکی دیکە وەبیرتان دەهێنمەوە کە بارودۆخی کوردستان نموونەیەکی دیکەی ئەو شێوە رەفتارەیە کە تورکیا بە درێژایی مێژوو لەگەڵ گەلی ئەرمەنی و گەلانی دیکە کردووەیە و دەبێ رابوەستێت.

## ٧ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## کێشەی کورد له ناوخۆی تورکیایه بەڵام دەوڵەتی تورکیا هەوڵ دەدات له دەرەوەی سنوورەکانی چارەسەری بکات

بەڕێز ستینی هۆیەر، نوێنەری ئەیالەتی مریلەند:
جەنابی سەرۆك، له ماوەی ئەم چەند ڕۆژەی ڕابردوودا، تورکیای هاوپەیمانی ناتۆ و دۆستی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا دیسان هێرشی کردووەتەوه سەر عێراق. ئەم داگیرکارییه که پێشێلکردنی سیاسی نێونەتەوەییه، به ڕواڵەت دژی گریلا کوردەکان ئەنجام دەدرێت که دژی تورکیا خەباتی چەکداری دەکەن بەڵام له ڕاستیدا ئەم هەڵمەته سەربازییانەی تورکیا بووەته هۆی کوژرانی ژمارەیەکی یەکجار زۆر له خەڵکی مەدەنی و ئاوارەبوونی ژمارەیەکی زۆر له خەڵك و دژواربوونی بارودۆخی ئابووری و زیاتربوونی پشتیوانی خەڵکی ناوچه له گریلاکان. لەکاتێکدا که سوپای تورکیا پاش هەموو هێرشێك ڕادەگەیەنێت که گریلاکانی لەناو بردووه ، پاش ماوەیەك دیسان بەم بیانووه هێرش دەکاتەوه سەر خاکی وڵاتیکی دیکه.
ئەم داگیرکارییه دواییەی تورکیا، شەپۆلێك نیگەرانی نوێی دروست کردووه. ئێستا زیاتر له سێ هەفتەیه هێزەکانی تورکیا بەتوندی پشتیوانی له پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK) دەکەن که چەند ساڵه سەرقاڵی شەڕێکی خوێناوییه لەگەڵ ڕکابەرەکەی، یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK). ڕاپورته بەفراوانەکان نیشان دەدات که تورکیا کنوانسیونه نێونەتەوەییەکان پێشێل دەکات و کەڵك له ناپاڵم و

بومبی هێشوویی وەردەگرێت. PUK بڕێکی بەرچاو یارمەتی ماددی له وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەردەگرێت، کەوابوو له کردەوەدا تورکیای هاوپەیمانمان هێرش دەکاته سەر حیزبێك که دەوڵەتی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا یارمەتی ماددی دەدات. پرسیار دەکەم بۆ دەوڵەتی ئێمه دان بەم ناتەباییەدا نانێت و لەوه گرنگتر بۆ دەوڵەتی ئێمه بێ دەنگه له کاتێکدا که تورکیای هاوپەیمانمان چەکوچۆڵه سەربازییەکانی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەکاردەهێنێت و دەستدرێژی دەکاته سەر"هەرێمی دژەفڕین"( له باکووری عێراق که وڵاته یەکگرتووەکان دروستی کردووه) بۆ کوشتنی خەڵکی مەدەنی و گوندەکانیان کاول دەکات لەم هەرێمه بەناو"ئارامەدا".

جەنابی سەرۆك، تورکیا له پاڵ وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا له"ڕەوتی ئانکارا"دا بەشداری کردووه بۆ کۆکردنەوەی دو لایەنه کورده نەیارەکه لەسەر مێزی وتووێژ، بەڵام پشتیوانیی سەربازی تورکیا له KDP کۆتایی به هەموو هیوایەك دێنێت که ئەم دەوڵەته بتوانێ وەك هێزێکی ئاشتیخوازی بێ لایەنی ناوچەیی کار بکات. لەمه زیاتر بەرنامەکانی تورکیا بۆ دروستکردنی"هەرێمی قەڵخان" له ناو خاکی کوردستانی عێراق به لانیکەم ۸ هەزار سەربازەوه، سەراسەری ناوچه ناسەقامگیر دەکات و ڕێگا بۆ دەستێوەردانی عێراق، ئێران و سوریا خۆش دەکات.

جەنابی سەرۆك، داوا دەکەم سەروتارێکی ڕۆژنامەی *واشنگتۆن پوست* له ژێر ناوی"پێش ئەوەی تورکیا بچێته ریزی ئەوروپا" بخرێته بەر دەستی هاوکارانم که "جیم هوگلاند[1]" یەك شەمبەی ڕابردوو، ۲ ی تشرینی دووەمی ۱۹۹۷ بڵاوی کردووەتەوه و

[1]Jim Hoagland

کۆمەڵێك پرسیاری خستووەتەڕوو دەربارەی مەنتیقی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان لەم ناوچەیە.

جێگای داخ و پەژارەیە کە تورکیا هەوڵ دەدات لە دەرەوەی سنوورەکانی، وەڵامی کێشەی کورد بداتەوە لەکاتێکدا کە لەراستیدا دەبێ ئەم مەسەلەیە لە ناوخودا چارەسەر بکات. ١٥ میلیون کورد لە تورکیا لە کاتی دامەزرانی تورکیای نوێ لە ١٩٢٣ تا ئێستا سەرکووت دەکرێن. لەوکاتەوە تا ئێستا ٢٨ راپەڕینی سەرەکی کوردی لەو وڵاتە رووی داوە کە دواییینیان راپەڕینی(PKK)یە کە لە ساڵی ١٩٨٤وە دەستی پێکردووە و بووەتە هۆی کوژرانی ٣٠ هەزار کەس. بەگوێرەی سەرچاوەکانی دەوڵەتی تورکیا، ٣١٨٥ گوندی کوردنشین چۆڵ کراون و زیاتر لە ٣ میلیون کەس لە باشووری رۆژهەڵات، ئاوارەی شوێنەکانی دیکەی ئەم وڵاتە بوونە.

سەرەڕای توندوتیژبوونی ئەم کێشەیە، تورکیا ناهێڵێت رێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتی لە ناوچەی نەهامەتی لێدراوی(باشووری رۆژهەڵات) چالاکی بکات. ئەم کێشەیە بووەتە هۆی ئەوەی هەر ساڵ بیلیونەها دولار لە تورکیا خەرج بکرێت و هیوای پێشکەوتنی ئابووری کە بۆ ناوچەی کوردنشین زۆر پێویستە، لە ناو بردووە.

جەنابی سەرۆك، رژێمی تورکیا دەبێ دیموکراسیە لاوازەکەی بەهێز بکات وەگەرنا کێشەی کورد و مەسەلە گرنگەکانی دیکە دەگەنێت و ناهێڵێت تورکیا بەرەو ئەورووپا بچێتە پێش. رێبەرانی سەربازی و مەدەنی تورکیا بەردەوام رایانگەیاندووە کە دەیانەوێت کێشەکانی مافی مرۆڤ چارەسەر بکەن. بەڵام کێشەکان هێشتا هەر لە جێگای خۆیدایە و هەوڵەکان بۆ چاکسازی کەمترە لەوەی کە راگەیاندنە گشتیەکان باسی دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا دەوڵەتی ئێمە وەك رابردوو درێژە دەدات بە بازرگانی

کردن لەگەڵ تورکیا و لەبواری ئاسایشدا بایی بیلیونها دولار، یارمەتی دەدات بە ئانکارا و نیشانە روولەزیادبووەکانی ناسەقامگیری تورکیا لە رووی سیاسییەوە پشتگوێ دەخات. پشتیوانییەکی نایەکسانی وەها لە جێی خۆیدا نییە، بەهۆی ئەوەی سوپا و لایەنە نادیموکراتیەکانی تورکیا بەهێز دەکات و ئەو پەیامە دەنێرێت کە دەوڵەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێ لەبەرچاوگرتنی کارنامەی لاوازی مافی مرۆڤی تورکیا، پشتیوانی لە دەوڵەتی تورکیا دەکات.

جەنابی سەرۆك، گروپێك لە کورد و ئەرمەنیەکان، لەوانە خاتوون کاترین کامیرۆن پورتێر[٢] لەبەردەم بینای کۆنگرێس مافیان لە خواردن گرتووە بۆ ئەوەی پێشێلکاری مافی مرۆڤ لە تورکیا پروتستۆ بکەن. ئەوان بە تەواوی لەسەر ئەو بڕوایەن کە دەوڵەتی ئێمە تا ئێستا بێ دەنگ بووە لەبەرامبەر پێشێلکاری روو لە زیادبووی دیموکراسی لە تورکیا. یەکێ لە هۆکارە سەرەکیەکانی نارەزایەتی ئەم مانگرتووانە، زیندانیبوونی بەردەوامی چوار پارلمانتارە کوردەکەیە کە یەکێکیان لەیلا زانایە کە یەکێ لە تاوانەکانی ئەوەیە کە لە بەردەم کومسیونی هلسینکی ئامادە بووە. هەموو حیزبە سیاسیە کوردەکان لە تورکیا سەرکوت دەکرێن، لەکاتێکدا کە دەبێ بیرورا سیاسیەکانی کوردەکان لەبەرچاو بگیردرێت، دەبێ رێگە بە حیزبە کوردە ناتوندوتیژەکان بدرێت لە ژیانی سیاسیدا بەشداری بکەن، نابێت تاکەکان بەهۆی دەربڕینی بیروڕای خۆیان بخرێنە بەندیخانە و دەوڵەت وەك هەڕەشە چاو لە دەربڕینی بیروڕا بکات. دەبێ مشتومڕ و دیالوگی ئازاد هەبێت.

[٢] Kathryn Cameron Porter

جهنابی سهرۆك، هێمایهكی دیموكراتیكی دیكه، ئازادی میدیاكانه. له ٢١ تشرینی یهكهم كومیتهی پاراستنی رۆژنامهنووسان(CPJ) راپورتێكی له ژێر ناوی"دهریای پڕ له دوورگهی ئاناتولی" بلاّو كردهوه كه تێیدا چارهنووسی ٧٨ رۆژنامهنووسی خستووهتهڕوو كه به تاوانی رادهربڕین خراونهته بهندیخانه. CPJ كه توێژینهوهیهكی وردو دروستی ئهنجام داوه و پێش له بلاّو كردنهوه، ئهم راپورتهی نیشانی دهوڵهتی توركیای داوه، له ئهنجامی راپورتهكهدا دهڵێت له ٣ ساڵی رابردوودا، ههر ساڵ له توركیا زیاتر له ههر ولاّتیكی دیكه، رۆژنامهنووس خراونهته بهندیخانه.

داكوكیكارانی مافی مرۆڤ و چالاكانی ئاشتیخوازی كوردیش لهگهڵ ئازار و ئهزیهت، بهندیخانه و كردهوهی لهوهخراپتر روبهڕوو بوونهتهوه. ههر ئهم ههفتهی دواییه یاووز ئونهن[٣] و ئاكین بیردالّ[٤] كه دوو رێبهری چالاكی مافی مرۆڤ له ئاستی نێونهتهوهییدان، و "ئهحمهد تورك" (كه كورده) تۆمهتی ئهوهیان خراوهته پالّ كه راپورتێكیان بۆ ئاپورای خهڵك خوێندووتهوه دهربارهی وردهكارییهكانی رسوایی پهیوهندی بهردهوامی كاربهدهستانی توركیا لهگهڵ گروپه"مرۆڤكوژهكان". ئهم كهسانه حوكمی سێ ساڵ بهندیخانهیان لهسهر دراوه. له ٢٠ ی تشرینی یهكهم چالاكی بهناوبانگی ئاشتی، "ئهسبهر یهگموردهرلی" حوكمی ٢٢ ساڵ بهندیخانهی لهسهر درا. له ٢١ ی تشرینی یهكهم ،سهرۆك و ٧ كهس له كارگێڕانی كۆمهڵهی مافی مرۆڤ (HRA) حوكمی ١ تا ٢ ساڵ بهندیخانهیان لهسهر درا به تاوانی لێدوان له ههفتهی مافی مرۆڤ له ساڵی

[٣] Yavuz Onen
[٤] Akin Birdal

١٩٩٦ . لەم ساڵێنەی دواییدا، ٢٠ لقی HRA داخراون، لەوانە سەرجەم لقەکانی که خزمەتی کۆمەڵگای کوردیان له باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەکرد.

ئازادی رادەربڕین تەنها یەکێ لەو بوارانەیە که تورکیا پێشێلی دەکات و ئەرکەکانی خۆی بەنیسبەت مافی مرۆڤ جێبەجێ ناکات. NGO ناوچەییەکان، رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی، رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ و وەزارەتی دەرەوەی خۆمان بەو ئەنجامە گەیشتوون که ئەشکەنجە له تورکیا هەروا بەردەوامە و تەنها ژمارەیەکی کەم لەو کەسانە که تۆمەتبارەکانیان ئەشکەنجە کردووە، دادگایی کراون. هەفتەی رابردوو لێژنەی دادوەری که سەرۆکایەتی دادگایەکی نێونەتەوەیی دەکرد، ئەو پولیسەی تاوانبار نەکرد که ١٤ جوانی ـ که هەندێکیان تەمەنیان ١٣ ساڵ بووە ـ ئەشکەنجە کردبوو.

جەنابی سەرۆك، من هاوڕێ لەگەڵ ١٦٠ کەس له هاوکارانم نامەیەکمان واژۆ کردووە که تێیدا داوای ئازادکردنی پارلمانتارە بەندکراوەکانمان کردووە. لانیکەم هیچ نەبێت وەك ئەندامی ئەنجوومەنێکی هەڵبژێردراوی یاسادانەر، ئێمە دەبێ داوا بکەین هاوکارەکانمان له تورکیا ئازاد بکرێن چونکە لەگەڵ عەقڵدا ناگونجێت که له کۆمەڵگایەکی دیموکرات، یاسادانەرەکان بخرێنە بەندیخانە بەهۆی داکۆکی کردن له مافی خەڵکەکەیان. داوا له هاوکارانم دەکەم ئەم نامەیە واژۆ بکەن و سەردانی ئەو کەسانە بکەن که له سەر پلەکانی ئەم بینایە مانیان له خواردن گرتووە.

هەروەها من هاوڕێ لەگەڵ هاوکارانم له کومسیونی هلسینکی، بڕیارنامەیەکمان ئامادە کردووە که دەربڕی هەستی کۆنگرێسە دەربارەی ئەوەی که نابێ تورکیا وەك خانەخێوی کۆبوونەوەی داهاتووی رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا

هەڵببژێردرێت. هەتا کاتێك کە تورکیا درێژە بدات بە پێشێلکردنی یاسای نێونەتەوەیی و ئەرك و پرەنسیپەکانی OSCE ، نابێ وەك خانەخێوێکی گونجاو بۆ کۆبوونەوەیەکی مافی مرۆڤ هەڵببژێردرێت.
جەنابی سەرۆك، قازانجی خانەخێوی لە کۆبوونەوی OSCE دەبێ بەو وڵاتە بدرێت کە لە کردەوە و لە دروشمدا پشتیوانی شێلگیرانەی خۆی لە پرەنسیپ و رێوشوێنەکانی هلسینکی نیشان دابێ، بەتایبەت رێزگرتن لە مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ.

## ۹ ی تشرینی دووهمی ۱۹۹۷ - ئهنجوومهنی نوێنهران
## لهیلا زانا ئازاد بکهن

بهرێز جان ئێدوارد پۆرتێر:

جهنابی سهرۆك، ئهمرۆ دهمهوێت ئهوپهری تورهیی خۆم نیشان بدهم بهنیسبهت رهفتاری تورکیا لهگهڵ پارلمانتارێکی ههڵبژێردراو. لهیلا زانا که پارلمانتارێکی کورده که به ههق له لایهن خهڵکی ناوچهکهیهوه ههڵبژێردراوه، به تاوانی دهربڕینی بیرورِا و بیروبۆچوونه سیاسیهکانی دهستگیر کراوه و له بهندیخانهدایه. لهراستیدا خاتوون زانا ئهوهنده ئازایهتی و جهسارهتی ههبوو که بیروراکانی خۆی له کۆبوونهوهیهکی کومسیونی ئاسایش و هاوکاری ئهوروپا لێره له واشنگتۆن دهربڕێ. گرتن و دادگایی کردنی خاتوون زانا تاوان دژی دیموکراسی و ئازادییه.

۳ ههفتهیه گروپێك له کوردهکان و ئهرمهنیهکان لهبهرامبهر بینای کۆنگرێس مانیان له خواردن گرتووه بۆ پروتستۆ کردنی زیندانی کردنی لهیلا زانا. یهکێ لهم مانگرتووانه دوێنی ناچار بوو واز له مانگرتنهکهی بێنێ، بههۆی ئهوهی بارودۆخی تهندروستی زۆر خراپ بوو.

ههفتهی رابردوو زیاتر له ۱۵۰ کهس له هاوکارانم و من نامهیهکمان نارد بۆ سهرۆك کۆمار، کلینتۆن و داوامان لێکرد داوا له تورکیا بکات لهیلا زانا ئازاد بکات. بهههرحاڵ بهداخهوه دهبێ بڵێم که هیوایهکی زۆرم بهوه نییه که دهوڵهتی ئێمه ئهم داواکارییه به ههند وهربگرێت. ئیدارهی ئێمه ـ ههر وهك ئیدارهی پێشوو ـ سیاسهتی

پشتگوێ خستنی پێشێلکردنی توندی مافی مرۆڤ له لایەن دەوڵەتی تورکیا پەیڕەو دەکات و تەنها لەسەر کاغەز باسی کەموکوڕییەکانی دیموکراسی تورکیا دەکات. له هەفتەی رابردوودا من و گەلێ له هاوکارانم لێرە ئەوپەڕی توڕەیی خۆمان له پێشێلکردنی مافی مرۆڤ له چین(صین) دەربڕی. بۆ ئێمه ئەم چاوەڕوانییەمان له وڵاتیك وەك تورکیا ـ که بەرواڵەت وڵاتیکی رۆژئاوایی، ئەوروپایی و دموکراتە ـ نییە که هەمان جۆرە کێشەی مافی مرۆڤی هەیە که چین هەیەتی. مەسەلەی لەیلا زانا نیشان دەدات که ئەمڕۆ ئازادی رادەربڕین، ئازادی بیروڕا و ئازادی نەیارێتی سیاسی به هەمان ئەندازە که له چین مەترسیدارە، له تورکیاش مەترسیدارە. تورکیا هاوپەیمانی نزیکی ئێمەیە، ئەندامی ناتۆیە و وڵاتیکی ئەوروپاییە. بۆ ئێمه رەخنه له چین دەگرین بەڵام هیچ چاوەڕوانیەکمان له تورکیا نییە؟ ئەم دووڕوییە دەبێ کۆتایی پێبێت.

مەسەلەی شەرماوینتر ئەوەیە که دەوڵەتی تورکیا کۆتایی به سەرکووتی گەلی کورد له نێو وڵاتی خۆیدا ناهێنێت. ئەوە سێ هەفتەیە تورکیا بێ فەرق و جیاوازی هێرش دەکاتە سەر گوندە کوردنشینەکانی باکووری عێراق. تورکیا دەڵێت تەنها به شوێن PKK دادەچێت بۆ باکوری عێراق بەڵام راستیەکە شتێکی دیکەیە. بەکارهێنانی ناپاڵم و بومبی هێشوویی دژی خەڵکی مەدەنی له باکووری عێراق، بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە که تورکیا له هەوڵە سەربازییە بیرلێنەکراوەکەی بۆ قەڵاچۆ کردنی کوردەکان، دەست له هیچ ناپارێزێت. من شەرم دەکەم که بڵێم دەوڵەتی ئێمه ـ که هەمان ئەو دەوڵەتەیە که سەراسەری کۆمەڵگای نێونەتەوەیی خستەگەڕ کاتێ که هەمان ئەو کوردەکانە کەوتنەبەر هێرشی سەدام حوسەین ـ هیچ رەخنەیەك لەم رەفتارە نایاساییەی تورکیای هاوپەیمانمان ناگرێت، له باتی ئەوە ئێمه رێگامان به

تورکیا داوه که به کەیفی خۆی هەوڵەکانی ئێمه هەڵبوەشێنێتەوه بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانەی کێشەی نێوان گروپه کوردەکان له باکووری عێراق. ولاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیارەتی ئەخلاقی هەیه که دژی ئەم جۆره رەفتارانه رابوەستێت، چ لەلایەن تورکیاوه بێت، چ لەلایەن "چین" وه. هیوادارم که هاوکارانم هاورێ لەگەڵ من تورەیی خۆیان دەرببڕن بەنیسبەت کردەوه دەستدرێژیکارانەکانی تورکیا له ناوخۆ و دەوروبەری سنوورەکانی و هەروەها تورەیی خۆیان دەرببڕن بەنیسبەت سیاسەتی "چاوتان له خراپییەکان ببەستن"ی دەوڵەتەکەی ئێمه.

بەرێز فیلنێر:

جەنابی سەرۆک، چەند کەسێك له کوردەکان مانیان له خەوتن گرتووه بۆ ئاشتی و مانیان له خواردن گرتووه بۆ زەقکردنەوەی سەرکووتی گەلی کورد. من تەنها به یەك هۆ هەڵساوم قسه بکەم، ئەویش ئەوەیه که هاوخەمی خۆم دەرببڕم لەگەڵ مانگرتووان و پشتیوانی خۆم دەرببڕم له خەباتی گەلی کورد بۆ ئازادی، دادپەروەری و مافی چارەی خۆنووسین. سەمبولی ئەم خەباته، پارلمانتاری به دیموکراسی هەڵبژێردراو و رێبەری بەندکراوی کورد، "لەیلا زانا"یه.

جەنابی سەرۆك، ئەمرۆ له تورکیا خەڵکی کوردی مەدەنیی بێ گوناه به کۆمەڵ دەکوژرێن، هەموو گوندە کوردنشینەکان کاول دەکرێن و میلیونەها کورد ناچار دەکرێن زێدی خۆیان بەجێ بهێڵن و ئاوارەی ئەو شارانه بن که رێژەی بێکاری و هەڵئاوسینی ئابووری زۆر له سەرەوەیه. سەراسەری ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا کاول کراوه و له رووی ئابوری و مرۆڤییەوه بووه به ناوچەیەکی نەهامەتیلێدراو. دیاره ئەم بارودۆخه نابێ قبوڵ بکرێت. ئەمه هۆشدارییەکه بۆ

وڵاتیك كە كەڵك لە چەكەكانی ئەمریكا وەردەگرێت بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانانە. نابێ جارێكی دیكە چەكەكانی ئەمریكا دژی كوردەكان یا هەركەسێكی دیكە بەكاربرێت، هەروەها كە ئەم چەكانە لە شاری كەوناری هەڵەبجە بەكار برا و لە ئەنجامدا ٥ هەزار كوردی مەدەنی كە زۆربەیان ژن و منداڵ بوون، بە گازی كیمیایی كوژران. جارێكە دیكە نابێت شتێكی وەها روو بدات.

لەیلا زانا ژیانی خۆی تەرخان كردووە بۆ چارەسەربوونی ئاشتیخوازانە و دادپەروەرانە و كۆتاییپێهاتن بە كێشەی كورد. هیوادارم كە هاوكارانم چاو لە بەسەرهاتی ئەو بكەن كە وانەی خۆپێگەیاندن، گەشەی سیاسی، قارەمانیەتی و ئازایەتییە. دەوڵەتی توركیا لەوە دەترسێ كە لەیلا زانا لە هەوڵەكانی بۆ ئاشتی زۆر بچێتە پێش ، هەر بۆیە ئێستا لەگەڵ تاوانبارە مرۆڤكوژەكان لە یەك ژووردا خستوویەتیە بەندیخانە بەڵام قەد ناتوانێت وێنەی لەیلا زانا، قسەكانی لەیلا زانا، ئازایەتی لەیلا زانا و بەسەرهاتە سەمبولیكەكەی بەند بكات.

هەنگاوێك لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هەڵگیراوە بۆ ئازادی لەیلا زانا. من و ١٤٣ كەس لە هاوكارانم لە كۆنگرێس نامەیەكمان ناردووە بۆ سەرۆك كلینتۆن و داوامان لێكردووە كە داوای ئازادی دەستەبەجێ و بێ شەرت ومەرجی لەیلا زانا لە بەندیخانە بكات. ئێستا لە چاو رابردوودا ژمارەیەكی زۆرتر لە ئەندامانی كۆنگرێس پشتیوانی لە لەیلا زانا و گەلی كورد دەكەن. بێ گومان كۆنگرێسی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ئێستا زۆرتر ئاگاداری بارودۆخی دژواری گەلی كوردە و هاوسوزترە لە گەڵیان.

کوردەکان لە ئێران، عێراق، سوریا و هەروەها تورکیا وەك هاووڵاتی پلە دوو دەژین و مافە بنەڕەتیەکانی ژیان، ئازادی و شادمانییان لێ زەوت کراوە. بەڵام بەهۆی خەباتی ئیلهامبەخشی لەیلا زانا و هەزاران کوردی دیکە، سەرکووتی کەمینەی کورد رۆژی لە رۆژان کۆتایی پێدێت. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە زۆر باشترە کە کەڵك لە شێوەگەلی ئاشتیخوازانە وەربگیردرێت و کۆتایی بەم توندوتیژییە لە مێژینەیە بێت. کەوابوو ئێمە دەبێ لەیلا زانا لە باوەش بگرین لەبەر ئەوەی نە لە رێگای توندوتیژی، بەڵکو لە رێگای چالاکی ئاشتیخوازانە و دیموکراتیك ژیانی خۆی بۆ گەلی کورد خستووەتە ناو مەترسی.

کەوابوو جەنابی سەرۆك من سەری رێز و نوازش دادەنوێنم لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە ئەمڕۆ بۆ پشتیوانی لە ئازادی لەیلا زانا مانیان لە خواردن گرتووە و بە دەوڵەتی تورکیا دەڵێم: "بە ناوی مرۆڤایەتی لەیلا زانا ئازاد بکە".

## پێویستی دادگایی کردنی رێبەرانی رژێمی عێراق و تورکیا لە دادگای نێونەتەوەیی تاواندا

### ١٤ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧ – ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "گیلمەن":
جەنابی سەرۆك ئەم بڕیارنامەیە کە ئەمڕۆ لە بەر دەستی ئێمەدایە واتا بڕیارنامەی ١٣٧ ی کۆنگرێس کە من و نوێنەری ئەیالەتی "ئیلۆنۆیز" و هاوسەرۆکی کومیتەی مافی مرۆڤ ، بەڕێز "پۆرتێر" خستومانەتەڕوو، هەستی کۆنگرێس دەردەبڕێت بە نیسبەت پێویستی دەستبەجێ پێکهێنانی دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان بۆ دادگایی کردنی سەدام و ئەندامانی ڕێبەرایەتی رژێمی عێراق بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی. دەمەوێت سپاسی بەڕێز "پۆرتێر" بکەم بۆ ڕێبەرایەتییەکەی لەپەیوەندی لەگەڵ ئەم مەسەلە گرینگەدا. پێویستی پێکهێنانی ئەم دادگایە دوای ڕووداوەکانی ئەم دواییە زۆرتر بووە. بڕیارنامەی ١٣٧ ئاماژە بەوە دەکات کە سەدام حوسەینی دیکتاتور مافی هاوولاتیانی عێراقی پێشێل کردووە، لەوانە لەسێدارەدانی سەرەڕۆیانە، ئەشکەنجە، رەفتاری زاڵمانە و نامرۆڤایانە، دەستگیر کردن و زیندانی کردنی سەرەڕۆیانە و بێ سەروشوێنی کردنی خەڵك.
سەدام حوسەین هەوڵی داوە خەلکی کوردی عێراق لە ڕێگای چەکی کیمیایی لە ناو ببات، عەشیرەتە سوننەکانی رۆژئاوای عێراقی سەرکووت کردووە، کلیساو گوندەکانی ئاشووری و کەلدانیەکانی کاول کردووە، تورکمانەکانی لەسێدارە داوە و شیعەکانی بە

کۆمەڵ کوشتووە. سەدام هەروەها درێژە بە لە ناوبردنی ژینگەی شارستانی کەوناری "مارشی عەرەبی" دەدات. رەفتارە دڕندانەکانی سەدام تەنها هاوولاتیانی عێراق ناگرێتەوە، ئێمە رۆژە تاریکەکانی جەنگی کەنداو لە بیر ناکەین کە سەدام کوێتی داگیر کردبوو و خەڵکی بێ گوناهی کوێت بە ماوەی چەند مانگ بە بارمەتە گیرابوون. چارەنووسی پتر لە ٦٠٠ کوێتی کە لە کاتی شەڕی کەنداو بە دیل گیراون هێشتا نادیارە و دەوڵەتی عێراق هیچ حیسابێکیان بۆ ناکات.

کەوابوو بڕیارنامەی ١٣٧ هەستی کۆنگرێس دەردەبڕیت بۆ شەرمەزارکردنی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ لەلایەن دەوڵەتی عێراق و ئیدانەی سەرپێچی عێراق دەکات لە جێبەجێ کردنی رێکەوتننامە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ کە واژۆی کردوون.

ئەم بڕیارنامەیە هەروەها پشتیوانی دەکات لە پێکهاتنی دادگای تاوانە نێونەتەوەییەکان بۆ دادگایی کردنی سەدام و دارودەستەکای و داوا لە سەرۆك کۆمار و وەزیری دەرەوی ئەمریکا دەکات چالاکانە کار بکەن بۆ پەسەند کردنی بڕیارنامەیەك لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانی نێونەتەوەیی بۆ عێراق. داوا لە هاوکارانم دەکەم بە تەواوی پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەن.

بەڕێز" هاستینگز[٢]"، نوێنەری ئەیالەتی" فلۆریدا":

سپاسی بەڕێز "پۆرتێر" دەکەم بۆ هەوڵەکانی بۆ ئامادەکردنی ئەم بڕیارنامە بەوەختە و هەروەها سپاسی نوێنەری ئەیالەتی ئیندیانا، بەڕێز "هامیلتۆن" دەکەم بۆ دەربڕینی هەستی ئێمە لە رێگای ئەم بڕیارنامە تایبەتەوە.

---

[٢] Mr. HASTINGS

ئێمە دژی ئەم بڕیارنامەیە نین. منیش پەیوەست دەبەم بە سەرۆکی کۆنگرێس بۆ شەرمەزارکردنی عێراق بە هۆی پێشێلکردنی توندی مافی مرۆڤ . ئەوانەی کە ئەم تاوانانەیان ئەنجام داوە دەبێ لە دادگای تاوانی نێونەتەوەیی دادگایی بکرێن، هەروەها کە ئەم بڕیارنامە بەدروستی ئاماژەی پێکردووە. بەڵام پرسیاری من و گەلێ لە هاوکارانم ئەوەیە کە ئایا ئەم بڕیارنامەیە ئەوەندە کاریگەری هەیە. بڕیارنامەکە داوای دادگایی کردنی سەدام دەکات لە دادگایەکی نێونەتەوەییدا بەڵام پێمان ناڵێت ئێمە لێرەوە چۆن دەتوانین شتێکی وابکەین. نیگەرانی سەرەکی من ئەوەیە کە ئەم بڕیارنامە کۆمەڵێك چاوەڕوانی دروست دەکات، بەتایبەت لە کوێت بۆ ئەوەی ئەم دادگایە پێکبێت بەڵام ئێمە تا ئێستا بەکردەوە نەمانتوانیوە دادگایەکی وا پێکبهێنین. بە هەرحاڵ من بەتەواوی پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە دەکەم. ئەم بڕیارنامەیە داوا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات کار بکات بۆ پەسەندکردنی بڕیارنامەیەك لە نەتەوە یەگرتووەکان بۆ پێکهاتنی دادگای تاوانی نێونەتەوەیی بۆ عێراق. هیوادارم ئێمە بەردەوام هەوڵ بدەین بۆ ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات.

"خاتوون فۆرس[٣]":

جەنابی سەرۆك، من پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە دەکەم. ئەوەی کە من دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە کە هەموو خەباتێك بۆ مافی مرۆڤ بەرپرسیارێتی و قوربانی دەوێت. ئەمڕۆ گروپێکی تازا لە مانگیراوانی کورد بۆ شەرمەزارکردنی پێشێلکردنی مافی کوردەکان لەلایەن دەوڵەتی تورکیا مانیان گرتووە. ئێمە دەبێت بڕیارنامەیەکیش لە پەیوەندی

[٣]Ms. FURSE

لەگەڵ پێشێل کردنی مافی کوردەکان و مافی ئەندامانی پارلمانی تورکیا کە لەلایەن کوردەکانەوە هەڵبژێردراون، پەسەند کەین.

دەمەوێت ئەو نامەیە وەبیری هاوکارانم بهێنمەوە کە ١٠٣ کەس لە ئەندامانی کۆنگرێس واژۆیان کردووە و ناردراوە بۆ سەرۆك کۆمار کە تێیدا ئاماژە بە بارودۆخی زۆر خراپی سیاسەتمەداری کوردی تورکیا "لەیلا زانا" کراوە کە لەلایەن خەڵکەکەیەوە وەك ئەندامی پارلمانی تورکیا هەڵبژێردراوە بەڵام بەتاوانی پێشێل کردنی یاسای تورکیا ئێستا لە بەندیخانەدایە.

تەنها تاوانی لەیلا زانا ئەوە بووە کە بە زمانی کوردی قسەی کردووە و قسە کردنیش مافی هەموو پارلمانتاریکە، هەروەها کە من ئەمرۆ قسە لە سەر مافی مرۆڤ دەکەم. ئێمە لە نامەکەماندا بۆ سەرۆك کۆمار ئاماژەمان بەوە کردووە کە یەکێ لەو تاوانانەی کە خراوەتە پاڵ "لەیلا زانا" ئەوە بوو کە لە ساڵی ١٩٩٣ لە سەر بانگهێشتی کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەردانی واشنگتۆنی کردووە. ئێمە تورەیی خۆمان لەوە دربری کە هەر چەند کە "لەیلا زانا" لەلایەن کۆنگرێسەوە بانگهێشت کرابوو بەڵام لە ئاکامی چالاکیەکانیدا خرایە بەندیخانە. ئەمرۆ ئێمە بەتوندی داوا لە حکوومەتی ئەمریکا دەکەین کار بکات بۆ ئازادی لەیلا زانا و چاوێك بخشێنێت بە بارودۆخی زۆر خراپی خەڵکی کورد لە تورکیا. من رۆژێکی دیکە نامەیەکەم لەلایەن نوێنەری ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەندامی پێشووی کۆنگرێس، بەرێز" بیل ریچاردسۆن[٤]" بەدەست گەیشت کە تێیدا ئاماژە بەو کرابوو

[٤] Bill Richardson

که فایلی "لەیلا زانا" یەکێ لەو چوار فایلانەیە کە تەسلیمی کۆمیسیونی مافی مرۆڤی ئەوروپا کراوە.

جەنابی سەرۆك، ئێمە دەبێ ویژدانی ئەمریکا لە سەر ئەو خەڵکە چڕ بکەینەوە کە ئەمڕۆ بۆ دەربڕینی هاوخەمی خۆیان لەگەڵ هاووڵاتیانی (کورد) مانیان گرتووە، چ ئەوانەی ناو تورکیا چ ئەوانەی ناو عێراق . بە تایبەت دەمەوێت سەرنجتان بەرەولای ئەو هاووڵاتیە ئازانە رابکێشم کە بڕیاریان داوە ژیان وتەندروستی خۆیان بخەنە ناو مەترسی و مان بگرن بۆ دەربڕینی هاوخەمی خۆیان لەگەڵ خاتوون" زانا" و سیاسەتمەدارانی دیکەی کورد کە لە تورکیا خراونەتە بەندیخانە .

سپاسی سەرۆکی کۆنگرێس دەکەم کە رێگەی پێدام باسی ئەم مەسەلەیە بکەم، ئەمە مەسەلەیەکە کە پەیوەندی بە مافی کوردەکانەوە هەیە هەروەها کە بڕیارنامەی ۱۳۷ پەیوندی بە مافی خەلکی عێراقەوە هەیە. ئەرکی ئێمەیە(وەك ئەندامانی کۆنگرێس و هاووڵاتی گەورەترین وڵاتی دیموکراسی جیهان) کە باسی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ بکەین، چ ئەم پێشێلکارییە لەلایەن دوژمنەکانمانەوە کرابێت چ لەلایەن دۆستەکانمانەوە. سپاسی نوێنەری ئەیالەتی فلۆریدا، بەڕێز" هاستینگز" دەکەم کە کاتی خۆی دا بە من و سپاسی هەوڵە زۆرەکانی دەکەم بۆ داکۆکیکردن لە مافی مرۆڤ و هەروەها سپاسی نوێنەری ئەیالەتی نیوریورك، بەڕێز " گیلمان" دەکەم کە داکۆکی دەکات لە مافی مرۆڤ لەم کۆنگرێسە.

پێموایە هەمووومان دەبێ پێکەوە هەوڵ بدەین بۆ ئازادی ئەم سیاسەتمەدارە کوردانە کە لە تورکیا خراونەتە بەندیخانە و داکۆکی لە مافی خەلکەکەی خۆیان دەکەن. کەوابوو ئەمڕۆ من هاوخەمی خۆم لەگەڵ ئەم مانگرتووانە دەردەبڕم. هەندێك جار

دهبیسم ههندێ كهس دهڵێن"بهلێ ئهمانه تروریستن". من ئهو كاتهمه دێتهوه یاد كه به "نیلسۆن ماندیلا" له باشووری ئهفریقایان دهگوت"تروریست"، تروریستێك كه جهنگاوهری ئازادیشه. ئهم سیاسهتمهداره كورده بهندكراوانه داوای ئازادی خهڵكهكهیان دهكهن.

بهڕێز "پۆرتێر":

بهلهبهرچاوگرتنی ئهو شتانهی كه ئێستا له عێراق ڕوودهدات ئهم بڕیارنامهیهی بهردهستمان ناتوانێت بڕیارنامهیهكی بهرۆژ بێت. جارێكی دیكه سهدام حوسهین سیمای ڕاستهقینهی خۆی وهك دیكتاتورێكی دڵڕهق نیشان دا كه دهیهوێت ههموو كارێك بكات بۆ ئهوهی له دهستی گهمارۆكان و پشكنینهكانی چهكه كۆمهڵكوژهكان ڕزگاری بێت. جهنابی سهرۆك بهداخهوه من له سهردهمێكدا گهوره بووم كه سهردهمی دیكتاتوره دڵڕهقهكان(هیتلهر، موسولینی و ئیستالین) بوو. ئهمانه كهسانێك بوون كه تاوانگهلی بهزمان نههاتوویان دژی خهڵكی خۆیان و كهمینهكانی خۆیان ئهنجام دا. ڕژێمی عێراقیش له شێوهی ههمان حكومهتی ئاڵمانیای نازی، ئیتالیای فاشیست و یهكێتی سۆڤیهتی كومونیستی ژێر دهسهڵاتی ئێستالینه. ئێمه دهبێت ههر ئێستا سهدام حوسهین ڕابوهستێنین، دهبێ گۆشهگیری بكهین و دڵنیابین لهوهی كه جیهان پهی به سروشتی ئهم ڕژێمه دڵڕهقه بردووه. ئێمه دهبێ دڵنیابین لهوه كه سهدام حوسهین و ههموو ئهندامانی داروودهستهكهی وهك تاوانبارانی جهنگ و كهسانێك كه تاوانی دژی مرۆڤایهتیان ئهنجام داوه، بناسرێن. من خۆشحاڵم كه یهكێ له پشتیوانه سهرهكییهكانی ئهم بڕیارنامهیه بووم بۆ سپاردنی سهدام به دهستی دادپهروهری به هۆی ئهو تاوانانه كه دژی خهڵكی عێراق و هاوولاتیانی ولاتانی دیكه ئهنجامی داوه ،

لەوانە خەڵکی ئەمریکا. کوردەکان، عەرەبە مارشەکان، کەمینەی ئاشووری، ئەندامانی کۆنگرێسی نیشتمانی عێراق و دیلە کویتیەکانی جەنگ، تەنها چەند نمونەیەك لە قوربانیانی سەدام و رژێمە دلڕەقەکەینی.

جەنابی سەرۆك، سەدام چەکی کیمیایی دژی خەلکی خۆی بەکار هێناوە. لە ساڵی ١٩٨٨ ، ٨ هەزار کورد لە هەڵەبجە لە ئەنجامی هێرشی سەدام بە چەکی کیمیایی( کە خۆی بەرهەمی هێنابوو*) کوژران. ئێستا ئێمە لە عێراقداین و هەوڵ دەدین ئەوە روون بکەینەوە کە ئایا ئەم چەکانە لە عێراقدا ماون و بەتایبەت چەکی کیمیایی VX کە هەروەك کیمیایی "سارین°" دەتوانێ خەڵك بکوژێت بە هەمان شێوە کە کوردەکانی عێراقی لە هەڵەبجە کوشت. بە بیروبۆچوونی من سەدام بێ هیچ گومانێك تاوانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانی دژی ئاشتی ئەنجام داوە و یاساکانی مافی مرۆڤی بە توندی پێشێل کردووە. ئەگەر ئەمڕۆ تەنها یەك کەس لە جیهاندا هەبێت کە هەق بێ بدرێتە دەستی دادپەروەری، ئەو کەسە سەدام حوسەینە.

من پیرۆزبایی ئەم بڕیارنامەیە دەکەم لە هاوکارانم و داوا لە هەموویان دەکەم تەڤلی من بن بۆ ئەوەی پەیامێکی بەهێز بنێرین بۆ سەدام حوسەین و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەربارەی ئەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تاوانەکانی سەدامی لە بیر نەکردووە و ئێمە بە بەرپرسیاری دەزانین بۆ ئەم پێشلکارییانە و داوای دادپەروەری دەکەین بۆ قوربانیەکانی.

---

* ئاڵێت ئەمریکا و ئەوروپا ئەم چەکیان پێدابوو- وەرگێڕ

°sarin

جەنابی سەرۆك، هەر ئێستا چەند کوردێك لە سەر پلەکانی بینای کۆنگرێس مانیان لە خواردن گرتووە، ٢٥ ڕۆژە ئەم کوردانە بۆ ئازادکردنی لەیلا زانا مانیان لە خواردن گرتووە کە پارلمانتارێکی کوردی تورکیایە کە لە ساڵی ١٩٩١ وەك ئەندامی پارلمان هەڵبژێردرا و لە ١٩٩٣ سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کرد بۆ شایەتیدان لە بارەی پێشێلکردنی مافی کەمینەی کورد لە تورکیا و لە بەرامبەر کومیتەیەکی هەمیشەیی کۆنگرێس و کومیتەی مافی مرۆڤی کۆنگرێس شایەتی دا. لەیلا زانا پاش ئەوەی گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە لە پۆستەکەی لابرا، دەستبەسەر کرا ، بەتاوانی خیانەت دادگایی کرا و حوکمی ١٥ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپا تەنها بە تاوانی ئەوەی کە هزری خۆی هێناوەتە سەر زمان و لە بەرامبەر کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا شایەتی داوە.

جەنابی سەرۆك، ئێستا تورکیا و عێراق بەیەکەوە هێرش دەکەنە سەر کوردەکان لە باکووری عێراق. تورکیا بە دەیان هەزار سەربازی تایبەت سنووری عێراق دەبەزێنیّ و بە بومبای ناپاڵم و هێشوویی هێرش دەکاتە سەر کوردەکانی خۆی کە لە تورکیا هەڵهاتوون. عێراقیش لەو لاوە هەروا دەکات. هەردوویان ئێستا کوردەکانی خۆیان دەچەوسێننەوە. هەمووی ئەو وڵاتانەی کە کورد تێیدا دەژین واتا ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا کەمینەی کورد دەچەوسێننەوە. هەموویان کوردەکان دژی یەکدی هان دەدەن و هەوڵ دەدەن بەم شێوەیە سەرکوتیان بکەن و هەموویان بە خەڵکی کورد دەڵێن "تروریست"، لە کاتێکدا کە کوردەکان تەنها داوای مافە سەرەتاییەکانی خۆیان دەکەن و تەنها خۆیان لە بەرامبەر چەوساندنەوەدا دەپارێزن.

جەنابی سەرۆك ئەم چەوساندنەوەیە دەبێ کۆتایی پێبێت. کورد تیرۆریست نیە. لەوانەیە هەندێ کەس لە سەر ئەو باوەڕە بن کە ئیللا کوردەکان تروریستن بەڵام کوردەکان تروریست نین. کوردەکان تەنها داوای مافی خۆیان دەکەن، ئەو مافەی کە دەوڵەتی تورکیا، دەوڵەتی ئێران، دەوڵەتی سوریا و رژێمی سەدام حوسەین لە عێراق، لێیانی زەوت کردووە. ئەو دەوڵەتانە تروریستن کە کوردەکان سەرکووت دەکەن، ئەو دەوڵەتانە تروریستن کە مافە سەرەتاییەکانی کوردەکان زەوت دەکەن و لە ناو کۆمەڵگای خۆیاندا رێزیان لێ ناگرن و هەر رۆژ خۆیان و منداڵەکانیان دەکوژن و هەوڵ دەدەن کوردەکان لە کۆمەڵگای خۆیان دەربکەن. جەنابی سەرۆك، تروریستی ڕاستەقینە ئەم دەوڵەتانەن.

سەردەستەی ئەم دەوڵەتانە، سەدام حوسەینە کە رژێمەکەی وەڵامی هیچ کەس ناداتەوە و حیساب بۆ گوشاری بیروڕای گشتی و بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتووەکان ناکات. ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئەم رژێمە گۆشەگیر بکەین، کاتی ئەوەیە ڕابگەیەنین سەدام کێیە، سەدام کەسێکە کە تاوانی دژی مرۆڤایەتی ئەنجام داوە کە هەموومان نفرەتی لێدەکەین، ئێستا کاتی ئەوەیە رووی ڕاستەقینەی سەدام نیشان بدەین و دادگایی بکەین و لەسەر دەسەڵات لای ببەین و دەوڵەتیك لە عێراق پێك بهێنین کە لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و دراوسێکانی بە ئاشتی بژی و پێش بەم رژێمە دیکتاتورە خوێنرێژە دڵڕەقە بگرین بۆ سەرکووتی زیاتری خەڵکەکەی و هەڕەشەکردن لە دراوسێکانی.

بەڕێز "لانتۆس":

جهنابی سهرۆك سپاسی هاوسهرۆکی (سهربه پارتی کۆماری) کومیتهی مافی مرۆڤی کۆنگرێس و نوێنهری ئهیالهتی ئیلۆنۆیز، بهڕێز "پۆرتێر" دهکهم بۆ لێدوانه بههێز و پاراوهکهی و ههروهها سوپاسی سهرۆکی کومیتهی پهیوهندییه نێونهتهوهییهکان دهکهم بۆ خهباته بێ وچانهکهی بۆ مافی مرۆڤ و ئامادهکردنی بڕیارنامهی ۱۳۷. من بهتهواوی لهگهڵ ئهو وتانهدام که سهبارهت به سهدام و رژێمه سهرکوتکهرهکهی هێنایه سهر زمان.

جهنابی سهرۆك ههر ئێستا کهسانێك ههن له رۆژئاوا که داکۆکی له سهدام و رژێمه درندهو دڵڕهقهی دهکهن. ههندێك له وڵاتانی رۆژئاوا ههن که ناتوانن له بازرگانیه پڕ ڕهونهق و بهرفراوانهکهیان لهگهڵ عێراق چاوپۆشی بکهن، سهرهڕای ئهو ڕاستیه که رژێمی سهدام حوسهین ههوڵی داوه پێشکهوتنه بهردهوامهکانی خۆی له بواری بهرههمهێنانی چهکه کۆمهڵکوژهکان بشارێتهوه و به درۆی بخاتهوه و حاشای لێبکات. پاشنیوهڕۆی ئهمڕۆ، کۆنگرێس ههلی ئهوهی بۆ دهڕهخسێت تاوتوێی بڕیارنامهیهك بکات که ڕوانگهی کۆنگرێس دهردهبڕێت سهبارهت بهوهی که ئهگهر ڕێگا ئاشتیخواز و دیپلوماتیکهکان سهرنهکهوت دهبێ ڕێگاچارهی سهربازی(باشتر ئهوهیه له ڕێگای هاوپهیمانی نێونهتهوهیی بێت) بهکار ببرێت بۆ لهناوبردنی توانایی کیمیایی، بیولوژیك، ناوکی و موشهکی سهدام حوسهین. بهڵام ئهم مهسهلهیه له ههمان کاتدا که مهسهلهیهکی سهربازییه، پهیوهندی به مافی مرۆڤیشهوه ههیه.

رژێمێك که به چهکی کیمیایی هێرشی کردووته سهر خهڵکی خۆی، رژێمێك که خراپترین و توندترین پێشێلکارییهکانی مافی مرۆڤی له سهدهی ۲۰ دژ به خهڵکی خۆی ئهنجام داوه دهبێ راکێشی دادگایهکی نیونهتهوهیی بکرێت و به تاوانی دژی

مرۆڤایەتی دادگایی بکرێت. ئەگەر تەنها یەك کەسی سەرەکی هەبێت کە دەبێ لە بەرامبەر کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی دادگایی بکرێت، ئەو کەسە سەدام حوسەینە. دڕندەیی، دڵڕەقی و بەخوێن تینووبوونی سەدام هیچ سنوورێك ناناسێ. داوا لە هەموو هاکارانم دەکەم پشتیوانی لە هەنگاوە گرنگەکانی ئەم بڕیارنامەیە بکەن.

بەڕێز" ڕۆهراباچێر" [٦]:

جەنابی سەرۆك، من بەتوندی پشتیوانی لە وتەکانی بەڕێز "پۆرتێر" دەکەم سەبارەت بە دادگاییکردنی سەدام بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانەکانی جەنگ. من دەنگم دا بە جەنگی کەنداو، لە کاتێکدا کە لە ناخی دڵمەوە رازی نەبووم بەم دەنگە بەڵام دەمزانی بەرژەوەندی نەتەوەیی و ئاسایشی نەتەوەییمان لە مەترسیدایە. پاشان بەخێرهاتن ی سەربازەکانمان کرد لە کاتی گەڕانەوە سەرکەتووەکەیان بۆ وڵات کە یەکێ لە گەورەترین و درەوشاوەترین سەرکەوتنەکانی مێژووی وڵاتی ئەمریکایە.

بەڵام کاری ئێمە تەواو نەبووە، ئەگەر شتێك هەبێت کە سەرۆك بوش حەسرەتی بۆ بخوات ئەو ڕاستییەیەکە سەدان هەزار سەربازی نارد بۆ کەنداوی فارس بەڵام کاری سەدامی تەواو نەکرد. روونە کە دوژمنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خەڵکی عێراق نەبوون. وتەکانی ئەمڕۆی بەڕێز "پۆرتێر" لەسەر دوژمنێکی ڕاستەقینە چڕ بووەوە، دوژمنێك کە نەتەنها دوژمنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، بەڵکو دوژمنی ئەو خەڵکەیە کە باوەڕیان بە مافی مرۆڤ و مافە دیموکراتیکەکان هەیە و ئەم

---

[٦] Mr. ROHRABACHER

دوژمنەش سەدام حوسەین و دارودەستە خوێنڕێژەکەیەتی کە بە سەر عێراقدا دەسەڵاتداری دەکەن.

لە کاتی جەنگی کەنداو، ئێمە سەدان هەزار جوان و چەندەها ژن و منداڵمان کوشت کە دوژمنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەبوون و گەلێکیان لەلایەن دیکتاتورێك بە ناوی سەدام حوسەینەوە لە سوپادا بەکارهێنرابوون. ئەم بڕیارنامەیە دەچێتە ناو ناخی مەسەلەکە. سەدام حوسەین دوژمنی ئێمەیە، ئێمە دەبێ ئەم پیاوە رسوا بکەین. دەبێ سەدام وەك تاوانبارانی دیکەی جەنگ دادگایی بکرێت، با ئەم تاوانبارە "ئادۆلف هیتلەر" بێت یان هەندێ لە پیاوکوژەکانی"سرب[٧] " کە ئەم دواییانە تاوانی ژینوسایدیان لە "بۆسنیا" ئەنجام دا.

جارێکی دیکە ئەم ڕووداوانە نیشان دەدات کە لە نێوان ئاشتی و ئازادی و خۆشبەختیدا پەیوەندی هەیە. ئەگەر ئێمە بۆ ئاشتییەکی وا کورتخایەن چووینەتە کەنداو و سەربازەکانمان بەم زووانە بگەڕێنینەوە وڵات و پەیوەندی خۆمان لە گەڵ دیکتاتورەکان نەپچڕێنین، نە ئاشتیمان دەست دەکەوێت و نە ئازادی. ئێمە ناتوانین لە سەر بایەخی ئازادی سازش بکەین لە بەر ئەوەی سەرەنجام دەمانخاتە ناو بارودۆخێك کە ئاسایشەکەمان لەگەڵ هەڕشەی هێرش بەرەوڕوو دەبێتەوە.

با ئەو ٦٠٠ کویتیە لە بیرنەکەین کە چارەنووسیان هێشتا نادیارە. هەزاران هەزار بنەماڵەی کوێتی، یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەکەیان لە دەست داوە کە لە کاتی داگیرکرانی ئەو وڵاتە لەلایەن هێزەکانی عێراق کوژراون یان بەدیل گیراون. ئەمە وەك ئەوە وایە میلیونەها ئەمریکایی یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەیان لە دەست بدەن یان هیچ

[٧] Serbian

ئاگایەکیان لە چارەنووسیان نەبێت. دەبێ حیسابێك بۆ دیلە کویتیەکانی جەنگ هەبێت، دەبێ حیسابێك بۆ تاوانەکانی سەدام حوسەین هەبێت. با ئەوە وەبیر بێنینەوە کە لەو کاتەوە کە یەکێتی سوڤیەت لە روسیای دیموکراتیکی ئەمڕۆدا دەستی بە کرانەوە کردووە یان درێژە بە هەوڵەکانی دەدات بۆ ئەوەی ببێ بە روسیایەکی دیموکراتیك، شانسی ئاشتی زۆرتر بووە. داخوازی ئازادی عێراق و لەناوچوونی دیکتاتوری سەدام حوسەین، شانسی ئاشتی لە هەموو ناوچە زیاد دەکات و ئاسایشی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش مسۆگەرتر دەکات. من بە توندی پشتیوانی لە پێشنیارەکەی بەڕێز "پۆرتێر" دەکەم بۆ دادگایی کردنی سەدام.

بەڕێز" وۆلف "[٨]:

جەنابی سەرۆك من بە توندی پشتیوانی دەکەم لە بڕیارنامەی ١٣٧ ی کۆنگرێس کە دەوڵەتی عێراق شەرمەزار دەکات بە هۆی سەرکوتکردنی بەردەوام و ترساندن و تۆقاندنی کوردەکان. بەداخەوە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا ڕۆژئاوا سەرنجی بە کەشوهەوای ترساندن و تۆقاندنی سەدام نەداوە بەڵام لە ڕێگای ئەم بڕیارنامەیە و هەوڵی خودی کوردەکان، خەڵك زۆرتر سەرنجی پێ دەدات. ئەم بڕیارنامەیە پێکهاتنی دادگای تاوانەکانی جەنگ هان دەدات بۆ دادگایی کردنی سەدام حوسەین و کاربەدەستانی دیکەی دەوڵەتی عێراق بە هۆی تاوانەکانیان دژ بە مرۆڤایەتی.

دەمەوێت سپاسی بەڕێز "پۆرتێر" و بەڕێز " گیلمان" و ئەندامانی دیکەی پشتیوانی ئەم بڕیارنامەیە بکەم. خۆشبختانە ئەم بڕیارنامەیە نە تەنها پەیامێکە بۆ خەڵکی ئەمریکا، بەڵکو پەیامێکە بۆ خەڵکی کورد لە سەراسەری جیهان و بەتایبەت خەڵکی

---

[٨] Mr. WOLF

ناوچە کە کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا واتا خانووی خەڵکی ئەمریکا زۆر زۆر بەوردی چاودێری دەکات بە سەر بارودۆخەکەدا.

دەوڵەتی عێراق دەوڵەتیکی خراپە، سەدام حوسەین دیکتاتورێکی دڕندەیە کە لە بیری هیچدا نییە جگە لە پاراستنی دەسەڵاتی خۆی. سەدام خەڵکی عێراقی چەوساندووە و سەرکووت کردووە و لەگەڵ رۆژئاوا کەوتووتە ناو کایەکی مەترسیدار. سەدام لە کوشتنی ئەندامانی بنەماڵەی خۆی سڵ ناکات کە راستیەکانی رەفتارە دڕندەکانی ئەویان درکاندووە یان هەڕەشەیان لە دەسەڵاتەکەی کردووە.

سەدام بە شوێن ئەوەدایە کوردەکانی باکووری عێراق پاکتاو بکات کە بە هۆی جوگرافیاکەیان گیریان خواردووە. کوردەکانی باکووری عێراق هیچ شوێنێکیان نییە تا لەم بارودۆخە زۆر خراپە هەڵبێن و بچنە ئەو شوێنە. کوردەکان کوژراون و ئێستاش دەکوژرێن، زیندانی کراون و ئێستاش زیندانی دەکرێن، ئەشکەنجە دراون و ئێستاش ئەشکەنجە دەدرێن و سەرکووت کراون و ئێستاش هەر سەرکووت دەکرێن. خۆشبختانە لە رێگای ئەم بڕیارنامەیە ئەو پەیامە دەدرێت بە سەدام کە رۆژئاوا ئاگاداری کردەوەکانیەتی و ئەو پەیامەش دەگەیەنێت بە کوردەکان کە ئێمە بە وردی ئاگاداری بارودۆخەکەیانین و پشتیوانیان لێ دەکەین.

بەڕێز "پاوڵ":

جەنابی سەرۆک، بەدڵنیاییەوە منیش لە گەڵ ئەو رەخنە توندانەم کە لە دەوڵەت و رێبەرانی عێراق گیرا. بەڵام لەگەڵ ئەو شتانە نیم کە ئێمە هەوڵ دەدەین لێرە بیکەین، نە لە بەر ئەوە کە ئەم هەوڵانە بەباش نەزانم بەڵکوو بە هۆی ئەوەی ئەو دەسەڵاتە لە خۆماندا نابینم کە بتوانین کتووپڕ سیستمی دادپەروەری خۆمان بە سەر سەراسەری

جیهاندا بسەپێنین. پێموانییە ئەمە شتێکی کاریگەر و بە سوود بێت و پێموایە دوژمنایەتی لەگەڵ ئەمریکا زیادتر دەکات لەباتی ئەوەی دادپەروەری دەستەبەر بکات. بەڵام لێرە تۆزێ پارادوکس بەدی دەکرێت. پێشتر ئاماژە بەوە کرا کە تەنها دەوڵەتی عێراق نییە کە مافی کوردەکان پێشێل دەکات، بەڵکو دەوڵەتی تورکیاش بە هەمان شێوە مافی کوردەکان پێشێل دەکات. کەوابوو بۆ ئەم بڕیارنامەیە تورکیاش لە خۆ ناگرێت؟ بۆ ئێمە ناوی تورکیاش نەهێنین و کردەوەکانی نیشان نەدەین و خوازیاری ئەوە نەبین کە دادپەروەریش بە نیسبەت تورکیا جێبەجێ بکرێت، با هاوپەیمانیشمان بێت.

لە هەمان کاتدا ئێمە کۆمەڵێك گیروگرفتی سەرەکی دیکەش پشتگوێ دەخەین. ئێمە چیمان کردووە و لە گەڵ چین؟ ڕێبەرانی دەوڵەتی" صین" هاتنە ئێرە ، فەرشی سوور لە بەر پێیان ڕاخرا و بەڵێنی پارەی زۆرتریان پێدرا. بەڵام دەوڵەتی "صین " لە مەیدانی "تیانانمێن[9]" چۆن لە گەڵ خەلکەکەی رەفتاری کرد و ئێستاش لە سەراسەری وڵاتەکەی رەفتار دەکات؟ ئەوان لە وێ کەڵکی خراپ لە ئازادییە مەدەنیەکان وەردەگرن. بەڵام ئایا ئێمە دەمانەوێت هەمان شت بکەین؟ ئایا ئەندامانی کۆنگرێس وابیردەکەنەوە کە ئێمە دەتوانین وابکەین؟

ئێمە ئەم دەست و ئەو دەست دەکەین و وا دەنوێنین کە دەمانەوێت ئەم سیستمە گەورە دادپەروەرییە لە جیهاندا جێبەجێ بکەین. ئەندۆنیزیاش هەروا، بە دەیان بیلیون دولار پارەی باجی هاووڵاتیانی ئەمریکا دەدرێت بە دەوڵەتی ئەندونیزیا، لە کاتێکدا کە ئەو رەفتارە زۆر خراپەیان هەیە لە گەڵ خەلکی" تەیموری رۆژهەڵات".

---

Tiananmen Square [9]

بەڵام ئێمە لێرە کتوپڕ بڕیار دەدەین کە دەمانەوێت (لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ) پارەی باجی هاووڵاتیانی ئەمریکا خەرج بکەین و ژیانی سەربازانی ئەمریکا بکەین بە قوربانی بۆ ئەوەی دەمانەوێت دادپەروەری جێبەجێ بکەین. ئایا ئێمە ئەو دەسەڵاتمانە هەیە کە ببین بە پۆلیسی جیهان؟ من پێموانییە ئەم دەسەڵاتمان هەبێت. پێموایە بەگشتی بە زەرەری ئاسایشی نەتەوەییمان بێت. پێموایە ئەمە هەڕەشەیە بۆ خەڵکی ئەمریکا و ناراستەوخۆ، بە گەلێ لە شێوەکان هەڕەشەیە بۆ باجدەرەکانی ئەمریکا. من دژی ئەم کارەم، دژی گەلێ لەم جۆرە پێشنیارانەم. دژ بەو سزا و ئەو تاوانانە نیم کە دەخرێنە پاڵ عێراق و ڕێبەرایەتیەکەی. من ڕەخنەی توندم هەیە بەنیسبەت شێوازی هەوڵەکانمان بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە زۆر جیدییانە.

بەڕێز "روهراباچێر":

جەنابی سەرۆک، ئایا مەبەستی بەڕێز "پاوڵ" ئەوە بوو کە هیچ پەیوەندییەك نییە لە نێوان ئازادی و ئاشتیدا؟

بەڕێز "پاوڵ":

جەنابی سەرۆك، من بە دڵنیاییەوە نازانم بەڕێز" روهرا باچێر " بە شوێن چیدایە، بەڵام دەزانم گرنگترین شت بۆ ئازادی و ئاشتی بە لای منەوە، گوێڕایەڵبوون بەیاسای بنەڕەتییە. یاسای بنەڕەتی لە کوێ ئەو دەسەڵاتەی بە ئێمە داوە کە ببین بە پۆلیسی جیهان؟

بەڕێز "رۆهراباچیر":

کەوابوو بەڕێز پاوڵ دەڵێت کۆنگرێس نابێت "ئادۆلف هیتلەر" شەرمەزار بکات لە بەر ئەوەی هێرشی نەکردووەتە سەر دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئایا مەبەستی بەڕێز پاوڵ ئەمەیە؟ ئایا ئەمە سیاسەتی دەرەوەی بەڕێز پاوڵە؟

بەڕێز "پاوڵ": پێموایە ئێرە شوێنی ئەم مشتومڕانە نییە. پێموایە کاتێك کە ئاسایشی نەتەوەیی ئێمە لەگەڵ مەترسی روبەڕوویە، خەڵکی ئەمریکا مافی ئەوەیان هەیە لە ڕێگای کۆنگرێسەوە جەنگ رابگەیەنن. ئەمە لە شێوەی ئەو بارودۆخەیە کە جەنگەکانی ڤیەتنام و گەمارۆکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی لێکەوتەوە، لە شێوەی ئەو بارودۆخەیە کە جەنگی کۆریا و ڤییەتنام و جەنگە بێ سوودەکانی دیکەی لێکەوتەوە. هەر بۆیە ئێمە جەنگی کەنداوی فارسمان نەبردەوە و هێشتاش لەگەڵ ئەم کێشەیە بەرەوڕووین.

بەڕێز "رۆهرا باچیر":

کەوابوو بە بیروبۆچوونی بەڕێز پاوڵ، ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جەنگی دژی عێراق رانەگەیاندبایا، چی لە گەڵ ئەم دیکتاتورە بکردبایا؟

بەڕێز" پاوڵ ":

من لە سەر ئەو باوەڕەم کە کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیارە لە بەرامبەر ئەوەی لەوە دڵنیابێت کە کاتی ئەوەیە جەنگ ڕابگەیەنێت.

جەنابی سەرۆك، بە کورتی من هیچ رەخنەیەکم نییە لەو کەسانەی کە ڕێبەرایەتی عێراق دەبەنە ژێر پرسیار. من ڕێبەرایەتی عێراق شەرمەزاردەکەم. کێشەی من لەگەڵ ئەو تەکنیکەیە کە ئێمە بەکاری دەبەین، کێشەی من لەگەڵ ئەو رەوتەدایە کە ئێمە کەڵکی لێوەردەگرین، پێموانیە ئێمە دەسەڵاتی ئەوەمان هەبێت. لە درێژ خایەندا

ئەمە بە قازانجمان نییە. کاتێ کە ئێمە باسی صین(چین) دەکەین بە تەواوی لە ناتەباییداین. ئەو بڕیارنامە دەستنیشانکراوانە کە ئێمە بۆ صین دەرمانکردوون، بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە بەکار نایێت. لە هەمان کاتدا، ئێمە پارەی زۆرتر دەدەین بە صین، دەیدەین بە تورکیا، دەیدەین بە ئەندونیزیا و هەموویان ئازادییەکانی هاوولاتیانی خۆیان پێشێل دەکەن.

بەڕێز "پۆرتێر":

جەنابی سەرۆك، تەنها دەمەوێت ئەوە بە بەڕێز "پاوڵ " بڵێم کە بە دڵنیاییەوە ڕێزم هەیە بۆ قسەکانی بەڵام لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی نیم. ئەگەر بەڕێز "پاوڵ" ئەم بیروبۆچوونانەی لە پارلەمانی تورکیا یا عێراق یا ئەندونیزیا دەربڕایا لەگەڵ چارەنووسێك وەك چارەنوسی لەیلا زانا و پارلەمانتارە کوردەکانی دیکە بەرەوڕوو دەبووەوە واتا دەکەوتە بەندیخانە.

بە هەرحاڵ من لەگەڵ ئەو بەشە لە قسەکانی بەڕێز "پاوڵ" دام سەبارەت بەوەی کە ئێمە نابێت ئیدی پارە بە دەوڵەتی تورکیا بدەین هەتا کاتێك کە کوردەکان سەرکووت بکات. یا ئیدی پارە بە دەوڵەتی ئەندۆنیزیا نەدەین کە ئازادییە ئایینیەکانی خەڵکی "تیمووری رۆژهەلات" زەوت دەکات، یا پشتیوانی لەو دیکتاتورانە نەکەین کە مافی بنەڕەتیەکانی خەڵکەکەیان پێشێل دەکەن. من لە سەر ئەو باوەڕەم کە ئێمە دەبێت زۆر شەفاف کار بکەین و ناتەبایی لە کارماندا نەبێت. ئێمە ٩ بڕیارنامەمان دژی صین پەسەند کردووە. ئەم بڕیارنامانە کاریگەریان هەبووە، بەتایبەت ئەو بڕیارنامەیە کە پەیوەندی بە "رادیو ئاسیای ئازاد"ەوە هەیە کە بۆ صین و تەبەت و کوریای باکوور و برمێ بەرنامە بڵاو دەکاتەوە.

بە بیروبۆچوونی من ئێمە توانایی ئەوەمان هەیە کاریگەری ئەرێنیمان هەبێت لە سەر کۆمەڵگای ئەم وڵاتانە. با ئێمە قەد دەست لە ئیدەئالەکانمان و باوەڕەکانمان هەڵنەگرین بە نیسبەت ئازادی مرۆڤ کە بنەمای کۆمەڵگای ئێمەیە.

## ١٤ ی ئاداری ١٩٩٨ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## هێزەکانی ئاسایشی تورکیا و گروپە"مرۆڤکوژەکان" پێکەوە هاوکاری دەکەن

بەڕێز ستینی هۆیەر:
جەنابی سەرۆك، سەر لە بەیانی دوێنێ "ئاکین بیردالْ"، سەرۆکی کۆمەڵەی مافی مرۆڤی تورکیا(IHD) لە ئوفیسی خۆی لە ئانکارا دەستڕێژی گوللەی کرایە سەر. گروپێکی توندئاژۆ بەرپرسیاریتی ئەم هێرشەی ـ کە بارودۆخی زۆر خراپ مافی مرۆڤی لە تورکیا ئەوەندەی دیکە شێواند ـ وەئەستۆ گرتووە.
لە ساڵی ١٩٨٦ وە بە ڕێبەرایەتی "ئاکین بیردالْ"، IHD بوو بە گەورەترین NGO ی سەربەخۆی چاودێری مافی مرۆڤ لە تورکیا. "ئاکین بیردالْ" لەبەرامبەر کومسیونی هلسینکی ئامادە بووە و لەگەڵ کارمەندەکانی لە واشنگتۆن و ئانکارا دیداری کردووە، و یاسادانەران و دیپلوماتەکانی سەراسەری جیهان ڕێزی زۆری لێدەگرن. لەم ساڵانەی دواییدا "ئاکین بیردالْ" خەڵاتی زۆری لە لایەن کومیتەی پارێزەرانی مافی مرۆڤ ، گروپی یاسای نێونەتەوەیی مافی مرۆڤ و NGO کانی ئەورووپا پێبخشراوە و ساڵی پار وەك جێگری سەرۆکی فدراسیونی نێونەتەویی یەکیتەکانی مافی مرۆڤ (FIHD) ـ کە ڕێکخراوێکی بەناوبانگ و متمانەپێکراوە ـ هەڵبژێردرا. ئەم هێرشە دژێوە بۆ تۆقاندن و سەرکوتکردنی خەباتی "ئاکین بیردالْ" بۆ مافی کرێکاران لە سەراسەری تورکیا ئەنجام درا.

دەوڵەتی تورکیا چالاکی ناتوندوتیژانە بۆ مافی مرۆڤ، بە تاوان لە قەڵەم دەدات. هێزەکانی ئاسایش و "گروپە مرۆڤکوژەکانی" باڵی راست پێکەوە هاوکاری دەکەن بۆ کوشتنی چالاکانی مافی مرۆڤ ، رۆژنامەنووسان، نەیارە کوردەکان و کەسانی دیکە. کاربەدەستانی تورکیا زیاتر لە ١٢ نووسینگەی IHD یان داخستوە و رێبەرانی IHD ، لەوانە خودی بەرێز "بیردالّ" لەگەڵ لێپرسینەوەی بەردەوامی دادگاکان رووبەڕوو بووەتەوە.

جەنابی سەرۆك، سەرەڕایْ مەترسی یەکجار زۆر بۆ سەر ژیانی "ئاکین بیردالّ"، ئەو و هاوکارەکانی ئەوەندە ئازان کە درێژەیان داوە بە دەربڕینی نارەزایەتی خۆیان دژی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە. IHD بە تایبەت رەخنەی لە"شەڕی پیسی" دەوڵەتی تورکیا دژی کوردە راپەڕیوەکان گرتووە. لەم هەفتانەی دواییدا کەشوهەوای ترسان و تۆقان لە تورکیا پەرەی سەندووە و گەلێ جار هەڕەشە لە بەرێز "بیردال" و بنەماڵەکەی کراوە. کاربەدەستانی ئاسایشی تورکیا بێ بنەما بانگەشەی ئەوە دەکەن کە"ئاکین بیردالّ" لە PKK فەرمان وەردەگرێت کە بزووتنەوەیەکی گریلایی کوردی نایاساییە لە تورکیا. بەرێز "بیردال" ئەم تۆمەتانەی بە توندی رەت کردووەتەوە و پیلانی بەرێکخستنکراوی دەسەڵاتدارانی سوپای تورکیا دژی ئەو کەسانە کە ناویان لە "لیستی دوژمنان"دایە ئیدانە کردووە.

جەنابی سەرۆك، تەقە کردن لە "ئاکین بیردالّ" تراژیدیایەکی گەورەیە بۆ هەموو ئەو کەسانە کە هۆگری مافی مرۆڤن. پشتیوانی شێلگیرانەی "ئاکین بیردالّ" لە ئاشتی و ناتوندوتیژی ئیلهامبەخشە بۆ گەلێ کەس لە ناوخۆی تورکیا و دەرەوە. IHD لەگەڵ NGO کانی سەراسەری جیهان هاوکاری کردووە بۆ بەرزراگرتی پەنجاهەمینساڵیادی

پەسەندكرانی جاڕنامەی گەردونی مافی مرۆڤ. لەم بۆنە پیرۆزەدا جێگای داخە كە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە توركیا خراپتر دەبێت و دەسەڵاتی بێ سنووری سوپا زیاتر دەبێت. دەوڵەتی توركیا لە باتی ئەوەی پشتیوانی لە چالاكی NGO سەربەخۆكانی مافی مرۆڤ بكات ـ كە یارمەتیەكی زۆر دەدەن بە پێشكەوتنی كۆمەڵگای مەدەنی و سەروەری یاسا ـ ئەم(NGO )انە سەركووت دەكات و بەرچەسپی"تروریست" لە ئەندامەكانی دەدات و بە ئاشكرا هێرشیان دەكاتە سەر.

جەنابی سەرۆك، دەوڵەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پشتیوانی سەربازی، ئابووری و سیاسی لە توركیا دەكات. توركیا ئەندامی ناتۆ و رێكخراوی ئاسایش و هاوكاری ئەوروپایە. كەوابوو من پێشوازی لەوە دەكەم كە وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە ئەم هێرشە شەرمەزار بكات و داوا دەكەم كە بكەرانی ئەم تاوانە بدرێنە دەستی دادپەروەری. بەهەرحاڵ دەوڵەتی ئێمە دەبێ زۆرتر كار بكات بۆ پابەندبوونی ئێمە بە چەسپانی دیموكراسی لە توركیا. ئەگەر ئێمە لەراستیدا بایەخ بە پەیوەندی سەقامگیر و درێژخایەن لەگەڵ توركیا دەدەین، نابێ درێژە بدەین بە پشتگوێ خستنی ئەو راستیە كە زاڵبوونی سوپا بەسەر سیاسەتدا زەبر لە دیموكراسی راستەقینە دەوەشێنێت. ناتوانایی سوپا یا ئیدارەی مەدەنی بۆ چارەسەركردنی ئاشتیخوازانەی كێشەی كورد یا سەرهەڵدانی چالاكی ئیسلامی سیاسی دەبێ بەكارەسات بۆ توركیا كە ئەنجامەكەی ئەوەیە كە توركیا لە رووی سیاسیەوە ناسەقامگیر دەبێت و رێگا خۆش دەبێت بۆ ئەوەی هێرش بكرێتە سەر چالاكانی مافی مرۆڤ و ئازادی رادەربڕین سنووردار بكرێت و ئازادییە بنەڕەتیەكانی دیكە پێشێل بكرێت.

جەنابی سەرۆك، هەروەها کە باسم کرد، بیرم لای "ئاکین بیردال"، بنەماڵەکەی، هاوکارەکانی لە IHD و هەموو ئەو کەسانەیە کە هۆگری مافی مرۆڤ و دیموکراسین و دوعای خەریان بۆ دەکەم. دوێنی رۆژێکی ناخۆش بوو بۆ هەمووان و ئێمە تەنها دەتوانین هیواداربین کە ئەم رووداوە خەڵك بخاتە ناو بیرکردنەوە و هانیان بدات بە جیدی کار بکەن بۆ باشترکردنی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا.

## ٤ ی ئابی ١٩٩٨ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا درێژە دەدات بە پشتگوێ خستنی بارودۆخی خراپی گەلی کورد

خاتوون ئیلیزابێت فۆرس، نوێنەری ئوریگون:
جەنابی سەرۆك، من دەمەوێت ئەمڕۆ بە نوێنەرایەتی لە لایەن ٤٠ میلیون کەس قسە بکەم کە شوناسی تایبەتی خۆیان هەیە بەڵام وڵاتیکیان نییە. ئەم گەلە، گەلی کوردە، گەلێك کە سەرزەمینەکەی چەند دەیەیە بەردەوام بووە بە گۆڕەپانی شەڕ و کاولکاری.
کورد، کەمینەیەکی چەوساوەیە. لە تورکیا قسەکردن دەربارەی کورد و مەسەلە کوردییەکان سووچە، کەس ناتوانێت ئاڵای کوردستان بەرز بکاتەوە یان تەنانەت کەسێکی دیکە بە ناوە کوردییەکەی بانگ بکات.
جەنابی سەرۆك، مافی مرۆڤ لە هەر شوێنی پێشێل بکرێت، من پێی زیز دەبم، بەڵام بەتایبەت لەوە توڕە و زیزم کە وڵاتی ئێمە درێژە دەدات بە پشتگوێ خستنی گەلی کورد و بارودۆخە دژوارەکەی. ساڵەهای ساڵە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو راپۆرت و هێما و بەڵگانە پشتگوێ دەخات کە پەیوەندی بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤی گەلی کوردەوە هەیە.

جەنابی سەرۆك، دەوڵەتی ئێمە دەبێ خۆی بدا لە قەرەی کێشەی کورد و سیاسەتێك بەنیسبەت کوردەکان بگرێتە بەر. ئێمە ناتوانین هەروا لەبەرامبەر چەوساندنەوەی میلیونەها کەس لەم گەلە بێ دەنگ بین.

ئێستا تورکیا شەریکێکی گرنگی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، ئەندامی ناتۆیە و بڕێکی یەکجار زۆر پارە لە ئێمە وەردەگرێت بەڵام پێشێلکردنی مافی گەلی کورد شتێکە کە قبوڵ ناکرێت. دەمەوێت سەرنجی هاوکارانم بەرەولای لەیلا زانا رابکێشم کە وەك ئەندامی پارلمانی تورکیا هەڵبژێردراوە. لەیلا زانا یەکەم ژنی کوردە کە وەك ئەندامی پارلمان هەڵبژێردراوە و کاندیدکراوە بۆ خەڵاتی ئاشتی "نۆبێل"، بەڵام لەیلا زانا دەستگیر کرا و بەتوندی بە دەستی پولیس لە ساڵی ١٩٨٨ ئەشکەنجە درا. سوچی لەیلا زانا چی بوو؟ تەنها ئەوە بوو کە بە نوێنەرایەتی لە لایەن ئەو بەندکراوانە کە ئەشکەنجە دەدران، بەشداری لە خۆپیشاندانێکی ئاشتیخوازانەدا کردبوو . بەهۆی داکۆکی لە کەرامەتی مرۆڤ و جاڕنامەی گەردونی مافی مرۆڤ، لەیلا زانای پارلمانتار ئێستا هاوڕێ لەگەڵ ٤ ئەندامی کوردی دیکەی پارلمانی تورکیا حوکمی ١٥ ساڵ بەندیخانەکەی تێپەڕ دەکات.

لەیلا زانا بۆ منی نووسیوە کە شێلگیرە" بەشێوەگەلی ئاشتیخوازانە درێژە بە خەباتەکەی بدات بۆ ئاشتی کورد و تورك، بۆ دیموکراسی و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ ". لەیلا زانا تەنانەت وتوویەتی: "کۆمەڵێك بایەخی جیهانی هەیە کە ئێمە پێکەوە دەبەستێتەوە" .

ئێمە وەك ئەندامانی هەڵبژێردراو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دەبێ ناڕەزایەتی خۆمان دژ بە پێشێلکاریی مافی کوردەکان دەرببڕین و داوای ئەوە بکەین کە دەوڵەتەکەمان سیاسەتێك بەنیسبەت کورد بگرێتەبەر.

## ٨ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## بڕیاری تورکیا بۆ مەحکوم کردنی لەیلا زانا پێشێلکردنی بێ ئەملاولای ئازادی ڕادەربڕینە

خاتوون ئیلیزابێت فۆرس:

جەنابی سەرۆك، دەمەوێت توڕەیی خۆم دەربڕم بەنیسبەت بڕیاری دەوڵەتی تورکیا بۆ مەحکوم کردنی لەیلا زانا، پارلمانتاری کورد کە حوکمی ١٥ ساڵ بەندیخانەی لەسەر دراوە و ئێستا زیاتر لە دوو ساڵە کە لە بەندیخانەدایە. ئەم حوکمە پێشێلکردنی یەکجار توندی ئازادی ڕادەربڕینە و سووکایەتیە بە پشتیوانانی لەیلا زانا لەسەراسەری جیهان. ئەمجارە کاربەدەستانی تورکیا تاوانی یاساشکێنیان خستووەتە پاڵ لەیلا زانا، بەهۆی ئەو نامەیە کە بۆ حیزبی گەلی دیموکراتیك(HADEP) نورسیویەتی و داوای لێکردوون دەستپێشخەربن، تێبکۆشن و شێلگیربن و داوای ئازادییە تاکەکەسی و بە کۆمەڵەکان بکەن.

ئەو ڕاستیە کە لەیلا زانا تۆمەتی"هاندانی ناکۆکی ڕەگەزی" خراوەتە پاڵ نیشان دەدات کە تورکیا دەوڵەتیکی ڕەگەزپەرەستە و بەردەوام دەنگی کوردەکان لە ناو حکوومەتدا کپ دەکات. هەروەها کە هاوکارانم دەزانن، لەیلا زانا یەکەم ژنی کوردە کە وەك ئەندامی پارلمانی تورکیا هەڵبژێردراوە و زیاتر لە ٨٤٪ ی دەنگەکانی لە ناوچەی خۆی بە دەست هێناوە و لە ئەنجوومەنی نیشتمانی باڵای تورکیا بەتوندی

لایەنگری لە مافی مرۆڤ کردووە و وتوویەتی دەبێ شەڕی دەوڵەتی تورکیا دژی کوردەکان کۆتایی پێبێت.

ساڵی پار ١٥٣ ئەندامی ئەم ئەنجوومەنە لە دەوری یەك کۆبوونەوە و نامەیەکیان نارد بۆ سەرۆك بیل کلینتۆن و داوایان لێکرد مەسەلەی لەیلا زانا لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیا باس بکات و داوای ئازادی دەستبەجێ و بێ شەرت ومەرجی ناوبراو لە بەندیخانە بکات. لەیلا زانا بێ تێگەیاندنی تاوانەکەی لە ٥ ی ئاداری ١٩٩٤ تا ٧ ی دیسامبری ١٩٩٤ لە بەندیخانەدا بوو. لە ٨ ی دیسامبری ١٩٩٤ دادگای ئاسایشی ئانکارا حوکمی چەند ساڵ بەندیخانەی بۆ لەیلا زانا و ٥ پارلمانتاری کوردی دیکە دەرکرد. لەیلا زانا تاوانی"لێدوانی خیانەتکارانە لە واشنگتۆن، دی سی"، "لێدوان لە شوێنەکانی دیکە" و "لە سەرکردنی سەرپۆشی کوردی سێ ڕەنگی سەوز، سوور و زەرد" ی خراوەتە پاڵ.

ئەمساڵ ساڵی پێنجەمە کە لەیلا زانا لە بەندیخانەدایە. تا ئەمڕۆ لە کوردستانی تورکیا ٤٠ هەزار کەس ژیانی خۆیان لەدەست داوە، زیاتر لە ٣ هەزار گەندی کوردنشین کاول کراون، زیاتر لە ٣ میلیون کورد ئاوارە بوونە و سەرەڕای ئاگربەستە یەکلایەنە یەك لە دوای یەکەکانی کوردەکان، سوپای تورکیا درێژە دەدات بە سیاسەتی دژایەتی کردن، ئەشکەنجە کردن، کوشتن و ژینوسایدکردنی گەلی کورد.

جەنابی سەرۆك، ٦ ساڵە من ئەندامی کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکام و ئێستا لەسەر ئەو باوەڕەم کە جێگای تورەبوونە کە دەوڵەتی تورکیا پاش ئەم هەموو داد و بێداد و داوا و پاڕانەوەیە و سەرەڕای خۆشەویستی گشتی لەیلا زانا، دەوێرێت

دیسان لەیلا زانا سزا بدات و دۆستان و پشتیوانانی لەیلا زانا لە سەراسەری جیهان توڕە بکات.

جەنابی سەرۆك، لەم پەیوەندییەدا تەنها یەك وشە دەگات بەمێشکی من، ئەویش"ترس"ە. دەوڵەتی تورکیا لە لەیلا زانا دەترسێت و وادەزانێت دەتوانێت بۆ هەمیشە پێش لە رێگای لەیلا زانا بگرێت. بەڵام هەروەها کە نەیانتوانی پێش لە رێگای نیلسون ماندیلا[1] بگرن، ناتوانن پێش لە رێگای "لەیلا زانا"ش بگرن.

جەنابی سەرۆك، لە کۆتایی هەموو شەوکارێکی درێژ، ئاسۆیەکی روون دێت. ئێستا بەڕێز "ماندلا" کەسایەتیەکی خۆشەویستە و جیهان شانازی پێ دەکات. کەسانێك وەك لەیلا زانا کە داوای ئاشتبوونەوە و پێکەوەسازان دەکەن، پێویستە لە ئامێز بگیردرێن، بایەخیان پێبدرێت و ئازاد بکرێن.

من داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکەم کە حوکمی مەحکومکردنی لەیلا زانا هەڵبوەشێنێتەوە و دەستبەجێ ئازادی بکات و داوا لە هاوکارانم و دەوڵەتەکەمان دەکەم کە مەحکومکردنی لەیلا زانا شەرمەزار بکەن و ئازادکردنی ئەو بکەن بە ئامانجی یەکەمی خۆیان.

[1] Nelson Mandela

## ١٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## ئاگربەستەکەی PKK دەرفەتێکە کە نابێ پشتگوێ بخرێت

بەڕێز فیلنێر:

جەنابی سەرۆك، ئەمڕۆ دەمەوێت پشتیوانی خۆم لە رووداوێك دەرببڕم کە گەلێ کەس لەم وڵاتەی ئێمە ئاگاداری نین بەڵام رووداوێکی زۆر گرنگە:

رێبەری بزووتنەوەی کورد، بەڕێز عەبدوڵا ئوجەلان لە ٢٨ ی ئابی ١٩٩٨ ئاگربەستێکی یەکلایەنەی راگەیاند.

بەڕێز عەبدوڵا ئوجەلان لە شوێنی ژیانی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە لە بەرنامەیەکی زیندووی MED- TV بەشداری کرد و رایگەیاند کە فەرمانی بە گریلاکانی داوە کە لە ١ ی ئەیلوولی ١٩٩٨ وە ئوپراسیونەکانیان رابوەستێنن و تا ئەوکاتە کە پاشان رادەگەیەنرێت، شەڕ نەکەن.

جەنابی سەرۆك، ئەمە هەلێکی گەورەیە بۆ هۆگرانی ئاشتی، بۆ داکوکیکارانی مافی مرۆڤ و قارەمانانی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی خاوەن سەرچاوەی نەوت کە ئەم ناوچە تەقینەرەیان گەمارۆ داوە کە ناوی"کوردستانە".

جەنابی سەرۆك، چەند ساڵە من لێرە لە ئەنجوومەنی نوێنەران هەوڵ دەدەم سەرنجی هاوکارانم بەرەولای خەباتی دوورودرێژی کورد بۆ ئاشتی، دیموکراسی و مافی مرۆڤ رابکێشم. من بەتوندی پشتیوانیم لە مافی بێ ئەملاولای"چارەی خۆنووسین" بۆ کورد

کردووە. کێ لە ئێمە هەیە کە رەفتارە درندەکەی سەدام حوسەین دژی کوردەکانی نەبیستبێت؟

حکوومەتی مەلاکان لە ئێران رێبەرانی پایەبەرزی بزووتنەوەی بەرخۆدانی کوردی کردووە بە ئامانج و گەلێ لە رێبەرانی بەتواناى ئەم بزووتنەوەیەی کوشتووە. تورکیا- ئەو وڵاتە کە ئێمە لە کاتی "شەڕی سارد" وەك قەڵخانیك لەبەرامبەر زیادەخوازی سۆفیەت پشتیوانیمان لێدەکرد- ئێستا سەرزمینی کوردەکان کاول دەکات.

جەنابی سەرۆك، ئێمە ناتوانین وڵاتیك بە دوست، هاوپەیمان و شەریکی خۆمان بزانین کە بنەماییترین پرەنسیپەکانی دیموکراسی وەك ئازادی رادەربڕین و دامەزراندنی کۆروکۆمەڵەکان پێشێل دەکات. کوردەکان کە یەك لە سێی دانیشتوانی تورکیا پێکدەهێنن و نفوسیان ۲۰ میلیونە و گەلێکی جیاواز و خۆماڵین کە ریشەیان لە ناخی مێژوودا داکوتاوە، لە مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ وەك دەربڕینی شوناسەکەیان، بەکارهێنانی زمانەکەیان و پێشخستن و ئەنجامدانی کولتوورەکەیان بێ بەشن. یاسای بنەڕەتی تورکیا ـ کە تەنها بەڵگەیە کە خەڵکی تورکیا پێکەوە دەبەستێتەوە ـ هیچ ئاماژەیەك بە بوونی کوردەکان ناکات. مادەی ۳ ی ئەم یاسایە بەکارهێنانی زمانی کوردی بەشێوەی نووسراوە و قسەکردن بەم زمانە لە شوێنە گشتیەکان قەدەخە دەکات. کەوابوو کوردەکان دەتوانن بە زمانی ئینگلیزی، فەرانسی یا ئاڵمانی کتێب بنووسن بەڵام ناتوانن بە زمانی زگماکی خۆیان بینووسن و ئەوانە کە ئەم یاسایە پێشێل بکەن حوکمی بەندیخانەیان لەسەر دەدرێت کە لەوانەیە تا سەد ساڵ درێژ بێت، بۆ نمونە کۆمەڵناسی بەناوبانگی تورك، "ئیسماعیل بیشکچی" تەنها بەهۆی نووسین دەربارەی کورد، حوکمی زیاتر لە ۱۰۰ ساڵ بەندیخانەی لەسەر دراوە.

جەنابی سەرۆك، گەلێ لە ئێمە باش ئاگاداری رەشەکوژی مێژوویی ئەرمەنیەکانین. لە ساڵی ١٩١٥ ئەرمەنیەکان بەشێوەی سیستماتیك لە ئیمپراتوری عوسمانی قەڵاچۆ کران. ئێستاش ستراتژییەکی هاوشێوە دژی کوردەکان ئەنجام دەدرێت.

جەنابی سەرۆك، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە بوێرانە و جەسورانە دەست لە سیاسەتی کۆنی خۆمان هەڵبگرین کە رێگە بە تورکیا بدەین هەرچی پێی خۆشە لەگەڵ کەمینەی کوردی خۆی بیکات. دەوڵەتی تورکیا خۆی لە بەرپرسیارەتییەکانی دزیوەتەوە و ١٨ ساڵە دەسەڵاتی سەراسەری ناوچەی کوردنشینی سپاردووەتە دەستی ژنراڵە تورکە دەمارگرژ و ئاشتنەبووەکان. ئەم ژنەراڵانە ٤٠ هەزار کەسیان کوشتووە و ٣ میلیون کەسیان لە زێدی خۆیان دەرکردووە و زیاتر لە ٣ هەزار گوندی کوردنشینیان کاول کردووە. پارلمانتارە کوردە بەهەق هەڵبژێردراوەکان ئێستا لە بەندیخانەدا دەپووکن و دەنگی ئاشتبوونەوە و پێکەوەژیان کپ دەکرێت. ئەمە تراژیدیکی مێژووییە کە ئێمە بە چاوی خۆمان دەیبینین.

ئێستا پێشنیاری ئاگربەستی رێبەری بزووتنەوەی کورد، بەرێز عەبدوڵا ئوجەلان پوتانسیەلی ئەوەی تێدایە کە ئاشتی بهێنێتەوە ناو ئەم ناوچە نەهامەتی لێدراوە و رێگا خۆش بکات بۆ پێکەوەژیانی کورد و تورك. بەرێز ئوجەلان رایگەیاندووە ئامادەیە هێزە(چەکدارەکانی) هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر تورکیا هەنگاو هەڵبگرێت و لە یاسای بنەرەتیدا بوونی ٢٠ میلیون کورد بەفەرمی بناسێت.

ئێستا هەندێ لە رێبەرانی بوێر و ئازا لە تورکیا دەڵێن ئەم قەیرانە دەبێ چارەسەر بکرێت. لە ١١ ی ئەیلوولی ١٩٩٨ حوسامەتین جیندۆروك[١]، رێبەری حیزبی

[1] Husamettin Cindoruk

دیموکراتی تورکیا که ئەندامی دەوڵەتی دەسەلاتداری ئیتیلافی تورکیایە، لەراستیدا دانی بەوەدا ناوە که دەبێ وتوویژ دەست پێبکات. هەروەها که بەڕێز "جیندروك" وتوویەتی تورکیا بە شاردنەوەی ئەم کێشانە و وەدواخستنی چارەسەرکردنیان، بە ڕێگای هەڵدێردا دەچێت. "جیندورۆك" وتوویەتی که ئەو وتوویژانە که"ڕێککەوتنی هەینی باش"[۲]ی لە نێوان ئیرلەندا و بەریتانیا دروست کرد، دەتوانێ ببێ بە مودیلێك بۆ وڵاتی تورکیا. ئەندامانی ڕێبەرایەتی گەورەترین حیزبی تورکیا، حیزبی "فەزیلەت" واتا ڕەجایی کوتان[۳] و" هاسیم هاسمی"[٤] ش کۆمەڵێك بیروبۆچوونی هاوشێوەیان دەربڕیوە. ئەم نوێنەرانە دەبێ بەهۆی ئازایەتی و بوێریان ستایش بکرێن، وتەکانیان ئاسۆیەکی روونە بۆ ئاشتی.

جەنابی سەرۆك، من تەنها ئەوەندەم لە دەست دێت سەرنجی هاوکارانم بەرەولای بارودۆخی دژواری گروپێك لە ژنانی کورد و تورك رابکێشم که لە بەردەم قوتابخانەی دواناوەندی گالاتاسارای[٥] کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی بێ سەروشوێن کردنی هاوسەرو مندالە ئازیزەکانیان لە ماوەی سێ ساڵی رابردوو لە تورکیا پروتستۆ بکەن. ئەم گروپە که بە"دایکانی شەمە"[٦] ناسراوە، ئەم مانگی کانوونی دووەمی رابردووە لەگەڵ هاوکارەکانمان، بەڕێز "جان پۆرتێر"، نوێنەری ئەیالەتی ئیلۆنویز و بەڕێز "ستین هۆیەر"، نوێنەری ئەیالەتی مریلەند و سەرۆکی ڕێکخراوی یەکێتی مافی مرۆڤ ، خاتوون "کاترین پۆرتێر" دیداری کردووە. بەگوێرەی جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان

[۲] good Friday agreement
[۳] Recai Kutan
[٤] Hasim Hasimi
[٥] Galatasaray High School
[٦] Saturday Mothers

بۆ"پاراستنی خەڵك له بێ سەروشوێن کردن"، دەسەڵاتدارانی تورکیا بەرپرسیارن که لێکۆڵینەوەی گونجاو، چڕوپڕ و بێ لایەن بکەن لەگەڵ هەموو ئەو راپۆرتانه که دەربارەی بێ سەروشوێن کردن بڵاو دەبنەوە. بە وتەی رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی، تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ لەم پەیوەندییەدا له تورکیا نەکراوە. ئەم بارودۆخه ناخۆشه بە گیرانی ۱۵۰ کەس بە دەستی پولیسی تورکیا له ۲۹ ی ئاب، خراپتر بووە.

جەنابی سەرۆك، بە راگەیاندنی ئەم ئاگربەسته له لایەن کوردەکانەوە، ئێستا هەلێك بۆ ئێمه رەخساوە. ئێمه یارمەتیمان دا بە پێکهاتنی"رێککەوتنامەی هەینی باش"، "وتووێژەکانی دایتون[٧]" و "رێککەوتننامەکانی ئیسرائیل ـ فەلەستین". ئێستاش دەبێ هەمان ئەو یارمەتیه بە کوردەکان بدەین.

[٧]Dayton talks

## ٢٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ - ئەنجوومەنی نوێنەران
## ئەو پاکتاوییە رەگەزییە کە لە کوردستانی تورکیا روو دەدات زۆر لە پاکتاوی رەگەزی کۆزۆڤۆ گەورەترە بەڵام دەوڵەتی ئێمە هیچ کارێك ناکات

بەرێز مایکێل پاپاس[1]، نوێنەری ئەیالەتی نیوجێرسی:
جەنابی سەرۆك، من ئەمرۆ دەمەوێت نیگەرانی خۆم دەرببڕم بەنیسبەت رێوشوێنە دووقاتەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئیدارەی کلینتۆن لە پەیوەندی لەگەڵ تورکیا. من ناتوانم لەوە تێبگەم کە بۆ هەر ئەو سیاسەتە کە ئیدارەی کلینتۆن ئێستا لەبەرامبەر سربەکانی بۆسنیا[2] = کە مافە بنەڕەتیەکانی ئالبانیاییەکانی کۆزۆڤۆ پێشێل دەکەن و حوکمی مەرگ بەسەر سەدان ژن و منداڵ ئالبانیایی لە کۆزۆڤۆ دەسەپێنن= گرتوویەتییەبەر، لە بەرامبەر تورکیا نایگرێتەبەر.
١٤ ساڵە سوپای تورکیا راست و دروست بەهەمان شێوەی "سرب"-ەکان، هەڵمەتێکی نامرۆڤانە بەرێوە دەبات بۆ پاکتاوی رەگەزی و سەرکوتی خەڵکی کوردی خۆی. لەئەنجامی شەڕی تورکیا دژی کوردەکان زیاتر لە ٣٠ هەزار کورد کوژراون و دو میلیون کەس ئاوارە و دەربەدەر بوونە. بارودۆخی کۆزۆڤۆ و کوردەکانی تورکیا قابلی قبوڵ نییە و دەبێ بە زووترین کات چارەسەر بکرێت بۆ ئەوەی لەمە زیاتر خەڵکی بێ گوناح نەکوژرێن. ئەگەر سوپای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئامادەیە دەستێوەردان

---
[1] MICHAEL PAPPAS

[2] Bosnian Serbs

له کۆزۆڤۆدا بکات، مرۆڤ دەتوانێت پرسیار بکات ئایا ئێمه ئامادەین هەمان سیاسەت دژی تورکیا بگرینەبەر؟ "ڕێوشوێنی دوقاتی" سیاسەتی دەرەوە، سیاسەتێکی باش نییه، بەتایبەت له کاتی ئێستادا که ژیانی خەڵکی بێ گوناه لەمەترسیدایه. داوا له ئیدارەی کلینتۆن دەکەم کۆتایی بەم سیاسەته بێنێت و هەر ئێستا دژ به تورکیا دست بەکار بێت.

جەنابی سەرۆك، ئینیستیتۆی یونانی - ئەمریکایی(AHI) نامەیەکی لەم پەیوەندییەدا ناردووه بۆ سەرۆك کلینتۆن که ئەمه دەقەکەیەتی:

١٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨

بەڕێز ویلیام ج کلینتۆن[٣]، سەرۆك کۆماری وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا ،

واشنگتۆن، دی سی

زۆر بەڕێز جەنابی سەرۆك کۆمار

قەیرانی ئێستای کۆزۆڤۆ[٤] منی پاڵپێوەنا تا جارێکی دیکه نامەتان بۆ بنووسم دەربارەی "ڕێوشوێنی دووقات[٥]" بەنیسبەت سیاسەتی دەرەوەی ئیدارەی ئەمریکا لەبەرامبەر تورکیا. لەکاتێکدا که دەوڵەتی ئێمه بەگوێرەی بڕیارنامەی١١٩٩ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوه یەکگرتووەکان، هەڕەشەی دەستێوەردانی سەربازی دژ

---

[٣] William J. Clinton

[٤] Kosovo

[٥] Double Standard

بە "سربستان" کردووە، ئێمە قەت نەمانتوانیوە هەمان ئەو ڕێوشوێنە لەبەرامبەر تورکیا بگرینەبەر.

ئینیستیتۆی یونانی ـ ئەمریکی زۆر نیگەرانی توندوتیژی کۆزۆڤۆیە و شەڕمەزاری دەکات. ئێمە پیشوازی لە هەوڵەکانی ئیدارەی ئەمریکا دەکەین بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی کۆزۆڤۆ و بە باشترین نەریتی بایەخە ئەخلاقی و مرۆڤیەکانی نەتەوەکەمانی دەزانین بەڵام بە هەرحاڵ ئەم بایەخانە لە تورکیاش لە ژێر هەڕەشەدایە کە سوپای تورکیا هەڵمەتێکی بێ بەزەییانە بۆ پاکتاوی ڕەگەزی و سەرکوتی هاووڵاتیانی کوردی خۆی بەڕێوە دەبات. دروست بەهەمان شێوە کە ئێمە لە کۆزۆڤۆ هەڵسوکەوت دەکەین، پێویستە وڵاتی ئێمە بەهەمان شێوە هەوڵ بدات بۆ پاراستنی بەرژەوەندی و بایەخەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تورکیا.

شەڕی ١٤ ساڵەی تورکیا دژ بە کەمینەی کوردی خۆی لە کوردستانی تورکیا(کە ٢٠٪ نفووسی تورکیا پێکدەهێنێ) لە کەس شاراوە نییە. هێزە چەکدارەکانی تورکیا زیاتر لە ٣٠ هەزار کوردیان کوشتووە و ٣ هەزار گوندیان کاول کردووە کە لەئەنجامدا زیاتر لە ٢ میلیون کەس ئاوارە بوونە. ئەو پاکتاوە ڕەگەزییە کە لە کوردستانی تورکیا رووی داوە، زۆر لە پاکتاوی ڕەگەزی کۆزۆڤۆ گەورەترە، بەڵام هێشتا دەوڵەتی ئێمە هیچ کارێك ناکات. کاربەدەستانی پایەبەرزی دەوڵەتی ئێمە بەردەوام ناڕەزایەتی خۆیان لە بارودۆخی کۆزۆڤۆ و بوسنیا دەربڕیوە و ئێمە هێزە چەکدارەکانی خۆمان خستووەتەگەڕ بەڵام هەمان ئەو کاربەدەستانە لەبەرامبەر تورکیا بە ئاشکرا بێ دەنگن. ئەگەر ئێمە هەروەها کە لە هەفتەکانی رابردوودا نیشانمان داوە، ئامادەین دەستێوەردانی سەربازی بە قازانجی ئالبانیاییەکانی کۆزۆڤۆ بکەین، دەبێ ئامادە بین

هەمان ئەو پرەنسیپانەش بە قازانجی کوردەکانی تورکیا بگرینەبەر، ئەگەریش وانەکەین و لە باتی ئەوە پشتیوانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تورکیا بەردەوام بێت، ئەوکاتە ئێمەش دەبین بە هاودەستی تورکیا بۆ پێشێلکردنی بەرفراوانی مافی مرۆڤ ، و ئەمەش لەکەی عارە لەسەر شەرەفی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا .

جەنابی سەرۆك، ولاتی ئێمە ناتوانێت بە سیاسەتی ڕێوشوێنی دوقات بژی . لە ساڵی ١٩٩١ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ عێراق شەڕی کرد بۆ دەرکرنی عێراق لە کوێت. لەبنەڕەتدا چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراق لە ١٩٩٠ و داگیرکردنی ٣٧/٣٪ ی خاکی قوبرس لە ١٩٧٤ لە لایەن تورکیاوە. هیچ جیاوازیەك نییە. لەراستیدا سوپای تورکیا کە دەوڵەتی ئەم ولاتە کونترۆڵ دەکات زۆر زیاتر لە سەدام حوسەین لە کاتی داگیرکردنی کوێت، یاساکان پێشێل دەکات. کردەوە توندەکانی ئیدارەی ئەمریکا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کۆزۆڤۆ زۆر ناتەبایە لەگەڵ پشتیوانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تورکیا بۆ سەرکوتی هاوولاتیانی کوردی خۆی(کە هەندێ کەس ژینوسایدی پێ دەڵێن) و خۆنەویستی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ دەرکردنی کۆمەڵێك بڕیارنامە لە ئەنجوومەنی ئاسایش و کۆڕی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ شەرمەزارکردنی داگیرکردنی نایاسایی قوبرس لە لایەن تورکیا لە ساڵی ١٩٧٤ وە. بۆ ولاتی ئێمە ئەوەندە بەپەرۆشە بۆ دەرکردنی بڕیارنامە دژ بە هەندێ دەوڵەت، و دەوڵەتەکانی دیکە پشتگوێ دەخات؟ بەداخەوە وەڵامەکەی ئەوەیە کە تورکیا، ئیرادەی دەوڵەتی ئێمەی لێسەندووەتەوە، کە ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکیەتی:

١ـ کاتێ که له ئوکتوبری ١٩٩٨ ، تورکیا ههڕهشهی سهربازی له سوریا کرد و هێزه چهکدارهکانی خۆی لهسهر سنووری سوریا وهگهڕخست، ئیدارهی ئهمریکا ئهم کردهوهیهی تورکیای وهك پێشێلکردنی مادهی ٤٢ ی مهنشووری نهتهوه یهکگرتووهکان و ههڕهشه بۆ سهقامگیری ناوچه شهرمهزار نهکرد و له باتی ئهوه، جارێکی دیکه PKKی به رێکخراوێکی تروریستی ناوهزهد کرد و داوای له سوریا کرد که پشتیوانی خۆی له PKK رابوهستێنێت. لهئهنجامی ئهم سیاسهتهدا، کوردهکان له مافی ئوتۆنۆمی بێبهش کران ، ههر ئهو مافه که دهوڵهتی ئێمه بۆ ئاڵبانیاییهکانی کۆزۆڤۆ داکۆکی لێدهکات.

٢ـ کاتێك که له ئابی ١٩٩٨ "دمیرل"ی سهرۆك کۆماری تورکیا بهیاننامهیهکی دهرکرد و یهکپارچهکی خاکی قهڵهمڕهوهکانی یونانی له "ئیژه" برده ژێر پرسیار، ئیدارهی ئهمریکا هیچ بهیاننامهیهکی دهرنهکرد بۆ شهرمهزارکردنی ئهم زیادهخوازییه بێ پرسیارهتییانهی تورکیا دژی یونان که ئهندامی ناتۆیه و هاوپهیمانی ئهمریکایه.

٣ـ کاتێك که له کانوونی یهکهمی ١٩٩٧ یهکێتی ئهورووپا به تێکڕای دهنگ داواکاری ئهندامێتی تورکیای لهم رێکخراوهیه رهت کردهوه لهسهر بنهمای ئهوه که تورکیا دهوڵهتیکی دیموکراتی ئاسایی نییه و مافی مرۆڤ پێشێل دهکات، ئیدارهی وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا لایهنی تورکیای گرت.

٤ـ کاتێك که له سهرهتای ١٩٩٧ کۆماری قوبرس رایگهیاند که دهیهوێت توانایی بهرگری خۆی تا ئاستێکی مهعقول زیاد بکات، ئیدارهی وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا موجامهلهی ٣٠٠ ـ S ی بهرێ خست و رهخنهی له قوبرس گرت. ئهم سیاسهته پاشان رێگای بۆ ئهوه خۆش کرد که ئهو لێکدانهوه بێ بنهمایهی تورکیا

زیاتر بچێتە پێش کە ئەم کردەوەیەی قوبرس هاوسەنگی دەسەڵات لە ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانە تێکدەدات. ڕاستیە خەمبارەکە ئەوەیە کە ئیدارەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەختی خۆی بەستووەتەوە بە دەوڵەتی لە ژێرکونترولی سوپای تورکیا. ئێمە چەکی پێویست دەدەین بە تورکیا تا هاووڵاتیانی خۆی پێ سەرکووت بکات، ئێمە لایەنی تورکیا دەگرین لەبەرامبەر یەکێتی ئەورووپا، ئێمە دەستدرێژی بەردەوامی تورکیا بۆ سەر یاسای نێونەتەوەیی لە "ئەژە" و سەراسەری قوبرس شەرمەزار ناکەین و پشتیوانی لە تورکیا دەکەین، لەکاتێکدا کە تورکیا بە دەیان جار نیشانی داوە کە سەرچاوەی سەرەکی ناسەقامگیری ناوچەیە.

پاکانەی ئیدارەی ئەمریکا بۆ ئەم سیاسەتە هەوەسبازانەیە ـ کە بە روونی هەم دژی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکایە و هەم دژی بایەخەکانی ئەمریکایە ـ ئەوەیە کە تورکیا دەوڵەتیکی سکولارە و ئەگەر ئەمریکا سیاسەتێکی دیکە بەنیسبەت ئەم وڵاتە بگرێتەبەر، لەوانەیە تورکیا بکەوێتە دەستی بناژۆخوازە ئیسلامیەکان.

بەڵام جەنابی سەرۆك، ئەم لێکدانەوەیە لەبنەمادا هەڵەیە. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە تورکیا لە نێوان سکولاریزم و بناژۆخوازیدا گیری نەخواردووە، بەڵکوو لە نێوان دەسەڵاتی سەربازی و دیموکراسیدا گیری خواردووە. سیاسەتی ئێستای ئیدارەی ئەمریکا پشتیوانی لە سوپای تورکیا دەکات و دیموکراسی پشتگوێ دەخات. ئێمە بە بەهایەکی گران بەو ئەنجامە گەیشتین کە ئەم سیاسەتە لە ئێران سەرکەوتوو نابێت، ئێمە نابێت هەمان ئەو هەڵەیە لە تورکیاش دووپات بکەینەوە.

یاسای بنەڕەتی تورکیا کۆمەڵێك دەسەڵاتی سیاسی داوە بە سوپا کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یا دەوڵەتە دیموکراتە ئاساییەکانی دیکە قەد قبوڵ ناکرێت.

نیدارەی ئەمریکا لە باتی لایەنگریکردن لە سوپای تورکیا و دارودەستە سیاسی و دیپلوماتیکەکەی، دەبێ وەك AHI پشتیوانی لە هاوولاتیانی ئازای تورکیا بکات کە بۆ مافی مرۆڤ و سەروەری یاسا خەبات دەکەن. دەبێ پرەنسیپی سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا قسەکانی سەرۆك وایت ئایزنهاوێر[6] بێت کە لە کاتی قەیرانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لە ١٩٥٦ ، داگیرکردنی میسر لە لایەن بریتانیا، فەرانسا و ئیسرائیلی شەرمەزار کرد و لە لێدوانێکی لەبیرنەکراودا لە ٣١ ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦ وتی:

"ئاشتی بێ یاسا نابێت و یاساش نابێت ئەگەر ئێمە یەك رەفتاری یەکسانی نێونەتەوەیی نەگرینەبەر لەبەرامبەر ئەوانەی دژی ئێمەن و ئەوانەی دۆستی ئێمەن".

گۆڕینی سیاسەتی ئێمە بەنیسبەت تورکیا شتێکی زۆر پێویستە بۆ بەرژەوەندییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

لەگەڵ رێزمدا

ئیویگینی ت روزیدز[7]

سەرۆکی ئینیستیتۆی یونانی - ئەمریکایی(AHI)

---

[6] Dwight D. Eisenhower

[7] Eugene T. Rossides

## ۲۵ ی ئاداری ۱۹۹۹- ئهنجوومهنی نوێنهران
## رفاندنی بهڕێز عهبدولا ئوجهلان کارێکی نایاسایی و ناڕهوایه

بهڕێز فرانك پالۆن، نوێنهری ئهیالهتی نیۆجێرسی:
جهنابی سهرۆك، دهمهوێت سهرنجی هاوکارانم بهرهولای بارودۆخی گهلی کورد رابکێشم.
کۆمهڵێك مهسهله ههیه که مانگی رابردوو به گیرانی بهڕێز عهبدوڵلا ئوجهلان، رێبهری پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) سهرنجی خهڵکی جیهانی بهرهولای خۆی راکێشا لهکاتێکدا که ئهم مهسهلانه پێشتر سهرنجیان پێنهدهدرا. بهڕێز ئوجهلان بۆ ئوتونۆمی گهلی کورد خهباتی کردووه، گهلێك که بووه به قوربانی سهرکوتی دهوڵهتی تورکیا و ههروهها دهوڵهتی عێراق، ئێران و سوریا. رژێمی تورکیا تهنانهت دان به بوونی کورددا نانێت و به"تورکی شاخاوی" ناویان دهبات و ههموو هێماکانی کولتوور و زمانی کوردی قهدهخه کردووه و ههوڵ دهدات به زۆرهملێ بیانتاوێنێتهوه و رێبهرانی کورد دهخاته بهندیخانه، ئهشکهنجهیان دهدات یا دهیانکوژێت. رژێمی عێراق گازی کیمیایی دژی کوردهکان بهکارهێناوه و ٤ ههزار گوندی کوردنشینی کاول کردووه. رژێمی ئێران کوردهکانی داوهته دهستی"گروپه مرۆڤکوژهکانی"، لهکاتێکدا که رژێمی سوریا تۆزێك تهحهمولیان دهکات بهڵام هیچ مافێکیان پێنادات.
جهنابی سهرۆك، هاوکات لهگهڵ ئهوهی بارودۆخی کوردهکان له عێراق، ئێران و سوریا زۆر خراپه، بهڵام رهفتاری خراپی تورکیا لهگهڵ گهلی کورد به یهك هۆی

بنەڕەتی بەتایبەت بۆ ئێمە هەژێنەرە، هۆیەکەشی ئەوەیە کە تورکیا هاوپەیمانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە و ئەندامی ناتۆیە و ساڵەهای ساڵە بایی میلیونەها دولار یارمەتی ئابووری و بەتایبەت یارمەتی سەربازی لە گیرفانی باجدەرانی ئەمریکایی وەردەگرێت. ئەم پشتیوانیە زۆر گەرموگوڕەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە رژێمی تورکیا مانگی رابردوو گەیشتە ئەوپەڕی خۆی واتا ئەو کاتە کە دەزگای جاسووسی و دیپلوماتیکەکانی ئێمە یارمەتیەکی یەکجار زۆری تیمی کۆماندوکانی تورکیایان دا بۆ ئەوەی بەڕێز ئوجەلان لە کینیا دەستبەسەر بکەن. ئەم کردەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشێلکردنی رۆحی"پەیماننامەی دژە ئەشکەنجە"یە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا واژۆی کردووە.

ئەگەر بەڕێز ئوجەلان لێرە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوایا، بۆ من شتێکی وێنانەکراو بوو کە رادەستی تورکیا کرابایا، دروست هەروەك ئەوەی ئیتالیا بەڕێز ئوجەلانی رادەستی تورکیا نەکرد، ئەو کاتە کە بەڕێز ئوجەلان لە ئیتالیا بوو. لەئەنجامی ئەم هاوکارییە دزیوەی ئێمە لەگەڵ تورکیا، بەڕێز ئوجەلان ئێستا لە دوورگەیەك لە بەندیخانەیەکی تاکەکەسیدایە و دەستی ناگات بە تیمی پارێزەرە نێونەتەوەییەکانی. ئێستاش دەوڵەتی تورکیا دەیەوێت لە دادگایەکی نهێنی سەربازی، بێ لێژنەی دادوەری و بێ چاودێری بیانی دادگایی بکات. بەلەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە رفاندنی بەڕێز ئوجەلان کارێکی نایاسایی و نارەوا بووە و دادگای ئاسایشی تورکیا دادگایەکی نارەوایە، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین کە بەڕێز ئوجەلان دادپەروەرانە دادگایی ناکرێت.

جەنابی سەرۆك، دەمەوێت وەبیرتان بهێنمەوە کە رفاندن و دادگایی کردنی نادادپەروەرانەی بەڕێز ئوجەلان و مەسەلەی سەرکووتی گەلی کورد، لەسەراسەری جیهاندا دەنگی داوەتەوە و سەرنجی پێدراوە. بۆ نموونە لێرە لە واشنگتۆن لە کۆتایی هەفتەی رابردوو خەڵك لەبەرامبەر باڵوێزخانەی تورکیا کۆ بوونەوە.

کۆمەڵەی مافی مرۆڤی کۆنگرێس و یەکێتی مافی مرۆڤ ئەم دواییانە یازدەهەمین ساڵیادی کۆمەڵکوژی ٥ هەزار کورد بەدەستی سەدام حوسەین لە گوندی هەڵەبجەیان بەرز راگرتووە. چەوساندنەوەی گەلی کورد بەتەواوی پشتگوێ نەخراوە بەڵام پێویستە ئێمە کاری زۆرتر بۆ گەلی کورد بکەین. شەڕی شاراوەی تورکیا دژی کوردەکان بووەتە هۆی کوژرانی ٤٠ هەزار کەس و زیاتر لە سێ میلیون کەسی ئاوارە کردووە. هاتنی بەڕێز ئوجەلان بۆ رۆما و بەڵێندانەکەی بۆ ئەوەی ئامادەیە توندوتیژی ئیدانە بکات، هەلێك بوو بۆ ئاشتی بەڵام نە تورکیا و نە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشنیارەکەی ئەویان بە هەند وەرنەگرت.

جەنابی سەرۆك، ئێستاش درەنگ نییە. ئێمە دەبێت لە دەستڕۆیشتوویی خۆمان لە سەر تورکیا کەڵك وەربگرین و داوای پێکهاتنی دادگایەکی نێونەتەوەیی بۆ بەڕێز ئوجەلان بکەین، لەبەرئەوەی تورکیا لەگەڵ کوردەکان شەڕ دەکات و چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێت بەڕێز ئوجەلان دادپەروەرانە دادگایی بکات. هیوادارم یەکێتی ئەورووپاش ـ کە تورکیا بەشوێنی ئەوەدایە ببێ بە ئەندامی ـ لەم پەیوەندییەدا گوشار بخاتە سەر تورکیا. ئێمە دەبێ داوای دادگایەکی دادپەروەرانە بۆ بەڕێز ئوجەلان بکەین بەڵام ئەمە تەنها هەنگاوی یەکەمی هەوڵەکانی ئێمەیە بۆ ئەوەی تورکیا بخەینە ژێر گوشار تا دەست بە وتووێژ لەگەڵ کوردەکان بکات بۆ گەیشتن بە رێگاچارەیەکی سیاسی بۆ

ئەم کێشە بەردەوامە. ئەم ڕێگاچارەیە لەبنەڕەتدا و لە درێژەخایەندا زۆر بە قازانجی تورکیاشە، لەبەر ئەوەی تورکیا ناتوانێت درێژە بە سەرکوتکردنی ۳۵ میلیون کورد بدات.

۲۱ ی کانوونی دووەم ، ئێمە جەژنی ساڵی تازە بەڕێوە دەبەین و کوردەکانیش جەژنی ساڵی تازەی خۆیان بەڕێوە دەبەن کە پێی دەڵێن "نەوروز" کە سەمبولی ڕۆژی بەرخۆدانی و ڕزگاری کوردە لە دەستی دیکتاتۆر. هیوادارم نەورۆزی ئەمساڵ ببێ بە خاڵێکی وەرچەرخان بۆ ڕزگاربوونی گەلی کورد لەو تراژیدیە ترسناکە کە لەگەڵی ڕوبەڕوویە، و سەرلەنوێ لە دایکبوونی کوردستانێکی ئازاد و بەهێز بە چاوی خۆمان ببینین.

جەنابی سەرۆك، ئەم هەفتەیە هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستیان بە شەڕ کردووە لە یوگوسلاڤیای پێشوو وەك هەوڵدانێك بۆ پێشگرتن لە ژینوسایدی خەڵکی کۆزۆڤۆ. من بەتوندی پشتیوانی لەم هەوڵە دەکەم و هیوادارم ئەو تورەیی و هەستی بەرپرسیارەتیە کە ئێمەی پاڵپێوەنا تا خەڵکی کۆزۆڤۆ و بپارێزین، سەرەنجام پاڵ بە ئەمریکا و جیهانی ئازادیشدا بنێت تا کوتایی بە ژینوسایدی گەلی کورد بهێنن.

جەنابی سەرۆك، ڕێگەم پێبدەن ئەوەتان وەبیر بهێنمەوە ساڵی تازەی کورد، "نەوروز"، لە ڕاستیدا یەك شەمەی ڕابردوو، ۲۱ ی ئادار بوو و ئەم ڕۆژە ڕۆژێکە کە کوردەکان جەژنی ساڵی تازەی خۆیان بەڕێوە دەبەن.

## ١١ ی گوڵانی ١٩٩٩ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## كێشەی كورد ـ تورك دەبێ چارەسەر بكرێت

بەڕێز فرانك پالۆن[١]، نوێنەری ئەیالەتی نیوجێرسی:
جەنابی سەرۆك، لەكاتێكدا كە هەڵمەتی سەربازی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە بالكان بەردەوامە بۆ ئامانجی پیروزی راوەستاندنی پاكتاوی رەگەزی خەڵكی ئالبانیایی كۆزۆڤۆ[٢] بەدەستی میلیسۆویچ[٣]، كردەوەیەكی بێ بەزەییانەی هاوشێوە لە ناوچە شاخاوییەكانی رۆژهەلاتی توركیا دژی گەلی كورد بەردەوام بەرێوەدەچێت.
بەرهەرحاڵ جیاوازیكی زۆر هەیە لە نێوان بارودۆخی كۆزۆڤۆ و بارودۆخی كوردستان.
لە كۆزۆڤۆ هێزەكانی ناتۆ بەكارهێنراون بۆ راوەستاندنی شالاوە مرۆڤكوژەكەی "میلیسۆویچ" بەلام رژێمی توركیا كە بەرپرسیاری شەڕ دژی كوردەكانە، لەراستیدا خۆی ئەندامی ناتۆیە. بەداخەوە بەهۆی ئەوەی كە توركیا وەك هاوپەیمانی ئیستراتژیكی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و رۆژئاوا سەیر دەكرێت، بارودۆخی دژواری كوردەكان لە توركیا لە لایەن ولاتە یەكگرتووەكانی ئامریكاوە سەرنجی ئەوتۆی پێنەدراوە.
لەراستیدا جەنابی سەرۆك، ئێمە یارمەتی دەوڵەتی توركیا دەدەین بۆ سەركوتكردنی كوردەكان. مەسەلەی شەڕی توركیا دژ بە كوردەكان و پشتیوانی ولاتە

---

[١] Mr. Pallone
[٢] Kosovar Albanian people
[٣] Milosevic

یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تورکیا سەرەتای ئەمساڵ بە دەستگیرکردنی بەڕێز عەبدوڵڵا ئوجەلان، ڕێبەری بزووتنەوەی سەربەخۆیی کورد گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. بەڕێز ئوجەلان بۆ ئوتونۆمی بۆ گەلی کورد شەڕی کردووە، ئەو گەلە کە بووە بە قوربانی سەرکوتی تورکیا و هەروەها عێراق، ئێران و سوریا.

جەنابی سەرۆك، ڕژێمی تورکیا تەنانەت دان بە بوونی کورددا نانێت و بە "تورکە شاخاوییەکان" ناویان دەبات و هەموو هێماکانی کولتووری کورد و زمانی کوردی قەدەخە کردووە و هەوڵ دەدات بە زۆرەملێ بیانتاوێنێتەوە و هاوکات ڕێبەرانی کورد دەخاتە بەندیخانە، ئەشکەنجەیان دەکات و دەیانکوژێت. کۆمەڵگای کورد لە عێراق، ئێران و سوریاش بەتوندی سەرکووت دەکرێت. ئێمە دەبێت چارەنووسیان لەم وڵاتانە لەبیر نەکەین و لەراستیدا "ئوپەراسیونی دابینکردنی ئاسایش" لە باکووری عێراق بە ڕێبەرایەتی ئەمریکا کردەوەیەکە کە هەموومان شانازی پێدەکەین. پێشێلکردنی توندی مافی مرۆڤ لە لایەن ڕژێمی ئێران، عێراق و سوریا شتێکی چاوەڕوانکراوە بەڵام بۆ تورکیا کە ئەندامی ناتۆیە و بە ناو دیموکراتە و لە ئوپەراسیونی هێزە هاوپەیمانەکاندا بەشدارە، چاوەڕوانکراو نییە. تورکیا ساڵەهای ساڵە میلیونها دولار یارمەتی ئابووری و بەتایبەت یارمەتی سەربازی لە گیرفانی باجدەرە ئەمریکییەکان وەردەگرێت. کەوابوو مافی خۆمانە کە چاوەڕوانی ئەوە لە تورکیا ـ وەك ئەندامی ناتۆ و کاندیدی ئەندامێتی لە یەکێتی ئەورووپا ـ بکەین کە زیاتر پابەند بێت بە مافی مرۆڤ .

لەمە زیاتر، ڕەفتاری خراپی دەوڵەتی تورکیا لەگەڵ هاووڵاتیانی کورد تەنها نموونەی پێشێلکردنی توندی بایەخەکان، ئایدیالەکان و بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا نییە.

داگیرکردنی بەردەوامی باکووری قوبرس و گەمارۆدانی ئەرمەنستان، دو نموونەی روونی ئەو سیاسەتەن کە تورکیا پەیرەوی دەکات کە ئێمە نابێ لە هیچ دەوڵەتیك، بەتایبەت تورکیای هاوپەیمانمان قبوڵی بکەین.

جەنابی سەرۆك، من زۆر تورە بووم کاتێ کە بیستم دەزگای جاسوسی و دیپلوماتیکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەراستیدا یارمەتی بە تیمی کۆماندۆی تورکیا داوە بۆ دەستگیرکردنی بەرێز ئوجەلان لە کینیا لە مانگی شوباتی ئەمساڵ. لەئەنجامی ئەم هاوکارییە دزیوەی دەوڵەتی ئێمە لەگەڵ تورکیا، بەرێز ئوجەلان لە دوورگەیەکدا لە ژوورێکی تاکەکەسیدا لە تورکیا بەند کراوە و وادیارە لە دادگایەکی سەربازیدا دادگایی دەکرێت بێ بوونی لیژنەی دادوەری و چاودێری بیانی. دادئەستینەکانی تورکیا بەشوێن ئەوەدان حوکمی لەسێدارەدان بۆ بەرێز ئوجەلان دەربکەن و هیوا کەمە بۆ ئەوەی بەرێز ئوجەلان دادپەروەرانە دادگایی بکرێت. لەراستیدا قسەوباسەکانی چاپەمەنیەکانی تورکیا ئەوەنییە کە ئایا بەرێز ئوجەلان دادپەروەرانە دادگایی دەکرێت یا نا، بەڵکو ئەوەیە کە کەی لەسێدارە دەدرێت.

بەگوێرەی راپۆرتێکی ئەم دواییانەی رێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی، پارێزەرانی بەرێز ئوجەلان بەردەوام لە لایەن پۆلیسی تورکیاوە لێیان دەدرێت و سووکایەتیان پێدەکرێت، تەنانەت پولیسی تورکیا هەوڵ دەدات ئاژاوەیەکی گشتی دژی تیمی پارێزەرانی بەرێز ئوجەلان بەرپێبخات و پارێزەران و بنەماڵەکانیان لەرێگای تەلەفۆنەوە هەڕەشەیان لێکراوە. دەبێ وەبیرتان بهێنمەوە کە ئەم رەفتارە، پێشێلکردنی پرەنسیپە بنەڕەتیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانە دەربارەی "دەوری پارێزەران" کە دەڵێت نابێت پارێزەران بە کەسایەتی ئەو کەسانەوە بچەسپێندرێن کە داکۆکیان لێدەکەن، یا

كەسایەتی ئەو كەسانە كە ئەوان داكۆكیان لێدەكەن ببێتە هۆی ئەوەی ئەرك و كاری خۆیان هەڵبوەشێننەوە.

لە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ولاتانی دیكە كە رێز لە یاسا دەگیردرێت، بە باوەڕی ئێمە هەموو كەسێك، تەنانەت بێزلێكراوترین تۆمەتباران مافی ئەوەیان هەیە كە دادپەروەرانە دادگایی بكرێن و هیچ گروپێك ناتوانێت گەلەكۆمە لە كەسێكی دیكە بكات و لێبدات. لەوانەیە بەڕێز ئوجەلان پاش ئەو ئەو سێ مانگە كە لە بەندیخانەی تاكەكەسیدا راگیراوە و لە دەستڕاگەیشتن بە پارێزەرەكانی بێبەش كراوە و بەردەوام لە لایەن سەربازە چەكدارەكانەوە ـ كە دەموچاوی خۆیان بە دەمامكی رەش داپۆشیوە ـ گەمارۆ دراوە، لە رووی دەروونییەوە تێكچووبێت. هەموو دیدارەكانی بەڕێز ئوجەلان لەگەڵ پارێزەرەكانی لە ژێر چاودێریدایە و ئەگەری ئەوە یەكجار زۆرە كە ئەشكەنجە كرابێت.

بەڵام ئەگەر توركیا لەمە زیاتر بچێتە پێش و بەڕێز ئوجەلان لەسێدارە بدات، ئاكامەكەی ئەوەیە كە شەهیدێك بۆ گەلی كورد دروست دەكات و لەگەڵ شەڕێكی گەورەی ناوخۆ روبەڕوو دەبێتەوە كە دەبێت بەكارەسات بۆ سەرجەم خەڵكی ناوچە بە كورد و توركەوە. ئاكامێكی وەها بە قازانجی هیچ كەس نییە، نە بە قازانجی توركیایە و نە بە قازانجی گەلی كوردە و نە بە قازانجی دراوسێكانی توركیایە و بە دڵنیاییەوە بە قازانجی ولاتە یەكگرتووەكانی ئامریكاش نابێت.

جەنابی سەرۆك، بۆ تەشوێق كردنی دەوڵەتی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بۆ ئەوەی دەورێكی سودمەند لە چارەسەركردنی ئەم قەیرانە لە توركیا بگێڕێت، من و هاوكارم، بەڕێز "فیلنێر"، نوێنەری ئەیالەتی كالیفورنیا ئەم هەفتەیە نامەیەك ئامادە

دەکەین و داوا لە هاوکارەکانمان دەکەین واژۆی بکەن، پاشان دەینێرین بۆ سەرۆك کلینتۆن و داوای لێدەکەین لەم کێشەیەدا دەستێوەردان بکات و داوا لە دەسەلاتدارانی تورکیا بکات بەڕێز ئوجەلان دادپەروەرانە دادگایی بکەن و لەسێدارەی نەدەن.

لەئەنجامی شەڕی شاراوەی تورکیا دژ بە کوردەکان، نزیکەی ٤٠ هەزار کەس کوژراوە و زیاتر لە سێ میلیون کەس ئاوارە بوونە. بەڕێز ئوجەلان پێش دەستبەسەربوون رایگەیاندبوو کە ئامادەیە توندوتیژی ئیدانە بکات و لەگەڵ تورکیا وتووێژ بکات بەلام تورکیا هیچ ئاورێکی لەم داواکارییە نەدایەوە. لەوەخراپتر، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پاڵی بەم وتووێژەدا نەنا.

جەنابی سەرۆك، بە باوەڕی من باشتر ئەوەیە بەڕێز ئوجەلان لە دادگایەکی نێونەتەوەییدا دادگایی بکرێت، لەبەر ئەوەی تورکیا لەگەڵ کوردەکان شەڕ دەکات و چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێت بەڕێز ئوجەلان دادپەروەرانە دادگایی بکات. هەوڵدان بۆ دادگایی کردنی دادپەروەرانەی بەڕێز ئوجەلان دەبێ ببێ بە یەکەم هەنگاو لە هەوڵەکانی ئێمە بۆ ئەوەی گوشار بخەینە سەر تورکیا تا دەست بە وتووێژ بکات لەگەڵ کوردەکان بۆ ئەوەی بگەن بە رێگاچارەیەکی سیاسی بۆ ئەم خەباتە تراژیدیکە. ئەوەی کە لەراستیدا دەربارەی کێشەی نێوان رژێمی تورکیا و گەلی کورد وەڕاست دەگەڕێت ئەوەیە کە گەلی کورد و تورك بێ کێشە ژیاون، و هیچ هیوایەك بە ئاشتبوونەوەی کورد و تورك نییە مەگەر ئەوە کە کاربەدەستانی تورکیا ماف و شوناسی جیاوازی کوردەکان بە فەرمی بناسن و سەرەنجام دەست لە ئامانجەکەیان هەڵبگرن کە کونترۆلکردن و بندەستکردنی کوردەکانە.

## ٢٠ ی گوڵانی ١٩٩٩ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

## کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان هێمای نەتەوەیەکە بەقەد مێژوو کۆنە

بەڕێز باب فیلنێر، نوێنەری ئەیالەتی کالیفۆڕنیا:

جەنابی سەرۆک، ئەمڕۆ دەمەوێت دەربارەی جۆرە دیموکراسیەك و جۆرە دەوڵەتیك قسە بکەم کە لە سەدەی ٥ ی پێش لە زایین بەدەستی یونانیەکان لە "ئاتینا" داهات. بریتانیایەکان شانازی بە دیموکراسی لە پارلمانەکەیان دەکەن، ژاپونیەکان "دێت" ی[١] خۆیان هەیە، روسەکان "دۆما"یان[٢] هەیە و لێرە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش "کۆنگرێس" هەیە. دیموکراسی هێشتا باشترین هیوایە بۆ مرۆڤایەتیی شڵەژاو لەسەراسەری جیهاندا.

جەنابی سەرۆك، بە کۆتایی هاتنی شەڕی سارد دەبینین کە دیموکراسی زۆر پەرەی سەندووە. ئەمڕۆ جیهان شوێنێکی باشترە، لەبەر ئەوەی گەلێ لە کۆمارەکانی پێشووی سۆفیەت ئێستا گەیشتوونە بە مافی چارەی خۆنووسین و لەسەر کورسی خۆیان- کە هەقی خۆیانە - لە هۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان دانیشتوون. بەخۆشییەوە هەرچەند کە رێگای ئازادی بەرەوپێش دەچێت، بەڵام زۆری ماوە جیهان بەتەواوی ئازادبێت، هەندێ نەتەوە هێشتا کۆیلەن، هێشتا رەنگی پێست ناهێڵێت هەندێ کەس چێژ لە مرۆڤایەتی هاویەش وەربگرن. بەڵام هیوا بۆ ئەوەی کۆتایی بە نایەکسانی

---

١ Diet

٢ Duma

تەواو بێت، پتەوە و خەڵکی خێرخواز ژیانی خۆیان دەخەنە ناو مەترسی و دژی هەڵاواردن رادەوەستن، چونکە دەزانن ئەنجامی کارەکەیان، ئەوەندە بایەخی هەیە کە ژیانی خۆیانی بۆ بخەنە ناو مەترسی.

جەنابی سەرۆك، ٢٤ ی مایسی ١٩٩٩ دروست چەند رۆژ لەمەوپێش نەتەوەیەك کە لە مێژە دەنگی کپ کراوە، یەکەم کۆنگرێسی خۆی کردەوە، هەرچەند کە بەداخەوە نەیتوانی ئەم کۆنگرێسە لە وڵاتی خۆی دابمەزرێنێت و لە "بروکسیل" ی پایتەختی بەلژیکا دایمەزراند. ١٥٠ لێژنە کە نوێنەری گەلی کورد لەسەراسەری جیهان بوون، لەوانە کوردەکانی تورکیا، سوریا، عێراق، ئێران و کۆمارەکانی پێشووی سۆفیەت لە دەوری یەك کۆبوونەوە بۆ ئەو ئامانجە کە دەنگی برا و خوشکەکانیان بەرز بکەنەوە، ئەو دەنگە کە لە کوردستان کپ کراوە. من لە دایکبوونی ئەم کۆنگرێسە پیرۆز دەکەم کە هێمای نەتەوەیەکە کە بە قەد ناخی مێژوو کۆنە.

جەنابی سەرۆك، کوردەکان، دانیشتووانی خۆماڵی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستن کە لە ناوچەیەکی شاخاویدا دەژین کە بە قەد ئەیالەتی "تیگزاس"-ە و بە زمانێك قسە دەکەن کە لە زمانی تورکی و عەرەبی جیاوازە بەڵام نزیکە لە زمانی فارسی. کوردەکان بەدرێژایی مێژوو لە مەتەرێزە قورس و قایمەکانی خۆیان لە شاخەکاندا ژیاون و لە سەردەمی کەوناردا ئیمپراتۆری خۆیان هەبووە بەڵام ئێستا دەچەوسێنرێنەوە و حاشا لە شووناسەکەیان دەکرێت و بەدەستی ئەو دەوڵەتانە کە لە سەرەتای سەدەی ٢٠ لە دایك بوون، ناچار دەکرێن ببن بە تورك و عەرەب و فارس. ئەم دەوڵەتانە وەك حماڵ و قەڵغان سەیری ئەم گەلە بەهێزە ٣٠ میلیونیە دەکەن و قەد وەکو کورد کە مافێکی هەیە، سەیریان ناکەن.

جەنابی سەرۆك، کوردبوون لە تورکیا سووچە، سەدام حوسەین چەکی کیمیایی و بیولوژێکی دژی کوردەکان لە عێراق بەکارهێنا، حکوومەتی مەلاکان لە ئێران نەیارە کوردەکانی داوەتە بەر دەستڕێژی گوللە لە گورەپانی شارەکانی(ئەوروپا). مرۆڤ کاتێ لەم بارودۆخەی کوردەکان زیز دەبێت کە دەبینێت هەندێ جار دەوڵەتی خۆشمان دەستی هەیە لەم بارودۆخە دڵتەزێنەی ئەواندا. تورکیا بە فڕۆکە شەڕکەرە ١٦ ـ F کان، کوپتەرە هێرشبەرە "سیکورسکیە"کان و تانکە ٦٠ ـ M کانی ئەمریکا تەیار بووە. سەدام حوسەین ـ بەگوێرەی هەندێ لە بەڵگەنامە ئازاد کراوەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان ـ لە لایەن ٢٤ کومپانیای ئەوروپاییەوە پشتیوانی لێدەکرێت بۆ بەرهەمهێنانی گازی کوشندەی کیمیایی و بیولوژیکی. دژایەتی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ کوردەکان لە سنووری ئەو وڵاتە تێپەڕیوە و ڕێبەرانی کوردی لە ویەننا و بیرلین کوشتووە.

جەنابی سەرۆك، بەلەبەرچاوگرتنی چارەنووس و بەختی کوردەکان بۆمان دەردەکەوێت کە چەندە گرنگە کە کوردەکان کۆنگرێسی خۆیان دامەزراندووە و بەرپرسیاریتی چارەنووسی خۆیان گرتووە دەستی خۆیان. کوردەکان گەلیان لەپشتە، سەرچاوەی پێویستیان هەیە و ئەوەندە دەرکی سیاسیان هەیە کە بتوانن خەون و ئاواتی دروستکردنی دەوڵەتی خۆیان وەدی بێنن.

جەنابی سەرۆك، هەروەها بە پێویستی دەزانم ڕۆشنایی بخەمە سەر بارودۆخی ڕێبەری کورد، بەڕێز عەبدوڵڵا ئوجەلان کە بەگوێرەی وتارێکی ئەم دواییانەی ڕۆژنامەی *نیویورك تایمز*، بە یارمەتی دەزگای سیخوڕی ئێمە، رادەستی تورکیا کراوە. هەروەها کە لەوانەیە ئێوە لەبیرتان بێت بەڕێز ئوجەلان شوێنی ژیانی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاست بەجێ هێشت و هاتە ئەوروپا بۆ ئەوەی ڕێگاچارەیەکی سیاسی بۆ خەباتی دێرینی کورد بۆ مافە بنەڕەتیەکانی بدۆزێتەوە. ئەو کاتە من لێرە پێشوازیم لە ڕاگەیاندننامە ئاگربەستەکەی بەڕێز ئوجەلان کرد و هیوام دەربڕی کە ئاراستەی کێشەی کورد لە شەڕ بگۆڕێ بۆ ئاشتی و لە ململانێ بگۆڕێ بۆ دیالۆگ.

بەڕێز ئوجەلان لە مافی پەنابەریتی لە ڕۆما بێ بەش کرا و بەڵێنی پێدرا لە ڕێگایەکی ئەمنەوە لە ڕێگای یۆنانەوە بگوازرێتەوە بۆ "لاهە[٣]" لە هولەندا چونکە دەیویست لە "دیوانی نێونەتەوەیی دادپەروەری[٤]" لە لاهە سکاڵا دژی تورکیا تۆمار بکات بەهۆی ئەو تاوانانە کە تورکیا دژی کوردەکان ئەنجامی داوە. بەڵام یاساکانی بەخشینی مافی پەنابەری بە کەسایەتیە سیاسیەکان ـ کە مێژووەکەی بە قەد کاتی سەرهەڵدانی پیغەمبەرەکان کۆنە ـ دەربارەی بەڕێز ئوجەلان خرایە ژێرپێ و لە ئەنجامدا بەڕێز عەبدوڵڵا ئوجەلان - کە ئەمڕۆ خۆشەویسترین کەسایەتی کوردە لە سەراسەری جیهاندا- دەستبەسەر کرا و لە ڕێگای مامەڵەیەك کە بۆنی ئەوپەڕی بێ شەرەفی لێدەهات رادەستی تورکەکان کرا و ئێستاش چاوەڕوانی لەسێدارەدانە لە بەندیخانەی تاکەکەسی لە دوورگەی "ئیمرالی[٥]" لە دەریای "مەرمەرە[٦]".

جەنابی سەرۆك، بۆ زلهێزێك وەك ئەمریکا باش نییە یارمەتی دەوڵەتیکی دیکتاتۆر وەك تورکیا بکات و پشتیوانی لێبکات کە تەنها جلی دیموکراسی لەبەر کردووە. ئەوانە کە پارلمانتارە بەهەق هەڵبژێردراوەکان وەك "لەیلا زانا"یان بە تاوانی

---

[٣] Hague

[٤] International Court of Justice

Imrali Island [٥]

[٦] Sea of Marmara

ئامادەبوون لەبەرامبەر کۆمیتەی کۆنگرێسی ئەمریکا خستووەتە بەندیخانە، نابێ و ناتوانن له لایەن ئێمەوە پشتیوانیان لێبکرێت. رێبەرگەلێك وەك بەڕێز عەبدوللا ئوجەلان ئێستاش هێما و سەمبولی ئاشتی و ئاشتبوونەوەی کوردن لەگەڵ دراوسێکانی. ئەو رێگاچارەیە کە ئێمە بۆ ئازادی نەتەوە کۆیلەکان له یەکێتی سۆفیەتی پێشوو هەستمان پێدەکرد، دەبێ ئێستا بۆ هاوپەیمانەکانمان و هاوولاتیەکانیان پەیڕەو بکرێت. کەوابوو ئێمە پێشوازی له دەستبەکاربوونی کۆنگرێسی نەتەوەیی کوردستان دەکەین.

گەلی کورد خەون بە شتێکەوە دەبینێ کە بەلای گەلێ کەسەوە خەیاڵە(کە بەلای منەوە وانییە)، ئەویش یەککگرتنی گەلی کوردە له ناو دەوڵەتی کوردستاندا.

## تورکیا دەبێ پێشنیارەکەی عەبدوڵڵا ئوجەلان بۆ ئاشتی قبوڵ بکات

## ٨ ی حوزەیرانی ١٩٩٩ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز فرانك پالۆن، نوێنەری ئەیالەتی نیوجێرسی:

جەنابی سەرۆك، دادگایەك لە پێشمانە کە هەندێ کەس پێی دەڵێن "دادگای سەدە".

بەڕێز عەبدوڵڵا ئوجەلان، ڕێبەری بەندکراوی کورد لە بەردەم دادگای سەربازی تورکیایە، دادگایەك کە دادپەروەرانە نییە. بەڕێز ئوجەلان کە لەگەڵ سزای لەسێدارەدان رووبەڕویە، لە مافی دەستڕاگەیشتن بە پارێزەرەکانی بێ بەش کراوە و تیمی پارێزەرەکانی لەگەڵ هەڕەشە و ترساندن و تۆقاندنی دەوڵەتی تورکیا روبەڕوون. دەوڵەتی تورکیا و میدیاکانی تورکیا گڕوتینی ناسیونالیستان دژ بە بەڕێز ئوجەلان وەڕی خستووە. ئەگەر بەم شێوازە بچێتە پێش و تورکیا بەڕێز ئوجەلان لەسێدارە بدات، ئەنجامێکی کارەساتباری بۆ سەرجەم خەڵکی ناوچە بەدواوە دەبێت. بەڵام خۆشبەختانە دادگاییکردنی بەڕێز ئوجەلان بوارێکی ئەرێنی و درێژخایەنی رەخساندووە بۆ ئاشتبوونەوەی گەلی کورد و تورك.

بەڕێز ئوجەلان تەنانەت ئێستاش کە لە دادگادایە داواکارییەکی ئازایانە و بوێرانەی خستووەتەڕوو بۆ چارەسەرکردنی دیموکراتیکی کێشەی کورد لە ڕێگای وتووێژ. ڕێکخراوەکەی بەڕێز ئوجەلان واتا پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK)یش پشتیوانی خۆی لە پێشنیارە ئاشتیخوازانەکەی بەڕێز ئوجەلان دەربڕیوە. ئێستا کە میدیاکانی جیهان سەرنج بەم دادگایە دەدەن و بە شێوە و رادەیەکی بێ وێنە مەسەلەی کوردیان

کردووه به رۆژەڤی خۆیان، تورکیا دەتوانێ له رێگای رازیبوون به دەستپێکردنی وتووێژ لەگەڵ ئەم رێبەره کورده، وێنەی خۆی له کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا باشتر بکات بەڵام بەداخەوه دەوڵەتی تورکیا تا ئێستا خۆی لەم رێگای ئاشتیه بواردووه و لەسەر ئەوه پێدادەگرێت که لەگەڵ بەرێز ئوجەلان یا هیچ رێبەرێکی دیکەی بزووتنەوەی کورد وتووێژ ناکات.

دوێنی رۆژنامەی *واشنگتۆن پوست* سەروتارێکی بڵاو کردەوه له ژێر ناوی"کرانەوەی مەسەلەی کورد له تورکیا" که بەم جۆره دەستپێدەکات:

" لەوانەیه تورکیا دەست به قۆناخێك بکات بۆ چارەسەرکردنی شێرپەنجەی وڵاتەکەی واتا کێشەی کەمینه کورده سەرکوتکراوەکەی".

رۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست" ـ که بەردەوام هاوسۆزی بیروبۆچوونەکانی تورکیا بووه لەسەر هەندێ مەسەله ـ ئێستا ئاماژه بەوه دەکات که سیاسەتی تورکیا بۆ هێرشی بێبەزەییانەی سیاسی و سەربازی بۆ سەر بزووتنەوەی کورد، تورکیای خستووەته ناو کێشەیەك که دەبێ له رێگای بایەخه دیموکراتیکەکانی دەوڵەتانی رۆژئاوا چارەسەری بکات.

جەنابی سەرۆك، ئەمه کۆت و بەندێکه که تورکیا بەدەستی خۆی، خۆی خستووەته ناوی. تورکیا ئەندامی ناتۆیه و هەوڵ دەدات ببێ به ئەندامی یەکێتی ئەوروپا که تا ئێستا سەرکەوتوو نەبووه. لەهەمان کاتدا تورکیا نەتەنها درێژه به شەرێکی پیس دژی کەمینەیەکی ناو وڵاتی خۆی دەدات بەڵکو سەرکووتی دەکات و له بنەڕەتدا حاشا له شوناس، زمان یا کوولتووری جیاوازی کوردی دەکات. لەهەمان کاتدا رێژەی پێشکەوتنی ئابووری، ئاستی پەروەرده، ژێرخانی ئابووری، پێشکەوتن و ئاستی ژیان

لە باشووری رۆژهەلاّت زۆر لە دوای ئێستانداردەکانی تورکیایە و لەهەمان کاتدا تورکیا سەرچاوە ئابووریە کەمەکانی خۆی بۆ شەڕە بەردەوامەکەی دژی کوردەکان بەفیڕۆ دەدات. ئەمە بازنەیەکە کە دەبێ بشکێت. هەروەها کە سەروتارەکەی رۆژنامەی *واشنگتۆن پوست* لە کۆتاییدا ئاماژەی پێدەکات"دۆستەکانی تورکیا دەبێ هیوادارین کە تورکیا ئەوەندە بوێری و ئازایەتی هەبێت کە تێڕوانینی خۆی بەرفراوانتر بکات و کەڵکی باش و پاك لە دەستپێشخەرییەکەی ئوجەلان وەربگرێت".

بەڵام جەنابی سەرۆك، ئەم دوایانە دوو وتار لە رۆژنامەی *نیویورك تایمز*دا بلاّو بووەتەوە کە بەداخەوە نیشان دەدات ئیدارەی سیاسی و سەربازی تورکیا زۆر لەو رێگایە دوورە کە ئەم هەنگاوە گەورەیە هەڵبگرێت. هەینی رابردوو رۆژنامەی *نیویورك تایمز* بلاّوی کردەوە کە بەناوبانگترین چالاکی مافی مرۆڤ لە تورکیا، بەڕێز "ئاکین بیردال" خراوەتە بەندیخانە بۆ ئەوەی حوکمی ۹/۵ مانگ بەندیخانەکەی تێپەڕ بکات کە بەهۆی ئەوە بۆی دەرکراوە کە هەندێ لێدوانی داوە کە دەوڵەتی تورکیا بە لێدوانی رووخێنەری دەزانێت. بەڵام بەڕێز "بیردال" کام چالاکی رووخێنەری ئەنجام داوە؟ بەڕێز "بیردال"، سەرۆکی کۆمەڵەی مافی مرۆڤ بەردەوام داوای لە دەوڵەتی تورکیا کردووە کە لەگەڵ راپەڕیوانی کورد بگات بە رێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە. بەڵام ئێستا ـ هەروەها کە راپۆرتەکەی رۆژنامەی *نیویورك تایمز* نیشان دەدات ـ ئەم داواکارییە بەگوێرەی یاسای تورکیا، پشتیوانی لە تروریزمە. هەر ئەم یاسایە ئەم دواییانە بەکار براوە بۆ مەحکومکردنی دو رۆژنامەنووس، پروفسورێکی زانکۆ و یاریدەدەری بەڕێز "بیردال". هاوکات هەندێ تورکی بوێرو ئازا ـ لەوانە دادوەرێکی

پایەبەرزی وڵات ـ داوای پێداچوونەوە بەسەر ئەم یاسایانە کردووە بەڵام رژێمی دمارگرژ ئەم داواکارییەی رەت کردووەتەوە.

جەنابی سەرۆك، وەك هەوڵێك بۆ تەشویقکردنی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئەوەی دەورێکی ئەرێنی بۆ چارەسەرکردنی ئەم قەیرانە لە تورکیا بگێرێت، من و هاوکارم، نوێنەری هێژای ئەیالەتی کالیفورنیا، بەڕێز "فیلنێر" ئەم هەفتەیە نامەیەك ئامادە دەکەین ـ کە داوا لە هاوکارانم دەکەم واژۆی بکەن ـ و دەینێرین بۆ سەرۆك کلینتۆن و داوای لێدەکەین دەستێوەردان بکات و داوا لە کاربەدەستانی تورکیا بکات بەڕێز ئوجەلان دادپەروەرانە دادگایی بکرێت و لەسێدارەی نەدات. هەوڵدان بۆ دادگایەکی دادپەروەرانە بۆ بەڕێز ئوجەلان دەبێ یەکەم هەنگاوی ئێمە بێت بۆ ئەوەی تورکیا دەست بە وتوویژ لەگەڵ کوردەکان بکات بۆ ئەوەی بگەن بە رێگاچارەیەکی سیاسی بۆ ئەم خەباتە تراژیدیکە.

بەڕێز ئوجەلان و رێکخراوە کوردەکەی، لقی زەیتون بەرەولای دەوڵەتی تورکیا درێژ دەکەن. بۆ تورکیا شتێکی باشە کە ئەم پێشنیارە نیازپاکانەیە قبوڵ بکات و بکەوێتە ناو رێگای ئاشتی.

جەنابی سەرۆك لەراستیدا بەڕێز ئوجەلان پێش لەوەی دەستبەسەر بکرێت، چەند جار پێشنیاری ئاگربەستی داوە کە هەموویان لە لایەن کاربەدەستانی مەدەنی و سەربازی تورکیاوە رەت کراوەتەوە.

یەکشەممەی ئەم هەفتەیە وتارێك لە رۆژنامەی *نیویورك تایمز*دا بڵاو بووەتەوە کە دەمارگرژی هەڵوێستی کاربەدەستانی تورکیای زیاتر خستووەتە بەر باس. بەگوێرەی ئەم وتارە وەزیری ناوخۆی تورکیا لیستێکی دەرکردووە کە کۆمەڵێك دەستەواژە لەخۆ

ئەم شەپۆلی دەستبەسەرکردنە، کۆمەڵێ پرسیار دەهێنێتە ئاراوە نەتەنها دەربارەی ڕەوایەتی دیموکراسی تورکیا بەڵکوو دەربارەی ڕاستگۆیی و نیازپاکی تورکیا بۆ پابەندبوون بە پێشخستنی ئاشتی. سێ ساڵ لەمەو پێش کە من باسی، بارودۆخی کوردەکانم لێرە کرد، بیرکردنەوە و پەخشی بەرنامە بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکان، تەنانەت وەك زمانێکی بیانی قەدەخە بوو، بەداخەوە ئەم قەدەخەبوونە ئەمڕۆش بەردەوامە. بەڵام دەبێ ئەوەش زیاد بکەم کە بە سوچزانینی لێدوان و دەربڕینی بیروڕا تەنها بە هاووڵاتیانی کورد سنووردار نییە و ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەنووسان، چالاکانی مافی مرۆڤ ، پزیشکان و پارێزەرانیش کە لەگەڵ ڕەفتاری نادادپەروەرانەی سوپا، پۆلیس یا حکوومەتی تورکیا ڕووبەڕوون، حوکمی بەندیخانەیان لەسەر دەدرێت و ئەشکەنجە دەکرێن.

جەنابی سەرۆك، کێشەی کورد هەڵقوڵاوی سروشتی دیموکراسی لاوازی تورکیایە و کۆمەڵێك گیروگرفتی جیدی بۆ سەراسەری کۆمەڵگای تورکیا بەدواوە بووە. هەر ئەم هەفتەی ڕابردووە کاربەدەستانی تورکیا لە ئیستانبول نزیکەی ٢٠٠ کوردیان بەهۆی بەڕێوەبردنی جەژنی نایاسایی "نەورۆز"، ساڵی تازەی کورد دەستبەسەر کرد. دوابەدوای دەستبەسەرکردنی ئەم کەسانە، کاربەدەستان دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەسەر ٦ ڕۆژنامەی تورکیا کە ڕاپۆرتی چالاکیەکانی "نەورۆز"یان بڵاو کردبووە، بەهۆی ئەوەی وشەی"نەورۆز"یان بە پیتی(W) ی کوردی نووسیبوو، نە پیتی(V) ی تورکی. تەنها نووسینی پیتی(V) نییە کە کراوە بە سووچ، بەڵکو پیتی(P) و (K) یش لە وانەی کتێبەکان سڕاوەتەوە.

پایەبەرزی وڵات ـ داوای پێداچوونەوە بەسەر ئەم یاسایانە کردووە بەڵام رژێمی دمارگرژ ئەم داواکارییەی رەت کردووەتەوە.

جەنابی سەرۆك، وەك هەوڵێك بۆ تەشویقکردنی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئەوەی دەورێکی ئەرێنی بۆ چارەسەرکردنی ئەم قەیرانە لە تورکیا بگێرێت، من و هاوکارم، نوێنەری هێژای ئەیالەتی کالیفورنیا، بەرێز "فیلنێر" ئەم هەفتەیە نامەیەك ئامادە دەکەین ـ کە داوا لە هاوکارانم دەکەم واژۆی بکەن ـ و دەینێرین بۆ سەرۆك کلینتۆن و داوای لێدەکەین دەستێوەردان بکات و داوا لە کاربەدەستانی تورکیا بکات بەرێز ئوجەلان دادپەروەرانە دادگایی بکرێت و لەسێدارەی نەدات. هەوڵدان بۆ دادگایەکی دادپەروەرانە بۆ بەرێز ئوجەلان دەبێ یەکەم هەنگاوی ئێمە بێت بۆ ئەوەی تورکیا دەست بە وتووێژ لەگەڵ کوردەکان بکات بۆ ئەوەی بگەن بە رێگاچارەیەکی سیاسی بۆ ئەم خەباتە تراژیدیکە.

بەرێز ئوجەلان و رێکخراوە کوردەکەی، لقی زەیتون بەرەولای دەوڵەتی تورکیا درێژ دەکەن. بۆ تورکیا شتێکی باشە کە ئەم پێشنیارە نیازپاکانەیە قبوڵ بکات و بکەوێتە ناو رێگای ئاشتی.

جەنابی سەرۆك لەراستیدا بەرێز ئوجەلان پێش لەوەی دەستبەسەر بکرێت، چەند جار پێشنیاری ئاگربەستی داوە کە هەموویان لە لایەن کاربەدەستانی مەدەنی و سەربازی تورکیاوە رەت کراوەتەوە.

یەکشەممەی ئەم هەفتەیە وتارێك لە رۆژنامەی *نیویورك تایمز*دا بڵاو بووەتەوە کە دەمارگرژی هەڵوێستی کاربەدەستانی تورکیای زیاتر خستووەتە بەر باس. بەگوێرەی ئەم وتارە وەزیری ناوخۆی تورکیا لیستێکی دەرکردووە کە کۆمەڵێك دەستەواژە لەخۆ

دەگرێت کە میدیاکان لە پەیوەندی لەگەڵ بەڕێز ئوجەلان و بزووتنەوەکەی یا کوردەکان بەگشتی، دەبێ تەنها کەڵك لەم دەستەواژانە وەربگرن. دەبێ هەواڵنێرانی ئاژانسە حکوومەتیەکان ئەم ڕێوشوێنە رەچاو بکەن. ئەمە نموونەیەکی دیکەی کردەوە بەردەوامەکانی تورکیایە بۆ هاندانی گرووتینی ناسیونالیستی دژی PKK و هاندانی خەڵکی تورکیا دژی کوردەکان، مێژووەکەیان، کولتوورەکەیان و رەوایەتی خەباتەکەیان.

جەنابی سەرۆك، رژێمی تورکیا تەنانەت دان بە بوونی کوردەکاندا نانێت و پێیان دەڵێت "تورکی شاخاوی" و هەموو هێماکانی کولتوور و زمانی کوردی قەدەخە کردووە و هەوڵ دەدات بیانتاوێنێتەوە و هاوکات ڕێبەرانی کورد دەخاتە بەندیخانە و ئەشکەنجەیان دەکات و دەیانکوژێت. لە ئەنجامی شەڕی شاراوەی تورکیا دژی کوردەکان، نزیکەی ٤٠ هەزار کەس کوژراون و زیاتر لە ٣ میلیون کەس ئاوارە بوونە.

## کێشەی کورد هەڵقوڵاوی سروشتی دیموکراسی لاوازی تورکیایە

## ٦ ی نیسانی ٢٠٠٠ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز فرانك پالۆن، نوێنەری ئەیالەتی نیوجێرسی:
جەنابی سەرۆك، من دەمەوێت پەیوەست بم بە هاوکاری هێژام بۆ ئامادەکردنی بڕیارنامەیەك کە داوای مافە دیموکراتیکە زمانی و کولتوورییەکان بۆ سەرجەم کوردەکانی تورکیا دەکات.

سەرزەمینی کوردستان شوێنی لە دایکبوونی مێژووی کولتووری مرۆڤایەتییە. هەندێ لە سەرەتاییترین شوێنەکانی نیشتەجێ بوونی مرۆڤ و سەرەتاییترین ئاسەوارەکانی "شۆڕشی نئولۆتیك" لە نێو تەپۆلکە و دۆڵەکانی ئەم وڵاتە جوانەدا دۆزراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە مرۆڤ دەتوانێت بیر لە پێشکەوتنە کولتوورییەکان لە خاکی کورد لە هەزاران ساڵ پێشدا بکاتەوە، بەڵام ناتوانێت سەری لەوە سڕنەمێنێت کە چارەنووسی کورد لە داهاتوودا چی دەبێت. کوردەکان کە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دەژین، لەمێژووی هاوچەرخی خۆیان هیچ خەیرێکیان نەبینیوە.

کوردەکان لە ئێران، عێراق، سوریا و تورکیا بە دەستی رژێمە دەسەڵاتدارەکان چەوساونەتەوە و سەدام حوسەین لە ساڵی ١٩٨٨ لە هێرشێکی دڕندانەدا بە گازی کیمیایی بەشێکی تەواوی شاری(هەڵەبجەی) لەگەڵ ٥ هەزار دانیشتووەکەی لەناو برد. هەرچەند هێرشە دزێوەکەی سەدام حوسەین بووە هۆی کوژرانی وێنانەکراوی خەڵك و کاولبوونی ناوچە بە چەکی بیولوژیکی، بەڵام رژێمی سەدام هیچ کاتێ هێرشێکی بەرفراوانی نەکردووەتە سەر کولتووری کوردەکان. جێگای داخە کە چڕوپڕترین هێرش

بۆ سەر زمان و کولتووری کورد لە لایەن تورکیای هاوپەیمانمان و ئەندامی ناتۆ ئەنجام دراوە.

جەنابی سەرۆك، ساڵی ١٩٩٧ لێرە لەم ئەنجوومەنەدا باسی سەرکوتی کولتووری کوردەکان بە دەستی دەوڵەتی تورکیام کرد و ئاماژەم بە بەندکردنی نادادپەروەرانەی پارلمانتارە کوردە بە دیموکراسی هەڵبژێردراوەکان لە تورکیا کرد، بەداخەوە ئەمڕۆش من لێرە لەبەرامبەر ئێوە راوەستاوم و رووداو و پێشهاتەکانی ئەم دواییەی تورکیاتان وەبیر دەهێنمەوە کە هەموویان نیشان دەدات بارودۆخەکە هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا نەهاتووە. زمان و کولتووری کورد هێشتا بەتوندترین شێوە سەرکوت دەکرێت و پارلمانتارە کوردەکان کە هەڵبژێردراون بۆ ئەوەی داکۆکی لە مافی خەڵکەکەیان بکەن، هێشتا دەنگیان کپ دەکرێت. کاتێ کە سێ ساڵ پێش باسی بارودۆخی کوردستانی تورکیام کرد، کوردستانی تورکیا لە ژێر حاڵەتێکی نائاسایی راگەیەندراودابوو کە ژاندارمەکان دەیانپاراست. ئەشکەنجە و پێشێلکردنی مافی کوردەکان، گەڕانی ماڵی کوردەکان بێ ئیزنی دادگا و تێکشکاندنی کۆڕوکۆمەڵەکان و خۆپیشاندانەکان شتێکی ئاسایی بوو.

پێشێلکردنی توندی مافی مرۆڤ، ئەمڕۆش بەردەوامە. راپۆرتی ساڵی ١٩٩٩ی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا دەڵێت کە هێزەکانی ژاندارمەی بەردەوامن لە پێشێلکردنی توندی مافی مرۆڤ ـ لەوانە ئەشکەنجە کردنی کوردەکان ـ چونکە باش دەزانن لێپرسینەوەیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ناکرێت. بەڵام بەهەرحاڵ بەپێچەوانەوە، لێپرسینەوە لەگەڵ کوردەکان زۆر توندوتۆڵە. ٦ ساڵ لەمەو پێش، چوار ئەندامی پێشووی پارلمانی تورکیا لەسەر کارە

فەرمیەکانیان دەرکران و بە تاوانی دەربڕینی خواست و داواکارییەکانی هاووڵاتیانی کورد خرانە بەندیخانە و ئەمڕۆش کە من لێرە لە بەرامبەر ئێوەدا راوەستاوم، خاتون لەیلا زانا، بەڕێز هاتیپ دیجلە، بەڕێز ئورهان دوغان و بەڕێز سەلیم ساداك هێشتا لە بەندیخانەدان. ئەم چوار کەسە کە لە لایەن رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەییەوە نازناوی"بەندکراوی ویژدان"یان پێبەخشراوە، تەنها گوناهیان ئەوەیە کە هەوڵیانداوە رۆحی راستەقینەی دیموکراسی لە تورکیا زیندوو بکەنەوە. ۳ ساڵ لەمەو پێش ۱۵۳ کەس لە ئەندامانی کۆنگرێس نارەزایەتی خۆیان لە رەفتاری نادیموکراتیکی تورکیا لەگەڵ پارلمانتارە کوردە هەڵبژێردراوەکان لە پارلمانی تورکیا دەربڕی، بەڵام ئەمڕۆ لێرە لە بەرامبەر ئێوەدا بە دڵنزمی پرسیار دەکەم ئایا تەنها دەربڕینی نارەزایەتی بەس بوو.

ئەمڕۆش ئەم چوار کەسە هێشتا لە بەندیخانەدان، مەسەلەی لەوە خراپتر ئەوەیە کە دەستدرێژیکردن بۆ سەر مافی کاربەدەستە کوردە بەدیموکراسی هەڵبژێردراوەکان لە ئاستی نەتەوەییدا تێپەڕ بووە و پێی ناوەتە ئاستی مەحەلی. مانگی شوباتی ئەمساڵ، لە کردەوەیەکدا کە گەلێ لە ئێمەی لێرە هەژاند، ژاندارمری تورکیا سێ شارەداری کوردی کوردستانی تورکیای دەستبەسەر کرد کە یەکێکیان شارەداری دیاربەکر بوو کە دروست یەك رۆژ پێش لە دەستبەسەربوون، لەگەڵ وەزیری دەرەوەی سوئید دیداری کردبوو بۆ ئەوەی هیواکان بۆ ئاشتیەکی درێژخایەن و پتەو لە نێوان تورك و کوردەکان بخاتە بەرباس. هەرچەند کە شارەدارەکان پاشان ئازاد کران بەڵام لە داهاتوودا دادگایی دەکرێن و ئەگەر تاوانبار بناسرێن، لەگەڵ حوکمی بەندیخانە رووبەڕوو دەبنەوە.

ئەم شەپۆلی دەستبەسەرکردنە، کۆمەڵێ پرسیار دەهێنێتە ئاراوە نەتەنها دەربارەی ڕەوایەتی دیموکراسی تورکیا بەڵکوو دەربارەی ڕاستگۆیی و نیازپاکی تورکیا بۆ پابەندبوون بە پێشخستنی ئاشتی. سێ ساڵ لەمەو پێش کە من باسی بارودۆخی کوردەکانم لێرە کرد، بیرکردنەوە و پەخشی بەرنامە بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکان، تەنانەت وەك زمانێکی بیانی قەدەخە بوو، بەداخەوە ئەم قەدەخەبوونە ئەمڕۆش بەردەوامە. بەڵام دەبێ ئەوەش زیاد بکەم کە بە سوچزانینی لێدوان و دەربڕینی بیروڕا تەنها بە هاووڵاتیانی کورد سنووردار نییە و ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەنووسان، چالاکانی مافی مرۆڤ ، پزیشکان و پارێزەرانیش کە لەگەڵ ڕەفتاری نادادپەروەرانەی سوپا، پولیس یا حکوومەتی تورکیا ڕووبەڕوون، حوکمی بەندیخانەیان لەسەر دەدرێت و ئەشکەنجە دەکرێن.

جەنابی سەرۆك، کێشەی کورد هەڵقوڵاوی سروشتی دیموکراسی لاوازی تورکیایە و کۆمەڵێك گیروگرفتی جیدی بۆ سەراسەری کۆمەڵگای تورکیا بەدواوە بووە. هەر ئەم هەفتەی ڕابردووە کاربەدەستانی تورکیا لە ئیستانبول نزیکەی ۲۰۰ کوردیان بەهۆی بەڕێوەبردنی جەژنی نایاسایی "نەورۆز"، ساڵی تازەی کورد دەستبەسەر کرد. دوابەدوای دەستبەسەرکردنی ئەم کەسانە، کاربەدەستان دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەسەر ٦ ڕۆژنامەی تورکیا کە ڕاپۆرتی چالاکیەکانی "نەورۆز"یان بڵاو کردبووە، بەهۆی ئەوەی وشەی"نەورۆز"یان بە پیتی(W) ی کوردی نووسیبوو، نە پیتی(V) ی تورکی. تەنها نووسینی پیتی(V) نییە کە کراوە بە سووچ، بەڵکو پینی(P) و (K) یش لە وانەی کتێبەکان سڕاوەتەوە.

ئەم لێپرسینەوەیە لەگەڵ کولتوور و زمانی کوردی کە ئەوەندە توندوتۆڵ و بەگڕوتینەوە بەڕێوەدەچێت کە تەنانەت پیتەکانی ئەلفوبێی کوردیشی قەدەغە کردووە، لەهەر ناوچەیەکی ئەم جیهانەدا روو بدات، جێگای داخ و پەژارەیە. ئەم دەستدرێژییە لە کوردستانێکدا روو دەدات کە لانکی شارستانییە و یەکەم چەخماخەکانی کولتوری مرۆڤ لەوێ سەری هەڵداوە بەڵام بارودۆخەکەی ئەمڕۆ ئەوەندە دژوارە کە هەمووی ئەو کەسانە کە ئەمڕۆ لێرە کۆبوونەتەوە، دەهەژێنێت.

جەنابی سەرۆك، ئەم بڕیارنامەیە کە هاوکارانی هێژام، بەڕێزان باب فیلنێر[1]، جان پورتێر[2]، فرانك وۆلف[3] و خاتوون ئانا ئیشۆ[4] پشتیوانیان لێکردووە، بەو هیوایە ئامادە کراوە کە کوردەکان لە داهاتوودا لەگەڵ ئازارو ئەزیەت و چەوساندنەوەی گەورەتر روبەڕوو نەبنەوە. بڕیارنامەکە بە ئاگاداری لەو مەسەلەیە ئامادە کراوە کە دیموکراسی دیاردەیەکی سادە نییە و پرۆسەیەکە کە دەبێ بەردەوام گەشە بکات و بەرەوپێش بچێت. بڕیارنامەکە هەروەها بەو هیوایە ئامادە کراوە کە تۆمی ئاشتی و دادپەروەری لە تورکیا بچێنێت، هەربۆیە داوا لە دۆستان و هاوکارانی هێژام دەکەم کە پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەن بۆ ئەوەی رێگە بەوە بدرێت کە زمان، کولتوور و دیموکراسی ئەوەندە بگەشێتەوە کە ئامانجە کولتوورییە هاوبەشەکانی مرۆڤ لە ناخی خاکدا ریشە دابوکتێت.

---

[1] Bob Filner
[2] John E. Porter
[3] Frank Wolf
[4] Anna Eshoo

## بەسەرهاتی لەیلا زانا هێمای بەسەرهاتی گەلی کوردە
## ٦ ی نیسانی ٢٠٠٠ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز باب فیلنێر:
جەنابی سەرۆك، دوێنێ من بڕیارنامەی(٤٦١)م لێرە خستەڕوو بۆ ئەوەی داوای ئازادی لەیلا زانا، هاتیب دیجلە، ئورهان دۆغان و سەلیم ساداك و هەروەها ئازادبوونی زمان و کولتووری کورد لە تورکیا بکەم. ناوی ئەم چوار کەسە لەوانەیە بۆ هەندێ کەس نامۆ بێت، بەڵام ئەمە ناوی پارلمانتارە کوردەکانە، ناوی ئەندامانی کۆنگرێسی کوردە کە لانیکەم ٦ ساڵە لە بەندیخانەدان. ئەمانە نوێنەری کولتوور و زمانی کوردەکانن. کوردەکان گەلێکی لەدایکبووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستن کە لە سەرزەمینێکی کەونار بە ناوی کوردستان دەژین. ئەم نوێنەرانە لە بەندیخانەدان تەنها بە تاوانی ئەوەی کە کوردن، و کوردەکان ئازاد نین بەهۆی ئەوەی وڵاتەکەیان لە ژێر دەستی تورکیا، سوریا، ئێران و عێراقدایە.

ئەنجوومەنی نوێنەران پێشتر ناوی "لەیلا زانا"ی بیستووە کە بەگوێرەی رۆژنامەی *نیویورك تایمز*، بەناوبانگترین کەسایەتی خەباتکاری کوردە لە جیهاندا. خەڵکی وڵاتی ئەمریکا ناوی کوردیان بیستووە، بەهۆی ئەوەی سەدام حوسەین بە چەکی کیمیایی و بیولۆژیکی ساڵی ١٩٨٨ هێرشی کردە سەریان و لە ساڵی ١٩٩١ یش هەڕەشەی دووپاتکردنەوەی ئەم هێرشەی لێیان کرد. بەڵام نە وڵاتی ئەمریکا و نە ئەنجوومەنی نوێنەران هیچ سەرنجێکی راستەقینەیان بە بارودۆخی دژواری کوردەکان نەداوە کە

هێشتا لەسەر خاکی کەوناری خۆیان دەژین و تەنانەت ئێستاش کە من لێرە قسە دەکەم بە دەستی دەوڵەتی تورکیا، سوریا، ئێران و عێراق دەچەوسێنەوە.

جەنابی سەرۆك، ئەمڕۆ دەمەوێت قسەکانم تەنها بە تورکیا سنووردار بکەم، لەبەر ئەوەی تورکیا وڵاتیکە کە ئێمە وەك هاوپەیمانێك شانازی پێ دەکەین و وەك دۆستێك پشتیوانی لێدەکەین و وەك شەریکێك لایەنگری لێدەکەین. تورکیا بە چەکە پێشکەوتووەکانی ئەمریکا تەیار بووە و ئەنبارەکەی پڕە لە چەکەکانی ئەمریکا وەك تفەنگی ١٦ ـ M ، تانکی ٦٠ ـ M ، کۆپتەری هێرشبەری "کوبرا" و فڕۆکەی شەڕکەری ١٦ ـ F . لەراستیدا هێزە تایبەتەکانی ئەمریکا لە تورکیا پەروەردە بە کوماندۆکانی تورکیا دەدەن. ڕێبەرانی تورکیا بە شانازییەوە بە خەڵکەکەیان دەڵێن"نەتەوەی سوپایی"[1] و ئێستاش قسەوباس ئەوەیە کە ئەمریکا دەیەوێت ١٤٥ کوپتەری هێرشبەر بە ٤ بیلیون دولار بفرۆشێت بە تورکیا.

ئێستا ئایا تورکیا بایەخی ئەم پشتیوانییەی ئێمەیەی هەیە؟ ئایا فڕۆکە شەڕکەرەکانی ئێمە، کۆپتەرە هێرشبەرەکانی ئێمە، تانکەکانی ئێمە و تفەنگەکانی ئێمە داکۆکی لە ئازادی هاووڵاتیانی تورکیا دەکەن؟ بۆ ئێمە پەروەردە بە کوماندۆکانی تورکیا دەدەین کە سەری قوربانیەکانیان دەبڕن و تەرمەکانیان بەشوێن ئوتومبیلە سەربازییەکاندا رادەکێشن؟

جەنابی سەرۆك، لە تورکیای ئەمڕۆدا بەداخەوە ئازادی لە ژێر هێرشدایە و ژینوسایدی کولتووری، یاسای سەرزەمینەکەیەتی و ژیانی کوردەواری لەوپەڕی تەنگژە و لەناوچووندایە.

---

[1] "army nation"

جەنابی سەرۆك، ولاّتی ئێمە هەمیشە کەمتەرخەم نەبووە بەنیسبەت بارودۆخی دژواری کوردەکان. بیست و هەشتەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا، وودرۆ ویلسۆن[٢] پشتیوانی لە مافی چارەی خۆنوسین گەلانی بندەست کردووە و لە لێدوانێکدا بۆ ئەنجوومەنی پیران لە ٢٢ ی کانوونی دووەمی ١٩١٧ وتی:

"نابێ هیچ نەتەوەیەك بەشوێن ئەوەدابێت دەسەلاّتی خۆی بەسەر نەتەوەیەك یا گەلێکی دیکەدا بسەپێنێت، بەلکو هەموو گەلان ـ گەلی بچووك لە پالّ گەلی گەورە و بەهێز ـ دەبێ ئازاد بن و سیاسەتی خۆیان و رێگای پێشکەوتنی خۆیان بێ هیچ کەندوکۆسپێك، بێ هیچ هەرەشەیەك و بێ هیچ ترسێك دیاری بکەن".

٣ مانگ دوای ئەم لێدوانە، ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چووە ناو بەرەی شەڕ بۆ پشتیوانی لە دەولّەتانی هاوپەیمان. هاواری"جیهان ئارام بکەن بۆ دیموکراسی" لە گەلانی بندەست لەسەراسەری جیهان و بنەمالّەکان لە ئەفریقای باکوور بگرە تا ئەورووپای ناوەڕاست بەرز بووەوە کە ناوی کوڕەکانی خۆیان دەکرد بە ناوی سەرۆك کۆماری ئێمە. بەلاّم وتە پێغەمبەرانەکانی سەرۆك "ویلسون" پشتگوێ خرا، بەتایبەت لە ناوچەکانی ئیمپراتوری عوسمانی. ئەرمەنیەکان بەکۆمەلّ کوژران و کوردەکان سەرکوت کران و پاش سەرهەلّدانی کۆماری تورکیا و دوابەدوای ئەوە هێدی هێدی کۆمەلکوژی کوردەکان بەڕێوەچوو.

لە تورکیا، یەك سالّ پاش دامەزرانی کۆماری تورکیا، ئەو گەلە کە مێژوونوسان بە "کورد" ناوی دەبەن و سەرزەمینێك کە جوگرافیناسان بە "کوردستان" ناوی دەبەن، یەك شەوە لە ئاخێوی فەرمی ولاّتی تورکیا سڕایەوە. کاربەدەستانی تورکیا دەیانگوت

[٢] Woodrow Wilson

کوردەکان لەراستیدا کورد نین بەڵکوو" تورکی شاخاوین" و سەرزەمینەکەیان لەراستیدا کوردستان نییە بەڵکو رۆژهەڵاتی تورکیایە و لەو کاتەوە تا ئێستا ئەم دەستێوەردانە کۆمەڵایەتی و چەواشەکارییە مێژووییە وەك یاسای وڵاتی تورکیا پروپاگەندای بۆ دەکرێ. هەزاران کەس لە راپەڕینە یەك لە دوای یەکەکاندا گیانی خۆیان لەدەست دا و میلیونەها کورد قەڵاچۆ کران.

لەوانەیە بەسەرهاتی لەیلا زانا، هێمای بەسەرهاتی کوردەکان بێت و هێمای واتای هەموو ئەو چیرۆکانە بێت کە دەربارەی سەرزەمینی کوردستانی بندەستی تورکەکان دەیگێڕنەوە. لەیلا زانا ساڵی ۱۹۶۱ لە گوندێکی بچووکی کوردنشین لە نزیکی "فارقین[3]" لە دایك بوو. یەکەمین بیرەوەرییەکانی لەیلا زانا لە گەڵ تورکەکان دەگەڕێتەوە بۆ هەڵسەوکەوتی تورکە باجکۆکەرەکان یا سەربازە تورکەکان. لە قوتابخانەی سەرەتاییدا مامۆستا تورکەکان بە" لەیلا زانا"یان گوت دەبێ فێری زمانی تورکی بێت لەبەر ئەوەی زمانی تورکی، زمانی شارستانییە. لەیلا زانا تەنها توانی ۳ ساڵ بچێتە قوتابخانە و پاش ئەوە لە کێڵگەیەکدا دەستی بەکار کرد و یارمەتی بنەماڵەکەی لە ناوماڵ دەدا و جارناجار ناوی "مەهدی زانا"ی دەبیست کە پاشان بوو بەهاوسەری و بوو بە ئەستێرەی روولەگەشەی سیاسەتی کورد.

لەیلا زانا لە ساڵی ۱۹۷٦ لەگەڵ مەهدی زانا ژیانی هاوسەری پێکهێنا و کۆچیکرد بۆ گەورەترین شاری کوردنشینی جیهان بە ناوی ئامەد(دیاربەکر) لە باکووری کوردستان. لە ساڵی ۱۹۷۷ مەهدی زانا وەك شارەداری "ئامەد" هەڵبژێردرا، بەڵام کاربەدەستانی تورکیا تۆقان. مەهدی زانا بوو بە کوردێکی ناسیونالیستی گەرموگوڕ

[3] Farqin

و توانی متمانەی هاووڵاتیە کوردەکانی بەدەست بهێنێت. شاری ئامەد لە لایەن حکومەتەوە گەمارۆی خرایە سەر و سەرچاوەی ئابووری وشك بوو. مەهدی زانا داوای یارمەتی لە هاوکارە ئەوروپاییەکانی کرد. شارەدارەکانی فەرانسا وەڵامیان دایەوە و ۳۰ پاس و ئوتومبیلی بارهەڵگری پڕ لە کەلوپەلی ئیداریان بۆ نارد. ئەم پاسانە پاش ئەوەی ماوەیەکی کورت خەڵکیان لەناو شار گوازتەوە، بە ئاسانی لە ناو بران. ئاشنایەتی لەیلا زانا لەگەڵ سیاسەت لەم ساڵە پڕ لە ئاژاوانە دەستی پێکرد.

لە ۱۲ ی ئەیلولی ۱۹۸۰ ، ژنەراڵێکی سوپای تورکیا بە ناوی کە کەنعان ئەورەن[٤] رایگەیاند رێبەری باڵای وڵاتە و دەوڵەت و پارلمانی هەڵبژێردراوی تورکیای هەڵوەشاندەوە. هێزەکانی "کەنعان ئەورەن" پاشان دەستیان کرد بە گرتنی نەیاران، بەتایبەت کوردەکان، کە ئەستێرەی روولە گەشەی ئاسمانی سیاسەتی کورد، مەهدی زانا یەکێ لە ئامانجە سەرەکیەکانیان بوو. پاش ۱۲ رۆژ، مەهدی زانا دەستگیر کرا و بێ ئەوەی تاوانەکەی رابگەیەندرێت لە سەرکارەکەی لابرا و بەماوەی ۸ ساڵ لە بەندیخانەی سەربازی دزێوی تورکیا ئەشکەنجە درا و مەرگی ۵۷ کەس لە هاورێکانی بە چاوی خۆی بینی. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە مەهدی زانا کۆڵی نەدا و هەروەك ژن و منداڵە ساواکەی تەحەمولی کرد. مەهدی زانا ۳ ساڵی زیادەی دیکەی لە بەندیخانە جۆراجۆرەکانی تورکیا تێپەڕ کرد و بیرەوەرییە پڕ ئێش و ئازارەکانی خۆی لە کتێبێکدا بە ناوی"بەندیخانەی ژمارە ٥" نووسی کە ئەم کتێبە ئێستا لە کتێبفرۆشیەکانی ئەمریکا و سایتی www. Amazoon.com دا هەیە.

[٤]Kenan Evren

من شانازی ئەوەم پێبەخشرا دو ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ ئەم قەهرەمانە ئاشتیخوازەی مافی کورد دیدار بکەم و کەوتمە ژێر کاریگەری رۆحی لێبوردوویی ئەم پیاوە بە نیسبەت ئەوانەی وا ئەشکەنجەیان کردووە. مەهدی زانا هەر وەك سەرۆك "نلسون ماندیلا" لە ئەفریقیای باشوور بەشوێنی تۆڵەسەندنەوەدا نییە، بەڵکو بەدوای ئاشتیدایە بۆ خۆی و بنەماڵەکەی و گەلەکەی. مەهدی زانا لەچەند وشەیەکدا کە هێشتا کار دەکاتە سەر من، داوای لێکردم دژی ژینوسایدی هێواش و بەرەبەرەی کوردەکان قسە بکەم و ئاماژەی بەوە کرد کە"ئەرمەنیەکان رەشەکوژ کراون، ئیستاش کوردەکان خەریکە بۆ هەتاهەتایە لەبیر دەکرێن".

جەنابی سەرۆك، رۆژانی قوتابخانەی لەیلا زانا بە کوێرەوەری، ئەشکەنجە، سووکایەتی پێکردن و ئازار و ئەزیەت تێپەڕ بوو، ئەم ئێش و ئازارانە تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە. کاتێ کە مەهدی زانا شارەداری ئامەد بوو، لەیلا زانا مندالێکی بە دنیا هێنا و پاشان کە هاوسەرەکەی دەستگیرکرا کچێکی هێنایە دنیا. لەیلا زانا بۆی دەرکەوت رێگایەکی ئەستەمی لە تورکیا لەپێشە چونکە هاوسەری شارەدارێکی خۆشەویست بوو و لە لایەن پۆلیسەوە ئازار و ئەزیەت دەدرا و دادگاکان دەیانگوت بازرگانە و بە شیاوی مەرگیان دەزانی.

لەساڵی ١٩٨٨ خودی لەیلا زانا خرایە بەندیخانە و لەگەڵ ئازار و ئەزیەت، ئەشکەنجە و سووکایەتیپێکردن روبەڕوو بووەوە بەهۆی ئەوەی هاوسەری بەندکراوە سیاسیە کوردەکانی بەرێکخستن کردبوو تا داوای دیدار لەگەڵ هاوسەرەکانیان بکەن. کاربەدەستان لە ترسی زنجیرەی کاردانەوەکان سەرەنجام داواکاری ئەم ژنانەیان قبوڵ کرد و هێشتیان بەندکراوەکان لەدوورەوە لەگەڵ هاوسەرەکانیان دیدار بکەن. لەیلا زانا ئەم

کێشمەکێشەی لەگەڵ پۆلیس کرد بە خاڵی وەرچەرخان لە خەباتی هۆشیارکەرەوەی خۆیدا وەك چالاکێکی سیاسی. لەیلا زانا شێلگیرانە دەستی کرد بە خوێندن و نووسین و وتاری بۆ گەلیّ لە بلاّڤۆکەکان نووسی و لە ئازموونی دیپلۆمی قوناخی دواناوەندیدا سەرکەوت و لەراستیدا بوو بە یەکەمین ژنی کورد کە لە شارەکەیدا ئەم دیپلۆمەی وەرگرتبوو.

ئەو ساڵانە هاوکات بوو لەگەڵ رووخانی "دیواری بەرلین"[٥] و هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت و کۆتایی پێهاتنی شەڕی سارد ـ کە بەسەر سیاسەتی نێونەتەوەییدا زاڵ بوو ـ لە رێگای نزیکبوونەوەی رۆژهەلاّت و رۆژئاوا. شەپۆلی گۆڕان، دیموکراسی برد بۆلای کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو و خەڵك هیوادار بوون کە ئەم شەپۆلە بچێتە ناو ئەو ولاّتانە کە لە ژێر دەسەلاّتی "دیکتاتورەکانی ئێمە" دا بوون وەك ئافریقیای باشوور، ئەندونیزیا و تورکیا. هەموومان دەزانین ئەفریقیای باشوور پێی نایە ناو دیموکراسی و هەر پارساڵ جیهان پێشوازی لە سەربەخۆیی یەکیّ لە بچووکترین گەلانی جیهان کرد واتا گەلی "تەیموری رۆژهەلاّت".

بەلاّم کوردەکان، کوردەکان، لەم رەوتی بەرەوپێشچوونە بەرەو ئازادی دوور خرانەوە. نەیارانی کوردەکان و دۆستە ساختەکانیان توانیان کوردەکان وەك نەتەوەیەك پێناسە بکەن کە لە قەبارەی ئەم ئازادییەدا نین. بەلاّم ئامانجی ئازادی، ئامانجێکی باشە و

---

[٥] دیواری برلین ئەو دیوارە بوو کە ئاڵمانیای رۆژهەلاّتی(کە لایەنگری بلۆکی رۆژهەلاّت بوو) لە ئاڵمانیای رۆژئاوا(کە لایەنگری بلۆکی رۆژئاوا بوو) جیا دەکردەوە و پاش کۆتاییپێهاتنی شەڕی سارد رووخا و لە ئەنجامدا هەردوو بەشی ئاڵمانیا یەکیانگرتەوە. لە ئەدەبیاتی سیاسیدا، رووخانی دیواری برلین هێمای هەرەسهێنانی سۆڤیەت و بلۆکی رۆژهەلاّتە.(وەرگێڕ)

پەردەی سەرکووت دەبێ لەسەر کوردەکان لابرێت. ئەو کاتە(ساڵی ١٩٩١) پێدەچوو ئاسۆی ئاشتی و ئاشتبوونەوەی کورد و تورك ببێ بەراست. لە تشرینی یەکەمی ١٩٩١ هەڵبژاردنی گشتی لە وڵاتی تورکیا بەڕێوەچوو و ٢٢ کورد وەك ئەندامی پارلمانی تورکیا هەڵبژێردران. ئەو کەسانە کە من لە سەرەتای قسەکانمدا ناوم بردن واتا لەیلا زانا، خەتیب دیجلە، ئورهان دوغان و سەلیم ساداك بەشێك لەم گروپە بوون. هیواکان بەرز بووەوە کە ئەم نوێنەرە بەهەق و نوێ هەڵبژێرداوانە ببن بە ناوبژیوانی کورد و تورك و ئاشتی و دادپەروەری جارێکی دیکە بگەڕێتەوە بۆ سەرزەمینی کوردەکان، بەڵام ئەو کاتە کە محمەت سینجار[٦]، ئەندامێکی کوردی تازە هەڵبژێردەراوی پارلمانی تورکیا بە رۆژی رووناك لە ٣ ی ئەیلوولی ١٩٩٣ کوژرا، ئەم هیوایە مرد. ساڵێك دواتر ٦ پارلمانتاری کورد بەهۆی لایەنگری لە چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانەی کێشەی کورد دەستبەسەر کران و ٦ پارلمانتاری دیکە کە هەستیان دەکرد "شمشێری داموکلوس* " بەردەوام بەسەریانەوەیە، هەڵاتن بۆ دەرەوە و داوای مافی پەنابەری سیاسیان لە ئەورووپا کرد. ٩ پارلمانتارە کوردەکەی دیکە یا دەستیان لە پۆستەکەیان کێشایەوە یا حیزبەکەی خۆیان گۆڕی و بوون بە ئەندامی حیزبەکانی دیکە بۆ ئەوەی ژیانی خۆیان رزگار بکەن. پاشان شەڕێکی تەواو دژی کوردەکان راگەیەندرا کە ئاکامی کاولکارانەی زۆری بەدواوە بوو. سەربازە تورکەکان

---

[٦] Mehmet Sincar

* شمشێری دامۆکلوس(دێموکلوس) ( Sword of Democles) ئەفسانەیەکی یونانییە و لە ئەدەبیاتی سیاسیدا مەبەست هەر جۆرە مەترسی و کارەساتێکە کە لەسەرویەندی قەوماندا بێت و هەر ئانوساتێك لەوانەیە روو بدات .( وەرگێڕ)

بەکەڵکوەرگرتن لە چەکەکانی ئەمریکا ویستیان دەنگی بەرخۆدانیی کورد بۆ هەتاهەتایە کپ بکەن و پێشنیاری ناگربەستە یەك لە دوای یەکەکانی کوردەکان رەت کرانەوە. گوندنشینە کوردەکان ناچار کران دژی ئەندامانی بنەماڵەی خۆیان- واتا کوردە راپەڕێوەکان - چەك هەڵبگرن وەگەرنا گوندەکانیان کاول دەکران. زیاتر لە ٣٤٠٠ گوند کاول کران و ٣٧٠٠ کەس(کە زۆرتر کوردبوون) کوژران و ٣ میلیون کورد ئاوارە بوون.

جەنابی سەرۆك، ٣ ساڵ لەمەوبەر هاوکاری هێژامان، نوێنەری ئەیالەتی ئیلۆنوێز، بەڕێز "پورتێر" نامەیەکی نارد بۆ سەرۆك کلینتۆن کە ١٥٣ کەس لە ئەندامانی خولی ١٠٥ی کۆنگرێس واژۆیان کردبوو و داوایان لە سەرۆك کۆمار کردبوو پشتیوانی لە لەیلا زانا بکات. یەك ساڵ دواتر لەراستیدا بەڕێز "پورتێر" لە بەندیخانەی تورکیا لەگەڵ لەیلا زانا دیداری کرد و داوای لە کاربەدەستانی تورکیا کرد لەگەڵ لەیلا زانا دیدار بکەن. بەداخەوە ئەم هەوڵانە هیچ ئەنجامێکی نەبوو، چونکە لەیلا زانا هێشتا لە بەندیخانەدایە و دەمارگرژی تورکەکان هێشتا لەوپەڕی خۆیدایە. بەڕێز "پورتێر" پاشان لە ٣٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ هەندێ لەم نیگەرانیانەی لە ناو بڕیارنامەیەکدا گونجاند کە منیش بڕیارنامەکەم لە کۆنگرێس خستەڕوو کە ئەمە بەشێکیەتی:

"جەنابی سەرۆك کۆمار ئێمە دەمانەوێت سەرنجی ئێوە بەرەولای بارودۆخی تراژیدیکی لەیلا زانا، یەکەمین ژنی کوردی ئەندامی پارلمانی تورکیا رابکێشین. خاتوون زانا کە دایکی دو منداڵە، بە زۆرترین دەنگ وەك نوێنەری شاری کوردنشینی دیاربەکر لە پارلمانی تورکیا هەڵبژێردرا بەڵام لە ئاداری ١٩٩٤ لە ناو بینای پارلمان دەستگیر کرا و

دواتر بەو سووچە کە کاربەدەستانی تورکیا ناویان نیا"لێدوانی جیاییخوازانە"، لێپرسینەوەی لەگەڵ کرا و لە مافی ئازادی دەربڕینی بیروڕا بۆ داکۆکیکردن لە مافەکانی گەلی کورد بێ بەش کرا. لەیلا زانا لە دیسامبری ١٩٩٤ حوکمی ١٥ ساڵ بەندیخانەی لەسەردرا و تا ئەمڕۆ لە بەندیخانەدایە.

یەکێ لەو تۆمەتانەی کە خراوەتە پاڵ خاتوون زانا ئەوەیە کە ساڵی ١٩٩٣ لێرە لە واشنگتۆن لە بەرامبەر کومسیونی هلسینکی کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئامادە بووە. بە بۆچوونی ئێمە زۆر زوڵمە کە هەرچەند کە لەیلا زانا لەسەر بانگهێشتی ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکا، لە کومسیونی هلسینکیدا بەشدار بوو، بەڵام ئەم ئامادەبوونە بووە یەکێ لە هۆکارەکانی بەندکرانی. خەباتی لەیلا زانا بۆ ئاڵوگۆڕی دیموکراتیك لەڕێگای ئاشتیخوازانە لە لایەن پارلمانی ئەورووپاوە ڕێزی لێگیراوە و بەتێکڕای دەنگ خەڵاتی ئاشتی "ساخارۆڤ"ی ساڵی ١٩٩٥ ی پێبەخشراوە. هەروەها ڕێکخراوەی لێبوردنی نێونەتەوەیی و ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ نیگەرانی خۆیان لە مەسەلەی لەیلا زانا دەربڕیوە.

تورکیا شەریکێکی گرنگی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، ئەندامی ناتۆیە و یەکێ لە وەرگرە سەرەکیەکانی یارمەتی بیانی ئێمەیە، بەڵام پێشێلکردنی مافی هاووڵاتیانی کورد و نوێنەرە بەڕەوا هەڵبژێردراوەکانیان قابلی قبوڵ نییە. زۆربەی کوردەکان "لەیلا زانا"یان وەك نوێنەری خۆیان هەڵبژاردووە تا داکۆکی لە مافەکانیان بکات بەڵام دەوڵەتی تورکیا هەوڵێکی بێ وێژدانانەی داوە بۆ ئەوەی چالاکیەکانی رابوەستێنێت. دەنگی لەیلا زانا نابێ کپ بکرێت. مەسەلەی لەیلا زانا تەنها یەکێ لە

نموونەکانی کەڵکوەرگرتنی تورکیا لە هێزی دەوڵەتییە بۆ ئەوەی خەڵك بەهۆی بیروڕای سیاسیان سەرکووت بکات.

جەنابی سەرۆك، ئێمە داوا لە جەنابت و ئیدارەی جەنابتان دەکەین مەسەلەی خاتوون لەیلا زانا لەگەڵ پایەبەرزترین کاربەدەستانی تورکیا بهێننە بەرباس و داوای ئازادکردنی دەستبەجێ و بێ شەرت و مەرجی بکەن چونکە لەوانەیە ئێمە جارێکی دیکە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشوازی لێبکەین".

جەنابی سەرۆك، ئەمە ئەو نامەیە بوو کە ١٥٣ کەس لە ئێمە ئەم دواییانە ناردومانە بۆ سەرۆك کۆمار. لەوکاتەوە، رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی، لەیلا زانا و ئەندامانی کوردی دیکەی بەهەق هەڵبژێردراوی پارلمانی تورکیای وەك"بەندکراوی وێژدان" هەڵبژاردووە. لە ساڵی ١٩٩٥ و ١٩٩٨ کومیتەی خەڵاتی ئاشتی نۆبێل ـ کە خەڵاتەکەی خۆی دەبەخشی بەو کەسانەی کە بۆ ئامانجە زۆر گەورەکانی ئێمە بۆ جیهانێکی پێکەوەسازانە خەبات دەکەن ـ پشتڕاسی کردەوە کە لەیلا زانا یەکێ لەو کاندیدایانە بووە کە گەیشتووە بە قۆناخی کۆتایی ئەم کێبەرکێیە. شاری رۆما خەڵاتی"هاووڵاتی شەرەفمەندی" پێبەخشیوە و رێکخراوە ئەوروپاییەکان گەلێ خەڵاتی جۆراوجۆریان پێبەخشیوە.

جەنابی سەرۆك، لە ساڵی ١٨٦٧ هاووڵاتی گەورەی ئەمریکا، *فردریك داگلاس*[٧] لە"داواکارییەی خۆی بۆ کۆنگرێس بۆ مافی دەنگدانی یەکسان" بە کورتی باسی بارودۆخی بنەماڵەی خۆی کردووە کە زۆر لەو داواکارییە دەچێت کە ئەم بڕیارنامەیەی ئێمە دەربارەی خاتوون لەیلا زانا لە دەوڵەتی تورکیا داوای دەکات. کاتێ کە روانگە

[٧] Frederick Douglas

مێژووییەکانی بەڕێز "داگلاس" دەخوێنمەوە، دیدارەکانی خۆمم لەگەڵ مەهدی زانا دێتەوە یاد و دەکەومەبیری ئەوەی چۆن مەهدی زانا بەدوای هەمان ئەو هەست و هەڵوێستانەدایە کە رزگاریدەری گەورەی ئێمە، بەڕێز "داگلاس" هەیبوو. بەڕێز داگلاس دەنووسێت:

"ئێمە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە دەستی سەرجەم هێزە قەڵاچۆکەرە کۆیلەگیرەکان رزگارمان بوو و لە کۆتایی ۲۵۰ ساڵ کۆیلایەتی، سەرمان هەڵدا بەڵام تووڕە و مرۆڤنەویست و تۆڵەسێنەر نەبووین بەڵکو خۆشڕو و مرۆڤدۆست و لێبوردە بووین. ئێمە ئێستا لە بەرامبەر کۆنگرێسی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئامادەبووین نە بۆ ئەوەی تۆڵەی رابردوو بکەینەوە بەڵکوو تەنها داوای داهاتوویەکی باشتر دەکەین".

جەنابی سەرۆك، بڕیارنامەکەی من کە ئێستا لە لایەن هاوکارانی هێژام بەڕێز پورتێر[٨]، نوێنەری ئەیالەتی ئیلونۆیز، خاتوون ئیشۆ[٩]، نوێنەری ئەیالەتی کالیفورنیا، بەڕێز بۆنیۆر[١٠]، نوێنەری ئەیالەتی میشیگان، بەڕێز ۆلف[١١]، نوێنەری ئەیالەتی ویرجینیا، بەڕێز ئیسمیت[١٢] نوێنەری ئەیالەتی نیوجیرسی و بەڕێز پالۆن[١٣]، نوێنەری ئەیالەتی نیوجیرسی پشتیوانی لێکراوە، داوای داهاتوویەکی باشتر بۆ کوردەکان دەکات. لە داهاتوویەکی وەهادا رێز لەو کەسانە ناگیردرێت کە داوای سزادان و تۆڵەسەندنەوە دەکەن بەڵکوو لەو کەسانە دەگیردرێت کە دەبوورن. لە داهاتوویەکی

---

[٨] Mr. Porter
[٩] Ms. Eshoo
[١٠] Mr. Bonior
[١١] Mr. Wolf
[١٢] Mr. Smith
[١٣] Mr. Pallone

وەهادا، زمان وەك کەندوکۆسپ سەیر ناکرێت بەڵکو وەك پێشکەشیەك لە لایەن خوداوەند بە خەڵك و لە لایەن خەڵك بە ئەوە و ئەتیجەکانیان رێزی لێدەگیردرێت و تەنها لە داهاتوویەکی وەهادایە کە ئاسۆی ئاشتی و دادپەروەری بۆ کوردەکان و داهاتوویەکی رووناکتر بۆ تورکەکان بەدی دەکرێت.

جەنابی سەرۆك، داوا لە دۆستانم دەکەم پشتیوانی لە ئێمە بکەن بۆ ئەوەی یارمەتی خەڵکی تورکیا بدەین داهاتوویەکی باشیان بۆ خۆیان و هەروەها مرۆڤایەتی تێکشکاوی ئێمە هەبێت.

جەنابی سەرۆك، داهاتوویەکی باشتر ئەو شتەیە کە ئێمە ئێستا لێرە داوای دەکەین.

## ١٥ ی نیسانی ٢٠٠٠ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

## ئێمە دەبێت بەتوندی دژی کردووە نادادپەروەرانەکانی تورکیا رابوەستین

بەرێز جان ئێدوارد پورتێر:

جەنابی سەرۆك، من پشتیوانی لەو بڕیارنامەیە دەکەم کە ئەمرۆ دەخرێتەڕوو و داوای ئازادی دەستبەجێی چوار ئەندامی کوردی پارلمانی کۆماری تورکیا لە بەندیخانە دەکات. هەروەها دەمەوێت سپاسی نوێنەری هێژای ئەیالەتی کالیفۆرنیا، بەرێز "فیلنێر" بکەم بۆ پشتیوانیکردن لەم بڕیارنامەیە کە منیش بە شانازییەوە یەکێ لە پشتیوانەکانی بووم.

ئێستا چوار پارلمانتاری کوردی سەر بە حیزبی کوردی قەدەخەکراوی "دیموکراتی گەل"(DEP) واتا لەیلا زانا، خەتیپ دیجلە، ئورهان دوغان و سەلیم ساداك لە بەندیخانەدان، تەنها بەهۆی ئەوەی کوردن. لەیلا زانا کە یەکەمین ژنی کوردە کە وەك ئەندامی پارلمانی تورکیا هەڵبژێراوە، لە تشرینی یەکەمی ١٩٩١ بە زۆرینەی دەنگ وەك نوێنەری شاری دیاربەکر هەڵبژێردرا. ساڵی ١٩٩٣ لەیلا زانا سەفەری کرد بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تا دەربارەی پێشێلکارییەکانی مافی کەمینەی کورد لە تورکیا بۆ کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا قسە بکات و لە بەرامبەر کۆمەڵەی مافی مرۆڤی کۆنگرێس شایەتی دا.

لەیلا زانا لە ٢ ی ئاداری ١٩٩٤ لە بینای پارلمان دەستبەسەر کرا و پاشان تۆمەتی "لێدوانی جیاییخوازانەی" خرایە پاڵ و دادگایی کرا، لەوکاتەوە خاتون زانا

هاوڕێ لەگەڵ خەتیپ دیجلە، ئورهان دوغان و سەلیم ساداك تەنها بە تاوانی قسەکردن بۆ داکۆکیکردن لە گەلەکەیان واتا گەلی کورد کە ئەوانی هەڵبژاردبوو، لە بەندیخانەدان. تورکیا وڵاتێکە کە بانگەشەی ئەو دەکات، دیموکراتە و بەردەوام هەنگاو هەڵدەگرێت بۆ ئەوەی وەك شەریکی رۆژئاوا قبوڵ بکرێت و ئێستا کاندیدی ئەندامێتی لە یەکێتی ئەوروپایە. بەهەرحاڵ کردەوەکانی ئەم دواییەی تورکیا هیچ لەگەڵ ئەرکەکانی بەنیسبەت رێوشوێنە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤدا نایەتەوە.

لە هەفتەی رابردووەوە سوپای تورکیا سەرباز و تانکەکانی خۆی لەسەر سنووری عێراق کۆ کردووەتەوە و پێدەچێت هێرش بکاتە سەر کوردەکان. مەسەلەیەکی خراپی دیکە، سەرلەنوێ دەستبەسەرکرانی "ئاکین بیرداڵ"ە کە بەناوبانگترین کەسایەتی چالاکی مافی مرۆڤە لە تورکیا. "بیرداڵ" بەهۆی ئەو لێدوانە دەستبەسەر کراوە کە تێیدا لە ١٩٩٦ داوای کردبوو رێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ کێشەی دەوڵەتی تورکیا و پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) بدۆزرێتەوە.

ئەگەر تورکیا دەیەوێت وەك شەریکی یەکسانی رۆژئاوا سەیر بکرێت، ئێستا کاتی ئەوەیە کە بە مافی یەکسان و رێزگرتنی گشتی لە مافی مرۆڤ لەگەڵ هاووڵاتیانی خۆی رەفتار بکات. ئێستا کاتی ئەوە بۆ تورکیا هاتووە کە رێگە بە گەلی کورد بدات بە زمانی خۆیان قسە بکەن و کولتووری خۆیان بەڕێوەببەن. ئازادکردنی پارلمانتارە کوردەکان بە تورکیا و جیهان نیشان دەدات کە تورکیا ئامادەیە رێز لە مافی سەرجەم هاوڵاتیانی خۆی بگرێت و کەوتووەتە سەر رێگای راست بۆ ئەوەی لە لایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە قبوڵ بکرێت. ئێمە نابێت درێژە بە پشتگوێ خستنی رەفتارە زاڵمانەکەی تورکیا بدەین یا داوای لێبوردنی لێبکەین. ٦ ساڵ زۆر زۆرە بۆ

ئەوەی ئەم پارلمانتارانە لە بەندیخانەدابن، تەنها بە تاوانی داکۆکیکردن لە مافی گەلەکەیان کە بەگوێرەی جارنامەی گەردونی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان مسۆگەر کراوە. ئێمە دەبێت بەتوندی دژی ئەم هێرشانە و ئەم کردەوە نادادپەروەرانە رابوەستین و داوا لە تورکیا بکەین کۆتایی بەم هێرشە نایاساییانە بهێنێت.

## ١١ ی تشرینی یەكەمی ٢٠٠٠ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## دژایەتی كردن لەگەڵ فرۆشتنی كۆپتەری جەنگی بە توركیا

بەڕێز بیلیراكیس[١]، نوێنەری ئەیالەتی فلۆریدا:

جەنابی سەرۆك، من ئەمڕۆ دەمەوێت دژایەتی توندی خۆم دەرببڕم لەگەڵ فرۆشتنی ١٤٥ دانە كۆپتەری هێرشبەری بیل- تیكسترۆن[٢] بە توركیا كە ئیدارەی ئەمریكا بەرنامەی بۆداڕشتووە.

پێش لە هەموو شتێك و لەهەمووی گرنگتر، دەبێ بڵێم فرۆشتنی ئەم كۆپتەرانە بە توركیا هیچ پێویست نییە، لەبەر ئەوەی توركیا ئێستا چەكدارترین دەوڵەتی ناوچەیە و پاش سوپای وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ، گەورەترین سوپای هەیە لە نێو دەوڵەتانی ئەندامی ناتۆدا. سەرەڕای ئەم راستیانە، توركیا بەرنامەی داڕشتووە ١٥٠ بیلیون دولاری دیكە لە ٢٥ تا ٣٠ساڵی داهاتوو بۆ كڕینی چەك خەرج بكات و دەیەوێت قۆناخی یەكەمی ئەم بەرنامەیە كە كڕینی ٣١ بیلیون دولار چەكە، لە ١٠ ساڵی داهاتوودا جێبەجێ بكات. باشتر وایە توركیا ئەم پارەیە خەرج بكات بۆ دورستكردنی قوتابخانە، نەخۆشخانە یا دروست كردنی خانوو بۆ قوربانیانی بومەلەرزەكەی پارساڵ.

---

[١] Mr. BILIRAKIS

[٢] Bell-Textron

جەنابی سەرۆك، ئەم مەسەلەیە هەر کۆتایی پێنایەت. ئەزموونەکانی پێشووی فرۆشتنی چەك بە تورکیا، هیچ شوێنێك بۆ خۆشبینی ئێمە ناهێڵێتەوە دەربارەی ئەوەی تورکیا کەڵکی رەوا لەم چەکانە وەربگرێت. بەتەواوی بەپێچەوانەوە، کارنامەی تورکیا نیشان دەدات کە سوپای تورکیا قەد نەیتوانیوە جیاوازی بخاتە نێوان ئامانجە سەربازی و مەدەنیەکان. لانیکەم لە ماوەی ١٦ ساڵی رابردوودا سوپای تورکیا کەڵکی لە چەکەکانی ئەمریکا ـ بەتایبەت کوپتەرە هێرشبەرەکان ـ وەرگرتووە بۆ کوشتنی زیاتر لە ٣٠ هەزار کەسی مەدەنی و کاولکردنی زیاتر لە دوو هەزار گوندی کوردنشین و ئاوارەکردنی زیاتر لە ٢/٥ میلیون کورد .

سوپای تورکیا لەکاتێکدا کەڵکی خراپ لەم چەك و سازوبەرگە سەربازییانە وەردەگرێت کە دەوڵەتی تورکیا چەند رێککەوتننامەیەکی نێونەتەوەیی جۆراوجۆری واژۆ کردووە بۆ مسۆگەرکردنی پاراستنی ئازادی ئایین و مافی مرۆڤ، بەڵام ئەم دواییانە تورکیا کۆپتەرێکی "کوبرا"ی ئەمریکای لە هەڵمەتە سەربازییەکەی دژی کوردکان لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بەکارهێناوە کە ئەمەش پێشێلکردنی راستەوخۆی "یاسای کونترۆڵی ناردنە دەرەوەی چەك" و "رێککەوتننامەی فرۆشتنی چەك بە دەرەوە"یە کە تورکیا لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا واژۆی کردووە. بەپێچەوانەی بەڵێن و سۆزە بەردەوامەکانی تورکیا بۆ ئەوەی ئەم بارودۆخە باشتر بکات، کارنامەی مافی مرۆڤی ئەم دەوڵەتە هێشتا پڕە لە پێشێلکاری.

لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٧ لە کاتی کۆبوونەوە لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیا ، دیپلوماتەکانی تورکیا بەڵێنیان دا کۆمەڵێك چاکسازی تایبەت بۆ باشترکردنی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا ئەنجام بدەن. لە کۆبوونەوەکانی دواتردا،

کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەڵێنیان دا دژی فرۆشتنی کۆپتەرە هێرشبەر یا سازوبەرگی سەربازی دیکە بە تورکیا رابوەستن هەتا ئەو کاتە کە دەوڵەتی تورکیا ئەم رێوشوێنانە جێبەجێ نەکات. بەڵام تورکیا تاچە رادەیەك پابەند بووە بە بەڵێنەکانی؟

بەگوێرەی راپۆرتی ساڵی ١٩٩٩ ی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەربارەی مافی مرۆڤ ، تورکیا نەیتوانیوە هیچکام لەو رێوشوێنانە جێبەجێ بکات کە ئیدارەی ئەمریکا بۆی داناوە. کەوابوو ئێمە چۆن دەتوانین رێگە بە فرۆشتنی ئەم چەکانە بە تورکیا بدەین لەکاتێکدا کە تورکیا بەردەوام بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ نەکردووە. ئەگەر ئێمە رێگا بە فرۆشتنی ئەم چەکانە بە تورکیا بدەین، متمانەی دەوڵەتەکەمان لەگەڵ مەترسی روبەڕوو دەبێتەوە، چونکە ئێمە بەردەوام رادەگەیەنین پابەندین بە رێزگرتن و هاندانی مافی مرۆڤ و دژایەتی کردن لەگەڵ پێشێلکارییەکانی تورکیا. وڵاتانی دیکە فرۆشتنی چەکیان بە تورکیا رەت کردووەتەوە بەهۆی کارنامەی مافی مرۆڤی ئەم وڵاتە.

بەگوێرەی راپۆرتێکی ئاژانسی دەنگوباسی *رۆیتێرز*، لە ٨ ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠ حیزبی دەسەڵاتداری "دیموکراتی کۆمەڵایەتی ئاڵمانیا" وتوویەتی دەوڵەتەکەیان بڕیاری فرۆشتنی هەزاردانە تانك بەبڕی ٧/١ بیلیون دولار بە تورکیا "ڤیتۆ"[٣] دەکات بەهۆی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا. کەوابوو لەکاتێکدا کە ئاڵمانیا

---

[٣] ڤیتۆ: وشەیەکی لاتینییە بە واتای "من ناهێڵم". لە رووی سیاسییەوە بەو مافە دەوترێت کە ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان هەیانە بۆ ئەوەی هەر بڕیارنامەیەکیان کە پێباش نەبوو نەهێڵن پەسەند بکرێت.( وەرگێڕ)

دەیەوێت بەهۆی ئەم نیگەرانیانە چاوپۆشی لەم مامەڵە پڕقازانجە لەگەڵ تورکیا بکات، بۆ ئێمە هەروا نەکەین؟ ئایا دەوڵەتی ئێمە کەمتر پابەندە بە پاراستنی مافی مرۆڤ ؟ ئایا پرەنسیپەکانی ئێمە نەرمونیانترن کاتێ کە باسی مامەڵەیەکی گەورەی پڕ قازانج دێتە مەیدان؟ هیوادارم وا نەبێت.

جەنابی سەرۆك، هەندێ لە بایەخەکان لە قازانجە ژئوپلوتیکەکان گرنگترن کە رێزگرتن لە مافی مرۆڤ یەکێکیانە. خەڵکی سەراسەری جیهان چاویان لە رێبەرایەتی و رێنوێنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکایە، بەهۆی پابەندبوونی توندی ئێمە بەم پرەنسیپانە. ئێستا بەلەبەرچاوگرتنی کارنامەی رابردووی مافی مرۆڤی تورکیا، فرۆشتنی ئەم چەکانە بە تورکیا دژی ئەو بایەخانەیە کە ئێمە پشتیوانی لێدەکەین و خراپە بۆ روخساری ئێمە لە دەرەوەی وڵات و هەڕەشەیە بۆ ئاسایشی ناوچەیەکی ئیستراتژیکی گرنگ.

جەنابی سەرۆك، بەم هۆکارانە کە باسم کرد داوا لە ئەندامانی ئەنجوومەن دەکەم کە پەیوەست بن بە من بۆ دژایەتیکردن لەگەڵ ئەم مامەڵەیە لەگەڵ تورکیا و داوای ئەوە بکەین کە ئەم مامەڵەیە دەستبەجێ هەڵبوەشێتەوە.

بەڕێز مکگۆوێرن[٤]:

جەنابی سەرۆك، لەمێژە من نیگەرانی ئاستی یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا و فرۆشتنی چەك بە تورکیام. ئەگەر نێوەنجی ئەم فرۆشتنە لەبەرچاوبگرین، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەر ساڵ بایی زیاتر لە یەك بیلیون

---

[4] Mr. McGOVERN

دولار، یارمەتی سەربازی راستەوخۆی تورکیا دەدات و پەروەردەی سەربازی دەدات و چەکی پێدەفرۆشێت. بەهەرحاڵ کۆمەڵێك هۆکاری تایبەتی دیکە هەیە کە بۆچی من دژی ئەم مامەڵەیەم بۆ فرۆشتنی ١٤٥ کۆپتەری هێرشبەر بە ٤/٥ بیلیون دولار لە لایەن کارخانە چەکسازییەکانی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا. هیچ شتێ بە قەد ئەم مامەڵە سەربازییە لەگەڵ تورکیا خراپ نییە بۆ هەوڵەکانی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بۆ چەسپاندنی ئاشتی و سەقامگیری لە ناوچەی رۆژهەلآتی دەریای مەدیتەرانە. رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە ناوخۆ و دەرەوەی تورکیا بە بەڵگە سەلماندوویانە کە تورکیا لە کۆپتەرە کوبراکانی ئەمریکا کەڵك وەردەگرێت لە هەڵمەتە سەربازییەکەی دژی گەلی کورد لە باشووری رۆژهەلآتی تورکیا.

سوپای تورکیا قەد نەیتوانیوە جیاوازی بخاتە نێو ئامانجە سەربازی و مەدەنیەکان لە ماوەی ١٦ ساڵی رابردوودا. سوپای تورکیا چەکەکانی ئەمریکا، بەتایبەت کۆپتەرە هێرشبەرەکانی بەکارهێناوە بۆ کوشتنی زیاتر لە ٣٠ هەزار خەڵکی سڤیل و زیاتر لە دوو هەزار گوندی کوردنشینی کاول کردووە و زیاتر لە ٢/٥ میلیون کوردی ئاوارە کردووە. رێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی لەراپۆرتی ساڵی ٢٠٠٠ ی خۆیدا رایگەیاندووە کە رێژەی ئەشکەنجە لە تورکیا لە ساڵی رابردوو لەراستیدا زیادی کردووە.

ئێستا لەکاتێکدا کە جیهان بە هیوای ئەوەیە کە بونبەستی وتووێژەکان لەسەر قوبرس بشکێت، ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاری فرۆشتنی ئەم هەموو چەکوچۆڵەی بە تورکیا پەسەند کردووە. لەکاتێکدا کە جیهان هەوڵ دەدات هێرشەکان و کردووە

سەرکوتکارانەکانی دەوڵەتی تورکیا دژی کەمینەی کورد کەم ببێتەوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاری فرۆشتنی ئەم هەموو چەکوچۆڵەی بە تورکیا پەسەند کردووە. بۆ ئیدارەی ئەمریکا رێگە دەدات ئەم مامەڵە بازرگانیە بچێتە پێش؟ تورکیا چەکدارترین دەوڵەتی ناوچەی مەدیتەرانەیە و باڵادەستیەکی سەربازی گەورەی بەسەر دراوسێکانیدا هەیە. کەوابوو پێویست ناکات رێژەی چەکوچۆڵەکانی زیاد بکات.

باشتر ئەوەیە دەوڵەتی تورکیا لە باتی خەرجکردنی ٤/٥ بیلیون دولار بۆ کڕینی کۆپتەری هێرشبەر، ئەم پارەیە بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە بومەلەرزەلێدراوەکان و دروستکردنی قوتابخانەی زیاتر و بنکەی تەندروستی خەرج بکات و پێداویستە ئابووریە بنەڕەتیەکانی دیکەی خەڵکەکەی دابین بکات.

داوا لە ئیدارەی ئەمریکا دەکەم مۆڵەتی فرۆشتنی ئەم چەکانە بە تورکیا هەڵبوەشێنێتەوە و دەست لە سیاسەتی لەمێژینەی خۆی - کە هەم ئیدارەی دیموکراتەکان و هەم ئیدارەی کۆماریخوازەکان وەکوو یەك پشتیوانی لێدەکەن - بۆ چەکدارکردنی تورکیا هەڵبگرێت.

ئەو هەولانە کە لە کاتی شەڕی سارد دەدرا بۆ دژایەتیکردن لەگەڵ بەرهەمهێنانی چەك، ئێستا دەبێ بدرێت بۆ داماڵینی چەك لە ناوچە. فرۆشتنی چەك، هیچ یارمەتیەك بە ئاشتی و سەقامگیری ناوچە و رێزگرتن لە مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ نادات.

## ٧ ی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٠ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران
## دەوڵەتی توركیا دەبێ دان بە مافە بنەڕەتیەكانی گەلی كورددا بنێت

بەڕێز فرانك پالۆن:

جەنابی سەرۆك، ئەمڕۆ دەمەوێت دەربارەی ئەوە قسە بكەم كە پێویستە دەوڵەتی توركیا دان بە مافە بنەڕەتیەكانی گەلی كورددا بنێت. هەروەها دەمەوێت پێشێلكردنی بەردەوامی مافی ئەم گەلە لە توركیا، بەتایبەت لەم دواییانە شەرمەزار بكەم. من هەمیشە وتوومە كە دەبێت وەك گەلێك رێز لە كوردەكان بگیردرێت و جیهان دەبێ سەرەنجام گوێ لە داواكارییەكانیان بگرێت و رێز لە ئامانجەكانیان بگرێت و كوردەكان دەبێ مافی ئەوەیان هەبێت كە وەك سەرجەم گەلانی ئەم جیهانە، نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن.

دەوڵەتی توركیا دان بە رەوایی خەباتی كورد و تەنانەت دان بە بوونی گەلی كورددا نانێت و رێبەرانی ئەم گەلەی بەند كردووە، بەڵام پەیامی ئەم رێبەرانە بە دەنگێكی روون و بەرز دەلەرزێتەوە.

جەنابی سەرۆك، لە چەند هەفتەی رابردوودا دەوڵەتی توركیا حاڵەتی نائاسایی لە پارێزگا سەرەكییە كوردنشینەكان ـ كە ١٣ ساڵە هەیە ـ بۆ چوار مانگی دیكە درێژ كردووەتەوە و هەمووومان دەزانین كە لە كۆتایی ئەم چوار مانگەدا، دیسان درێژ دەكرێتەوە. لەمەزیاتر درێژكردنەوەی حاڵەتی نائاسایی بە پێچەوانەی لێدوانی فەرمی

کومسیونی ئەورووپا رووی داوە کە وتوویەتی وازهێنان لە حاڵەتی نائاسایی یەکێ لەو ئامانجانەیە کە تورکیا دەبێ پێبگات.

لە ٤ ی کانوونی یەکەم رۆژنامەی *واشنگتۆن پۆست* بڵاوی کردەوە کە بەرپرسی ئینسیتۆی زمانی کوردی لە ئیستانبول بە تۆمەتی ئەوەی کە گوایا ئەم ئینسیتۆیە، دامەزراوەیەکی نایاسابییە، دادگایی دەکرێت. ئەم تاوانبارکردنە سەرەڕای ئەو راستیە روودەدات کە دادگاکانی ئاسایشی تورکیا ٨ ساڵە لە کارمەندانی ئەم ئینسیتیتۆیە وەك وەرگێڕی زارەکی کەڵك وەردەگرن. ئەم رووداوە شێوازی دەستدرێژییەکانی تورکیا بۆ سەر مافی مرۆڤ نیشان دەدات کە بەردەوام دووپات دەبێتەوە، بەڵام ئەم پێشێلکارییە دژ بە مافی گەلی کورد دەبێ دەستبەجێ کۆتایی پێبێت.

جەنابی سەرۆك، داوا لە هاوکارانم دەکەم پەیوەست بن بە من و داوا لە تورکیا بکەن کە دەستبەجێ مافە بنەڕەتیەکان ببەخشێ بە هاووڵاتیانی کورد لە تورکیا و بەتەواوی دان بە بوونی گەلی کورددا بنێت. ئەم هەنگاوە، کۆتاییهێنان بە حاڵەتی نائاسایی، هەڵگرتنی سەرجەم کەندوکۆسپەکان لەسەر پەخشی زمانی کوردی لە تەلەڤیزیون، سینەما و سەرجەم شێوەکانی هونەرە جوانەکان و کولتوور لەخۆ دەگرێت. بەتایبەت بوونی کەندوکۆسپ لە سەر زمان و کولتوور کورد جێگای داخە، چونکە سەرزەمینی کوردستان شوێنی لە دایکبوونی مێژووی کولتووری مرۆڤایەتیە. زۆر جێگای داخە کە هێشتا پێویست بەوە دەکات کەسێکی وەکو من لێرە هەڵبسێت و پێشێلکردنی ئەم مافە بنەڕەتیانە بە دەستی تورکیا شەرمەزار بکات.

جەنابی سەرۆك، ساڵی۱۹۹۷ باسی ناوەندی"تۆڕی زانیاری کورد لە ئەمریکا[1]" م کرد کە رۆشنیایی خستبووە سەر سەرکووتی کولتووری کوردەکان بە دەستی دەوڵەتی تورکیا و تێکشکاندنی زمان و کولتووری کورد بە دەستی تورکەکان. ئەوکاتە ۱۵۳ کەس لە ئەندامانی کۆنگرێس نارەزایەتی خۆیان لە بەرامبەر رەفتاری نادیموکراتیکی تورکیا لەگەڵ نوێنەرە کوردە هەڵبژێردراوەکانی پارلمانی تورکیا دەربڕی. مانگی نیسانی ئەمساڵ ژمارەیەك لە هاوکارانم پەیوەست بوون بە من بۆ ئامادەکردنی بڕیارنامەیەك کە داوای ئازادی دەستبەجێ و بێ شەروتومەرجی ئەندامانی کوردی پارلمانی تورکیا لە بەندیخانە و دانپێدانان بە سەرجەم مافە کولتووری و زمانیەکانی کوردەکان لە ناو وڵاتی تورکیا دەکرد.

ئێستا جەنابی سەرۆك، من درێژە بە خەباتەکەم بە نوێنەرایەتی لە لایەن گەلی کوردەوە دەدەم، بەهۆی ئەوەی دەنگی ئەم گەلە هێشتا سەرکووت دەکرێت، هەر چەند کە شەڕی نێوان دەوڵەتی تورکیا و گریلا کوردە جیاییخوازەکان لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دوابەدوای گیرانی بەرێز عەبدوڵڵا ئوجەلان، رێبەری پارتی کرێکارانی کوردستان بەشێوەیەکی بەرچاو کەمی کردووە. بەهەرحاڵ ئەو ترسەی ناسیونالێستە تورکە دەمارگرژەکان کە گوایا دانپێیدانان بە شووناسی کورد، تورکیا لەیەك هەڵدەوەشێنێتەوە و هەستی جیاییخوازی بەهێز دەکات، لە جێی خۆیدا نییە چونکە ئالۆزییەکان رووی لە کەمی کردووە.

جەنابی سەرۆك، تورکیا دەبێ لەگەڵ رێبەرە کوردەکان وتووێژ بکات، تورکیا دەبێ گەمارۆکان لەسەر ئەرمنستان هەڵبگرێت و کۆتایی بە داگیرکردنی سەربازی باکووری

[1]American Kurdish Information Network

قوبرس بهێنێت. ئاڵوگۆڕێکی وەها لە ڕەفتاری تورکیا بە قازانجی هەموو کەسێکە لە ناوچەدا، لەوانە گەلی تورك. هیوادارم هاوکارانم پەیوەست بن بە من بۆ ئەوەی بە زووترین کات ئەم پەیامە بگەیەنین بە دەوڵەتی تورکیا.

هەروەها لە ٧ ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠ ، هاوکارمان، بەڕێز پالۆن لە لێدوانێکی چاپەمەنیدا داوای لە تورکیا کرد کە کۆتایی بە حاڵەتی نائاسایی لە چوار پارێزگا کوردنشینەکە بێنێت و مافە بنەڕەتیەکان بدات بە هاوولاتیانی کورد.

ئەمە دەقی لێدوانە چاپەمەنیەکەی بەڕێز "پالۆن"-ە:

واشنگتۆن، دی سی

ئەمڕۆ بەڕێز "فرانك پالۆن" لە لێدوانێکدا لە هۆڵی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داوای لە دەوڵەتی تورکیا کرد دان بە مافە بنەڕەتیەکانی گەلی کورددا بنێت و پێشێلکردنی ئەم مافانەی لە تورکیا لەم دواییانە شەرمەزا کرد. کۆنگرێسمەن "پالۆن" هەروەها ئەمڕۆ نامەیەکی نارد بۆ باکی ئیلکین[٢]، باڵوێزی تورکیا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و داوای لە دەوڵەتی تورکیا کرد حاڵەتی نائاسایی لە چوار پارێزگا کوردنشینەکە لاببات. بەڕێز "پالۆن" هەروەها داوای لە تورکیا کرد: "مافە بنەڕەتیەکان دەستبەجێ بدات بە هاوولاتیانی کورد لە تورکیا و بە تەواوی و بەشێوازێکی فەرمیتر دان بە بوونی گەلی کورددا بنێت".

ئەمە دەقی نامەکەی بەڕێز پالۆنە کە بۆ باڵوێز ئیلکین نووسیویەتی:

---

[٢] Baki Ilkin

٧ ی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٠
بەڕێز باكی ئیلكین، باڵوێزی توركیا

جەنابی باڵوێز ئیلكین
من داوا لە دەوڵەتی ئێوە دەكەم حاڵەتی نائاسایی لە چوار پارێزگا كوردنشینەكە لە توركیا هەڵبگرێت كە بریتین لە دیاربەكر، حەكاری، شەڕناخ و تونچیلی. درێژكردنەوەی ماوەی حاڵەتی نائاسایی بەپێچەوانەی لێدوانی فەرمی كومسیونی ئەوروپایە كە وتوویەتی هەڵگرتنی حاڵەتی نائاسایی یەكێ لەو ئامانجانەیە كە توركیا دەبێ پێیبگات. دەوڵەتی ئێوە لەباتی ئەوە، دەبێ دەستبەجێ مافە بنەڕەتیەكانی هاوولاتیانی كورد بدات پێیان و بەشێوەیەكی فەرمیتر و بە تەواوی دان بە بوونی گەلی كوردا بنێت. ئەم هەنگاوە، هەڵگرتنی كەندوكۆسپەكان و ئاسانكاری بۆ پەخشی زمانی كوردی لە تەلەڤیزیون، سینەما و هەموو شێوەكانی هونەرە جوانەكان و كولتوور لەخۆ دەگرێت.

لە ٤ ی كانوونی یەكەم رۆژنامەی *واشنگتۆن پۆست* بلاوی كردەوە كە بەرپرسی ئینیستیتۆی زمانی كوردی لە ئیستانبول بە تۆمەتی ئەوەی كە گوایا ئەم ئینستیتۆیە، دامەزراوەیەكی نایاساییە، دادگایی دەكرێت. ئەم تاوانباركردنە سەرەڕای ئەو راستیە روو دەدات كە دادگاكانی ئاسایشی توركیا ٨ ساڵە لە كارمەندانی ئەم ئینستیتۆیە وەك وەرگێڕی زارەكی كەڵك وەردەگرن. ئەم رووداوە، شێوازی دەستدرێژییەكانی توركیا بۆ سەر مافی مرۆڤ نیشان دەدات كە بەردەوام

دووپات دەبێتەوە، بەڵام ئەم پێشێلکارییە دژ بە مافی گەلی کورد دەبێ دەستبەجێ کۆتایی پێبێت.

ئەو ئاڵوگۆڕانە کە من داوای دەکەم، بەتایبەت لە کات و شوێنی خۆیدایە، چونکە شەڕی نێوان دەوڵەتی تورکیا و گریلا کوردە جیاییخوازەکان لە باشووری ڕۆژهەڵات تورکیا دوابەدوای گیرانی بەڕێز عەبدوڵڵا ئوجەلان، ڕێبەری پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) بەشێوەیەکی بەرچاو کەم بووەتەوە. بەهەرحاڵ ئەو ترسەی ناسیونالیستە تورکە دەمارگرژەکان کە گوایا دانپێدانان بە شووناسی کورد، تورکیا لەیەك هەڵدەوەشێنێتەوە و هەستی جیاییخوازی بەهێز دەکات، لەجێی خۆیدا نییە چونکە ئاڵۆزییەکان رووی لە کەمی کردووە.

سپاستان دەکەم کە ئەم هەلەتان بۆ رەخساندم بیروبۆچوونەکانم بگەیەنم بە ئێوە.

لەگەڵ ڕێزمدا

فرانك پالۆن

ئەندامی کۆنگرێس

# پاشکۆی١

## تاوتوێی بارودۆخی کوردەکانی ئێران، عێراق و تورکیا لە کومیسیونی ئاسایش و هاوکاری لە ئەوروپا (کومیسیونی هلیسینکی) سەر بە کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

١٧ی گوڵانی ١٩٩٣

## كۆنگرێسی ولآته یهكگرتووهكانی ئهمریكا
## كومیسیونی ئاسایش و هاوكاری له ئهوروپا (كومیسیونی هلیسینكی)

# بارودۆخی كوردهكان له ئێران، عێراق و توركیا

بهشداربووان:

لهیلا زانا- ئهحمهد تورك- دۆكتۆر بهرههم ئهحمهد صالح- دۆكتۆر نجم الدین كریم- دوكتۆر مارك ئیپیستهین

كومیسیونی ئاسایش و هاوكاری له ئەورووپا

كۆنگرێسی وڵاته یەكگرتووەكانی ئەمریكا

واشنگتۆن، دی ، سی، ٢٠٥١٥

١٩٠١-٢٢٥-٢٠٢

* * * *

سەرۆكی كومیسیون: كۆنگرێسمەن دینیس دیكۆنسینی[1]، نوێنەری ئاریزۆنا

هاوسەرۆكی كومیسیون: كۆنگرێسمەن ستینی هۆیەر[2]، نوێنەری مریلەند

* * * *

ئەندامانی بەڕێوەبەرایەتی:

ئێدوارد ج ماركی[3]: نوێنەری ماساچۆسێت

بیل ریچاردسۆن[4]: نوێنەری نیۆمێكزیكۆ

فرانك مەككلۆسكی[5]: نوێنەری ئیندیانا

---

[1] DENNIS DECONCINI
[2] STENY HOYER
[3] EDWARD J MARKEY
[4] BIL RICHARDSON
[5] FRANK MACCLOSKEY

بین کاردین[6]: نوێنەری مریلەند

کریستۆفێر ﻫ ئیسمیت[7]: نوێنەری نیۆجێرسی

جان ئێدوارد پۆرتێر[9]: نوێنەری ئیلۆنۆیز

فرانك ر ولف[10]: نوێنەری ڤیرجینیا

هامیلتۆن فیش[11]: نوێنەری نیۆیۆرك

فرانك لەوتینبیرگ[12]: نوێنەری نیۆجیرسی

هاری رەید[13]: نوێنەری نیڤادا

باب گراهام[14]: نوێنەری فلۆریدا

باربارا میکۆلسکی[15]: نوێنەری مریلەند

ئالفۆنس م داماتۆ[16]: نوێنەری نیۆیۆرك

ئارلین سپیکتێر[17]: نوێنەری پنیسیلڤانیا

چارلز گراسلی[18]: نوێنەری لۆڤا[19]

کۆنی ماك[20]: نوێنەری فلۆریدا

---

[6] BIN CARDIN
[7] CHRISTOPHER H SMIT
[9] JOHN EDWARD PORTER
[10] FRANK k WOLF
[11] HAMILTON FISH
[12] FRANK LAUTENBERG
[13] HARRY REID
[14] BOB GRaHAM
[15] BARBARA MIKULSKI
[16] ALFONSE M DAMATO
[17] ARLENE SPEKTER
[18] CHRLES GRASSLEY
[19] LOWA
[20] CONNIE MACK

*** *

ئەندامانی لقی کارگێڕی :

له وەزارەتی دەروە

له وەزارەتی بەرگری

له وەزارەتی بازرگانی

*** *

ئەندامانی بەڕێوەبەری بەشی ستاف:

سامۆئیل گ ویس[21]: بەڕێوەبەری بەشی ستاف

ماری سۆ هافنێر[22]: جێگری بەڕێوەبەری بەشی ستاف و راوێژکاری گشتی

جەین س فیشێر[23]: جیگری بەڕێوەبەری بەشی ستاف

دەیڤید م ئیوانس[24]: راوێژکاری باڵا له کاروباری رۆژهەڵاتی ئەوروپا و پۆست-سۆڤیەت

سپینسێر ئۆلیڤێر[25]: راوێژکار

*** *

[21]SAMUEL G WISE
[22] MARY SUE HAFNER
[23] JANE S FISHER
[24] DAVID M EWANS
[25]SPENCER OLIVER

ئەندامانی ستاف:

مایك ئامیتای[26]، پاتریکا کارلی[27] ، بریندا کۆلێر[28]( ریسیپشینیست)، ئۆریت دەیچاکیڤیسکی[29]، جان فینیرتی[30]، رۆبیرت هاند[31]، هیسێر هورلبورت[32]، جیسی جاکوبس[33]، رونالد مەکنامارا[34]، جین مەکناوتۆن[35]، تام مۆرفی[36] ، مایکیل ئۆشس[37]، جەیمز س رێد[38](سکرەتیری بەشی چاپەمەنی)، ئیریکا ب شلاگێر[39]، وینکا شۆڤالتێر[40]، کۆرین زاککاگنی[41]( بەڕێوەبەری ئیداری ئۆفیس).

[26] MAIK AMITAY
[27]PATRICIA CARLEY
[28] BRENDA COLLIER
[29] OREST DEYCHAKIWISKY
[30] JOHN FINERTY
[31]ROBERT HAND
[32] HEATHER HURLBURT
[33] JESSE JACOBS
[34] RONALD MCNAMARA
[35] JEANNE MCNAUGTHON
[36] TOM MURPHY
[37]MICHAEL OCHS
[38] JAEMES S REIDG
[39] ERICHA B SCHLAGER
[40] VINCA SHOWALTER
[41] CORIEEN ZACCAGNINI

پانیلیك (دانیشتنێك) دەربارەی بارودۆخی کوردەکان له ئێران، عێراق و تورکیا له کۆمیسیونی ئاسایش و هاوکاری له ئەوروپا سەر به کۆنگرێسی ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا

واشنگتۆن دی سی ، دوشەمبە، ١٧ی گولانی ١٩٩٣

ئەم پانیله له ژوری ٢٢٢٦، بینای رایبۆرن سەر به ئەنجوومەنی نوینەران له واشنگتۆن دی سی، کاتژمیر ١٠ی پێش نیوەرۆ بەرێوەچوو.

بەرێوەبەری پانیل: خاتوون ماری سۆ هافنێر[42] ، جێگری بەشی ستاف و راوێژکاری گشتی کۆمیسیونی ئاسایش و هاوکاری له ئەوروپا

بەشداربووانی سەرەکی: ئەحمەد تورك ، بەرهەم (ئەحمەد) صالح و دوکتۆر مارك ئیپیستەین[43]

وەرگێڕ: کانی غولام[44]

[42] MARY SUE HAFNER
[43] MARK EPSTEINE
[44] KANI XULAM

خاتوون هافنێر:

بەخێرهاتنی سەرجەم بەشداربووان دەکەم. ئەم پانیلە لە لایەن کومیسیونی ئاسایش و هاوکاری لە ئەورووپا بەڕێوەدەچێت. ئەم کومیسیونە هەروەها بە "کومیسیونی هلیسینکی"ش بەناوبانگە کە گروپێکی چاودێریکاری مافی مرۆڤە و بە گوێرەی یاسا کار دەکات بۆ چاودێریکردن بە سەر جێبەجێبوونی یاسای کۆتایی هلیسینکی. ئەم کومیسیونە لە ۹ نوێنەر سەر بە ئەنجوومەنی نوێنەران و ۹ نوێنەر سەر بە ئەنجوومەنی پیرانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێکدێت و هەروەها ۳ ئەندامی لقی کارگێڕی هەیە کە لە لایەن سەرۆکی کومیسیونەوە لە وەزارەتی بەرگری، وەزارەتی بازرگانی و وەزارەتی دەرەوە دادەنرێن. لە بنەڕەتدا ئێمە لە سەر مەسەلەی مافی مرۆڤ چڕ دەبینەوە لە ڕێگای بەڕێوەبردنی پانیلی شایەتیدان و گوێگرتنی گشتی، دەرکردنی ڕاپۆرت، ناردنی لیژنەی کۆنگرێس بۆ وڵاتانی دیکە بۆ باس و تاوتوێکردنی بارودۆخی مافی مرۆڤ، بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکان و لیژنەکانی CSCEو هەروەها چاودێری کردنی هەڵبژاردن.

ئێمە زۆر خۆشحاڵین کە ئەمڕۆ لێرە باسی مەسەلەی کەمینەی کورد دەکەین کە چوارەمین نەتەوەی گەورەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە و نفوسیان نزیکەی ۲۰ تا ۲۵ میلیونە و زۆرتر لە وڵاتی ئێران، عێراق و تورکیا (و لە پێوەرێکی کەمتردا) لە سوریا دەژین. خاڵی هاوبەشی کەمینەی کورد لە هەمووی ئەم وڵاتانە ئەوەیە کە (ئەڵبەتە لە ئاستی جۆراوجۆردا) مافەکانیان پێشێل دەکرێت و لە ئازادی تاکەسی بێبەشن.

ئەم پانیلەی ئەمڕۆ، هەنگاوێکی دیکەیە لە چوارچێوەی هەوڵە بەردەوامەکانی کومیسیون بۆ تاوتوێکردنی مەسەلەکانی کەمینەکان لە ناو CSCEدا و هەروەها ئامادەکارییە بۆ بەڕێوەبردنی سمینارێك کە هەفتەی داهاتوو لە سەر مەسەلەکانی کەمینەکان لە" وەرشەڤ"ی پایتەختی پۆلەندا بەڕێوەدەچێت.

وەك لایەنێك دەمەوێت ئەوە زیاد بکەم کە لە کۆتایی شەڕی کەنداو، سەرۆکی کومیسیون، سناتۆر دینیس دیکۆنسینی و هاوسەرۆکەکەی، بەڕێز "ستینی هۆیەر"ی ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بیرۆکەی کۆنفرانسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان لە کومیسیونی ئاسایش و هاوکاری لە ئەورووپا لەژێر ناوی CSCMEخستەڕوو. ئامانجی سەرەکی ئەم پێشنیارە ئەوەبوو کە پرۆسە یا چوارچێوەیەکی سیاسی وەگەڕ بخات بۆ ئەوەی هێزە سەرەکییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێکەوە دابنیشن و هەندێ لە پرەنسیپ و رێوشوێنە تایبەتەکانی پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتەکان و هەروەها پەیوەندییەکانی دەوڵەتەکان و هاوولاتیانی خۆیان بخەنە بەرباس .

ئەو کاتە وادیار بوو کە ئەو ٣ پرەنسیپە کە لە چوارچێوەی ئەورووپا گرنگ و سوودبەخش بوو واتا یەکپارچەیی خاك، مافی چارەی خۆنووسین و رێزگرتن لە مافی مرۆڤ بەتەواوی بە چوارچێوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشەوە پەیوەندی هەیە. ئەمانە ئەو پرەنسیپانەن کە ئێمە هیواداریین ئەمڕۆ لەگەڵ میوانەکانمان تاوتوێی بکەین.

سەرەتا دەمەوێت دۆکتۆر "مارك ئیپستەین"تان پێبناسێنم. دوکتۆر ئیپستەین ئێستا کارناسی باڵای کاروباری نێونەتەوەییە لە واشنگتون دی، سی و راوێژکاری فەرمییە. هەروەها ئەندامی ستافی هەردوو بەشی کۆنگرێس(ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی پیران) بووە و وەك توێژینەر لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا خزمەتی کردووە. دوکتۆر

ئیپستەین لە تورکیا بووە و لە زانکۆکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئالمانیا و تورکیا لەسەر مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە تورکیا و ئیمپراتۆری عوسمانی سوخەنرانی کردووە. باس و گوفتوگۆکەی ئەمرۆمان بە قسەکانی مارك ئیپستەین دەستپیدەکەین. پاشان بەشداربووانی دیکەتان پێدەناسینم و پاش ئەوە قسە و باسی میوانەکانی دیکە وەردەگرین.

سپاستان دەکەم

فەرموو بەرێز مارك

بەرێز ئیپستەین: سپاس خاتوون هافنێر.

وتاری دۆکتۆر مارك ئیپستەین

خۆشحالم لەم (پانیلی) کومیسیون ئامادە دەبم بۆ ئەوەی تاوتوێی بابەتێکی رۆژەڤ و ئالۆز بکەم. هەوڵ دەدەم لە ماوەی چەند خولەکدا بە کورتی چوارچێوەی مێژوویی و سیاسی تەوەرەکانی ئەمرۆ واتا نەتەوایەتی کورد، مافە سیاسییەکانی کوردەکان و ئاوات و ئامانجەکانی کوردەکان بخەمە بەرباس.

هەروەك زۆربەی مەسەلەکانی ئەم بەشە لە جیهان، کارنامەی مێژوویی تەوەرەکانی ئەمرۆ دوورودرێژ و ئالۆزن. لەراستیدا ئێستا کە بە سالانی کۆتایی سەدەی ۲۰ نزیك دەبینەوە، جارێکی دیکە لەگەڵ کێشەی شەر و دیپلوماسی روبەروو دەبینەوە کە کێشەگەلێکی گرنگن لە سەرەتای سەدەی ۲۱.

مەسەلەی کوردەکان لە ئیمپراتۆری عوسمانی لە کونفرانسی ئاشتی(پاریس- وەرگێر)پاش کۆتایی شەری جیهانی یەکەم بەرەو چارەسەری دەچوو بەلام بۆ هەمیشە

بوو بە کێشە، کێشەیەك کە ئەمڕۆ ئێمە لێرە باسی دەکەین. ئەگەر بۆچوونەکانی من زۆرتر لەسەر تورکیا چڕ دەبێتەوە، دوو هۆکاری مێژوویی و سیاسی هەیە. ئێمە لێرە باسی گەلێ لە دەوڵەتە جێنشینەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی دەکەین (مەبەستی ئەو دەوڵەتانەیە کە لە ئەنجامی لە یەکهەڵوەشانەوەی ئیمپراتوری عوسمانی دامەزران- وەرگێڕ) بەڵام هەروەها کە خاتوون هافنێر ئاماژەی پیکرد تەنها تورکیا ئەندامی( CSCE ) و هەروەها ئەندامی ناتۆیە. کەوابوو زیدەباری ئەوەی کە تورکیا هاوپەیمانی ئێمەیە و بارودوخەکەی مایەی نیگەرانی قوڵی ئێمەیە، کاروباری تورکیا راستەوخۆ دەکەوێتە ناو چوارچێوەی چاودێری ئەم کومیسیونە. لە راستیدا دامەزراندنی CSCME وەها کە سناتۆر دیکۆنسینی و ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران ، بەڕێز هۆیەر پێشنیاریان کردووە بۆ من سەرنجراکێشە بەڵام ئامانجێکی دژوارە و لەوانەیە گوێگرتن لەم جۆرە پیشنیارە نیشاندەری بایەخی ئەم مەسەلەیە وەك گۆڕەپانێك بۆ باس و گوفتوگۆیەکی وەها بێت.

دەبی لێرە وەبیری هەمووتان بێنمەوە کە تەوەری ئەمڕۆی ئێمە لەرووی مێژووییەوە ئاڵۆزە. لە سەدەی ١٧ و١٨ و تەنانەت ١٩ لەراستیدا هەمووی ئەو سەرزەمینە کە کوردەکان یا بە شێوەی رەوەندایەتی یا بە شێوەی گوندنشینی تێیدا دەژیان، بەشێك بوو لە ئیمپراتۆری عوسمانی یا نزیك بوو لە سنوورەکانی بەردەوام لە دۆخی گۆڕانی عوسمانی لەو ناوچانە کە لە ماوەی دوو سەدە پیشتر لەوەدا جێگای ناکۆکی بوون. تا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی، عێراق پارێزگایەکی عوسمانی بوو، بەغداد و بەسرە ناوەندی ئیداری مەحەلی بوون و جیهان دەستی کرد بە شەڕکردن لەسەر نەوت لە ناوچە زۆرتر کوردنشینەکانی دەوروبەری کەرکووك و موسل و هەروەها ناوچە

سنوورییەکانی (عوسمانی) و روسیا. سووریاش پارێزگایەکی عوسمانی بوو کە ناوەندە ئیدارییەکەی دیمەشق بوو. ئورشەلیم و بەیروت ناوەندی ئیداری دووەمی ئەم سەرزەمینانە بوون، سەرەڕای تایبەتمەندی جیاوازی کۆمەڵگای دەروەزی و مەسیحی لە لوبنان و گرنگی تایبەتی ئورشەلیم بۆ پەیرەوانی سێ دینە گەورە یەکتاپەرەستەکە(مەبەستی ئیسلام، یەهوودییەت و مەسیحییەتە- وەرگێڕ).

کەوابوو سنووری ئەمڕۆی عێراق و تورکیا، تورکیا و سوریا، سوریا و عێراق، عێراق و کوێت و عەرەبستانی سعوودی و شوێنەکانی دیکە لە ناوچە، هەموویان ئاکامی شەڕی یەکەمی جیهانی و و پێش ئەوە بوون. تەنها پێویستە پێشینەی "لاورینسی عەرەبستان" وەبیری خۆمان بهێنینەوە کە باشترین و ناسراوترین نموونەی ئەو رووداوانەیە کە لە بیری هەمووماندا ماوەتەوە. ئەو کاتە کۆمەڵێک کێشە لەسەر ئینتیدابی "کۆمەڵەی گەلان" هەبوو و مەسەلەی سەربەخۆیی عەرەبەکان، کێشەی ئینتیدابی فەلەستین و کێشە قورسەکانی دیکەتان بیستووە کە لە سەرەتای ئەم سەدەیە تا ئێستا لەگەڵمانن.

هەروەها دەبێ ئێمە وەبیری خۆمانی بهێنینەوە کە پێش کۆتاییپێهاتنی شەڕی یەکەمی جیهانی، سوپای هەرەسهێناوی عوسمانی هێشتا لەگەڵ رورسیا شەڕی دەکرد، لانیکەم لەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی رووسیا کە ئەمڕۆش دیسان جێگای شەڕوشۆڕن و هێڵی بۆری نەوت جارێکی دیکە بووە جێگای مشتومڕ و باس و گوفتوگۆ . عەشیرەتە کوردەکان بە شێوەی ئاسایی لە سەراسەری ئەم ناوچانە جموجۆڵیان دەکرد واتا لە ناو لە ئەو ناوچانە کە پاشان بوو بە سنووری سیاسی دەوڵەتە نوێکان. لە دوایین راپۆرتی گرنگی خۆیان دەربارەی تورکیا لە حوزەیرانی ١٩٨٨،

ستافی ئەم کومیسیونە ئاماژەیان بە مەسەلەی نەتەوایەتی کورد و ئامانجەکانی کرد وەك یەکێ لەو چەند مەسەلە گرینگانە کە تورکیا لەگەڵیدا رووبەڕوویە. پێشبینییەکەی ئەوان بە دڵنیاییەوە راست و دروست بوو.

هەتا ئەم دواییانە دەوڵەتی تورکیا شێلگیرانە لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بە گوێرەی پەیماننامەکانی کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی کە لەئەنجامیدا کۆماری تورکیا دروست بوو، کوردەکان (هەروەك خەڵکی موسڵمانی دیکە) مافێکی تایبەتیان نییە و نابێت مافە تایبەتەکانی کەمینەکانیان هەبێت. دەوڵەتی تورکیا دەیگوت نەتەوەیەکی جیاواز بەناوی کورد بوونی نییە و ئەمانە تەنها تورکە رەوەندەکانن. بە کورتی کاتی وتوویژ دەربارەی ئەو شەرتومەرجانە کە لە ئەنجامیدا دەوڵەتیکی سەربەخۆ لەسەر بەشێك لە خاکی ئیمپراتوری هەرەسهێنراوی عوسمانی دامەزرا، پەیماننامەی لۆزان لە ١٩٢٣ کۆمەڵێك گارانتی تایبەتی بۆ ناموسڵمانەکان دانا. بەماوەی چەند سەدە هێزەکانی رۆژئاوا خۆیان بە پارێزەری کەمینە ناموسڵمانەکان لەناو ئیمپراتۆری عوسمانی دەزانی و لە سەدەی ١٩ لەو رێوشوێنە تایبەتە کەڵکیان وەرگرت کە بەگوێرەی ئەوە دەستێوەردانیان لە کاروباری عوسمانی دەکرد، و یارمەتیان دا بە مەسیحییەکانی ناوچەی باڵکان، لەوانە یوگسلاڤیا، بۆ ئەوەی سەربەخۆیی بەدەستبهێنن. هەروەها دەستیان کرد بە خستنەڕووی بانگەشە و هەڵوێستەکانیان بە نیسبەت هەڵوەشانەوەی بەرەبەرەی ئیمپراتۆری عوسمانی کە هەروەها کە سزاری رووسیا جارێکیان وتبووی، "پیاوی نەخۆشی ئەورووپا" بوو.

کەوابوو ئەورووپاییەکان هەستیان دەکرد بەتەواوی مافی خۆیانە کە داوای جێبەجێبوونی رێوشوێنەکانی "پەیماننامەی لۆزان" بکەن تا ئەو شوێنە کە پەیوەندی

بە مسۆگەربوونی ئۆتۆنۆمی بەردەوامی ئایینی و کولتووری کەمینە ناموسڵمانەکانی عوسمانییەوە هەیە، بەتایبەت یونانییەکان و کۆمەڵگا مەسیحییەکانی دیکە. بەهەرحاڵ تورکەکان دەیانگوت زۆربەی هەرەزۆری کوردەکان موسڵمانی سوونەن و بەشێکن لە زۆرینەی سوننەی تورکیا، کەوابوو کوردەکان نە دەکەونە ناو ئەم چوارچێوەیە و نە پێویستە مافێکی تایبەتیشیان پێبدرێت، چونکە ئەم مافە تایبەتانە پێشتر تەنها هی ناموسلمانەکان بووە. ئەم برەنسیپە و سەرهەڵدانی راپەڕینێکی کوردەکان بەخێرایی بووە هۆی پەیڕەوکردنی سیاسەتی سەرکوتی توندی شووناسی کولتووریی جیاوازی کورد بە قازانجی شوناسی گشتی و سکولاری تورکیا. بیرەوەری راپەڕینەکانی کوردەکان لە دەیەی ۱۹۲۰ و ۱۹۳۰ هێشتا زۆر زیندووە و سیاسەتی دروستکردنی دەوڵەتی مودێرن و سیکۆلاری تورکیا هێشتا لەجێگای خۆیدایە. هەتا ئەم دواییانە قسەکردن بە زمانی کوردی لە شوێنە گشتییەکان لە تورکیا قەدەخە بوو و هیچ چەشنە دامەزراوەیەکی کولتووری بوونی نەبوو. هەروەها ساڵەهای ساڵ ئاماژەکردن بە وشەی کورد و کوردستان لە چاپەمەنییەکانی تورکیا وەك هێرشی نائاسایی بۆ سەر کیانی کۆماری تورکیا لەقەڵەم دەدرا.

بزووتنەوەیەکی چەکداری بە ناوی pkk کە بنکەکانی لە دۆڵی بوقاع لە لوبنان بوو و بەگشتی خۆی بە بزووتنەوەیەکی کوردی –مارکسی دادەنا (کە بە دڵنیاییەوە ئەمڕۆ ئێمە لێرە باسی دەکەین) بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کرد. دەگوترێت تا کاتی لەیەکهەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت، پارتی کرێکارانی کوردستان (pkk) کە ئامانجە راگەیاندراوەکەی ئەوەبوو دەوڵەتیکی سەربەخۆی کورد لەسەر خاکی تورکیا

دابمەزرێنێت، یارمەتی ماددی لە گەلێ لە دەوڵەتانی بلۆکی رۆژهەڵات وەردەگرت.
ئەمڕۆ بە پێشنیاری pkk ئاگربەستێك لە ئارادایە و قسەو باسێك لە ئارادایە کە لەوانەیە تورکیا لەگەڵ pkk دانوستان بکات.

لە بیاڤی سیاسیدا بەبەراوەرد لەگەڵ بێدەنگی سەدەی رابردوو، ئێستا نوێنەرانی جیاییخوازی کورد لە پارلمانی تورکیادان و لە چاپەمەنییەکاندا قسەوباسی بەرفراوان دەربارەی کورد دەکرێت و مشتومڕی زۆر دەربارەی ماڤە کولتوورییەکانی کوردەکان دەکرێت. ئەمڕۆ بەشداربووان زۆرتر ئاماژە بەم مەسەلەیە دەکەن ، هەربۆیە من تەنها ئاماژە بەوە دەکەم کە ئەو پرسیارە کە ئەم کومیسیونە و ستافەکەی لە ساڵی ١٩٨٨وە دەیخاتەڕوو ئەوەیە کە " ئایا تورکیا دەتوانێ رێگایەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ئامانجە کولتوورییە رەواکانی کوردەکان جێبەجێ بکات و هاوکات یەکپارچەیی خۆی وەك وڵاتێك و وەك دیموکراسییەکی کارا رابگرێت. ئەمە ئەو پرسیارەیە کە لێرە تاوتوێ دەکرێت.

لە عێراق مەسەلەکە جیاوازە، چونکە عێراق ئەندامی CSCE نییە و سیستمێکی دیموکراتیکی پارلمانی نییە. لە کۆتایی شەڕی کەنداو تا ئێستا ناوچەی زۆرتر کوردنشینی باکووری عێراق لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکینە سەربازییەکانی هاوپەیمانان، لە رێگای بنکەکانیان کە لە تورکیان، دەپارێزرێت و ناهێڵن سوپای عێراق و هێزی هەوایی عێراق لەوێ چالاکی بکات. لەو ناوچانەی عێراق، دامەزراوەگەلی سیاسی چالاکی دەکەن بەڵام مەسەلە گەورەترەکان وەك سەربەخۆیی بەرەبەرە، جیابوونە لە عێراق و راگرتنی یەکپارچەیی خاکی عێراق

هیشتا به چارەسەرنەکراوی ماونەتەوە. به دڵنیاییەوە مەسەلەکانی دیکە ئەمڕۆ لێرە دەخرێتە بەر باس.

ئەو مەسەلە و گیروگرفتانە کە بە بۆچوونی من ئەمڕۆ لێرە دەبێ تاوتوێ بکرێن ئەوەیە کە :

- ئایا رێگاچارەیەك بۆ کوردستانی تورکیا هەیە بۆ وەدیهاتنی ئامانجەکانی کوردەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتی دیموکراتی تورکیا کە هەموو لایەنەکان قبوڵی بکەن؟
- ئەگەر رێگاچارەیەکی وەها بەدی دەکرێت، ئامرازە گونجاو و قبوڵکراوەکانی وەدیهاتنی کولتوور و ناسنامەی کورد چین لە کاتێکدا کە کوردەکان نەریتی ئەدەبیاتی نووسراویان نییە؟
- بۆ کوردەکانی تورکیا، ئێران و عێراق و کوردەکانی شوێنەکانی دیکە کە لە چوارچێوەی هێڵگەلی عەشیرەتی و بنەماڵەییدا دابەش کراون و بە چەند زاراوەی جیاواز قسە دەکەن و لە ناو خەڵکانیك دەژین کە بە زمانگەلی جیاواز قسە دەکەن و سەربە دەوڵەت- نەتەوەگەلی جیاوازن. ئایا بەڕاستی خاڵی هاوبەشی ئەم کوردانە چییە و چۆن دەتوانن لە راستیدا پێکەوە بژین؟
- وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، CSCE و ناتۆ بە شوێن چیدان و دەتوانن چ کارێك بکەن کە شانسی سەرکەوتنێکی راستەقینەی تێدابێت کە یەکپارچەیی خاکی ئەم وڵاتانە نەباتە ژێر پرسیار و لە هەمان کاتدا زەرەو زیان بە بەرژەوەندیە گشتییەکانی ئێمە لە ناوچە نەگەیەنێت.

زۆر سپاستان دەکەم.

خاتوون هافنێر: سپاس دۆکتۆر مارك

کومیسیون زۆر بەخێرهاتنی بەڕێز ئەحمەد تورك دەکات کە سەرۆکی "حیزبی کاری گەل" و نوێنەری شاری ماردینە لە ئەنجوومەنی نیشتمانی بالآی تورکیا(مەبەستی پارلمانی تورکیایە- وەرگێڕ). ئەحمەد تورك پێشتر سەرۆکی کومیسیونی مافی مرۆڤی پارلمانی تورکیا بووە. من شانازی ئەوەم پێبەخشرا سالۆنیوێك لەمەوپێش لە ئۆفیسەکەی لە ئانکارا لەگەڵ بەڕێز ئەحمەد تورك دیدار بکەم. ئێمە زۆر خۆشحالّین کە ئەمرۆ لێرە پێشوازی لێدەکەین.

دوابەدوای کودیتای سەربازی ١٩٨٠ لە تورکیا ، بەڕێز(ئەحمەد) تورك بە ماوەی یەك ساڵ کەوتە ناو بەندیخانە بە هۆی ئەوەی پشتیوانی لە مافە سیاسییەکانی کوردەکان لە تورکیا کردبوو. لەو کاتە بەدواوە چالاکییە سیاسییەکانی بەڕێز (ئەحمەد) تورك سنووردار کرا و ئیزنی پێنەدرا لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٣ی پارلمان بەشداری بکات. لە ساڵی ١٩٨٦ ئەحمەد تورك جارێکی دیکە خرایە ناو بەندیخانە بەهۆی داکۆکیکردن لە مافی کوردەکان و کاتێك کە لە ساڵی ١٩٨٧ وەك نوێنەری پارلمان هەڵبژێردرا ، لە بەندیخانە ئازاد کرا. ساڵی ١٩٨٩ ئەحمەد تورك بەهۆی ئەوەی بەشداری لە کونفرانسێکدا کردبوو کە لەسەر مەسەلەی کورد بەڕیوەچووبوو، لە "حیزبی دیموکراتی کۆمەڵایەتی" دەرکرا.

زۆر بەخێرهاتنی بەڕێز (ئەحمەد) تورك دەکەین و خۆشحالّین بە هاتنی بۆ ئێرە

بەڕێز (ئەحمەد) تورك: سپاستان دەکەم.

خاتوون هافنێر: ئایا وەرگێڕ ئامادەیە؟

بهڕێز کانی غولام (وهرگێڕ): بهڕێز (ئهحمهد) تورك پێشهکییهکی ئاماده کردووه که من کردوومه به ئینگلیزی و دهمهوێت بۆتانی بخوێنمهوه.

## وتاری بهڕێز ئهحمهد تورك

خوشك و برایانی بهڕێز

سپاستان دهکهم بۆ ئهم دهرفهته که بۆ ئێمهتان رهخساند تا باسی بارودۆخی دژواری کوردهکان بکهین. گهلی بێ کهس و چهوساوهی من پێویستی به ئاوردانهوهی ئێوه ههیه. نیگهرانی کۆمهڵگای نێونهتهوهیی به نیسبهت ئهم مهسهلهیه جێگای پێزانینه.

به نوێنهرایهتی ٣٠ میلیون کورد سپاستان دهکهم .

مێژوو شاهیدی ئهو راستییهیه که ئێمهی کورد ٤ ههزار ساڵه لهو ههرێمه دهژین که ئهمڕۆ ناوی کوردستانه. ههندێ جار به ئازادی، ههندێ جار به ژێردهستی لهگهڵ دراوسێکانمان و لهناو دهوڵهته یهك له دوای یهکهکاندا ژیاوین. ئهمڕۆ ئێمه ههر له نیشتمانی خۆمان دهژین بهڵام ژێردهستی نهتهوهکانی دیکهین. تورکهکان ، عهرهبهکان و فارسهکان، کوردستانیان له ناوخۆیاندا وهك کۆلۆنییهکی بێ ماف دابهش کردووه. ئێمه چهوساوینهتهوه و ئهم چهوسانهوهیهش تهنها له رووی مادییهوه نییه، بهڵکوو له رووی رۆحی و دهروونیشهوه ئهوهنده چهوساوینهتهوه که ههبوونمان وهك نهتهوهیهکی جیاواز له مهترسیدایه.

له تورکیا ئێمهی کورد ژیانێکی زۆر دژوارمان ههیه. بهڵێنی مافی یهکسان لهگهڵ تورکهکان به ئێمه درابوو بهڵام لهگهڵ سیاسهتی تاواندنهوهی تهواو روبهڕوو بوینهوه،

حاشا له زمانەکەمان دەکرێت، ناتوانین له زمانی زگماکی خۆمان که خودا پێیداوین، کەڵك وەربگرین. ئەو کەسانه له ئێمه که راستییەکان قبووڵ دەکەن و دان بەو راستیەدا دەنێن که ئێمه کوردین، لەناو ئەم بەناو دیموکراسییەی تورکیا لەگەڵ سەرکوتێکی دووقات رووبەڕوو دەبنەوە. لەباتی بەرەوپێشچوون، لەگەڵ بەرەوپاشچوون رووبەڕوین، لەباتی ئەوەی ئازاد بین، وەك جیاییخواز دەخرێینه ناو بەندیخانه. ژیان بۆ ئێمه بووه به خەباتێکی سیاسی و هەر ئەمەیه که ئێمه به گەلەکەمانەوە دەبەستێتەوە، چوونکه گەلی ئێمه سەرکوت دەکرێت و ئێمه دەمانەوێت کۆتایی بەم سەرکووتە بێت.

وەڵامی تاکەکەسی و بەکۆمەڵی کوردەکان( بەم سەرکووتە) هەروەها که چاوەڕوان دەکرێت، هەم توندوتیژانه و هەم ناتوندوتیژانه بووه. له شوێنه جۆراوجۆرەکانی کوردستانی تورکیا، ساڵەهای ساڵ کوردەکان، چ ژن و چ پیاو، چ گەورە، چ بچووك دەستیان بۆ چەك بردووە بۆ ئەوەی تورکەکان وەخەبەر بێنن که ئێمه کوردین و نامانەوێت بتوێینەوە و ببین به تورك. له دیاربەکر، دیرسیم و کۆچگیری و بەشه جۆراوجۆرەکانی دیکەی کوردستان، کوردەکان بەشداریان له راپەرینەکاندا کردووە و بێ جیاوازی توندوتیژانه سەرکووت کراون. کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەگەڵ رێبەرەکانیان تێکشکێنراون و دوور خراونەتەوە.

ئەمڕۆش بارودۆخەکه هیچ فەرقێکی نەکردووە و کوردەکان وەك هاووڵاتیانی تورکیا له سەدەی ٢٠دا بۆ ئازادی و مافه بنەڕەتییەکانیان خەبات دەکەن.

ئەمڕۆ کوردستانی تورکیا له دڵەڕاوکێ و قەیراندایه. هەندێ له ئێمه خەباتی سیاسی و ناتوندوتیژانەمان بەڕێوە بردووە بۆ رزگارکردنی گەلەکەمان که هێشتا نەچووەته

ریزی بنەماڵەی نەتەوەکانی جیهان لە سەر بنەمای مافی یەکسان. هەندێکی دیکە لە ئێمە بۆ رزگارکردنی گەلەکەی دەستی بردووە بۆ خەباتی چەکداری، چونکە بێ هیوا بووە لەو هەنگاوە هێواشانە کە بۆ چاکسازی هەڵدەگیردرێت. شێوەگەلی خەباتی ئێمە جیاوازە بەڵام ئامانجمان یەکێکە.

هیوادارم بتوانم ئێوە لەگەڵ خەباتەکەمان ئاشنا بکەم و ئێوەش لایەنی هێزە دیموکراتەکان بگرن و یارمەتیمان بدەن بۆ ئەوەی ئەرکی ئاتوندوتیژانەی خۆمان خێراتر بەرەوپێش بەرین. ئێمە تەنها داوای ئەوە دەکەین دیموکراسی دەرفەتی ئەوەمان پێبدات خزمەت بە سەقامگیربوونی ناوچە بکەین و برایەتی و تەبابی لەنێو گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێکبێت.

من وەك رێبەری "حیزبی کاری گەل" لێرە ئامادەم کە ١٨ ئەندامی لە پارلمانی تورکیا هەیە کە ژیانی خۆیان بۆ داکۆکیکردن لە مافەکانی کوردەکان بە شێوەگەلی ئاشتیخوازانە تەرخان کردووە بەڵام دەرگا لە ئێمە داخراوە، ئەندامانی ئێمە دەتۆقێنرێن و حیزبەکەمان لە لایەن دادگای یاسای بنەڕەتی تورکیاوە کێشە و تەنگوچەڵەمەی بۆ دروست دەکرێت. ئەرکی ئێمە وەك کورد و وەك نوێنەری گەلەکەمان بە گوێرەی ویژدانمان، ئێمەی لەگەڵ یاسای دەوڵەت روبەڕوو کردووە.

رێگەم پێبدەن نمونەیەکی ئەم مەسەلەتانە بۆ باس بکەم . من و چەند کەس لە هاوکارە کوردەکانم پاش ئەوە کە سەر بە لیستی "پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی" وەك ئەندامی پارلمانی تورکیا هەڵبژێردراین، لە کونفرانسێکدا لە پاریس بەشداریمان کرد کە یەکێ لە تەوەرەکانی مەسەلەی پێشێلکردنی مافی کوردەکان لە تورکیا بوو. کاتێ کە ئێمە لە پایتەختی فەڕانسا گەڕاینەوە بۆ تورکیا ، بینیمان کە بەهۆی

بەشداریکردن لەو کونفرانسە لە حیزبەکەمان دەرکراوین. من بۆیە باسی ئەم نموونەیەم کرد کە لەرزۆکبوونی دیموکراسی لە تورکیاتان پێنیشان بدەم. ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە لەگەڵ ئاماجەکانی گەلەکەمان وەك کورد راستگۆ بین و بە چەکی گرانی یاسای تورکیا کە ئەم چالاکییانەمان لێ قەدەخە دەکات، دەست لە کار نەکێشین.

لە ساڵی ١٩٨٠وە ئێمە لەگەڵ یاساکانی دەوڵەتی تورکیا زیاتر لە جاران کێشەمان بووە(چونکە ئەم یاسانە پاش کودیتای سەربازی پەسەند کراون- وەرگێڕ). کوردەکان داوای مافی سیاسی زیاتر دەکەن و دەوڵەتی ئانکاراش لە وەڵامدا زیاتر ئێمە سەرکووت دەکات. سەرەتا دەسەڵاتی سەربازی جێگای ئیدارەی مەدەنی لە باشوری رۆژهەڵاتی تورکیا گرتەوە، پاشان سیستمی گوندپارێزی(جاشایەتی- وەرگێڕ) دامەزرا بۆ ئەوەی شەڕی کورد بە کورد بکرێت. گروپێکی فەندامینتالیستی ئیسلامی بە ناوی "حیزبی کونترا" کە لە لایەنMIT وە(دەزگای ئیستیخباراتی تورکیا- وەرگێڕ) پەروەردە کراوە و پێداویستییەکانی دابین دەکرێت، ئازادانە تەقە لە هێزە سکولار و دیموکراتەکانی ناو بزووتنەوەی کورد دەکات.

بۆ ئەوەی رۆشنایی بخەمە سەر ئەو نەهامەتیە کە کوردەکان ساڵی رابردوو بینیان، دەبێ ئاماژە بە مەسەلەی "عەلی وەیسەل[1]" و ئاماژەکردنەکانی بە هۆلۆکاستی جولەکەکان بکەم. بە هۆی داڵدەدانی شەڕوانانی ئازادی کورد ٣٠٠ گوند سوتێندراون و خاپوور کراون، ٦٠٠ گوند بە زۆر چۆل کراون، ٦٤٠ چالاکی سیاسی کورد (لەوانە ٤٦ ئەندامی حیزبەکەی خۆم) لە بارودۆخێکی گوماناویدا کوژراون کە هەندێ جار

[1] ALI WAISEL

تەنها یەك گولە لە پشتەوە لە سەریان دراوە، کە ئەمەش نیشانەی دلڕەقی و یەکشێوەبوونی ئەم تاوانە بەربەرییانەیە.
٦شاری داگیرکراوی کوردستان بە ناوەکانی شەڕناخ ، جزیرە، لیجە، کولپ، حازر و و نوسەیبین بە تانکی BRD(کە ئاڵمانیا دابیوو بە تورکیا) بومباران کران بێ ئەوەی پێشتر دانیشتووەکانی ئاگادار بکەنەوە.
پارتی کریکارانی کوردستان(pkk) و گریلاکانی لە وەڵامی ئەم کردەوە دلڕەقانەدا و بۆ دەرکردنی ( هیزە چەکدارە) تورکەکان لە خاکی کوردستان لە ماوەی ٩ ساڵی رابردوودا لەگەڵ سوپای تورکیا شەڕیان کردووە و بەهەرحاڵ بەپێچەوانەی بانگەشەکانی تورکیا ، هەردوولا هێرشی کوشندەیان دژی یەك ئەنجام داوە. راپۆرتە سەرەتاییەکانی ئێمە نیشان دەدات تا ئێستا ٣ هەزار گریلا و ژمارەیەکی زۆر سەربازی تورکیا کوژراون.
نزیکەی ٤هەزار خەڵکی سیڤیل بە دەستی یەکینە تایبەتەکانی تورکیا و گروپە مرۆڤ کوژەکانی کوژراون. ئەم کەسانە نیردرابوون بۆ ناوچە تا نەهیلن کوردەکان یارمەتی شەڕوانانی ئازادی کورد بدەن. نزیکەی نیو میلیون کەس ناچار کران رێدی خۆیان بەجێبهێلن و لە شوێنەکانی دیکەی کوردستان نیشتەجێ بن. هۆکاری هەمووی ئەم پێشامەدانە، ناتوانایی ئێمەیە بۆ ئەوەی پێکەوە دابنیشین و وتوویژ بکەین بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای پاکی و راستگۆیی و رێزگرتن لە مافەکانی کوردەکان، کۆتایی بە کێشەی لەمێژینەی کورد بێت.
بۆ کۆتاییپێهاتن بەم توندوتیژییە، رێبەرایەتی pkk لە ٢٠ی ئاداری ١٩٩٣ ئاگربەستێکی یەکلایەنەی راگەیاندووە. بە یارمەتی ئەم هەنگاوە، جەژنی نەورۆزی

ئەمساڵی کوردەکان لە کەشوهەوایەکی ئارامتر و بە خوێنڕێژی کەمترەوە بەڕێوەچوو. بۆ سەرلەنوێ دڵنیاکردنەوەی دەوڵەتی ئانکارا و بۆ ئەوەی جیهان بزانێت کە کوردەکان لایەنگری ئاشتین و و خوازیاری توندونیژی نین، ئەم ئاگربەستە جارێکی دیکە لە ١٥ی نیسانی ١٩٩٣ بۆ ماوەیەکی نادیار درێژ کرایەوە بۆ ئەوەی هەنگاوگەلی سیاسی و ناتوندوتیژانە بە راستەقینەترین شێوەی خۆی بەرەوپێش بچێت.

بە باوەڕی من ئەم ئاگربەستە دەرفەتێکی رەخساندووە بۆ لێکتێگەیشتن و سەقامگیربوونی ئاشتی لە کوردستانی تورکیا و پێش لە فرمێسکرژتنی دایکان و خوێنرژتنی رۆڵەکانیان دەگرێت و رێگا بەوە دەدات دیموکراسی قووڵتر لە تورکیا ریشە دابوکتێت و یارمەتی دەدات بە سەقامگیری سیاسی ناوچە. ئەم ئاگربەستە رێز لە یەکپارچەیی خاکی کۆماری تورکیا دەگرێت و ئەگەر بەردەوام بێت، رێگا خۆش دەکات بۆ برایەتی کوردەکان و تورکەکان لە سەر بنەمای مافی یەکسان کە هەندێکیان بریتین لە:

١- شوناسی کورد دەبێ بەفەرمی بناسرێت.

٢- کەڵکوەرگرتن لە زمانی کوردی بە شێوەی زارەکی و نووسراوە دەبێ ببێ بە یاسایی.

٣- دەبێ سەرجەم مافە کولتوورییەکانی کوردەکان بە فەرمی بناسرێت.

٤- بەڕێوەبەرایەتی(سەربازی) ناوچە کوردنشینەکان دەبێ هەڵبوەشێتەوە

٥- (سیستمی) گوندپارێزی دەبێ هەڵبوەشێتەوە و چەك بکرێت.

٦- حیزبە سیاسییە کوردەکان دەبێ سەرجەم مافە یاساییەکانیان پێبدرێت.

٧- لێبوردنێکی گشتی بۆ سەرجەم بەندکراوە سیاسییەکان دەربکرێت.

٨- کەشوهەوایەکی کراوە دەبێ پێکبێت بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکانی دیکە به شێوەی ئاشتیخوازانە.

خۆشك و برایانی بەڕێز

ئەم کێشەیە، کێشەی نێوان خەڵکی تورکیا واتا کورد و تورك نییە، بەڵکوو کێشەی نێوان کورد و دەوڵەتی تورکیایە کە لە رووی سیاسییەوە فەشەلی هێناوە و تەسکبینە. ئەم کێشەیە ئەنجامی قەیرانی دیموکراسی تورکیایە، چوونکە نزیکەی ٢٠ میلیون کورد سووکایەتیان پێدەکرێت و حاشا له سەرەتاییترین مافەکانیان دەکرێت.

لە جیهانێکدا کە لە راستیدا بووە بە گوندێکی جیهانی، نابێ ئاشتی و دیموکراسی ئیدی مایەی نیگەرانی بن. ئاشتی و دیموکراسی هەمووماںی بەرەولای خۆی راکێشاوە و ئەگەر راستگۆ بین، ئەمڕۆ رۆژی تێگەیشتن و ئاشتییە لە جیهاندا.

سپاستان دەکەم

خاتون هافنێر: زۆر سپاستان دەکەم بۆ ئەم لێدوانە جوان و رێکوپێکە.

ئێمە هەروەها زۆر خۆشحاڵین کە بەڕێز بەرهەم (ئەحمەد) صالح لێرە ئامادەیە کە نوێنەری کوردەکانی عێراقە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پەیوەندیکاری سەرەکی نێوان بزووتنەوەی کوردەکانی عێراق و دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هەروەها میدیا و کۆمەڵگای ئاکادیمیکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. بەڕێز بەرهەم صالح راوێژکاری باڵای رێبەرایەتی کورد، لە بۆاری سیاسەتی دەرەوە و وەك وتەبێژی بزووتنەوەی کورد لە لەندەن کاری کردووە.

زۆر سپاستان دەکەین بەڕێز بەرهەم صالح کە ئەمڕۆ لێرە لەگەڵمانن .

## وتاری بەڕێز دۆکتۆر(بەرهەم) ئەحمەد صالح

بەیانیتان باش خۆشك و برایانی بەڕێز

پێش هەموو شتێك دەمەوێت سپاستان بکەم بۆ ئەم دەرفەتە کە بۆ ئێمەتان رەخساند تا لەگەڵتان گفتوگۆ بکەم و دەربارەی بارودۆخی دژواری گەلی کورد بە گشتی و کوردستانی عێراق بە تایبەتی قسە بکەم.

دۆکتۆر ئیپستەین باسێکی مێژوویی و چوارچێوەیەکی باس کرد کە دەکرێت باردودۆخی ئێستای کوردەکانی تێدا ببینین. ئەو کێشانە کە ئەمڕۆ وڵاتی کورد هەیەتی و ئەو بارودۆخە دژوارە کە ئەمڕۆ کوردەکان تێیکەوتوون، ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پەیماننامەکانی ئاشتی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی. لەروانگەی منەوە وەك کوردێك، ئەمە ئاشتی بوو کە کۆتایی بە هەموو ئاشتییەکان هێنا.

بارودۆخی گەلی کورد لەو کاتەوە لە لایەن رێکخراوی مافی مرۆڤ، رێکخراوی هلیسینکی وەك کارنامەیەك وەسف کراوە کە پڕە لە پێشێلکاری مافی مرۆڤ، دەستگیر کردن، ئەشکەنجە کردن، کوشتنوبڕین، شەڕی کیمیایی، دەرکردن، دوورخستنەوەی بەکۆمەڵ، ژیان لە بارودۆخی زۆر چەپەڵ لەناو کەمپەکان، بێبەشبوون لە مافە ئەتنیکییەکان وەك مافی بەکارهێنانی زمان و ئەدەبیات و مۆسیقا و کاولکردنی گوندەکان و شارۆچکەکان.

لە ئاکامی ئەم بارودۆخەدا ، بەرخۆدانی و ناکۆکی بووە بە یەکێ لە تایبەتمەندییە زاڵەکانی مێژووی هاوچەرخی کورد. بەرکەنار لە رەهەندە ئەخلاقی و مافی مرۆڤییەکانی، مەسەلەی کورد بووە بە فاکتۆرێکی ناسەقامگیرکەری سەرەکی کە

ئاکام و ئەنجامی جیدی بۆ نەزمی سەراسەری ناوچە بەدواوە بووە. ئەم راستییە هەمیشە پشتگوێ خراوە یا بە تەواوی دانی پێدانەنراوە، چونکە شیکاران و سیاسەتمەداران، مەسەلەی کورد بە مەسەلەیەکی زۆر لاوەکی لە ناو ناوچە شاخاوییەکانی کوردستاندا دەزانن کەوابوو لە روانگەی ئەوانەوە ئەوەندە ئەم مەسەلەیە لە پەراوێزدایە کە ناتوانێ هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ئاشتی و سەقامگیری بەرفراوانتری ناوچە هەبێت.

بەڵام دەمەوێت ئاماژە بە نموونەیەکی تایبەت بکەم کە بۆ هەموومان بسوودمەندە، چونکە نادروستبوونی ئەم هەڵسەنگاندنە روون دەکاتەوە. ئاماژە بە قۆناخێکی ئەم دواییانەی مێژووی کوردستانی عێراق دەکەم. ساڵی ١٩٧٤ دەوڵەتی عێراق نەیویست داواکارییەکانی کوردەکان بۆ ئۆتۆنۆمی قبووڵ بکات و ساڵی ١٩٧٥ نەیتوانی راپەرینی کورد لە رێگای سەربازییەوە تێکبشکێنیت، هەربۆیە ئیمتیازیکی سەرزەمینی گەورەی دا بە شای ئێران تا شا کۆتایی بە (یارمەتیدانی) بزووتنەوەی کورد بهێنێت. ئەم ریککەوتننامەیە کە بە "ریککەوتننامەی جەزایر" بەناوبانگە ساڵی ١٩٧٩ لەلایەن سەدام حوسەینەوە هەڵوەشایەوە و بووەهۆی دەستپێکردنی شەڕی ٨ساڵەی کاولکارانەی عێراق و ئێران کە لەراستیدا پێشەکەییەك بوو بۆ داگیرکرانی کوێت و سەرهەڵدانی کێشەکانی ئەم دواییەی کەنداو.

خۆشك و برایانی بەڕێز، لە روانگەی منەوە ئەم کێشە دواییانەی کەنداو تا رادەیەکی زۆر لە ئەنجامی مەسەلەی نەتەوەیی کوردەوە سەریان هەڵداوە. کوردەکان سەرچاوەی ناڕاستەوخۆی کێشەکانی ناوچە بوونە و ئێستاش هەروان و یەکێ لە سەرچاوەکانی کێشەیەکی جیدین لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست کە وەزیرانی دەرەوەی زلهێزەکان و بە

هەمان شێوە شیکارە سەربەخۆکان بە شێوەی گونجاو مامەڵەیان لە گەڵدا نەکردووە. چەند دەیەیە ، دیپلوماتەکان بێوچان لەسەر مەسەلەی عەرەب- ئیسراییل چڕبوونەتەوە و گەلێ لە مەسەلە ناوچەییەکانی دیکە لەلایەن سیاسەتمەداران و شیکارانەوە سەرنجی پێدراوە، بەڵام مەسەلەی کورد پشتگوێ خراوە و هیچ سەرنجێکی پێنەدراوە. زلهێزەکان تەنها کاتێك لەگەڵ کوردەکان پەیوەندییان گرتووە کە ویستوویانە لەرێگای کەڵکوەرگرتن لە کوردەکان وەك داردەست بەشێوەی نهێنی، هەندێ قازانج و بەرژەوەندی بەدەست بهێنن، وەگەرنا کاردانەوەی هاوبەشی هەموویان ئەوە بووە کە کوردەکان لە خۆیان دوور بخەنەوە.

لەئەنجامدا، خۆشك و برایانی بەرێز بەبۆچوونی من مەسەلەی کورد ئەمڕۆ گەیشتووەتە قۆناخێکی ئەوەندە گرنگ کە ئەگەر پشتگوێ بخرێت، مەترسی ئاڵۆزییەکی گەورەی لە ناوچەی ئێمە لێدەکەوێتەوە. هیچ نەزمێکی سەقامگیر لە ناوچە دەستەبەر نابێت ئەگەر حیساب بۆ نیگەرانییەکان و ئامانجە نەتەوەییەکانی کوردەکان نەکرێت. لەم چوارچێوەیەدا من بارودۆخی کوردستانی عێراقتان بە وردی بۆ شی دەکەمەوە.

سەرهەڵدانی دەوڵەتی بەعس و بەدەسەڵات گەیشتنی سەدام حوسەین بوو بە خاڵی سەرەتای ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی گەلی کورد لە عێراق و دەوڵەتی بەغداد. دەوڵەتی بەعس هەوڵی دەدا شووناسی کورد بە هەموو شێوەیەك تێکبشکێنێت و بیتاوێنێتەوە و بەخێرای زۆرترەوە دەستی کرد بە جێبەجێکردنی بەرنامەی گۆڕینی دیموگرافیای کوردستان و عەشیرەتە عەرەبەکانی هێنا و لە وڵاتی کورد لە گوندە کوردنشینەکان نیشتەجێی کردن و کوردەکانی لەو ناوچانە دەرکرد. ئەم کۆلۆنییە

عەرەبانە كەم تا زۆر بوون بە تایبەتمەندی هەمیشەیی سیاسەتی كورد و لە شێوەی هەڵسوكەوتی دەوڵەتی بەغداد لەگەڵ كوردەكان لە ١٩٧٤و١٩٧٥ تا ئێستا رەنگی داوەتەوە. لە سەرەتای دەیەی ١٩٨٠ كاتێ كە سەدام بینی شەڕەكەی دژی ئێران باش ناچێتە پێش ، هەوڵیدا لەگەڵ كوردەكان ئاشت بێتەوە، بەڵام جارێكی دیكە باڵادەستی خۆی نیشان دا و دەستی كرد بە كاولكاری و كوشتن و بڕین كە هیچكام لە دەوڵەتانی پێشووتری عێراق تا ئەو كاتە لەو ئاستەدا نەیانكردبوو.

دەوڵەتی عێراق لە ١٩٨٧ و ١٩٨٨ بە چەكی كیمیایی هێرشی كردە سەر گوند و شارۆچكە كوردنشینەكان كە لە ئەنجامیدا لانیكەم ١٠ هەزار كەس كوژران. لە شاڵاوێكی بێ ناونیشاندا (بە ناوی ئەنفال- وەرگێڕ) زیاتر لە ١١٨ هەزار كەس كوژران یا بێ سەروشوێن كران. سوپای عێراق ٤ هەزار گوندی كاول كرد، زیاتر لە نیو میلیون كورد لە زێدی خۆیان دەركران و لەناو ئەم بەناو "شارۆچكە نوێیانە" نیشتەجێ كران كە لەراستیدا كۆمەڵێك شارۆچكەی ئیستراتژیك بوون كە لەرێگایانەوە رێژیم دەیتوانی خەڵكەكەمان بخاتە ژێر چاودێری.

كەوابوو لە ئەنجامی ئەم هەموو رووداوانەدا، زۆر جێگای سەرسووڕمان نییە كە كوردەكانی عێراق راپەڕینیان كرد ئەو كاتە كە سەدام حوسەین لە ئاداری ١٩٩١ لە كوێت هەرەسی هێنا. نزیكەی دوو میلیون كورد تۆقان و بەرەو ناوچە شاخاوییەكانی توركیا و عێراق هەڵهاتن ئەو كاتە كە دیكتاتۆری عێراق پاشماوەی هێزەكانی خۆی دژی كوردەكان بەكار هێنا.

ئێستا كوردەكان ئیدارەی هەرێمی خۆیان دامەزراندووە. سەرەڕای دەستێوەردانی هاوپەیمانان لە بەهاری ١٩٩١ و لە ئەنجامدا سەقامگیربوونی بارودۆخەكە، رێژیی

بەعس بە شێوەیەکی زۆر جیدی درێژە دەدا بە تۆقاندنی کوردەکان. نزیکەی ٣٠٠ هەزار کورد و تورکمان لە زێدی خۆیان لە کەرکوک دەرکراون و پێش لە گەڕانەوەیان دەگرن. دەوڵەتی عێراق یارمەتی تروریستەکان دەدات هێرش بکەنە سەر گوندە کوردنشینەکان و تەقینەوەی تروریستی لە شارو شارۆچکە کوردنشینەکانی دیکە ئەنجام داوە. بۆ پێشگرتن لە گەیشتنی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی نێونەتەوەیی بە کوردەکان ، دەوڵەتی عێراق گەمارۆیەکی نایاسایی توندوتۆلی خستووەتە سەر ئیدارەی هەرێمی کوردستان و سوپایەکی ٢٠٠ هەزار کەسی لە پاڵ سنوورەکانی مۆڵداوە.

سەرەڕای ئەو نەهامەتییانە کە سەدام حوسەین بەسەر کوردەکاندا هێناویە، هەستێکی یەکێتی نەتەوەیی لە نێو کوردەکانی عێراق دروست بووە کە لە مێژوودا بێ وێنەیە. ئەوە دوو ساڵە گەلی ئێمە بۆ یەکەمجار لە تەوقی دەوڵەتی بەغداد رزگاری بووە و توانیویە بگات بە مافی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی خۆی و ئەمەش بەڵێنێك بوو کەهاوپەیمانان دوابەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی دایانبوو بە کوردەکان.

لە مانگی گوڵانی ساڵی رابردوو، یەکەم هەڵبژاردنی ئازاد لە مێژووی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق بەڕێوەچوو کە لە لایەن چاودێرە نێونەتەوەییەکانەوە وەك هەڵبژاردنێکی ئازاد و دادپەروەرانە وەسف کراوە. پارلمان و نیمچە حکوومەتێك وەك رێبەرایەتییەکی سکولاری کورد پێکهاتووە. ئەم رەوتە دیموکراتیکە لە کوردستانی عێراق دەتوانێ ببێ بە پێشەکییەك بۆ چارەسەرییەکی بەرفراوانتر بۆ قەیرانی سیاسی لە عێراق و لە راستیدا دەتوانێ ببێ بە هەوێنی دیموکراسیزاسیۆنێکی سەراسەری لە وڵاتی عێراق.

خۆشك و برایانی بەڕێز

بە بۆچونی من بزووتنەوەی کورد لە عێراق هەم لە بواری سکولاربوون و هەم لە بواری دیموکراتبوونەوە، بەو پێگە ئیستراتژیکە کە هەیەتی دەتوانێ یارمەتی بدات بە سەقامگیربوونی ناوچەی ئێمە و تایبەتمەندییە دیموکراتیکەکەی نموونەیەکە بۆ خەڵکی دیکەی عێراق. ڕێبەرایەتی کورد بە پەیڕەوکردنی تێڕوانینی پاراستنی نەزمی ناوچە و لەسەر بنەمای بایەخە دیموکراتیکەکان و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ ، هەوڵی داوە دەورێکی سوودمەند لە سیاسەتەکانی ناوچە بگێڕێت و ڕوونی بکاتەوە و بیسەلمێنێت کە نابێ ئامانجەکانی کوردەکان وەك هەڕەشەیەك بۆ دراوسێکانمان سەیر بکرێت. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە پەیوەندیگەلی باشی لەگەڵ تورکیا دامەزراندووە و سنوورەکانی لەگەڵ تورکیا پاراستووە و چالاکانە یارمەتی داوە بە ڕاگەیاندنی ئاگربەست لە لایەن pkk وە بەو هیوایە کە لێکتێگەیشتنێکی باشتر لەنێوان دەوڵەتی ئانکارا و کوردەکانی تورکیا هان بدات. پەیوەندییەکانی نێوان ڕێبەرایەتی کورد لە عێراق و دەوڵەتی تورکیا بەقازانج بووە و پێشکەوتنی گرنگ و بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، سەرەڕای بوونی کۆمەڵێك گیروگرفت و هەستیارێتی دەرکپێکراو. تورکیا دەورێکی گرنگی بینیوە (و بەردەوامیش دەیبینێت)لە هەوڵە نێونەتەوەییەکان بۆ یارمەتیدانی گەلی کورد لە عێراق.

ئەو ئەرکە کە لەسەرشانی ڕێبەرایەتی کوردە لە عێراق (کە هیوادارم تورکیاش هەروا بێت) ئەوەیە کە ئەم پەیوەندی و دیالۆگە زیاتر پەرەپێبدات بە شێوەیەك کە بوار بۆ دیموکراسی و سەقامگیری ناوچەی دراوسێمان خۆش بکات و ئەم بوارە زیاتر بەرەوپێش بەرێت.

لەمەزیاتر خۆشك و برایانی بەڕێز بەبۆچوونی من دەوری كورد لە عێراق یەكلاییكەرەوەیە بۆ سەقامگیری درێژخایەن لە ناوچەی كەنداو. ئاسایشی كەنداو بەوە گرێدراوە كە بەشێوەیەكی زۆر هەستیار نەزمی سیاسی لە عێراق سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە بە شێوەیەك كە دیكتاتۆرێكی دیكە وەك سەدام حوسەین جارێكی دیكە نەتوانێ بگات بە دەسەڵات. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، رێبەرایەتی كورد، ئەندامێكی چالاكی " كۆنگرێسی نیشتمانی عێراق"ە كە ریكخراوێكی سەرپەنایە بۆ ئوپوزیسیونی عێراق . ئێمە هەوڵ دەدەین یاسایەكی دیموكراتیك و پلورالیستی لە عێراق دابنێین كە تێیدا مافە تاكەكەسی و بەكۆمەڵەكانی خەڵكی عێراق بە فەرمی بناسرێت.

بۆ ئەوەی ئێمە یارمەتیدەر بین بۆ چەسپانی نەزم، سەقامگیری و دیموكراسی ناوچە، كوردەكانی عێراق دەبێ زیندووبن و نەفەوتێن .٤ میلیون كەس كە لە ناوچەی خودموختاری كوردستان دەژین، لەژێر باری گەمارۆی ناوخۆیی دەوڵەتی عێراق و هەروەها گەمارۆی نەتەوە یەكگرتووەكاندان. گەمارۆی ناوخۆیی كە لەساڵی ١٩٩١ وە دەستی پێكردووە ناهێڵێت پێداویستییە سەرەكییەكان وەك خۆراك، دەراودەرمان و سووتەمەنی بگاتە ناوچەی كوردنشین و بارودۆخێكی دژواری دروست كردووە بۆ خەڵكی ناوچەی ئێمە، بە تایبەت لە وەرزی زستاندا.

زێدەباری ئەم گەمارۆ ناوخۆییە، دەوڵەتی خودموختاری كوردستان لە ژێر باری گەمارۆی نەتەوە یەكگرتووەكانیشدایە كە دژی عێراق بە گشتی داینراوە. ئەم گەمارۆیە كە بۆ تەمیەكردنی رێژیمی سەدام حوسەین بەهۆی داگیركردنی كوێت دانراوە، پێش لەوە دەگرێت كە (كوردستان) دەستی بگات بەو قەتەعاتە یەدەكی و

کەلوپەل و پێداویستیانە کە زۆر پێویستە بۆ بوژاندنەوەی پیشەسازی ناوچەی خۆمان و بووە بە کەندوکۆسپی جیدی لەسەر بوژاندنەوەی ئابووری ئێمە و چاککردنەوەی ژێرخانی ئابووریمان کە لەئەنجامی شەڕدا و بە هۆی سیاسەتی بەئەنقەستی ڕێژیمی بەعس بۆ کاولکردنی زیاتر لە ٤ هەزار گوند و شارۆچکەی کوردستانی عێراق، بەتەواوی تەپیوە.

بەهەرحاڵ گەورەترین مەترسی بۆ ناوچەی کوردنشین، بوونی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هێزەکانی دەوڵەتی عێراقە لەپاڵ سنوورەکانی ئێمەدا. هێزەکانی عێراق بە تانك، تۆپ و چەکی قورسی دیکە هەڕەشە لە سەرزەمینی کوردستان دەکەن. هێزی هەوایی عێراقیش هێرش دەکاتە سەر هێزە کوردەکان کە تەنها چەکی سووکیان پێیە و لەوانەیە نەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەرامبەر هێرشی عێراق رابوەستن. لە ئەنجامدا کۆڕەوێکی بەکۆمەڵی میلیونی دیکە بەرەو سنوورەکانی تورکیا و ئێران دروست دەبێت کە کۆمەڵگای جیهانی ناچار دەکات دیسان لەگەڵ کۆڕەو و ئاوارەییەکەی نیسانی ١٩٩١ بەرەوڕوو بێتەوە.

ئەوە کە پێش لە هێرشی عێراق بۆ قەڵەمڕەوی کوردەکان دەگرێت، بوونی هێزە هاوپەیمانەکانە کە لە خاکی تورکیاوە ئوپەراسیونی "دابینکردنی حەسانەوە" ئەنجام دەدەن. بە هۆی بوونی ئەم هێزە پارێزەرە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، سەدام حوسەین ناتوانێت هێرش بکاتە سەر ناوچەی کوردنشین. بەهەرحاڵ داهاتووی کاری ئەم هێزە پارێزەرانە دیار نییە چونکە نازانین ئایا هاوپەیمانان درێژە بەم کارە دەدەن و ئایا دەوڵەتی ئانکارا ئیزن بەوە دەدات ئەم هێزانە لە ناو خاکی تورکیا بمێننەوە. ئەم مەسەلانە مەترسی ئەوەی بردووەتە سەرەوە کە ڕێبەری عێراق وەسوەسە بێت و دەست

بدات به کارێکی (مەترسیدار) که تایبەتمەندی دەسەڵاتەکەیەتی. بۆ پاراستنی کوردەکان له بەرامبەر ئەم مەترسییە، هاوپەیمانە رۆژئاواییەکان و دەوڵەتی تورکیا دەبێ بڕیاری ئەوە بدەن که هەتا کاتێك سەدام حوسەین و رژێمەکەی بمێنێت ، کاری هێزە هاوپەیمانەکان درێژەی بێت.

خۆشك و برایانی بەڕێز

به بۆچوونی من مەسەلە هەم بۆ زلهێزەکان و هەم بۆ دەوڵەتانی ناوچە ئەوەیە که نایانەوێت پوتانسییەلی کۆمەڵگای کورد وەك جەمسەرێکی ئاسایشی ناوچە پەرەپێدەن. مەسەلەکە دەرککردنە بەو دەورە ئیستراتژیکە که کوردەکان دەتوانن بیگێڕن بۆ هاندانی سەقامگیری، دیموکراسی و رێزگرتن له مافی مرۆڤ. سەرنەکەوتن له دەرککردن بەم (راستییە) بێگومان بازنەی توندوتیژی و دڵڕەقی له ناوچەکانی دراوسێمان دروست دەکات. کوردەکان دەتوانن و دەیانەوێت دەوری ئەرێنی خۆیان وەك سەرچاوەی ناکۆکی و ناسەقامگیری له رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەلاوە بنێن. کوردەکان دەیانەوێت ببن به شەریکی هێزە دیموکراتیکەکانی ناوچەکەمان بۆ دروستکردنی نەزمێکی نوێ و ئەمنتر. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، خۆشك و برایانی بەڕێز به بۆچوونی من پشتیوانی له دیموکراسی ساوای کوردستانی عێراق شتێکی زۆر پێویستە.

سپاستان دەکەم.

خاتوون هافنێر: زۆر سپاس بەڕێز (بەرهەم) صالح

دەمەوێت ئاگادارتان بکەمەوە ك خاتوون لەیلا زانا لێرە ئامادەیە که ئەویش ئەندامی "پارتی کاری گەل" و ئەندامی ئەنجوومەنی باڵای نیشتمانی تورکیایە(مەبەستی

پارلمانی تورکیایه-وەرگێڕ). ئێمه زۆر خۆشحالێن که خاتوون زانا توانی له ناو ئێمه ئاماده بێت و لەوانەیه بیەوێت له درێژەی گفتوگۆکەماندا پەیوەست بێت به ئێمه.

پێش ئەوەی دەست به کاری خۆمان بکەین ئایا هیچکام له بەشداربووان دەیەوێت وەڵامی ئەو خاڵانه بداتەوه که تا ئێستا باس کرا؟

بەڕێز ئیپستەین: رێگەم پێدەن بگەڕێمەوه بۆ ئەو پرسیاره که له کۆتایی بەشی یەکەمی قسەکانمدا خستمەڕوو و بەڕێز (بەرهەم صالح)یش له کۆتایی قسەکانیدا رۆشنایی خستەسەر. بەبۆچوونی من مەسەلەیەك که هەموو ئەو کەسانه که لەگەڵ سیاسەت تێکەڵن، لەگەڵیدا رووبەڕوون- چ لەواشنگتۆن،چ له ئانکارا یا هەر شوێنێکی دیکه- ئەوەیه که مەسەلەی شووناسی کولتووری یەکێ لەو مەسەلانەیه که دەتوانین ئێستا کۆمەڵێك خاڵی هاوبەشی تێدا بدۆزرینەوه. مەبەستم ئەوەیه که لەم چەند ساڵەی دواییدا باس و گوفتوگۆ لەسەر مافه کولتوورییەکان، مافه زمانییەکان و هتد، زۆر بووه و به بۆچوونی من کۆمەڵێك رێگاچارەی بۆ بەدی دەکرێت.

مەسەلەی دیموکراسی، دامەزراوه دموکراتیکەکان و سەروەری خاك زۆر کار دەکاته سەر من و له کۆتایی وتارەکەشەمدا پرسیارێکم خستەڕوو دەربارەی ئەوەی روانگەی ئێمه چییه و خاڵه هاوبەشەکانمان کامانەن. نازانم ئەگەر هەرکام لەو دوو بەڕێزه که لێره بەشدارن، به قازانجی ئەم دانیشتنه و هەروەها کومیسیون و ستافەکەی و هەروەها خودی من قسه بکەن ، روانگەیان چی دەبێت به نیسبەت هاوکاری و پێکەوه کارکردن؟. من ئاگادارم که ئەم دواییه بۆ یەکەمجار کوردەکانی تورکیا ، عێراق و وڵاتانی دیکه و کوردەکانی سەر به رێکخراوه جۆراوجۆرەکان پێکەوه دیداریان کردووه و لانیکەم پێکەوه قسەیان کردووه. ٥ساڵ لەمەوبەر کەس شتێکی

وای پێشبینی نەدەکرد، چ بگات بە ١٠ یا ١٥ ساڵ لەمەو پێش. بە بۆچوونی ئێوە پاشان چی دەبێت؟

بەڕێز ئەحمەد تورك: وەکوو هەموو گەلانی جیهان، ئێمەی کوردیش دەمەناوێت لە ئازادیدا بژین بەڵام لەو راستییەش ئاگادارین کە نزیکەی ٦.٦٠ بیلیون کەس لە جیهان دەژین کە تەنها ١,٧٢ بیلیون کەسیان ئازادن. ئێمە لەوە تێدەگەین گۆڕینی سنووری وڵاتان ئاسان نییە و دەزانین کە باشترین رێگاچارە بۆ ئێمە لە ئێستادا ئەوەیە کە لەسەر بنەمای مافی یەکسان و لەناو سیستمی فدراسیونێکی دیموکراتدا لە چوارچێوەی ئەو وڵاتانەدا بمێنینەوە کە تێیاندا دەژین.

بەڕێز بەرهەم صالح: دمەوێت بڵێم بە نیسبەت بارودۆخی کوردستانی عێراق بە تایبەت، مەسەلەی ئێمە مەسەلەی مافی کولتووری نییە چونکە لە کردەوەدا کوردەکانی عێراق هەندێ جار لە مافە کوولتوورییەکانیان چێژیان وەرگرتووە. هەروەها مافی ئۆتۆنۆمی کورد لە عێراق لە یاسای بنەڕەتی عێراقدا گونجێبندراوە، بەڵام هەمووی ئەمانە پێشی لەوە نەگرتووە کە دەوڵەتی عێراق، دەوڵەتی سەدام حوسەین ئەو کردەوەیە ئەنجام نەدات کە ئێمە بە ژینوساید و قەڵاچۆکردنی گەلی کوردی دەزانین.

بەبۆچوونی من مەسەلەکە ئەوەیە کە هەوڵ بدرێت بۆ چاکسازی لە ناو سیستمی سیاسی عێراق و دابینکردنی گارانتی گەورەتر لە لە یاسای بنەڕەتی عێراقدا بۆ ئەوەی رەفتاری دەوڵەتی عێراق جیاواز بێ لەگەڵ ئەو رەفتارە کە تا ئێستا کردوویەتی. من نامەوێت ئەم کارە بە دەستی کەم بگرم. لە روانگەی ئێمەوە وەك بزووتنەوەی کورد، دیموکراسییەکی پلورالیستی و سیستمی فدراسیون دەتوانێ ببێ بە

خالّی وەرچەرخان بۆ داهاتوومان. ئەمە ئەو شتەیە کە ئێمە بەشوێنیدایین و هەست دەکەین تێیدا بە ئارامی و ئاسایش دەژین. بەبۆچوونی من ، کێشەی پێشەڕووی ئێمە ئەوەیە کە لەوە دڵنیابین کە ئەمە ریگاچارەیەکی متمانەپێکراو دەبێت و دان بەو گیروگرفت و کیشانەدا بنێین کە لەسەر رێگای گەیشتن بەم ئامانجانەدا هەیە.

بەڵام هەڵسەنگاندنی ئێمە ئەوەیە کە باشترین و کاریگەرترین رێگاچارە بۆ ئامانجە نەتەوەییەکانی کورد لە عێراق ئەوەیە کە هەوڵ بدات بۆ عێراقێکی فیدراڵی یەکگرتووی دیموکرات کە تێیدا ماف و ئامانجەکانی گەلی کورد وەدی بێت.

خاتوون هافنێر: ئەگەر پرسیارم لێتان کرد، داواتان لێدەکەم بێنە پێشەوە. ئەم قسانەی ئێوە تۆمار دەکرێت، بۆیە زەحمەت نەبێت خۆتانمان پێبناسێنن و ئەگەر سەر بە رێکخراوێکن، ناوی رێکخراوەشمان پێبڵێن.

بە بۆچوونی من لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو مەسەلەیە کە خالّی هاوبەشی کەمینەی کورد لە هەمووی ئەم ولاتانەدا چییە ، وادیارە وەڵامەکەی ئەوەیە کە کۆمەڵێك کەس دەیانەوێت ئاڵوگۆڕی دیموکراتیك لە ناو ئەم ولاتانەدا روو بدات و کۆمەڵێك کەسی دیکە دەیانەوێت سنووری ئەم ولاتانە بگۆڕن.

لە عێراق، دوو حیزبی سیاسی سەرەکی کورد بە بەهایەکی گران پشتیوانی لە هەڵمەتی سەبازی گرنگی تورکیا لە ناوچەی کوردنشین دەکەن کە لە بنەڕەتدا بۆ لەناوبردنی pkk ئەنجام دەدرێت (ئەگەر لە هەڵەدام، بەڕێز بەرهەم صالح جەنابت دەتوانی پاشان ئەم مەسەلەیە شی بکەیتەوە). ئایا ئەم بەهایە کە کوردەکان دەیدەن، بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی دەوڵەتی تورکیایە؟

بەڕێز بەرهەم صالح: له راستیدا هیچ چالاکییەکی سەربازی تورکیا له کوردستانی عێراقدا نییه که رێبەرایەتی کورد له عێراق پشتیوانی لێبکات. ئێمە ئەوە بە فەرمی قبووڵ دەکەین که رێبەرایەتی کورد له عێراق یا حکوومەتی هەرێمی کوردستان حکوومەتێکی دۆفاکتۆیە له باکووری عێراق و ئەرکی ئێمەیە که سنوورەکانمان لەگەڵ دراوسێکانمان بپارێزین.

ئێستا کۆمەڵێك هەوڵ دەدرێت بۆ پاراستنی سنوورەکانمان و کۆمەڵێك پێشهات رووی داوە که تێیدا سوپای تورکیا هێرشی کردووە، بەڵام ئەم هێرشانە بە هاوکاری یا هاوئاهەنگی لەگەڵ رێبەرایەتی کورد له عێراق ئەنجام نەدراوە.

هیچ گومان لەوەدا نییە که تورکیا لەمێژە پێداگری لەسەر ئەوە دەکات که دان بە رێبەرایەتی کورد لە عێراقدا نانێت. تورکیا بە دڵنیاییەوە رێبەرایەتی کورد لە عێراق بە شتێکی جیدی نازانێت، مەگەرئەوە که ئێمە بە شێوەیەك رەفتار بکەین که نیگەرانییە رەواکانی تورکیا لە پەیوەندی لەگەڵ ئاسایشی سنوورەکانمان بپارێزین و بە بەرپرسیارێتییەوە هەڵسوکەوت بکەین و ئەو پەیامە بە دەراوسێکانمان بگەیەنین که ئێمە هەڕەشە نین بۆ ئاسایشی ئەوان.

خاتوون هافنێر: سپاس بەڕێز بەرهەم صالح

بەڕێز ئەحمەد تورك ئێوە دەتانەوێت وەڵام بدەنەوە یا شتێکی دیکە بە سەر ئەم قسانەدا زیاد بکەن؟

بەڕێز ئەحمەد تورك: بەبۆچونی من ئەم شەڕە شتێکی خراپە. ئێمە دەزانین تورکیا وەك مەترسی سەیری pkk دەکات. ئێمە هەروەها دەزانین که لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، هێزەکانی ناوچە پێیان خۆشە ئێمە شەڕیان بۆ بکەین نە ئەوە که خۆیان بۆ خۆیان

شەڕ بکەن. ئەم شەڕە کۆمەڵێك هۆکاری هەیە. یەکی لە هۆکارەکانی ئەوەیە کە روانگە و بیروبۆچوونەکانی رێبەرایەتی کورد لە باکوور و باشووری (کوردستان) جیاوازە، روانگە فەلسەفییەکانی باکوور و باشووری کوردستان لە بنەڕەتدا لەیەك جیاوازن. ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین کە تورکیا دەورێکی ناعیلاجیانە دەگێڕێت لە بەگەژیەکتردادانی کوردەکان لەم پەیوەندییەدا.

خاتوون هافنێر: سپاس

پێمخۆشە دەست بە مشتومڕەکەمان بکەین، ئەگەر بەشداربووانی دیکە پێیان خۆشە قسە بکەن تکایە هەڵسن و لە پشت میکرۆفۆنەوە قسە بکەن.

بەڕێز هاینیز: نامەوێت دەستی خۆم بخەمە پێشەوە، بەڵام رێگەم پێبدەن، بە هەموو دۆستەکانمان کە لە تورکیا هاتوون، بڵێم "خۆش گەڵدین" (بەخێر بێن) و "سلام علیکم". ئێمە خۆشحاڵین کە ئێوە لێرەن و گوێ بۆ ئەم مەسەلە گرنگە بنەڕەتییە دەگرن کە لە بەشێك لەم جیهانە لەگەڵی روبەڕووین.

من ناوم" فرێد هاینیز"ە و سەرۆك و بەرپرسی "ئەنجوومەنی دۆستایەتی ئەمریکا- تورکیا"م. ئێمە تەنها یەك ئەجینندای سەرەکیمان هەیە، ئەویش ئاشتییە. ئێمە دەمانەوێت لە پەیوەندی لەگەڵ سیاسەت، بازرگانی، کولتوور و هتد خەڵك پەروەردە بکەین. ئێمە بەتەواوی پشتیوانی لە گەڵێ لەو بیرۆکانە دەکەین کە ئەمڕۆ لێرە دەیبیسین.

بە تایبەت دەمەوێت ئاماژە بە خاڵێك بکەم و پاشان پرسیارێکتان لێدەکەم.

خاڵەکەم ئەوەیە کە خۆشحاڵم بە بینینی نوێنەرانی" مەجلیس" واتا کۆنگرێسی تورکیا لێرە کە نوێنەری "حیزبی کاری گەل"ن و هەروەها نوێنەری کوردەکانی

ڕۆژهەڵاتی تورکیان. بەبۆچوونی من ئەمە هەنگاوێکی گرنگە بەرەوپێش، بەڵام لەگەڵ ئەو قسەیەی بەڕێز "تورك"دا نیم کە دەوڵەتی تورکیا دەوڵەتێکی فەشەلهێنراوە و تەسکبینە، نا وا نییە. من تەنها دەمەوێت ئەم خاڵە سەرڕاست بکەومەوە و خۆشحال دەبم کە لەبارەی ئەم مەسەلەیە بەشێوەی تاکەکەسی لەگەڵ هەموو کەسێك قسە بکەم.

پرسیارەکەم ئەوەیە کە ئایا ئابووری باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە ئەنجامی پرۆژەی ناوی GAP لە باشووری ڕۆژهەڵات و شوێنەکانی دیکە باشتر نەبووە و لە ئەنجامدا ئابووری دیاربەکر و شارەکانی دیکە کە پێشتر ئاماژەیان پێکرا، باشتر و خۆشبژێوتر نەبووە؟.

من زۆر ژیاوم و لە گەلێ شەڕدا بەشداریم کردووە کە پێمخۆش نییە ناویان ببەم، بەڵام دەمەوێت ئەوە بڵێم کە لە زۆربەی ئەو شوێنانە کە لە ڕووی ئابوورییەوە بارودۆخێکی باشیان هەیە، خۆراکی باشیان هەیە، منداڵەکان دەتوانن بچنە قوتابخانەو و دەتوانن دەنگ بدەن، ئێمە شەڕ نابینین. پرسیاری من لەم کۆبوونەوەیە و بە تایبەت لە بەڕێز ئەحمەد تورك و بەڕێز ئیپستەین و هەموو بەشداوانی دیکە کە ئاگاداری بارودۆخەکەن، ئەوەیە کە ئایا لەم بارودۆخەدا ئابووری پێشدەکەوێت و ئێمە دەتوانین چی بکەین بۆ ئەوەی تا ئەو ئاستە پێشبکەوین کە کەمینەی کورد و کەمینەکانی دیکە بە خۆشی و شادی بژین؟ سپاس.

خاتوون هافنێر: سپاس بەڕێز هاینیز

بە قسەکانی بەڕێز ئیپستەین دەستپیدەکەین کە تازە لە تورکیا گەڕاوەتەوە.

بەڕێز ئیپستەین: یەکەم، بە دڵنیاییەوە من لەگەڵ هەڵسەنگاندنەکەی بەڕێز "فرید"دام کە ئەو شوێنانە کە ئابووریەکی بەهێزیان هەیە و سیستمێکی سیاسی سەقامگیریان هەیە و خەڵکەکەیان خۆشبژێون، لەچاو شوێنەکانی دیکە کەمتر ناکۆکی و کێشە تێیاندا سەرهەڵدەدات.

دووەم، بە بۆچوونی من هەموو ئەو کەسانە کە لێرە ئامادەن و بۆ خۆتان (مەبەستی ئەحمەد تورکە- وەرگێڕ) باش دەزانن کە لە دەساڵی رابردوودا و پێش ئەوەش، دەوڵەتی تورکیا هەوڵی داوە کە نەتەنها بەنداو دروست بکات و سیستمی ئاودێری و کارەبا لە باشووری رۆژهەڵات وەك بنەمایەك بۆ پیشکەوتنی ئابووری دابین بکات، بەڵکوو بڕیارێکی سیاسیشی دەرکردووە بۆ هاندانی پێشکەوتنی ئابووری چونکە لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەمە مەسەلەیەکی یەکلاییکەرەوەیە بۆ کەمکردنەوەی ناکۆکییەکان و دەستەبەر کردنی سەقامگیری. من نامەوێت پێشبینی ئەوە بکەم کە لە ٥ ساڵی داهاتوودا داهاتی ئابووری راستەقینەی خەڵکی ئەم ناوچەیە چۆن دەبێت، ئەمە مەسەلەیەکە کە رێکخراوەکەی ئێوە تاوتوێی دەکات و هەوڵ دەدات چالاکی لەوێ هان بدات.

لە کۆتاییدا ئەگەر ئێمە دەربارەی بارودۆخی تورکیا قسە بکەین ، بێ لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە ئایا هەڵوێستەکەی بەڕێز ئەحمەد تورك و سیاسەتەکانی حیزبەکەی قبوڵ بکرێت یا نا، لەگەڵ ئەحمەد تورك وەك ئەندامێکی فەرمی پارلمانی تورکیا مامەڵە دەکەین کە بە ئازادی هەڵبژێردراوە و نوێنەری گەلێکە کە روانگە و بیروبۆچوونەکانی تەوەری ئەم مشتومڕەیە.

پرسیارەکەم ئەوەیە کە ئێوە یا کەسانی دیکە کە لێرە بەشدارن، چ جۆرە هەڵسەنگاندنێکتان هەیە دەربارەی بنەماکانی خۆشبەختی و ئاشتی و لە کۆتاییدا دەربارەی کێشەکانی دیکە کە دەبێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و چاوەڕوانی چ جۆرە سەرکەوتنێك دەکەن لەم سەرمایەگوزارییە بەرفراوانەدا. هەروەها دەبێ ئەوە بزانین (و هەروەها دەوڵەتی ئانکاراش دەبێ بزانێت) کە کۆمەڵێك مەسەلەی دیکە هەیە کە پەیوەندی بە ژیان و شوناسی خەڵکەوە هەیە.

لە پەیوەندی لەگەڵ تورکیا و ناوچەی دەوروبەری، هەڵسەنگاندنی ئەم مەسەلەیە بۆ مێژوونووسان ئاسانە چونکە گەلێ لەم مەسەلانە بە درێژایی مێژوو گەلێ جار دووپات دەبنەوە، کەوابوو ئێمە ئامرازێکمان هەیە بۆ ئەوەی هەڵیانبسەنگێنین. بۆ سیاسەتمەداران کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە ئەو مەسەلە کۆنانە دیسان سەرهەڵبداتەوە. هیوادارم ئەمڕۆ لێرە لانیکەم دەرفەتێك بۆ هاوکارانی بەشدارم بڕەخسێت تا لە روانگەی خۆیانەوە مەسەلەیەك شی بکەنەوە کە لە راستیدا یەکجار ئاڵۆزە و بە ئاسانی شرۆڤە ناکرێت.

خاتوون هافنێر: بەڕێز ئەحمەد تورك پێتاخۆشە لەم پەیوەندییەدا شتێك زیاد بکەن؟

بەڕێز ئەحمەد تورك: منیش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدام کە خۆشبژێوی ئابووری، ئاشتی لەگەڵ خۆی دێنێت بەڵام کێشەیەکی سیاسیش لە ناوچە هەیە. ئەم کێشەیە لە سەرووی خۆشبژێوی ئابووریدایە و پێش لە گەشەکردنی دیموکراسی دەگرێت. کوردەکان بۆ ژیان شەڕ دەکەن . کاتێك کە هیچ سەقامگیرییەك لە ئارادا نییە، وێناکردنی ئەوە زەحمەتە کە لە داهاتوودا (لە رووی ئابوورییەوە) خوشبژێو بین. ئارامشی فیکر و زەین لە دەوڵەمەندبوون (لە رووی ئابوورییەوە) گرنگترە. لەم پەیوەندییەدا

نموونەیەکتان بۆ باس دەکەم: ٣٠٪ی نەوتی تورکیا لە کوردستان بەرهەمدەهێنرێت، ٥٠٪ی ئەو بەنداوانە کە کارەبا بۆ شارە گەورەکانی تورکیا بەرهەمدەهێنن لە کوردستاندان. هەردووی ئەم بەرهەمانە(ئاو و کارەبا) دەگوازرێنەوە بۆ رۆژئاوای تورکیا بۆ خۆشبژێوی رۆژئاوای تورکیا. ئەو ولاتانە کە دەولەمەندن و سەقامگیرن، دەبێ پێش لە هەموو شتێك کێشە سیاسییەکانیان چارەسەر بکەن.
پەیامێکیشم هەیە بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی دۆستایەتی ئەمریکا- تورکیا. دەمەوێت جارێکی دیکە سەرنجتان بەرەولای ئەو مەسەلەیە رابکێشم کە بۆ دەولەتی تورکیا فەشەلی هێناوە و تەسکبینە. نزیکەی ٦٤٠ رۆشنبیر، وەرزشڤان، نووسەر و گۆرانیبێژی کورد کە هیچ چالاکییەکی چەکداریشیان نەکردووە، لە تورکیا کوژراون. من خۆم دوو خول ئەندامی پارلمان بوومە ، ٦مانگ و نیو لە بەندیخانەی تورکیادا بوومە و لە بارودۆخیکی پیس و چەپەلدا ژیانم کردووە. با ئێمە راستییەکان ببینین . لەو ولاتانە کە سوپا بە سەر سیاسەتدا زالە، زەحمەتە بتوانین بلێین ئەو ولاتانە دیموکراتن. ئەو کەسانە کە دان بەم راستییەدا نانێن یا دەرك بە سیاسەتەکانی تورکیا ناکەن، ناتوانن ئەو هێزە نادیارە ببینن کە سوپایە. کۆماری تورکیا لە ماوەی ئەم ٤٨ سالٚ ژیانەی خۆیدا لە ژێر دەسەلاتی سوپادا بووە. سێ کودیتای سەربازی لە تورکیا روویداوە و لە ئەنجامیدا سێ دەولەتی سەربازی جێگای دەولەتە بە دیموکراسی هەلبژێردراوەکانیان گرتووەتەوە، کەوابوو بەلەبەرچاوگرتنی ئەم رابردووەی کۆماری تورکیا، هەرکەس بلێت دیموکراسی لە تورکیا هەیە، مرۆڤێکی ساویلکەیە. سپاس
خاتون هافنێر: فەرموو دوکتۆر (نجم الدین) کریم.

بەڕێز (نجم الدین) کریم: من (نەجم الدین کەریم)م له کۆنگرێسی نەتەوەیی کورد. من تەنها ئاماژه بە دوو خاڵ دەکەم: خاڵی یەکەم پەیوەندی بە کوردەکانی ئێرانەوە هەیه که ئەمڕۆ لێره نوێنەریان نییە ، چوونکه پانیلەکەی ئەمڕۆ دەربارەی بارودۆخی کوردە له هەموو پارچەکانی کوردستان.

٧ میلیون کورد له ئێران دەژین که له مافه بنەڕەتییەکانی خۆیان بێبەشن. له ئێرانیش، هەر وەك تورکیا، پەروەده بە زمانی کورردی له قوتابخانەکاندا نییه و هەرچەند که کتێب بە بە زمانی کوردی بە ڕێژەیەکی زۆر بڵاو دەبێتەوه، بەڵام سەرکووتێکی بەرچاو له ئارادایه. هەمووتان ئاگاداری کارنامەی مافی مرۆڤی ئێرانن. هەر ئەم مانگی رابردووه هیزەکانی ئێران هێرشیان کرده سەر بنکەکانی سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران که له کوردستانی عێراق بوون که بەناو هەرێمی دژەفڕینه و هەرێمێکی ئارامه بۆ کوردەکانی عێراق. بومباران و هێرشی هێزەکانی ئێران بووەته هۆی کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لەو سەدان کەسه (که ئاوارەن) له ناوچەکانی دیکه نیشتەجی بوونه و ژمارەیەکی زۆری دیکه جارێکی دیکه ئاواره بوونەتەوه. ویستم سەرنجتان بەرەولای ئەم بارودۆخه رابکێشم. کوردەکانی ئێران داوای دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری (بۆ کوردستان) دەکەن له چوارچێوەی ئێراندا. ئەمه داواکاری رێبەرایەتی کوردی ئێرانه و قەد ئاڵوگۆڕی بەسەردا نەهاتووه.

خاڵێکی دیکه که دەمەوێت باسی بکەم پەیوەندی بە پرسیارەکەی بەڕێز "ئیپستەین"ەوه هەیه که چارەنووسی کوردەکان بەچی دەبێت. من وەکوو نوێنەری رێکخراوێك که کوردەکانی هەموو پارچەکانی کوردستان لەخۆ دەگرێت کۆمەڵێك

زانیاری و ئاشنایەتیم هەیە لەگەڵ هەموو پارچەکانی کوردستان بەڵام تەنها دەمەوێت تا ئەوشوێنە کە پەیوەندی بە کوردستانی عێراقەوە هەیە، ئاماژە بە خاڵێك بکەم*.

پێموایە لە رووی مێژووییەوە، کوردستانی عێراق نموونەیەکی بێ وێنەیە چونکە لە رووی مێژوویەوە بەشێك نەبووە لە عێراق بەڵکوو تەنها بە هۆکاری ئابووری و سیاسی لە سەرەتای دەیەی ١٩٢٠ بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی نوێ لکێندرا بە عێراقەوە. ئەم دەوڵەتە تازەدروستکراوەی عێراق قەد رێزی لە مافی مرۆڤ نەگرتووە و قەد نوێنەری سەرجەم خەڵکەکەی نەبووە.

هەروەها کە دۆکتۆر بەرهەم صالح ئاماژەی پێکرد ، کوردەکان ژینوساید کراون، سەرکوت کراون و ناوچەی کوردنشین نەتەنها بەدەستی دەوڵەتی سەدام حوسەین ، بەڵکوو بە دەستی دەوڵەتانی پێش ئەوەش (هەرچەند لە ئاستێکی کەمتردا) بە تەواوی کاول کراوە. هەروەها لە کوردستان کۆمەڵێك پەیماننامە و ریککەوتننامە لە نێوان دەوڵەتە کولونیالیستەکان و دەوڵەتانی ناوچە واژۆ کراوە کە بە روونی دانی بە مافی چارەی خۆنووسینی کوردەکانی عێراقدا ناوە، بە تایبەت پەیماننامەی "سێڤر" کە رێگای بە کوردەکان دەدا دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن و بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کوردەکان دوابەدوای شەڕی(یەکەمی) کەنداو تا ئێستا ژینوساید دەکرێن و سەرکووت دەکرێن، بە بۆچوونی من دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد لە عێراق دەبێ وەك بیرۆکەیەك بخرێتە بەر باس و گفتوگۆ.

---

* دەبوایا دۆکتۆر نجم الدین کریم باسی کوردستانی رۆژئاواشی- کوردستانی سوریا- بکردبایا ( وەرگێڕ).

هەروەها کۆمەڵێك ئالتێرناتیڤی دیکە هەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، بەڵام بەهەرحاڵ مەسەلەی سەربەخۆیی کوردستانی عێراق یەکێ لە رێگا باشەکانە چونکە تا ئەو شوێنە کە پەیوەندی بە من و گەلێ کەسی دیکەوە هەیە، مێژووی ۷۰ ساڵ پێکەوەژیان لە عێراق هیچ دەستکەوتێکی بۆ نەتەنها کوردەکانی عێراق، بەڵکوو بۆ خەڵکی دیکەی عێراق و ناوچەش نەبووە. سپاستان دەکەم.

**خاتوون هافنێر: سپاس**

**بەڕێز پەناهی:** بەیانیتان باش. من ناوم "فارس کەریم پەناهی"یە، خەڵکی ئێرانم. دەبێ هەموو کەس ئەو (نەهامەتییە) شەرمەزار بکات کە وەك کەمینەیەك بەسەر کورددا هاتووە لەو وڵاتانە کە کورد تێیدا دەژی. بەڵام دوو پرسیارم هەیە:

یەکەم، ئایا بەشداربووانی ئەم پانێلە و گەلی کورد پێیانوانییە کە لەماوەی ۲۲ یا ٤۰ ساڵی رابردوودا ، دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و زلهێزەکانی دیکە کەڵکیان لە کوردەکان وەرگرتووە و وەك داردەست بەکاریانهێناون دژی هەموو ئەو دەوڵەتانە کە پەیڕەوییان لە سیاسەتی ئەوان(زلهێزەکان) نەکردووە؟ بۆ نموونە لە کاتی حکوومەتی شا، ئەوان کەڵکیان لە کوردەکان وەرگرت و ئێستاش دژی سەدام کەڵکیان لێوەردەگرن. بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە ئایا بەشداربووانی ئەم پانێلە یا ئەندامانی ئەم رێکخراوە کوردانە لەوە تێدەگەن کە لە باتی ئەوەی لە راستیدا کێشەی کورد چارەسەر بکەن ، لە لایەن دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەو ناوچەیە بەکاردەهێنرین؟

پرسیاری دوەم ئەوەیە کە هەڵوێستی ئەم کومیسیونە و ئەم پانێلە چییە بە نیسبەت پێشێلکاریی مافی مرۆڤ و مافە سیڤیلەکانی کەمینەکانی ئەمریکا لە لایەن دەوڵەتی

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە. هەروەها کە هەمووتان دەزانن، هەموو مرۆڤێك سۆز و هەستی هەیە بە نیسبەت یاساکان و پێشێلکردنی ئەم یاسانە. ئەم مەسەلەیە لەپەیوەندی لەگەڵ پێشێلکردنی مافی کەمینەکان لێرە لە ئەمریکا و رۆژهەلاتی ناوەڕاست چۆنە؟

خاتوون هافنێر: وەلامی پرسیاری دووەمتان دەدەمەوە . کومیسیونی هلیسینکی بەگوێرەی یاسا چاودێری دەکات بەسەر جێبەجێبوونی یاسای کۆتایی(پەیماننامەی هلسینکی)و لە راستیدا ئێمە چاودێریمان کردووە بەسەر کارنامەی دەولەتەکەی خۆمان لەم پەیوەندییەدا و تائێستا چەند جار باسی ئەم پێشێلکاریانەمان کردووە. ئێمە چەند ساڵ لەمەوپێش چەند کۆبوونەوەیەکمان گرت و راپۆرتێکی تیروتەسەلمان دەربارەی مافە سیاسی و مەدەنییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (کەلە هەندێ ناوچەی تایبەتدا زۆر پێشێل دەکرێت) بلاو کردەوە.

ستافی کومیسیون نزیکەی دوو ساڵ لەمەوپێش راپۆرتێکی تیروتەسەلی دەربارەی دەربەدەربوونی خەڵك ئامادە کرد و سێ رۆژ لەمەوبەر کومیسیون، راپۆرتێکی دەربارەی ٥رۆژ گفتوگۆی گشتی و ئەنجامەکانی سەفەری ستافی کومیسیون بۆ رۆژهەلاتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هەروەها هەندێ لە ناوچەکانی فلوریدا و ناوچەکانی دیکە کە لە بارودۆخێکی خراپدان و لەگەڵ کێشەی کۆچی کرێکاران لەم وڵاتە رووبەڕوون ، بلاو کردەوە.

کەوابوو ئێمە بەجیدی سەرنج دەدەین بە کارنامەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لە راستیدا هەرکاتێ هەر هاووڵاتییەك لە هەر شوێنێکی ئەم وڵاتە نامە بۆ کومیسیۆن بنێرێت و داوا بکات کومیسیون چاودێری بەسەر مەسەلەکەدا بکات،

ئێمە بە خۆشحاڵییەوە جێبەجێی دەکەین ئەگەر لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئێمەدا بێت.

خاتوون هافنێر: بەڕێز بەرهەم صالح فەرموو

بەڕێز بەرهەم صالح: پێموایە پێش هەموو شتێك بیروڕای جیاواز هەیە دەربارەی پێناسەی "کەمینە"لە ناو خەڵکدا. بە دڵنیاییەوە منیش لەگەڵ ئەم جۆرە پێناسەیەدا نیم. ئێمە ناتوانین تەنها لەسەر بنەمای کۆمەڵێك هێما و نیشانە و تایبەتمەندی، کورد بە کەمینە دابنێین. ناکرێت مافەکانی گەلی کورد لەگەڵ بارودۆخی وڵاتە یەکگرتووەکان بەراورد بکرێت بێ لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندییەکانی کرێکارە کۆچەرەکان و نموونەکانی وەك ئەوان. پێموایە ئەم (پێناسەیە) لە سروشتی مەسەلەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەرچاوە دەگرێت.

لە پەیوەندی لەگەڵ مەسەلەی دیکەدا کە زلهێزەکان و هێزە نێونەتەوەییەکان بۆ قازانجی خۆیان ، کەڵك لە مەسەلەی کورد وەردەگرن، دەبێ بڵێم ئەم مەسەلەیە لە ڕاستیدا بە پێچەوانەیە. زلهێزەکان، هێزە نێونەتەوەییەکان بەردەوام بە شوێن ئەوەدا بوونە کە پشتیوانی لە دەوڵەتانی ناوچە و سیاسەتەکانیان بکەن بۆ تاواندنەوە و تێکشکاندنی چالاکییەکانی کوردەکان کە بە بۆچوونی من ئەمە بەشێکە لە کولتووری سیاسی و (لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا) بەشێکە لە کولتووری سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە هەوڵ دەدەن خۆیان دوور بگرن لە باسکردنی خودی مەسەلەکە و تەنها لە دەرەوە سەرزەنشتی بکەن.

کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، مەسەلەی شووناسی نەتەوەییە، مەسەلەیەکی سیاسییە کە ڕەگوڕیشەکەی لە ناوچەدایە و ئەگەر ڕەهەندی دەرەکیشی

هەبێت، له پلەی دووەمدایە. بە بۆچوونی من لە باتی ئەوەی لە دەرەوە سەرزەنشتی ئەم مەسەلەیە بکەین ، ئێمەی خەڵکی ئەو ناوچەیە دەبیٚ لەگەڵ خودی مەسەلەکە مامەڵە بکەین و هەوڵ بدەین ڕێگاچارەیەکی بۆ بدۆزینەوە.

**خاتوون هافنێر:** فەرموو بەڕێز

**بەڕێز هامپاریان:** من ناوم "ئارام هامپاریان"ـە لە کومیتەی نێونەتەوەیی ئەرمەنی لە ئەمریکا. لە دانیشتنی دوایی CSCE، ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی و ڕێکخراوی چاودێری هلیسینکی بەو ئەنجامە گەیشتن کە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە تورکیا لە ساڵی رابردوودا لە راستیدا خراپتر بووە. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش لە راپۆرتەکەی خۆیدا دەربارەی مافی مرۆڤ کە ئەم دواییانە بڵاو بووەتەوە، بەو ئەنجامە گەیشتووە کە دەوڵەتی (سولەیمان) دمیرل هیچ هەنگاوێکی بۆ چاکسازی هەڵنەگرتووە کە لەوانەیە ببێتە هۆی کەمبوونەوەی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە تورکیا و لە راستیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە راپۆرتەکان دەربارەی ئەشکەنجە رووی لە زیادبوونە.

ئەم مەسەلەیە چ کاریگەرییەکی دەبێت لە سەر ئاستی یارمەتی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا لە ساڵی داهاتوودا؟

**بەڕێز ئیپستەین:** من بە تەواوی ئاگاداری ئەو دانیشتنەم کە ئێوە ئاماژەتان پێکرد، چونکە خۆم تێیدا بەشدار بووم. بە دڵنیاییەوە من شیاوی ئەوە نیم کە بە نوێنەرایەتی کۆمیتەکانی کۆنگرێس قسە بکەم کە کارەکەیان پەیوەندی بە یارمەتی (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا) هەیە یا یارمەتی بیانی ئەمریکا بە دەستی ئەوانۆیە. پێموایە دەربارەی ئەم مەسەلەیە ئێوە دەبیٚ راستەوخۆ لە خۆیان پرسیار بکەن.

لە پەیوەندی لەگەڵ پرسیارەکەتان دەبێ بڵێم کە من لە دانیشتنی پێشوودا روانگەی گشتی خۆم بە نیسبەت مەسەلەی بەرفراوانی مافی مرۆڤ روون کردەوە و ئێستاش لێرە دیسان شی دەکەمەوە. ئەم بیروبۆچوونەی من هیچ ئاڵوگۆرێکی بەسەردا نەهاتوە. من ئەو کاتە وتم کە لە راستیدا رێژەی توندوتیژی لە تورکیا لە ساڵی رابردوودا (یا ساڵونیوێك لەمەو پێش) زیاتر بووە و ئەمەش پەیوەندی زۆر راستەوخۆی هەیە لەگەڵ ئەو شەڕە کە (دەوڵەتی تورکیا) لە باشووری رۆژهەڵات دژی راپەڕینی pkk دەیکات.

کۆمەڵێك مەسەلەی دیکە لەم پەیوەندییەدا هەیە کە ئێستا باسی دەکەم. لەو ناوچانە، پولیس خەڵك دەستگیر دەکات و کۆمەڵێك کێشەی دیکە هەیە بەڵام پێموایە لەو ناوچانە باروودۆخەکە نەگۆڕە و هەندێ جار (خەڵك) کەمتر دەستگیر دەکرێت و مافەکانیان لە ناو بەندیخانە پێشێل دەکرێت و هەندێ جار زیاتر کە ئەمەش پەیوەندی بە جۆری شەڕەکەوە هەیە. ئێستا ئاگربەستێك لە ئارادایە و دەتوانین چاوەڕوانی ئەوە بکەین کە رێژەی ئەم پێشێلکارییانە کەمتر دەبێت. پێموانییە هەموو کەسێك پێشبینی شتێکی وەها بکات و پێموانییە هیچ کەس لەم باروودۆخەدا بزانێت کە ئاگربەست چەندە درێژەی دەبێت بەڵام دەتوانین پێشبینی ئەوە بکەین کە لە داهاتوویەکی نزیك تا داهاتوویەکی نەچەندان دووردا، هێرشێکی سیاسی دەکرێتە سەر لایەنە سیاسییەکان(کە بەرێز ئەحمەد تورك باسی ئەم لایەنانەی کرد) و لەوانەیە دوو شت روویدات:

یەکەم، پێشکەوتنێکی راستەقینە لە بواری مافە ئابووری ، سیاسی و کولتوورییەکان و لە هەمان کاتدا لەوانەیە رێگا بە هەموو ئەو کەسانە کە پەیوەندییان هەیە بە

رەوتیCSCE ، ئەم کومیسیونە و ستافەکەی و کەسانی دیکە لە ئێمە، لەوانە کاربەدەستانی دەوڵەتی ئانکارا، تا بگەڕێینەوە سەر مەسەلەکانی دیکە لە ناوچەکانی دیکە و وەکوو پێویست سەرنجیان پێبدەن. من وەك خۆم هیچ گومانم لەوەدا نییە کە ئێستا بەرپرسیارەتییەك هەیە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو مەسەلانە بەڵام بەهەرحاڵ ناتوانم پێشبینی ئەوەتان بۆ بکەم کە چ هەنگاوێك بەرەوپێش هەڵدەگیردرێت.

خاتون هافنێر: بەڕێز "ئەحمەد تورك"یش دەیەوێت بە چەند خاڵێك لەم پەیوەندییدا ئاماژە بکات.

بەڕێز ئەحمەد تورك: دەوڵەتی سولەیان دمیرل و (عیسمەت) ئینۆنۆ بەڵێنیاندا بارودۆخی مافی مرۆڤ باش بکەن، بەڵێنیاندا راستی مەسەلەی کورد قبوڵ بکەن و رەوتی دیموکراسی تا ئەو شوێنە کە بتوانن بەرەو پێش بەرن، بەڵام بەهەرحاڵ کارنامەکە روونە. پاش ٥٠٠ رۆژ دەسەڵاتداری ، هیچکام لە بەڵێنەکانیان جێبەجێ نەبوو. ئەگەر ئێمە ئێستا لە وڵاتەکەمان لە قۆناخێکی زۆر گرنگداین، بەهۆی دەستپێشخەرییەکانی ئەوان نیە، بەڵکوو بە هۆی پێشنیارە ئاگربەستەکەی pkkیە .

ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین کە گەلی ئێمە وەکوو کورد، کێشەی خۆی چارەسەر دەکات. ئێمە لەسەر ئەو باوەڕە نین کە کێشەکانی کورد یا کوردستان لە واشنگتۆن یا پاریس یا شوێنەکانی دیکە چارەسەر دەبێت. پەیامی ئێمە وەکوو نوێنەری (گەلی کورد) ئەوەیە کە ئێوە لە ئازار و نەهامەتییەکان و گیروگرفتەکانی گەلی کورد ئاگادار بکەینەوە.

خاتوون هافنێر: فەرموو دۆکتۆر لۆری

بەڕێز لۆری: من ناوم "هیس لۆری" یە لە ئیتیستیتۆی توێژینەوەکانی تورکیا.
دەمەوێت رووی پرسیارەکەم راستەوخۆ بکەمە لای بەڕێز ئەحمەد تورك. هاوکات
لەگەڵ ئەوەی کە لەگەڵ گەلێك لە وەڵامەکانی بەڕێز "ئەحمەد تورك" دام، بەڵام
کۆمەڵێك خاڵ هەیە کە نەتەنها دروست نین بەڵکوو ئەوەندە هەڵەشن کە من تا ئێستا
لە زمانی هیچکەس لە تورکیا یا لە دەرەوەی تورکیا نەمبیستوون. بە دوو نموونە
ئەمەتان بۆ روون دەکەمەوە و هەر دوو مەسەلەکەش لە بەڕێز ئەحمەد تورك دەپرسم.
بەڕێز ئەحمەد تورك لە وتارەکەیدا کە وەرگێڕەکەی خوێندییەوە، ئاماژەی بەوە کردبوو
کە ئەمڕۆ ٢٠ میلیون کورد لە تورکیا دەژین. ئەم ئامارە نەتەنها دروست نییە
بەڵکوو کۆمەڵێك پرسیار دەربارەی گەلێ لە قسەکانی دیکەی بەڕێز ئەحمەد تورك
دەهێنێتە ئاراوە. نازانم ئەم ئامارە لە کوێ هاتووە؟ ئەگەر وەها بێت ، روونە کە
ئەمڕۆ کوردەکان ٣٥٪ی دانیشتوانی تورکیا پێکدەهێنن . بە گوێرەی کەمترین
ئامارەکان (کە بە دڵنیاییەوە کەمە) نفووسی کوردەکان لە تورکیا ٦ میلیون و بە
گوێرەی زۆرترین ئامارەکان ١٢ میلیونە کە بە بۆچوونی زۆربەی ئەو کەسانە کە کە
دەبارەی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە توێژینەوە دەکەن، تۆزێ زۆرە. بەڵام ئامارەکەی
بەڕێز ئەحمەد تورك ١٠٠٪ لەم ئامارە زیاترە و بەلەبەرچاوگرتنی ئەو راستییە کە
ئەو گرووپە کە بەڕێز ئەحمەد تورك لە پارلمانی تورکیا نوێنەرایەتی دەکات،١٨
کورسی لە ٤٥٠ کورسی پارلمانی بە دەستەوەیە، دەرککردن بەوە زەحمەتە کە چۆن
٣٥٪ی دانیشتووانی تورکیا بە ٥٪ی پارلمانتارەکان دەنگیان داوە.

خاڵی دووەم کە پێموایە ئەم زیادەرۆییەی بەڕێز ئەحمەد تورك رون دەکاتەوە ئەوەیە کە
بەڕێز ئەحمەد تورك وتی دانیشتووانی باشووری رۆژهەڵات هیچ خەبەرێکیان لە

پێشکەوتنی ئابووری لەو ناوچەیە نەبینیوە و لەم پەیوەندییەدا ئاماژەی بە مەسەلەی سەرچاوەی ئاو و نەوت کرد . من لە دەیەی ١٩٨٠ زۆر سەردانی گوندەکانی حەکاری، بیتلیس و "وان"م دەکرد و ئەو شتە کە لەوێ کاری کردە سەر من ئەوە بوو کە بینیم گوندەکانی ئەو ناوچەیە کارەبایان هەیە و لە دەیەی ١٩٨٠ پێش کەوتوون و بە سیستمی پەیوەندییەکان تەیار کراون. نازانم ئەم راستییە چۆن دەگونجێت لەگەڵ قسەکانی بەڕێز ئەحمەد تورك کە وتی ئەو ناوچەیە هیچ قازانجێکی ئابووری بە خۆوە نەبینیوە؟

خاتوون هافنێر: سپاس.

فەرموو بەڕێز ئەحمەد تورك

بەڕێز ئەحمەد تورك: دەبێ ئەوە پشتڕاست بکەمەوە کە ئامارەکانی من زانستی نین و هۆیەکەشی ئەوەیە کە شوناس و بوونی کورد بەفەرمی نەناسراوە، کەوابوو خستنەڕووی ئاماری (ورد و بە تەواوی دروست) دەربارەی کیانێك کە قبوڵنەکراوە، زەحمەتە. ئامارەکانی من، ئامارگەلی ڕێژەیین و دەڵێم ٨ میلیون کورد لە زێدی باوباپیرانی خۆیان دەژین و ١٢ میلیونی دیکە لە شارە سەرەکییەکانی رۆژئاوای تورکیا وەك ئێستانبول، ئانکاراو ئیزمیر دەژین.

پێمخۆشە سەرنجتان بەرەولای ئەو راستییە رابکێشم کە لە کۆبوونەوەیەکی کراوە لە"ئەشرەف بیتلیس" کە من بەشداریم تێدا کرد ژنراڵێکی سوپای تورکیا وتی ٢٧٪ی سەربازەکانی، کوردن. کەوابوو تەنها بە گوێرەی ئەم ئامارە، ژمارەی کوردەکان لە تورکیا دەبێتە ١٧ میلیون.

راستە، هەندێ لە گوندە کوردنشینەکان کارەبا و تەلەفونیان هەیە، بەڵام مەگەر ئێمە لە سەدەی ۲۰دا ناژین؟ ئایا ئێوە ئەم پێداویستیانە بۆ کوردەکان بە زیاد دەزانن؟ ئێوە وتتان زۆر باش تورکیا دەناسن، کەوابوو پرسیارێکتان لێدەکەم. چەندە کارخانە لە کوردستاندا هەیە و چەندە کرێکار لەم کارخانانەدا کار دەکەن؟ ئایا دەتوانن ئاماژە بە زیاتر لە یەك یا دوو کارخانە بکەن؟

ئێوە باسی سیستمی پەیوەندیەکانتان کرد. راستە، سیستمی پەیوەندییەکان چووەتە ناو گەلێ لە گوندەکان، بەڵام لە روانگەی منەوە خاڵی گرنگ ئەوەیە کە هۆکاری دامەزراندنی ئەم سیستمە ئەوەیە کە دەوڵەتی تورکیا دەیەوێت راپەڕینی کورد بەتەواوی بخاتە ژێر کونترۆلی خۆی بۆ ئەوەی چالاکییەکانی pkk کونترۆڵ بکات، هۆکارەکەی ئەمەیە.

هەروەها دەمەوێت بچمە سەر مەسەلەی حیزبەکەی خۆم. بەڵێ، راستە، ئێمە ۱۸ ئەندامان لە پارلمان هەیە، بەڵام دەمەوێت سەرنجتان بەرەولای ئەوە رابکێشم کە هەڵبژاردنەکەی پارلمان ئەوندە خێرا چووەپێش کە ئێمە نەمانتوانی خۆمان وەك حیزبێکی سەربەخۆ بەرێکخستن بکەین. ئێمە ناچاربووین لەگەڵ "حیزبی دیموکراتی کۆمەلایەتی" رێکبکەوین تا لە لیستەکەیاندا بەشداری بکەین و ئەوان وەك ئەندامی HEP جێگایان بۆ ئێمە تەرخان کرد. لە شارێك وەك دیاربەکر کە ۸ ئەندامی لە پارلمان هەیە، هەموو ئەندامەکانی سەر بە HEPن. لە شاری ماردین کە من نوێنەریمی، ۵ نوێنەر هەڵبژێردران، کە هەموویان ئەندامی HEPن.

ئێمە تەنها ئەوەمان دەوێت کە دەوڵەتی تورکیا کەشوهەوایەکی ئازاد بکاتەوە بۆ ئەوەی داخوازییەکان، ئامانجەکان و ئاواتەکانی کوردەکان راشکاوانە و پاك و

راستگۆیانه بخرێته بەرباس و گفتوگۆ. ئەگەر له کەشوهەوایەکی وەهادا خەڵك ئێمەی هەڵنەبژارد، تەقسیرەکەی دەکەوێته ئەستۆی ئێمه.

بەڕێز لۆری: به یارمەتیتان دەمەوێت وەڵامی بەڕێز ئەحمەد تورك بدەمەوە.

زۆر سپاس بەڕێز ئەحمەد تورك بۆ پرسیارەکانتان. من ئەو کاته له تورکیا بووم که ئێوه لەگەڵ ئەشرەف بیتلیس لەو بەرنامەیەدا بەشداریتان کرد و ئەو بەرنامەمە بینی که باستان کرد. ئەمه له راستیدا هەر ئەو خاڵەیه که من دەمەوێت ئەمڕۆ لێره روونی بکەمەوە. راستییەکەی ئەوەیه که ئێوه لەم بەرنامەیەدا ئامادەبوون، وەکوو کوردیش ئاماده بوون، وەکوو پارلمانتارێکی هەڵبژدراوێکی کورد ئاماده بوون و لەگەڵ فەرماندەی ژاندارمی تورکیا لەم بەرنامەیەدا ئاماده بوون و به ئاشکرا پێکەوە گفوگۆتان کرد که تەواوی جیهان بینی.

ئەمه به دڵنیاییەو گۆڕانکارییه، شتێکی وا ٥ ساڵ لەمەوپێش رووی نەدەدا، ٣ ساڵ لەمەوپێش رووی نەدەدا، بەڵام پارساڵ روویدا. ئەمه هەر ئەو خاڵەیه که دەمەوێت بۆتانی روون بکەمەوە. پێموایه کۆمەڵێ شت له تورکیا ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووه و له جێی خۆیدا نییه ئەگەر بڵێین هیچ شتێك نەگۆڕاوه یا له ئامارەکاندا زیادەڕۆیی بکەین و بڵێین هیچ پێشکەوتنێکی ئابووری نەهاتووەته ئاراوه یا هیچ ئازادییەکی سیاسی لەئارادا نییه. گرنگ ئەوەیه که بارودۆخەکه له ئاڵوگۆڕدایه، گرنگ نییه هێزی ئەم ئاڵوگۆڕە کێیه و هۆکارەکەی چییه. ئێستا ئاڵوگۆڕ بەردەوامه و و ئەو راستیه که ئێوه وەك رێبەرێکی سیاسی کوردی تورکیا لێره لەم پانێله له کومیسیونی هلیسینکی له واشنگتۆن دی سی ئامادەن، خۆی دەربڕی ئەم گۆڕانکارییەیه.

**خاتوون هافنێر:** سپاس.

بەڕێز ئەحمەد تورك و پاش ئەو، دۆکتۆر ئیپستەین دەیانەوێت قسە بکەن.

بەڕێز ئەحمەد تورك: راستە، من لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە بووم و وەکوو کوردیش ئامادە بووم. بەڵام ئێوەش دەبێ بزانن کە حیزبەکەی ئێمە بۆ دەربڕینی بیروبۆچوونەکانی، بۆ داکۆکیکردن لە مافەکانی کوردەکان، ئازار و ئەزیەتی بە دەستی دەوڵەتی تورکیا بینیوە و لەوانەیە لە کۆتایی ئەم مانگە داخرێت. یاسای بنەڕەتی، مافی پارێزراوبونی بەخشیوە بە ئێمە وەك ئەندامی پارلمان بەڵام ئەم مافە لە ئێمە زەوت دەکرێت.١٨ ئەندامیHEP لەگەڵ مەترسی مەرگ رووبەڕوون بە هۆی هەڵوێستی ئێمە وەك کورد و داکۆکیکردن لە مافەکانیان.

ئێمە تا ئێستا سەبوور بووینە ، تا ئێستا ئێمە سەبوور بووینە بە نیسبەت ئەو چاکسازییە هێواشانە کە لە تورکیا بەڕێوەدەچێت. خەباتی ئێمە تەنها بۆ مافەکانی خۆمان نییە، بەڵکوو بۆ مافی تورکەکانیشە بۆ ئەوەی لە ناو سیستمێکی دیموکراتدا بژین. بە هەڵەدا مەچن، ئێمە لەم پەیوەندییەدا پشتیوانی لە تورکەکانیش دەکەین.

بەڕێز ئیپستەین : ناچارم خۆم بخەمە ناو مشتومڕە پڕ لە سەفسەتەکەی نێوان دۆستی کۆنم (مەبەستی بەڕێز لۆرییە- وەرگێڕ) کە کۆمەڵێك بیروبۆچوونی جیاوازی توێژینەوەیی خستەڕوو و ئەندامێکی پارلمان(مەبەستی بەڕێز ئەحمەد تورکە- وەرگێڕ) کە چالاکییە تاکەکەسییەکەی لە بواری مافی مرۆڤدا، ئیلهامبەخشە.

من تەنها یەك، دوو خاڵم هەیە کە دەمەوێت دەربارەی ئەو پرسیارانە کە لەم باسانەدا خرانەڕوو، ئاماژەی پێبکەم.

خاڵی یەکەم دەربارەی ئەو پرسیارەیە کە پێشتر دەربارەی پێشکەوتنی ئابووری (لە تورکیا) خرایەڕوو. من بەڕاستی لەسەر ئەو باوەڕەم کە لە پەیوەندی لەگەڵ مەسەلەی

پێشکەوتنی ئابووری لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا لە ماوەی ١٠ ساڵی رابردوودا سەرمایەگوزارییەکی بەرچاو کراوە بەڵام نازانین ئاکامەکانی ئەم سەرمایەگوزارییە لە ١٠ ساڵی داهاتوودا چ دەبێت، بەڵام روونە کە بارودۆخی ئێستا هەمان بارودۆخەکەی ١٠ ساڵ لەمەو پێش نییە.

خاڵی دووەم پەیوەندی بەتەلەفۆن و سیستمی پەیوەندییەکانەوە هەیە. بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی هۆکار و هانای دامەزراندنی ئەم سیستمە چییە، بە بۆچوونی من (کە پێموایە هەموو ئەو کەسانە کە لێرە ئامادەن، لەگەڵم هاوڕان) وەك کەسێك کە تەجروبەی چالاکی مافی مرۆڤی لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو هەیە، کۆمەڵگای سۆڤیەت (پێش لە هەڵوەشانەوە) زۆر لە کۆمەڵگای تورکیا داخراوتر بوو، لە یەکێتی سۆڤیەت خەڵکێکی زۆر کەم تەلەفۆن و تیلیفەکس یان هەبوو و ژمارەیەکی زۆر کەم لە چالاکانی مافی مرۆڤ دەیانتوانی ئاڵوگۆڕ پێکبێنن. ئەمە یەکێ لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کار بۆ مافی مرۆڤ لە یەکێتی سۆڤیەت بوو، کەوابوو بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی سیستمی تەلەفۆن چۆن داهاتووە یا لە کوێ دەستتان دەگات بە تەلەفۆن یا دەتوانن چ کارێك بە کۆمپیوتر ئەنجام بدەن، گرنگ ئەوەیە کە هەر کەسێك کە دەسترەسی بەم ئامرازانە هەبێت، جیهان هی ئەوە.

ئەمە لایەنێکی مەسەلەکەیە، لایەنی دیکە ئەوەیە کە کاتێ کە ئێوە لە بەرامبەر کامێرای میدیاکانی تورکیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رادەوەستن، ئەمە بۆ خۆی نیشانەی شتێکە. ئەم میدیانە دەچنە هەموو شوێنێك کە ئێوە پێتانخۆش بێت، ئەم راگەیاندنانە سنووردار ناکرێن، کەوابوو گرنگ نییە ئەم تەلەفۆنانە بۆ دامەزراون، گرنگ ئەوەیە کە لە ناوچە هەن.

خاڵی کۆتایی کە لە پەیوەندی لەگەڵ مشتومڕ لە سەر ئاماری کوردەکان دەمەوێت ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە کە ژمارەی کوردەکان چ ٢٠ میلیون بێت، چ ١٢ میلیون بێت، چ٦ میلیون بێت، هیچ پەیوەندییەکی بە باسەکەی ئێمەوە نییە. تەوری باسەکەی ئێمە بارودۆخی کوردەکانە لە چوارچێوەی تورکیا و زۆر کارسان بە سەر عێراق(کە بارودۆخەکەی جیاوازە) و ئێرانەوە نییە. ئەمڕۆ لێرە باسی کوردەکانی ئێران نەکرا، هەرچەند کە تەفسیرەکە وەئەستۆی کومیسیون نییە، چونکە هیچ کەسێك وەك وتەبێژی کوردەکانی ئێران لە لەدەستڕەسی ئێمەدا نەبوو.

بەڵام لە چوارچێوەی تورکیا، لە راستیدا گرنگ ئەوە نییە کە کوردەکان ١٠ هەزار کەسن یا ١٠٠ هەزار کەسن، بەڵکوو ئێمە لەسەر ئەو تەوەرانە قسە وباس دەکەین کە ئێوە دەیخەنەڕوو و (لە داهاتووشدا) قسەوباسی لەسەر دەکرێت. بەهەرحاڵ مرۆ دەتوانێت هیوادار بێت کە کۆمەڵێك رێگاچارە لە داهاتوودا دێتە ئاراوە..

دەگەڕێمەوە سەر ئەو مەسەلانە کە لە کۆتایی وتارەکەمدا باسم کرد، ئەویش ئەوە بوو کە ئایا رێگاچارەیەك بۆ کوردستانی تورکیا هەیە بۆ وەدیهاتنی ئامانجەکانی کوردەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتی دیموکراتی تورکیا کە هەموو لایەنەکان قبوڵی بکەن؟ ئەگەر رێگاچارەیەکی وەها بەدی دەکرێت، ئامرازە گونجاو و قبوڵکراوەکانی وەدیهاتنی کولتوور و ناسنامەی کورد چین لە کاتێکدا کە کوردەکان نەریتی ئەدەبیاتی نووسراویان نییە؟

بە بۆچوونی من لەم قۆناخەدا گرنگ ئەوە نییە کە ئەم ئامانجانە چین یا ئاماری کوردەکان ١٠٠ هەزار کەسە یا ٢٠ میلیون کەس.

خاتوون هافنێر: سپاس بەڕێز مارك.

بەڕێز؟: دەتوانم شتێك بڵێم بە یارمەتیتان؟

من هیچ پرسیارێکم نییە بەڵام دەمەوێت ئەوە بڵێم کە کاتێ کە دۆکتۆر نجم الدین کریم قسەی دەکرد، ئەم بەڕێزە(دیار نییە مەبەستی کێیە- وەرگێڕ) گاڵتەی بە قسەکانی دوکتۆر نجم الدین کریم دەکرد. ئەم بەڕێزە هیچ زانیارییەکی دەربارەی مێژووی عێراق بە نیسبەت مافەکانی کوردەکان ، زمانەکەیان و خاکەکەیان نییە. هەر کاتێك کە مەسەلەی کورد بە زیانی ئەمانە بێت، کوردستان لەخۆیان دوور دەخەنەوە.

ئێستا کوردەکان دەچەوسێنرێنەوە و دەردەکرێن و دەکوژرێن. پێموایە گەلی کورد مافی ئەوەی هەیە سەربەخۆیی خۆی بە دەست بهێنێت. هەڵوێستی دژە کوردانەی ئەم بەڕێزە لە پرسیارەکەیدا دیارە. بە بۆچوونی من ئەم بەڕێزە مرۆڤێکی قازانجپەرەستە و پارەی پێدراوە وا قسە بکات.

خاتوون هافنێر: پێموایە مەسەلەکە بەهەرحاڵ ئەوەیە کە بیروبۆچوونی جیاواز هەیە لە نێوان ئەندامانی گروپە کوردەکان. بەڕێز بەرهەم صالح وتی لە چوارچێوەی کەمینەدا سەیری کوردەکان ناکات، چونکە ئێمە لە چوارچێوەیCSCE لەپەیوەندی لەگەڵ کوردەکان لە دەستەواژەی کەمینە کەڵکوەردەگرین، کاتێك کە باسی مافی کەمینەکان دەکەین.

کەوابوو لە ئەنجامی گوێگرتن لە لە قسەکانی بەشداربووانی ئەم پانیلە بۆم دەرکەوت کە ئەوان دوو روانگەی بە تەواوی جیاوازیان هەیە. یەکێ لەم روانگانە، روانگەی بزووتنەوەی کوردستانی عێراقە کە هەوڵ دەدات بیرۆکەی خودموختاری لە چوارچێوەی وڵاتی یەکپارچەی عێراق پێشبخات. پێمخۆشە بەڕێز بەرهەم صالح بە کورتی باسی

ئەوەمان بۆ بکات کە واتا و ئاکامەکانی سەربەخۆیی کوردستانی عێراق بۆ وڵاتی عێراق و تورکیا چین. وادیارە ئەم نیشانە و ئاکامانە زۆر جیدین. پاش ئەوە ئەگەر بتوانین پێمباشە لە کۆتاییدا بەڕێز ئەحمەد تورك بیروڕای خۆی سەبارەت بە روانگەی pkk بەنیسبەت دامەزرانی دەوڵەتی کورد لەسەر بەشێك لە خاکی تورکیا و هەروەها چەند وڵاتێکی دیکە بۆمان باس بکات.

بەڕێز ئەحمەد تورك لە سەرەتای قسەکانی خۆیدا ئاماژەی بەوە کرد کە pkk لە پێناو ئامانجەکانی سەرجەم کوردەکان دەجوڵێتەوە بەڵام لە رێگای ئامرازگەلی زۆر زۆر جیاواز بۆ ئەم ئامانجانە هەوڵ دەدات . پێمخۆشە بزانم لە راستیدا ئەم ئامانجە هاوبەشانە چین و ئایا ئەم هەڵسەنگاندنە لە جێی خۆیدایە. دوکتۆر لۆری لە دانیشتنی پێشووتری ئێمەدا باسی ئەوەی کرد کە pkk بە هەمان ئەندازە باسی ئامانجەکانی کوردەکانی تورکیا دەکات کە IRA(سوپای رزگاری ئیرلەندا- وەرگێڕ) بۆ ئیرلەندییەکان باسی دەکات. ئەمە پرسیارێکە کە دەبێ بخرێتەڕوو و لەوانەیە بەڕێز تورك بیەوێت وەڵامی ئەم مەسەلەیە بداتەوە. کەوابوو من لە هەردوو بەشداربووی بەڕێزی ئەم پانیلە (بەڕێز بەرهەم صالح و بەڕێز ئەحمەد تورك) داوا دەکەم بە کورتی باسی ئەوەمان بۆ بکەن ئامانجەکانی کوردەکان هەم لە عێراق و هەم لە تورکیا چین؟

فەرمووبەڕێز بەرهەم صالح

بەڕێز بەرهەم صالح: ئامانجەکانی ئێمە لە کوردستانی عێراق وەها کە رێبەرایەتی کوردی عێراق دایڕشتووە، دامەزرانی عێراقێکی دیموکرات و یەکگرتوو و سیستمێکی فدراڵییە کە تێیدا گەلی کورد لە عێراق بتوانێت بگات بە مافە نەتەوەییەکانی خۆی و نەتەوەکەی بەفەرمی بناسرێت لە چوارچێوەی عێراقێکی

فدراڵی یەگرتوودا. ئێمە بە دوای دامەزرانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد نین لە عێراق چونکە هەست دەکەین بارودۆخ و هەلومەرج (هەم بارودۆخی نێونەتەوەیی و هەم بارودۆخی ناوچەیی) رێگا بە کردەوەیەکی وەها نادات. بە بۆچوونی ئێمە ریگاچارەی کاریگەرتر و کەمبەهاتر بۆ کێشەی کورد لە عێراق ئەوەیە کە ئەم کێشەیە لە چوارچێوەی وڵاتی ئێستای عێراقدا چارەسەر بکرێت.

ئێمە هەست دەکەین سەرلەنوێ دامەزراندنی عێراقێکی نوێ کە دیموکرات بێت و لە یاسای بنەڕەتیدا کۆمەڵێك گارانتی بۆ کۆمەڵگاکان و خەڵکەکەی دابنێت، کارێکی ئاسان نییە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێموایە لە نێو ئەو رێگایانە کە لەبەردەم ئێمەدایە، گونجاوترین و واقعبینانەترین رێگا بۆ گەلی کورد لە عێراق ئەو رێگایەیە کە باسم کرد و بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ئێمە خۆمان بە بەرپرسیار دەزانین کە یەکپارچەیی خاکی عێراق بپارێزین و لە چوارچێوەی سنوورەکانی دەوڵەتی ئێستای عێراق، بەشرێن ریگاچارەیەکدا بگەڕێین.

مەسەلەکە ئەوەیە کە کوردەکان رێگای عێراقی دیموکراتی فیدراڵ هەڵنابژێرن ئەگەر سەرەنجام سەدام حوسەینێکی دیکە، جێگای سەدام حوسەینی ئێستا بگرێتەوە و دیکتاتۆرێکی دیکە بێتە جێگای. بەبۆچوونی من ئەمە مەسەلەیەکە کە دەبێ چەند جاری دیکە باس و گفتوگۆی لەسەر بکەین . بەبۆچوونی من دینامیکی کۆمەڵگای کورد ئەوەندە بەهێزە کە نایەوێت جارێکی دیکە بگەڕێتەوە ژێر تەوقی دیکتاتۆرێکی دیکە و ببن بە قوربانی هۆلۆکاستێکی دیکە و ژینوسایدێکی دیکە. کەوابوو زۆر بە دڵنیاییەوە بە هەموو ئەو کەسانە کە پێیانخۆشە خاکی عێراق بە یەکپارچەیی بمێنێتەوە و عێراق وەك کیانێکی یەکگرتوو بمێنێتەوە، دەڵێم لەراستیدا ئێمە بە دوای ئەوەداین

که هەموو عێراق ببێ بە وڵاتێکی دیموکرات و کۆمەڵێك گارانتی قایم لە ناو یاسای هەمیشەیی عێراق بۆ گەلی کورد دەستەبەر بکەین بۆ ئەوەی گەلی کورد لە ئاسایش و ئارامشدا بژی .

خۆشك و برایانی بەڕێز ، با لە بارودۆخی دژوار و نیگەرانییەکانی گەلێك تێبگەین کە هۆلۆکاست کراوە، ژینوساید کراوە و ژمارەی قوربانییەکانی ئەوەندە زیادە کە دەبێ مونۆمێنتیکیان بۆ دروست بکەین و سەری ڕێز و نوازش لەبەرامبەریان دابنوێنین. لەم پێناوەدا تەنها قسەکردن و دروشمدان بەس نییە، بەڵکوو دەبێ بە کردەوە و بە بەڵگە بە هانای نیگەرانییەکانیاندا بچین و ڕێگایان پێبدەین ببن بە شەریکێکی چالاك لە ناو ئەو وڵاتە کە پێیدەڵێن عێراق.

خاتوون هافنێر: زۆر سپاس بەڕێز بەرهەم صالح.

ئێستا بەڕێز ئەحمەد تورك قسە دەکات، پاشان پرسیاری ئەو بەڕێزە وەردەگرین.

بەڕێز ئەحمەد تورك: ئێمەی کورد هیچ هەستێکی شۆوینیمان تێدا نییە. ئامانجی ئێمە ئەوەیە کە لە وڵاتی خۆمان لە ئازادی و سەربەستیدا بژین . بەبۆچوونی من ئاگربەستەکەی pkk و درێژبوونەوەی و داواکاری بۆ ئاگربەست شتێکی زۆر پێویستە. Pkk کۆمەڵێك ڕاستی قبووڵ کردووە، قبوڵی کردووە کە بارودۆخی ئێستا بە ئاسانی ناگۆڕدرێت و ڕاشکاوانە ڕایگەیاندووە کە ئەگەر تورکیا ئازادی و سەربەستی بدات بە کوردەکان، ڕێز لە یەکپارچەیی خاکی تورکیا دەگرێت.

بە باوەڕی من ئێمە دەرفەتی ئەوەمان بۆ ڕەخساوە و کۆمەڵێك ڕێگامان لە بەردەمدایە و دەبێ ئەم ڕێگانە بگرینەبەر. بۆ سەقامگیربوونی ئاشتییەکی هەمیشەیی لە ناوچە، هەم کوردەکان و هەم تورکەکان نابێ ئەم دەرفەتە لە کیس بدەن

و بەشوێنیدا بچن. هەروەها لەسەر ئەو باوەڕەم کە هێزە دیموکراتیکەکان لە سەراسەری جیهان دەبێ بە نۆرەی خۆیان پشتیوانی ئەخلاقی لە دەولەتی تورکیا بکەن بۆ ئەوەی ئەم کێشەیە بە شێوەی سیاسی چارەسەر بکەن. ڕێگاچارەیەکی وەها بۆ خەلکی تورکیا باشە و هەروەها بالادەستی دەبەخشێت بە حیزبە سیاسییەکان لە ئانکارا.

**خاتوون هافنێر:** زۆر سپاس.

فەرموو بەڕێز، ئەمە دوایین پرسیارە کە وەریدەگرین؟

**بەڕێز داونە:** لە راستیدا پرسیارم نییە بەلام دەمەوێت دەربارەی pkk شتێك بلێم.

ناوی من "ئاری داونە"یە و سەر بە *ڕێکخراوی کوردی کانادا*م.

لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەهەڵە pkk بەگروپێکی تروریستی ناسراوە. لە راستیدا ئێستا پێناسەی تروریزم گۆڕاوە. بەبۆچوونی من ١٢ یا ١٨ میلیون کورد لە کوردستانی تورکیا شووناسی نەتەوەیی خۆیان لەناو پارتی کرێکارانی کوردستاندا(pkk) دەبیننەوە. Pkk ڕێکخراوێکی تروریستی نییە کە خەلکی سیفیل بوکژێت و هێرش بکاتە سەر دەرەوەی سنوورەکانی تورکیا. بەبۆچوونی من دەربارەی pkk، زانیاری هەڵە بە ئەم پانیلە و خەلکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دراوە. خەباتی pkk لە بنەڕەتدا خۆپاراستنە، بۆیە باش دەبێت ئەگەر پێداچوونەوەیەك بەسەر پێناسەی تروریزمدا بکرێت.

زۆ ر سپاستان دەکەم.

**خاتوون هافنێر:** زۆر سپاس.

له کۆتاییدا دەمەوێت سپاسی سەرجەم ئەو کەسانە بکەم کە لەم پانیلەدا بەشدار بوون. پێموایە باس و گوفتوگۆکەی ئەمڕۆ زۆر سەرنجڕاکێش بوو. کومیسیونی هلیسینکی(کومیسیونی هاوکاری و ئاسایش لە ئەوروپا) وەك مەسەلەیەکی زۆر جیدی و گرنگ لە چوارچێوەی CSCE و کاروباری جیهانیدا سەیری مەسەلەی مافەکانی کوردەکان دەکات.

بەبۆچوونی من پێویستە ئەم پانیلە بەرەو نوێنەرایەتی ، بەرپرسیارێتی و دیموکراتیزاسیونی زۆرتر بچێتە پێش. هەروەها پێویستە زیاتر خۆمان لە قەرەی ئەم مەسەلەیە بدەین و ئەمەش تەنها ئەرکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نییە بەڵکوو ئەرکی کۆڕوکۆمەڵانی مافی مرۆڤە کە بەشوێن ئەم مەسەلە زۆر گرنگەدا بچن.

سپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کەئەمڕۆ لێرە ئامادەبوون.

پانیل کاتژمێر ١١و٥٢ خولەکی پێشنیوەڕۆ کۆتایی پێهات.

# پاشکۆی ٢

## وتاری خاتوون کەژاڵ عەبدولی، هاوسەری فەتاح عەبدولی، لە قوربانیانی (تیرۆری) رستورانی میکونوس لە کومیسیونی مافی مرۆڤی کۆنگرێسی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

١٠ی حوزەیرانی ١٩٩٧

# کومیسیونی مافی مرۆڤی کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

## وتاری خاتوون کەژاڵ عەبدولی، هاوسەری فەتاح عەبدولی، لە قوربانییانی (تیرۆری) رستورانی میکونوس

## ١٠ی حوزەیرانی ١٩٩٧

لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٩٧ کومیسیونی مافی مرۆڤی کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دانیشتنێکی بۆ تاوتوێکردنی تروریزمی دەوڵەتیی ئێران بەڕێوەبرد. ئەمە وتاری خاتوون کەژاڵ عەبدولییە کە هاوسەرەکەی لە رستورانی میکونوس لە برلین لە ئاڵمانیا گیانی لەدەسدا.

## وتاری خاتوون کەژاڵ عەبدولی

جەنابی سەرۆك، خۆشك و برایانی بەڕێز

ئەمڕۆ ئێمە لێرە تەنها بۆ ئەوە کۆنەبووینەتەوە کە ئیدانەی تروریزم بکەین(کە لە سەراسەری جیهاندا بڵاو بووەتەوە) و یادی ئەو کەسانە بەرز رابگرین کە بوونە بە قوربانی دیاردەی دزێوی تروریزم، بەڵکوو بۆ ئەوەش لێرەین کە رێگاچارەیەك بدۆزینەوە بۆ کۆتاییهێنان بەم جۆرە ئامرازی خۆدەربڕینە کە بێگومان ترسنۆکترین و توندترین شێوەی خۆدەربڕینە کە مرۆڤ دەتوانێ بیری لێبکاتەوە.

ئەگەر ئەمڕۆ من لێرە لەگەڵ ئێوە ئامادەم، لەبەر ئەوەیە کە قوربانییەکی دڵشکاوی تروریزمم و خۆشحاڵ دەبم کە بتوانم بەم شایەتیدانەی خۆم، ئیرادەی ئێوە بۆ خەبات لەگەڵ تروریزم پتەوتر بکەم.

ناوی من کەژاڵە، هاوسەری فەتاح عەبدولیم کە نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو لە پاریس و هاوڕی لەگەڵ سکرتێری گشتی حیزبەکەمان، دۆکتۆر سەعید شەرەفکەندی و دوو هاوڕێی دیکە لە ١٧ی ئەیلوولی ١٩٩٢ لە رستورانی میکونوس لە برلین بە ماوەی چەند کاتژمێر پاش بەشداریکردن لە کۆنگرێسی ئینترناسیونال سوسیالیست کە لەو شارە بەڕێوەچوو، کوژران.

لەوانەیە ئێوە لە خۆتان پرسیار بکەن کە"ئەوانە بۆ کوژران؟" یا " لە ولاتیکی دیکە کە زۆر لە کوردستان دوورە، چ پێویستییەك بە شەڕکردن لەگەڵ رێبەرایەتی گەلی کورد هەیە؟".

وەڵامەکەی سادەیە. دەیان ساڵە کوردەکان بۆ بنەڕەتیترین مافەکانیان خەبات دەکەن و لەگەڵ چەندەها جۆر سەرکووت و چەوساندنەوە رووبەڕوو بوونەتەوە. بەتایبەت کۆماری ئیسلامی قەد رق و کینەی خۆی لە گەلی کورد و هەروەها رێکخراوە سیاسییە سەرەکییەکەی واتا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران(KDPI) نەشاردووەتەوە. رژیمی ئێران بەردەوام و بە ئاشکرا وتوویەتی کە دەست بە هەموو کارێك دەدات بۆ لەناوبردنی فیزیکی سەرجەم رێبەرانی KDPI لە هەر شوێنێك بن، بۆ ئەوەی بۆ هەمیشە کۆتایی بە بوونی ئەم حیزبە بێنێت.

بۆ دەبی وابێت؟ سوچی KDPI چییە کە دەبێ لەگەڵ سەرکووتێکی وەها رووبەڕوو بێتەوە. وەڵامی ئەم پرسیارەش ئاسانە. حیزبەکەی ئێمە بە روونی داوای مافەکانی گەلی کورد دەکات کە وەك سەرجەم گەلانی جیهان، ئامەزرۆی ئازادییە. KDPI هەروەها لەسەر ئەو باوەڕەیە کە تەنها رێگاچارە بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە "دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستانە". ئایا پێتانوانییە لە کۆتایی سەدەی بیستدا ئەمانە داواکاریگەلێکی سروشتی و رەوا بن.

بەهەرحاڵ لە ناوخۆی کۆماری ئیسلامیدا "داخوازی بۆ ژیان"یەکسانە لەگەڵ "داخوازی بۆ مەرگ" و ئەو شتە کە مەلاکان پێی دەڵێن "ئازادی"، هیچ نییە جگە لە شێوە ژیانێکی یەکرەنگ کە بەسەر هەموو هاووڵاتیانی ئێراندا سەپاندوویانە. ئەم دواییانە هەڵبژاردن لە ئێران بەڕێوەچوو و مەلایەکی بەناو لیبراڵ و میانەڕەو وەك سەرۆك کۆماری ئێران هەڵبژێردرا. بەهەڵەدا مەچن: تەنها گۆڕینی کەسێك لە سەرووی حکوومەت نە دەتوانێت بارودۆخی ناوخۆی وڵات چاك بکات و نە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئێران دەبێت .تکایە ئەم قسەیەم بە هەند

لێوەربگرن: "هەتا کاتێك رێگاچارەیەك بۆ کێشەی کورد لە ئێران نەدۆزرێتەوە، تروریزم هەر هەیە".ئەڵبەتە بەشێك لە رەفتاری دەوڵەتی ئێران پەیوەندی بە مودارای دەوڵەتانی رۆژئاواوە هەیە.

لەخۆم پرسیار دەکەم ئاکامی ئەم هەموو کۆبوونەوە و سمینارانە چییە؟ ئایا هیچ کاردانەوەیەکی جیدیی نێونەتەوەیی لەئارادا هەیە؟ تاکەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی راستیەکان پشتگوێ دەخات؟ بۆ وەڵامی بیروڕای گشتی رۆژئاوا ئەوەندە لاوازە؟ دەوڵەتانی رۆژئاوا چ هەنگاوێکیان هەڵگرتووە بۆ ئەوەی لەناوخۆی وڵاتی خۆیاندا لەگەڵ تروریزم خەبات بکەن؟ تاکەی خوێنی خەڵکی بێ گوناه ببێ بە قوربانی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان؟ تاکەی خوێنی "قاسملوو"ەکان، "شەرەفکەندی"یەکان، "عەبدولی"یەکان، "قادری"یەکان، "ئەردەلان"ەکان و خەباتگێرانی دیکەی ئازادی تەنها بە هۆی کوردبوون و خەبات بۆ ئازادی گەل تەنانەت لە وڵاتانی دیکە بفەوتێت؟ لەوانەیە ئەگەر بەهۆی ئاکامی دادگای میکونوسەوە نەبایا هیشتا شك و گومان لە ئارادا ببایا بەنیسبەت هەبوونی دەستی ئێران لە تروریزمدا.

هاوڕێیان

وەك ئەندامێکی بنەماڵەی قوربانیان چاوەڕوانی ئەوە دەکەم تروریزمی نێونەتەوەیی لانیکەم لەو وڵاتانە کە پابەندن بە پرەنسیپە دیموکراتەکان، رابوەستێندرێت.

ریگامام پێبدەن تۆزێ باسی مەسەلەی تاکەکەسی خۆمتان بۆ بکەم.

پێموایە ئەو کەسانە کە بە گولەی مرۆڤکوژەکان کوژران، تەنها قوربانیانی تروریزم نین. راستە ئەوان خۆشترین شتی خۆیان واتا ژیانیان لەدەسدا، بەڵام کاتێ کە

